



## له بڵاوكراوەكانی ڕێكخراوی دۆستانی هەڵەبجە،
## زنجیرە كتێبی ژمارە (١٣)

### لەسەر ئەركی بەڕێز (ئاسۆ حاجی محەمەد بامۆكی) لەچاپ دراوە

**هەڵەبجەو موزیک، بیرەوەری و یاد**

**ئازاد ساڵح (شنروێ)**

---


- بابەت: یادەوەری
- پیاچوونەوە و هەڵەبڕی: مەریوان سەلاح حیلمی
- تایپ: مەریوان سەلاح حیلمی
- دیزاینی بەرگ و ناوەرۆک: نزار نوری
- چاپخانە:
- تیراژ: ٥٠٠
- نرخ: ٨٠٠٠ دینار
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
- لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارە ( )ی ساڵی (٢٠٢٣)ی پێدراوە


---

## پێشەکی

لای من کاک ئازاد و لای هەڵەبجەییەکانیش بە ئازادی صالّحی مەلا سابیر و لەبواری هونەریی و لەسەر ئاستی کوردستانیش بە ئازادی شنرویّ ناسراوە، تەمەنێکی درێژی لەبواری هونەردا بەسەر بردووە، ئەم هونەرمەندە داینەمۆ و بزوێنەری گەشەکردنی هونەر بەگشتی و موزیک بەتایبەتی بووە لەهەڵەبجە دا، بۆ یەکەمجار ئەم بەڕێزە بەشێوەیەکی زانستی و دروستکردنی تیپ و کۆکردنەوە و هاندانی هاوڕێکانی و هاوتەمەنەکانی بۆ گەشەسەندن و پێشخستنی موزیکی کوردی کاریان کردووە، ئەگەرچی پێشتر لەڕێی هەندیّ کەسی دڵسۆزەوە بەتایبەتی مامۆستاوشاعیری نەمر (ع.ع.شەونم) لەڕێی قوتابخانەکانی هەڵەبجەوە بەردی بناغەی هونەر بەگشتی و ئاواز و موزیکی بەتایبەتی داناوە، بەڵام کاک ئازاد و هاوڕێکانی توانییان بۆیەکەمجار کاری هونەری لەقوتابخانەکان بهێننە دەرەوەو لەناو شاری هەڵەبجەدا بایەخ بەم کارە گرنگە بدەن و دواتر چالاکییەکانیان لەسەرتاسەری کوردستان و عێراق دەنگی دایەوەو بۆ یەکەمجاریش لەهەشتاکاندا تیپی مۆسیقای شنرویّ بەرهەمی لەتەلەفزیۆنی کەرکوک بڵاوکرایەوە.

کاک ئازاد و هاوڕێکانی لەساڵی ١٩٧٣ بۆ یەکەمجار بەردی بناغەی تیپی مۆزیکی هەڵەبجە دادەنێن، کەبۆ ئەو کاتە کارێکی ئێجگار گرنگ بوو، ئەگەر دامەزراندنی ئەم تیپە بەراورد بکەین بە شارەکانی تری کوردستان، ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە کە هەڵەبجە دوانەکەوتووە لەکاروانی هونەر بەگشتی و مۆزیک بەتایبەتی، بەپێچەوانەوە ئەگەر بارودۆخی سیاسی ناوچەکە نالەبار نەبوایە، ئەوا گەشەسەندنی زیاتری بەخۆیەوە دەدی، چونکە هونەر بەگشتی لەناوچەی ئارام و

سەقامگیر گەشەدەکات و پێشدەکەوێت و دانابڕێت، بەڵام ئەگەر سەیری مێژووی شاری هەڵەبجە بکەین بەتایبەتی ئەو کاتەی کە کاک ئازاد صالح منالْ و دواتر گەنج بووە، ڕێکەوتەکەی دەکەوێتە دوای شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١، کە قورسایی شۆڕشەکە لەناوچەی هەڵەبجە بووە، بمانەوێ و نەمانەوێ ئەمانە گەشەسەندنی هونەر بەگشتی دوادەخات، تەنانەت دوای دوو کەرتبوونی پارتی لەساڵی ١٩٦٤ و دروستبوونی باڵی مەکتەبی سیاسی کە دواتر بە جەلالی و مەلایی ناسرا، قورسترین ململانێ و شەڕەکانی ئەم دوو باڵە لەناوچەکانی هەڵەبجە بووە، ئەمانە هەمووی کاریگەربوون بۆ ئەوەی ڕێگربێت لەوەی هونەر لەسەر رەوتی خۆی نەڕوات، بەڵام لە ١١ی ئازاری ١٩٧٠ چونکە سەقامگیری سیاسی و ئابووری هەبوو، ئا لەوکاتەدا وردە وردە هونەر کەوتە سەر ڕێچکەی ئاسایی خۆی و تیپی مۆزیکی هەڵەبجە لەساڵی ١٩٧٣ دادەمەزرێت کە تا ئێستا بەردەوامە، ئەگەرچی دوای ساڵێک لەدامەزراندنی تیپی هەڵەبجە، کارەساتی ٢٦-٤-١٩٧٤ بەسەر هەڵەبجەدا دێت، دوای نسکۆی ١٩٧٥ و بەدیاریکراوی شەڕی عێراق – ئێران گەورەترین گورزی لە هەڵەبجەدا، چونکە لە ساڵانی ١٩٨٠ تا ١٩٨٨ کەم ڕۆژ هەبووە کە هەڵەبجە بۆردومان نەکرێت، بەتۆپ و راجیمە، کە ئەمە ئەگەرچی چالاکییەکانی تیپی هەڵەبجەی سست نەدەکرد، بەڵام ئەگەر کوردستان و عێراق سەقامگیر بووایە، ئەوا بێگومان تیپی مۆزیکی هەڵەبجە زۆرتر چالاکییان دەبوو، بێگومان کیمیابارانی هەڵەبجە لە ١٦-٣-١٩٨٨ گەورەترین گوزری لەژیان بەگشتی و هونەر بەتایبەتی لە هەڵەبجەدا، هەتا ئێستاشی لەگەڵ بێت ئەو شارە نەهاتۆتەوە سەرخۆی، لەلایەک خەڵک بەگشتی و هونەرمەندان بەتایبەتی بەجۆرێک پەرتەوازە بوون کە دوای راپەڕینیش ئەو ئاواتە نەهاتەدی کە هەڵەبجەو خەڵکەکەی بگەڕێتەوە بۆ مێژووی پێش ١٩٨٨، چونکە لەدوای راپەڕین و گەمارۆکانی ئابووری و خواروخێچی دەسەڵاتی کوردی بواری ئەوەی نەدا کە هەڵەبجە پشوویەک بدات، بەپێچەوانەوە حیزبە کوردییەکان هاتن لەسەر جەستەی ماندوو، جەستەی هەلاهەلابووی پاشماوەی کیمیاباران، سەخترین شەڕی ناوخۆیان بردە هەڵەبجە.

کەواتە هەڵەبجەیەک ئەمە مێژووی خوێناوی بێت، ئەگەر کاک ئازادو هاوڕێکانی نەبوونایە ئەوا ئەو تروسکەیەش نەدەبوو. لەکاتی دروستبوونی تیپەکەدا هەرگیز بیری لەوە نەکردبۆوە کە ببێت بەسەرۆکی تیپ، بەڵکو دووان

لەئەندامی تیپەکە، خۆیان بەکاک ئازاد دەڵێن کە ئەرکی لێپرسراوی تیپەکە بگرێتە ئەستۆ، ئەو کات کاک ئازاد خوێندکاری ئامادەیی بووە، هەڵبژاردنی کاک ئازاد لەلایەن دووان لە ئەندامانی تیپەکەوە کاک ئازادی بەجۆرێک خستە ناو بەرپرسیارێتیکەوە، هەتا ئێستاش بەو پەڕی دڵسۆزی کارەکانی خۆی ئەنجام دەدا.

پێویستە لێرەدا ئاماژە بۆ گرنگی مامۆستاو پەروەردە بکەین کە بناغە و کاریگەری لەسەر کاک ئازاد داناوە لەشەستەکاندا، ئەویش یەکەم بەرکەوتنی کاک ئازاد لەگەڵ ئامێری کەماندا ئەو کاتە بووە کە مامۆستاکەی پێی وتووە بچۆ کەمانەکەم بۆ بێنە، کاک ئازادیش تاوەکو کەمانەکەی تەسلیمی مامۆستاکەی کردووە لە ڕێگادا هەر دەستی بەئامێرەکەدا هێناوەو بەوردی سەیری کردووە، ئەمە سەرەتای کاک ئازاد بووە بۆ مۆزیک، بەتایبەتی ئەو کاتانەی کە مامۆستاکەی لە هەڵەبجە ئامێرەکەی ژەنیوەو کاک ئازاد بەوردی سەرنجی داوە.

لەقۆناغێکی دواتر دایکی کاک ئازاد لیرەیەکی بۆ فرۆشتووەو باوکیشی پێنج دیناری ئەو کاتەی داوەتێ بۆ ئەوەی کاک ئازادی مێرد منداڵ یان هەرزەکار ئامێری مۆسیقی بکرێت و ئیتر ئەمە دەبێتە خولیایی و لەتاریکترین ڕۆژەکانی هەڵەبجەدا، کاک ئازاد دەبێتە چرایەکی ڕۆشن و ئومێد، بۆ پێشخستنی هونەر و گۆرانی کوردی.

لەدوای بۆردومانی (١٩٧٤/٦/٢٦) کاک ئازاد و خێزانەکەی دێنە سلێمانی و هەر لە سلێمانی لەلایەن مامۆستای بەئەزموون و دێرین ڕەئوف عوسمان، هەڵسەنگاندن بۆ کاک ئازاد دەکات و داخڵی ئەزموونە گشتییەکانی پۆلی شەشەمی ئامادەیی دەکرێت و بەیەکەمی سلێمانی لەبەشی وێژەیی و نمرەیەکی بەرز دەهێنێت و لە کۆلێژی کارگێڕی و ئابووری لەبەغدا وەردەگیرێت، ئەگەرچی ئەو حەزی لەکۆلێژی هونەر بووە، بەڵام لەبەر ئەوەی بەشی موزیک لە کۆلێژی هونەرەجوانەکان نەبووە، بۆیە بەناچاری دەچێتە کۆلێژی کارگێڕی و ئابووری، بەڵام ئەمە لەکاری هونەری دووری ناخاتەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە بەشدار دەبێت لەزۆربەی ئەو کارو چالاکییانەی لەبەغدا ئەنجام دراون، چ ئەو هونەرمەندانەی لەشارەکانی کوردستانەوە چوون بۆ بەغدا، چ چالاکییە جۆراوجۆرەکانی هونەرمەندانی بەغدا و شارەکانی تری عێراق، لەبەغدا خوێندنەوە و گەڕان بەدوای سەرچاوەی جۆراو جۆرو بینینی چالاکییەکان و هەوڵدان بۆ زیاتر فێربوونی

مۆزیک بەشێوەیەکی زانستی، ژیانی کاک ئازادی بەتەواوی گۆڕی، لەناو ژیانی زانکۆی بەغداد دا، کاک ئازاد کەسێکی شەرمن بووە، ئەم شەرمنییە لەلایەک زیان و لەلایەکی تر قازانجی بە کاک ئازاد گەیاندووە، زیانەکەی ئەوەبووە کەمتر تێکەڵی خەڵک بەتایبەتی قوتابیانی زانکۆی کردووە، بۆیە ئەزموونی دڵداری کاک ئازاد لەم کتێبەدا غایبە، ئەگەر شانۆی ژیانی کاک ئازاد، خۆشەویستی و دڵداری تیابووایە، رەنگە زیاتر بەهرەی بتەقیایەتەوەو چەندین ئاوازی ناسکی دڵداری دابنایە، چونکە کاریگەری ئافرەت لەسەر داهێنان گرنگی خۆی هەیە.

لەلایەکی تریشەوە قازانجی کردووە کە ئەمەش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە کاک ئازاد خەریکی دوو شت بێت، یەکەمیان خوێندنی زانکۆ و دووەمیان فێربوونی زیاتری مۆزیک، رەنگە ئەم دوو هۆکارە وای لەکاک ئازاد کردبێت کە نەپەرژێ سەر بەرزبکاتەوە و جوانی ئافرەت لەو قۆناغەدا ببێتە هەوێنی لەدایکبوونی ئاوازی نوێ.

لەساڵی ١٩٧٩ ناوی تیپی مۆسیقای هەڵەبجە دەگۆڕن بۆ شنروێ، ئەگەرچی ناو گرنگ نییەو ناوەڕۆک گرنگە، بەڵام ئەمە هەڵەیەک بووە تاوەکو ئێستا بەسەریاندا تێپەڕیوە، دەبوو ناوی تیپە سەرەکییەکە هەر ناوی هەڵەبجە بووایە و تیپەکانی منالان و گەنجان ناوی شنروێ بوایە، چونکە بمانەوێ نەمانەوێ سلێمانی و هەولێر و کۆیەو هتد ناوی شارەکەیان کردۆتە ناسنامە، دەبوو هەڵەبجەش وابوایە، ئەمە ناوچە پەرستی و فاشیزمی شارچێتی ناگەیەنێ، بەڵکو کورت و پوخت ئەوە دەگەیەنێ کە هەڵەبجەش وەک شارەکانی تر ئەگەر پێشنەکەوتبێت ئەوا دوانەکەوتووە، وە ناوی هەڵەبجە یەکەم بەرکەوتنی گوێگرو بینەرە لەگەڵ ناوەکەدا، واتە ناو سەرەتای یەکەم و کاریگەرە بۆ چوونە ناوخەڵکەوە (مەبەستم خەڵکی ئاساییە)، هەروەها لەدوای راپەڕینیش هەڵەبجە بەوە ناسرا هەر لە شانزەی سێدا کۆمەڵی ئاواز و گۆرانی غەمگین نمایش بکات، دەبوو ناوی هەڵەبجە و تیپی هەڵەبجە لە تیڤی و راگەیاندنەکاندا بەوە بناسرایەتەوە کە سەرەڕای ئەو کارەساتە گەورەیە، ئەوەتا تیپی هەڵەبجە هەڵساوەتەوەو نایەوێ لەکاروانەکەدا دوابکەوێت، ئەگەرچی دوانەکەوتووە، بەڵام مەبەستەکەمان ئەوە بووە کە کارو چالاکییە جۆراوجۆرەکانی فیستیڤاڵ و تیڤیەکان بەناوی هەڵەبجەوە بووایە، نەک شنروێ، چونکە هەڵەبجە لەئێستادا ناوێکی نێودەوڵەتییە، بەڵام شنروێ ناوچەییە و بەشێکە لە هەڵەبجە.

ڕووداوێکی ناخۆش لەم کتێبەدا هەیە ئەویش ئەوەیە کە کاک ئازاد و هاوڕێکانی لە هەشتاکاندا لە ڕۆشنبیری هەڵەبجە پرۆڤەیان کردووە، شەوێکیان پێشمەرگە دێن و بەشێک لە ئامێرەکانی تیپەکە و تەسجیلەکە دەبەن بۆ خۆیان و ئەمە بەچالاکی ئەژماردەکەن، کە هەموو کەس چاک ئەوە دەزانێت ئەمە گورزێکی کوشندە بووە لەتیپەکە درا، چونکە بەشێک لەو ئامێرانە بە هەوڵ و پارەی کەسانی ناو تیپەکە کڕدرابوون.

هەر لەم پێشەکییەدا پێویستە ئاماژە بۆ چوار خاڵی گرنگ بکەم:

یەکەمیانماڵی باوک و دایک و تێکڕای ئەندامانی خێزانەکەیان کە هاوکارییەکی باشی کاک ئازاد بوون کە تا بووە بەم کاک ئازادەی ئەمڕۆ، تەنانەت لەکاتی پێویستدا کاک ئازاد خوشکەکانی خۆی بردووە بۆ بەشداری کردن و وتنی کۆرس لە ئاهەنگەکاندا.

دووەم: لەئاهەنگێکدا  مامۆستا هەتاو کە ناسراوە بە ست هەتاوی حەمەسەعید فەنی، پاندایکی شیڤەر پێشکەش بەکاک ئازاد دەکات، کە مانایەکی گرنگ و تایبەتی خۆی هەیە، چونکە قەڵەم هێمایە بۆ داهێنان و نوسین، هەر لە هۆنراوەیەکەوە تا دەکاتە نۆتەکانی مۆسیقا، کە ماوەیەکی درێژ دەمێنێتەوە، بەڵام ڕەنگە ئەگەر دیارییەکە جل و بەرگ بوایە، هەر ساڵێک یان دووان دەمایەوە، بەڵام قەڵەم ڕەمزی مانەوەو داهێنانە.

سێیەم: کاک ئازاد صالح و کاک عادل حەسەن لەگرنگی مۆزیک تێگەیشتوون و دەزانن دەبێت وردە وردە بەهۆی تەمەنەوە  ئەم ئەرکە قورسە تەسلیم بەنەوەی تازە بکەن، بۆیە لە خەمخۆرییان فێرگەی مۆزیکیان لە هەڵەبجە کردۆتەوە، بۆ ئەوەی منالآن بەشێوەیەکی زانستی فێربکەن و نەهێڵن چرای ڕووناکی و ئومێد لە هەڵەبجەدا بکوژێتەوە، واتە هەر گرنگ ئەوە نییە تۆ هونەرمەند بیت، بەڵکو لەوەش گرنگتر ئەوەیە دوای خۆت نەوەیەکی تازە دروستبکەیت و بمێنێتەوە، وەک چۆن ئەندامانی تیپی مۆسیقای سلێمانی لەناویاندا ئەنوەر قەرەداغی هەمیشە شانازی بەوەوە دەکەن کە مامۆستا و ڕەوانشاد (ولیەم یوحەنا) دەستی گرتوون و فێری مۆزیکیان کردوون، ئێستا خۆشبەختانە ئەم هەوڵە لە لایەن کاک ئازاد و کاک عادلەوە گرنگی پێدەدرێ و نایانەوێ ئەو روناکییە لە هەڵەبجە بکوژێتەوە، ئەگەرچی لەکوردستاندا تاوەکو ئێستاش فێربوونی هونەر زیاتر هەوڵی تاکە کەسییە، بەڵام مامۆستاو داهێنەرانی ئەم بوارەوە ڕۆڵی گرنگ دەگێڕن لەمانەوەو

گەشەندنی هونەر بەگشتی، کاک ئازادیش لەکوێ زانیارییەک هەبووبێت، دوای کەوتووەو دەرفەتی لەکیس نەداوە و سوودی لە ئەزموونی کەسانی تر وەرگرتووە، ئەگەرچی سەرەتا مۆزیکی وەک خولیا وەرگرتووەو دوای کەوتووە، لەسەرەتادا فێرگەی مۆزیک نەبووە کە کاک ئازاد لێوەی فێربێت، بەڵکو وەک(گۆران)ی شاعیر لەم بوارەدا دەڵێ (نەحەرفی مەکتەبێکت خوێند نە ئوستازێ پەلی گرتی/ صیرف بەرزی زەکا ئەم سنعەتی فێرکرد بە شمشاڵت/ هەموو وەزنێکی گۆرانی لە تولانی هەتا کورتی/ بەسەر پەنجەی هونەر کردتت بەدیلی کۆشش زاڵت) کاک ئازادیش وابوو، وەک هەوڵ و خولیای تاکە کەسی فێربوو، پاشان بەهۆی وریایی و چالاکی خۆیەوە چ لەشارەکانی کوردستان، چ زانکۆی بەغدا، زیاتر چاوی کرایەوە و بووە هۆی ئەوەی کە هەرگیز کۆڵ نەدات.

ئەوەی بەلامەوە گرنگە بیڵێم لەسەر فێرگەی موزیکی شنروێ لەهەڵەبجە ئەوەیە کە نابێت کاک ئازاد و کاک عادل و هەموو ئەو کەسانەشی لەدوای ئەمان دێن چاوەڕێی منداڵ و فێرخواز بکەن بۆ ئەوەی ناوی خۆیان تۆماربکەن و یان کەس و کاریان بیهێنن بۆ فێربوونی موزیک، بەڵکو ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە کاک ئازاد و هاوڕێکانی راستەوخۆی بچنە ناو منداڵان و خەڵکەوە، بۆ نمونە هەموو ساڵێک لەسەرەتای کردنەوەی دەوامی قوتابخانەکاندا کاک ئازاد و کاک عادل و چەند منداڵێک، سەعاتی یەکەمی کردنەوەی خوێندنگەیەک بە ئاهەنگێک یان چەند پارچە مۆسیقایەک ئەنجام بدەن، یان لەوەرزی بەهاردا، یان لەکاتی گونجاودا راستەوخۆ بەشێک لە چالاکییەکان ئەگەر نیو سەعاتیش بێت بەرنە ناو قوتابخانەکانەوە بۆ ئەوەی قوتابیان راستەوخۆ بەریەککەوتنیان هەبێت لەگەڵ بەرهەم و ئامێرەکانی مۆزیکدا، بۆ ئەوەی هیچ نەبێت لەوەرزی هاویندا زیاتر منداڵان روو لە فێرگەکە بکەن، وە پێویستە کاک ئازادیش ئەوە بۆ بەڕێوەبەری خوێندنگەکان و مامۆستایان روونبکاتەوە کە منداڵ لەم سەردەمەدا هەموو خەون و خولیای بۆتە مۆبایل و ئایپاد و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، کە ئەمەش زیانی گەورەی بە تەندروستی و بیرکردنەوەیان گەیاندووە، بۆیە پێویستە ئەوە بخەنە مێشکی قوتابیانەوە کە کاتەکانی خۆیان لەشتی بەنرخدا بەسەربەرن بەتایبەتی مۆسیقا، پێویستە جەغت لەسەر ئەوە بکرێتەوە لەکۆبوونەوەی دایکان و باوکاندا، کە لەکاتی پێویست و گونجاودا منداڵەکانیان بخەنە خولە جۆراوجۆرەکانەوە بەتایبەتی خولی موزیک لە فێرگەی شنرویێ هەڵەبجە، تەنانەت ئەم کارەش بۆ

خوێندکارانی هەرزەکار و ئامادەییەکان گرنگە، کە فێرگەی موزیک جاروبار هەڵسێت بە ئاهەنگی دەهۆڵ و زوڕناو گۆرانی شاد بۆ ئەوەی ئەو خوێندکارانە هەم چێژی لێوەربگرن، هەم بیر لەوە بکەنەوە رۆژێک لەرۆژان ببن بە ژەنیاری ئامێرە موزیکییەکان.

هەروەها لەگەڵ ئەمەشدا پێویستە قوتابخانەکانی دەرەوەی شارو لادێکان بێبەش نەکرێن لەم بەرهەم و بەهرانە.

ئێمە کە ئەم پێشنیارە دەکەین ئەوەش دەزانین کە ئەمە هاتوچۆ و نانخواردن و خەرجی جۆراوجۆری دەوێت، ئەمەش لەسەر شانی یەک دوو کەس ناکرێت، بۆیە پێویستە پارێزگارو دام و دەزگاکانی هەڵەبجە، تەنانەت وەزارەتی رۆشنبیریش هاوکاری جدی ئەم فێرگەیە بکەن.

چوارەم: کاک ئازاد لەم کتێبەدا خۆی نەکردووە بە پاڵەوانی سەرەکی و هەموو شتێ بکات بەناوی خۆیەوە، ئەگەرچی ئەو داینەمۆ و کۆڵنەدەر بووە هەر لەسەرەتاوە تاوەکو ئەمڕۆ، بەنەبوونی و قەیرانەوە دڵی هەر لەلای مۆزیک و تیپی شنروێ بووە، بەڵام کاک ئازاد ئەوەندەی زاکیرەی یارمەتی دابێت ناوی هەموو ئەو کەسانەی بردووە کە لەکوردستاندا هاوکار و بەشدابوون لە تیپی شنروێدا، تەنانەت کاک ئازاد ناوی یەک بەیەکی خوێندکارەکانی سەردەمی منداڵی و گەنجی و زانکۆشی بردووە.

لەم کتێبەدا هەندێ شتی کۆمیدیشی تیایە، بۆ نمونە جارێکیان لە حەفتاکاندا کاک ئازاد کەمانەکەی پێدەبێت و هاوڕێیەکی دەبینێت، هاوڕێکەی پێی دەڵێ چەندت کوشتووە؟ کاک ئازادیش دەڵێ کوشتنی چی؟ هاوڕێکەی دەڵێ کەو و کۆتر؟ چەندت راوکردووە؟ کاک ئازاد دەڵێ ئەوە ئامێری کەمانە بەدەستمەوە، هاوڕێکەشی تەریق دەبێتەوە و دەڵێ وامزانی تاپڕە.

لەکۆتاییشدا پێویستە ئاماژەیەکی خێرا بۆ بەشێکی تری ئەم کتێبە بکەین، (واتە جگە لەبیرەوەرییەکان) بەشێکی تری ئەم کتێبە بریتیە لە لەو وتار و لێکۆڵینەو چاوپێکەوتنانەی کە لەگەڵی ئەنجام دراون، یان کاک ئازاد ئەنجامی داوە، بەتایبەتی ئەو چاوپێکەوتنەی لە حەفتاکاندا لەگەڵ هاوڕێیەکی بەناوی هێرش محەمەد ئەمین، لەگەڵ مینەی لولک ژەن، لە هەڵەبجە ئەنجامی داوە، کە نرخێکی مێژوویی هەیە، هەر ئەمەشە وایکردووە دوای ساڵێک لە چاوپێکەوتنەکەی مینەی لولک ژەن، رۆژنامەی هاوکاری ئەو کاتە بە بایەخەوە سەیری هونەری مینە بکات و بۆ

کۆچی دوایی بابەتی لەسەر بنوسن، هەروەها ئەوەی گرنگە لەسەر ئەو چاوپێکەوتنەی مینە ئەوەیە کە کاک ئازاد ئەو کات گەنجێکی خوێندکاری زانکۆی بەغداد بووە، لەیەکێ لە سەردانکردنەوەیدا بۆ شاری هەڵەبجە دەرفەتی ئەوە وەردەگرێت کە مینە بەخوێنەرانی هەموو کوردستان بناسێنێت، هەر کەسێکی تر بوایە لەباتی کاک ئازاد لەو ماوەیەی کە گەڕاوەتەوە بۆ هەڵەبجە خەریکی گەڕان و پیاسەو شتی تایبەتی خۆی دەبوو، بەڵام کاک ئازاد چونکە خەمی هونەری بووە، هەمیشە هەوڵی داوە لەهەر شوێنێک پێی بکرێت و عەقڵی پێشکابێت خزمەتی گەلەکەی بکات.

هەروەها لەوتار و لێکۆڵینەوەکاندا بەوردی لەبابەتەکانی کۆڵیوەتەوە، پێویستە ئاماژەیەکی خێرا بەوە بکەم کە نوسەری بواری موزیک لەکوردستاندا لەپەنجەی دەست تێناپەڕێت، خۆشبەختانە کاک ئازاد یەکێکە لەنوسەرە باشەکانی بواری موزیک، بۆ نمونە ئەو دوو بابەت و لێکۆڵینەوەیەی لەسەر بیتهۆڤن نوسیویەتی شتێکی ئیجگار گرنگە، چونکە ئێمەی کورد بەشێوەیەکی گشتی هەر بەناو، ناوی ناودارانی جیهانیمان بیستووە، بە بێ ئەوەی ئیشمان لەسەر کارەکانیان کردبێت، بۆ نمونە هەموومان دەزانین (ئەنیشتاین) زانایەکی بەناوبانگە، بەڵام دوودێڕ نازانین لەسەر بەرهەم و نوسینەکانی، بۆ بیتهۆڤنیش بەهەمان شێوە، هەر ئەوەندەی لێدەزانین کە هونەرمەندێکی موزیکی بەناوبانگی جیهانە و ئیتر تەواو، بەڵام کاک ئازاد لە لێکۆڵینەوەیەکی راڤەییدا بەجۆرێک چۆتە ناو کارەکانی بیتهۆڤنەوە کەم کەس دەرەقەتی ئەوە دێت بتوانێت لێکۆڵینەوەی وەها بنوسێت و بیتهۆڤن و سەمفۆنیاکانی بە خوێنەری کورد بناسێنێت.

خاڵێکی گرنگی تر کە پێویستە هەموو تیپە مۆسیقییەکان لەبەرچاوی بگرن، ئەوەیە کە پێویست ناکات موزیک ژەن یان گۆرانی بێژ هەڵسێت بەدانانی شیعر، (مەگەر لە حاڵەتێکدا کەسەکە بۆ خۆی شاعیر یان نوسەری بواری ئەدەب بێت) چونکە شیعر رەگەزێکی گرنگی گۆرانییەو ئەگەر شیعرەکە بەهێز بێت، ئەوا تەمەنی گۆرانییەکەش درێژ دەبێتەوە، بەپێچەوانەشەوە ئەگەر شیعرەکە کرچ و کاڵ یان لاواز بێت، ئەوا گۆرانییەکە لای گوێگر نامێنێتەوە، رەنگە بەشێک لە موزیکژەنەکان یان ئاوازدانەرەکان بڵێن ئێمە ناوەڕۆکی شیعرێکمان ئەوێ رەنگە نەبێت، بەدڵنیاییەوە هەیە، چ شیعری کۆن یان نوێ، یان ئەگەر کەم و دەگمەنیش بێت پێویستە داوا لە شاعیرێک بکرێت شیعرەکە بنوسێت نەک کەسی تر، باشترین

بەڵگەش بۆ ئەمە گۆرانی پێشەکی دراما و حەلقەکانە، کە هەم شیعرەکەی تازەیە، هەم ئاواز و دابەشکردنەکە. ئەگەر سەرنجی تەمسیلی (ژاڵە) بدەین کە ناوەڕاستی هەشتاکان پەخش کرا، دەبینین کە شیعرەکە کەڵە شاعیرێکی وەک حەسیب قەرەداخی نوسیویەتی، ئاوازەکەش هی مامۆستا سەلاح رەئوفە، وتنەکەی عەدنان کەریم، بەکورتی ئەم سیانە هەم شاعیر هەم ئاوازدانەر هەم وتنەکە وەها چوون بەناویەکدا وەها داهێنانی تیاکراوە کە هەرگیز ئەو گۆرانییە نامرێت، چونکە هەرسێکیان شارەزای بوارەکەی خۆیانن.

ئەمە لەبارەی ناوەڕۆکی شیعرەوە، لەبارەی روخسار و قاڵبی شیعرییەوە ئەوا هەموو جۆرە قاڵبێکی شیعری لە ئەدەبی کوردییدا دەستدەکەوێت لەچواربڕگەییەوە هەتا شانزە بڕگەیی، بەڵام باش وایە ئاوازدانەر هەمیشە خۆی لەو شیعرانە نزیک بکاتەوە کە شیعرەکەی قاڵبی چوار یان حەوت، یان هەشت یان دە بڕگەیی بێت، چونکە هەتا ژمارەی دێڕ و بڕگەی شیعری کورت بێت زیاتر ئەچێتە ناو خەڵکەوە و لەسەر زمانی خەڵکی دێت و دەڕوات و دەمێنێتەوە، بۆ نمونە گۆرانییەکانی حەسەن زیرەک (جگە لە مەقامەکانی) زۆرینەی گۆرانییەکانی فۆلکلۆر یان ئەدەبی میللین، سیحری مانەوەی گۆرانییەکانی ئەوەیە کە بەزۆری قاڵبی هەشتی و دەیی بەکارهێناوە، ئەمە لای گوێگر دەمێنێتەوە، رەنگە هەندێ جار قاڵبی یانزەیی یان دوانزەیی یان چواردەیی بەکارهێنابێت، بۆ نمونە گۆرانی (گەوهەرێ) قاڵبەکەی چواردە بڕگەییە، بەڵام حەسەن زیرەک زۆر لێهاتووانە کردوویەتی بە دوو حەوتی، واتە دیسان گەڕاوەتەوە بۆ قاڵبە کورتەکە کە حەوت بڕگەییە.

بەکورتی هەڵەیە گۆرانی بێژ یان ئاوازدانەر شیعر بنوسێت، بۆ نمونە رەوانشاد حەمەجەزای هونەرمەند کاتێک لە حەفتاکان شیعری (هێمن) لەنمونەی (بەهاربوو فەصڵی زستانم ئەگەر یارم لەگەڵ بایە) یان (ئەگەر چی شەو درەنگە ساقی بۆم تێکە کەمێکی تر) یان شیعرەکەی عەبدوڵا پەشێو (لەدەستم دێ کاتژمێری کامەرانیت بوەستێنم) ... هتد کاتێک ئەمانە ئەکات بەگۆرانی و مەقام، هەمیشە گۆرانییەکە لەبەرزیدا دەمێنێتەوە، بەڵام کاتێک خۆی لەکۆتاییەکانی تەمەنیدا گۆرانی (بەلێوم) یان (رانیەو قەڵادزێ) دەنوسێت و دەڵێت، لای گوێگر ئەو بایەخەی نییە، چونکە شیعر نوسین بەدەگمەن نەبێت (وەک کاکی پێشمەرگە) ئیشی ئەو نییە، ئەم ئیشە بەو ناکرێت، نمونە زۆرە، هەموو گۆرانییەکانی

ڕەوانشاد سابیر کوردستانی ناگاتە گۆرانی (لەدوورەوە ناوت بیستووم) چونکە شیعرەکە بەهێزەو هی عەبدوڵا پەشێوە، تەنانەت کاتێک هاوڕێکانی دوای مردنی هونەرمەند ویستیان یەکێک لەگۆرانییەکانی نوێ بکەنەوە، گۆرانی (لەدوورەوە ناوت بیستووم)یان هەڵبژارد، بۆچی؟ چونکە شیعرەکەی بەهێزە و کار لە گوێگر دەکات و لای خەڵک دەمێنێتەوە.

ئەڵبەتە نمونە زۆرە لەمبارەیەوە و ئەتوانین دەیان وسەدان نمونە بهێنینەوە، بەڵام بەم نمونەیە ئەم بەشە کۆتایی پێ دێنین ئەویش گۆرانی (بەتەنیا جێم مەهێڵن) هۆی سەرکەوتنی ئەم گۆرانییە چی بوو؟ بۆچی چووە ناو خەڵکەوە؟ بۆچی هەموو کەس ئەیڵێتەوە؟ لەبەر ئەم دوو هۆیەیە: یەکەم شیعرەکە هی شاعیری نوێخواز و بەناوبانگ (ڕەفیق سابیر)ە. دووەم کێشی شیعرەکە چواردەیی کە کراوەتە دوو حەوتی بەم شێوەیە (بەتەنیا جێم مەهێڵن (٧برگە) — (ئەمشەو زریان ئەمچێنێ (٧برگە) واتە قاڵبی شیعرەکە کورتە نەک درێژ، قاڵبی کورتیش زووتر ئەچێتە ناو خەڵکەوە.

ئەڵبەتە ئێمە ئەوەش دەزانین کە ئاواز و دابەشکردن و دەنگی هونەرمەند واتە وتنەکەی زۆر گرنگە و هەموویان یەکتر تەواودەکەن، بەڵام ئەوەی گرنگە ئێمە بیڵێین ئەوەیە کە ئاوازدانەر بۆیەکەمجار هاتووە لەسەر بناغەکە ئیشی کردووە کە شیعرەکەیە، ڕەنگە هەندێ جاریش ئاواز لەدایک ببێت و ئینجا قاڵبێکی شیعری بەبەردا بکرێت، ئەمەش بابەتێکی ترە.

هەروەها ئەگەر ئاوازدانەر شیعری شاعیر بکات بەگۆرانی و ئاواز، باش وایە شیعرەکە پیشانی یەک دوو شاعیر یان ڕەخنەگر بدات، یان باش وایە بۆ هەر ئاوازێک زیاتر لە شیعرێک ئامادەبێت، بۆ ئەوەی باشترینیان هەڵبژێرێت.

با ئەوەشم لەبیر نەچێت کە پێویستە موزیک ژەن یان ئاوازدانەر ڕۆژانە لانیکەم دەبێت شیعرێک دوان، لاپەڕەیەک یان دووان بخوێنێتەوە، چ لە کتێب و دیوانەکاندا، یان تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، بۆ ئەوەی هەمیشە ڕابێن لەگەڵ شیعرو ئیقاعی شیعریدا بژین، بۆ ئەوەی شیعری چاک و لاواز لەیەک جیابکەنەوە، بۆ ئەوەی لە نەستیدا بمێنێتەوەو ببێتە هۆی لەدایکبوونی ئاوازێک، وە بۆ شیعریش پێویستە شیعری هەموو شاعیرانی ناوچەکانی کوردستان لەبەرچاوبگرێت، واتە مەرج نییە شاعیرەکە هەر خەڵکی هەڵەبجە یان سلێمانی بێت، بەڵکو پێویستە هەولێر و کۆیەو سنەو مەهابادیش .. هتد لەبەرچاوبگیرێ.

مادام لەو چەند دێڕەی سەرەوەدا باسی ئاواز و قالبی شیعریمان کرد، باش وایە ئاماژە بۆ ئەوەی بکەین کە کاک ئازاد جگە لەوەی لەئێستا و رابردوودا موزیک ژەنێکی بەتوانابووە، بەڵام هاوکاتیش بیری لەوە کردۆتەوە کە نابێت هەر بەتەنیا گۆرانییە فۆلکلۆرییەکان، یان بەرهەمەکانی تری تیپە مۆسیقییەکانی کوردستان دووبارە بکاتەوە، ئەگەرچی ئەم کارە بۆ سەرەتای دەستپێکردن کارێکی گرنگە، بەڵام کاک ئازاد بەسوود وەرگرتن لەو وانانەی کە جاروجار لەبەغدا و سلێمانی وەریگرتووە لەسەر موزیک، ئیتر هەوڵی داوە لەگەڵ بەهرەی خودی خۆی و ژەندنی ئامێری کەماندا ئاوازی تازەش دابنێت، کە هەموو کەس ئەوە دەزانن کەکاری مۆزیک ژەندن و ئاوازدانان دوو پسپۆڕی جیان و هەر یەکەیان تواناو شارەزایی و داهێنانی خۆی دەوێت، نەک هەر ئەمەش بەڵکو ئاوازی تازەش بۆ دنیای منالان دابنێت، کە من لام وایە دانانی ئاواز بۆ منالان کارێکی ئێجگار قورسە، چونکە دەبێت ئاوازدانەر بەتەواوی بچێتە ناو دنیای منالانەوە، بۆ ئەوەی منالان بەرهەمەکەی لێوەربگرن، ئەزمونی کاک ئازاد بۆ دنیای منالان بۆ کۆتایی حەفتاکان دەگەڕێتەوە، بەڵام لەهەشتاکانی سەدەی بیست و بەدیاریکراوی لەئۆپەرێتی سەوزەدا، ئاواز و گۆرانی بۆمنالان لای کاک ئازاد دەگاتە لوتکەی داهێنان، بەجۆرێکە ئەگەر لەگەڵ ئەو ئۆپەرێتەدا گۆرانییەکانی لەگەڵ نەبێت، ئەوا کاریگەری ئەوتۆی نابێت، یان باشتر وایە بڵێین گۆرانی ئۆپەرێتەکان بەگشتی کە کاک ئازاد کاری تێدا کردوون، وەهای لەمنالّ کردووە کە بەدیار تەماشاکردنی ناوەڕۆکی ئۆپەرێتەکەوە بێتاقەت نەبێت و جارو بار گۆرانییەک تێکەڵ بە نمایشەکە بکات بۆ ئەوەی منالان تەنانەت گەورەکانیش چێژ و سوودی لێوەربگرن.

لەلایەکی تریشەوە کاک ئازاد هەموو جارێک فۆلکلۆری وەک خۆی، واتە وەک ئەوەی کە هەیە کۆپی نەکردووە، بەڵکو هەوڵی ئەوەشی داوە تازەگەری تیا بکات بۆ ئەوەی گوێگری تازەش زیاتر چێژی لێوەربگرێت، یان بۆیەکەمینجار بەهەوڵی کاک ئازاد گۆرانی هەورامی چۆتە سەر شاشەی تەلەفیزیۆن، کە پێشتر هیچ گۆرانییەکی هەورامی مەگەر بەدەگمەن لەراگەیاندنەوە واتە لەرادیۆدا بڵاوکرابێتەوە، وەک دەگێرنەوە لەپەنجاکاندا تیپی رادیۆی مۆسیقای بەغداد لەگەڵ ئەوەدا نەبوون کە گۆرانی هەورامی بەتایبەتی سیاچەمانە تۆماربکەن و وتویانە گۆرانییەکە یان مەقامەکە درێژە و بەکەڵکی رادیۆ نایەت، بەڵام کاک ئازاد

بەشێوەیەکی ئەکادیمی گۆرانی هەورامی بۆیەکەمجار خستە سەر شاشەی تەلەفیزیۆنی کەرکوک لەساڵی ١٩٨٣دا، کە تا ئەو کاتە گۆرانی هەورامی بە بێ مۆسیقا یان بە بەزمی چەپڵە تۆمار دەکرا لەماڵان و سەیرانگاکاندا.

لەلایەکی تریشەوە کاک ئازاد لەباتی لایڤ موزیکی یانەکان و پارەپەیداکردن بەهونەرەوە، دێت کاتەکانی خۆی بە دانانی کۆراڵ و ئاوازی تازەو بابەتی ئەکادیمییەوە تەرخان دەکات، نەک بابەتی کرچ و کاڵ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم هونەرمەندە هەمیشە لەخەمی داهێنان و تازەگەرییدایە.

لەناو کتێبەکەدا ئەلبوومی وێنە هەیە، کە بەشێکی ئێجگار گرنگە، چونکە ئەو وێنانە زۆربەیان هی سەردەمی کامێرای رەش و سپی و رەنگاورەنگن، کە نرخێکی مێژووییان هەیە، رەنگە بەشێک لەو وێنانە تەنها لای کاک ئازاد هەبێت، بۆیە وێنەکان وەک مێژوو، وەک ئەرشیف، راستی و دروستی و هیلاکی و ماندووبوونی کاک ئازادمان بۆ دەگێڕێتەوە، ئەمە جگە لەوەی کە وێنەکان گەشتمان پێدەکەن بۆ رابردوو، هەر بەهۆی وێنەکانەوە چەندین یادەوەری ئەو رۆژانەی خۆمانمان دەهێنێتەوە یاد، هەروەها گرنگییەکی تری ئەوەیە کە ئێمە وەک کورد لە مێژوودا بەکەمی گرنگیمان داوە بەوێنەو ئەرشیف، کە ئەمەی کاک ئازاد کردوویەتی زیاتر بینەرو خوێنەر رادەکێشێت بۆ خۆی.

لەکۆتاییدا خۆزگەی ئەوەم ئەخواست کاک ئازاد بیتوانیایە کە سەرجەم گۆرانییەکانی تیپی موزیکی هەڵەبجەو شنرویێ هەر لە حەفتاکانەوە تاوەکو ئێستا (٢٠٢٢) واتە تێکستەکانی بنوسیایەتەوە، هەم بۆ ئەوەی هونەرمەندانی نوێی کورد سوودی لێوەربگرن و گۆرانییەکانییان بڵێنەوە، هەم بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی کە دوای لێکۆڵینەوەی دەقی ئەدەبی ئەکەون، لێکۆڵینەوەی راقەیی لەسەر بنوسن، هەم دەبێتە سەرچاوەیەکیش کە هەندێ لەو گۆرانییانە لەفەوتان رزگار دەبن.

جارێکی تریش دەستخۆشی لە کاک ئازاد ئەکەم، هیوای تەمەن درێژی بۆ ئەخوازم، هیوادارم ئەو ئەرکەی کە کاک ئازاد لەرابردوو وە ئێستا کێشاویەتی، نەوەی تازە بەو پەڕی دڵسۆزی و بەرپرسیارێتییەوە پەیامەکەی کاک ئازاد وەربگرن و نەهێڵن هونەر لە هەڵەبجەو کوردستان خامۆش بێت و بکوژێتەوە.

مەریوان سەلاح حیلمی

# بەشی یەکەم

# بیرەوەرییەکان

**سەرەتای منداڵیم، کۆتایی ساڵانی پەنجاکانی سەدەی بیستەم**
**لە گەڕەکی جوولەکان لە هەڵەبجە**



## چەند دێڕێک
## لە بیرەوەری منداڵیم

یادەوەریم دەمباتەوە بۆ سەرەتای منداڵیم، کۆتایی ساڵانی پەنجاکانی سەدەی بیستەم لەگەڕەکی جوولەکـان لە هەڵەبجە لە جوگرافیایەکی زۆر بچووک لە زەمەنێکی پڕ لە گۆڕانکاری، لە چەندین ڕووداو و ئاڵ وگۆڕی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی.

هێندەی وەک تروسکاییەک لە بیرم بێت، کۆڵانە تەنگەبەرەکانی گەڕەک، خانووە قوڕەکانی، گوێسەبانەکانی، کە بە داربەڕوو وەک منداڵێک سەیرم ئەکرد ڕێکوپێک لەگەڵ یەک ڕیز کرابوون، دیوارە سواغ دراوەکان، کە هەمووی لەگەڵ کایەکی زبردا تێکەڵ کرابوون، هەموو دیوارەکان درزیان تێ کەوتبوو، ئەو کۆڵانە تەسکانەی کە بە زستان لەقوڕدا دەچەقیت و بە هاوین تەپ و تۆز و جارجارەش بۆ بەردێک دەگەڕایت بۆ ئەوەی یارییەکی پێ بکەیت.

من نۆبەرەی منداڵەکانی خێزانی خۆمان بووم، وەک دایکم بۆی گێراومەتەوە نەوزادی مامە تاهیرم چل شەو لە من گەورەتر بووە، ئەوکاتانە واتە لە ساڵی (١٩٥٥) لە ماڵی نەنکم (دایکی باوکم واتە ناجیە خان) لەگەڵ نەنکم وکچەکانی ئافتاو و زەکاو و ماڵی مامە تاهیرم پێکەوە لە خانوویەک بووین ، وەک خەیاڵێک دارەڕاو کۆڵەکەکانی، شەوانی سەربانی هاوینم لە بیر دێت کە لە تەنیشت ماڵی کاک (فازیڵی خەیات)ەوە بووین، شێوەو ڕوخساری دادە (بەداو)ی خێزانی: (بەدری وەستا رەشید ١٩٢٧- ٢٠٠٥)، بەرامبەریشیان ماڵی دایە گەورەم؛ واتە دایکی دایکم بەدریە، ماڵی (فاتمە ئەحمەد)سنەیی و ماڵی باپیرم (حسین بانەیی)، لە پاڵیشیان ماڵی مامی دایکم صالح بانەیی، ئەو کۆڵانە دەرنەئەچوو، لە پاڵ ئەوانیش ماڵی جەمالی مەلا قادر و دایکی گێلاس خان، ڕێک بەرامبەر ماڵی دایە گەورەم ماڵی وەستا مەجیدی دەلاک ئامۆزای باوکم، تەمەنم سێ چوار ساڵێک ئەبوو، ئەو کاتە ماڵی ئێمەو پورە فەخریەم خوشکی دایکم خێزانی عومەری وەستا مەردان و ماڵی توحفە خان خێزانی عوسمانی وەستا مەردان، لە ماڵێک بوون لەو گەڕەکە، بیرم دێت لەسەر تەختەیەکی حەمام منداڵێک کە خوێن بە دەمیدا هاتبووە خوار بە دانیشتنەوە دەیان شت کە تەمەنی ٨ ڕۆژێک بوو گیانی لەدەست دابوو، بیرم دێت شەویک چەند کەسێک بردیان بۆ گۆڕستانی شێخ سمایل لە بەرماڵێک پێچرابوو بردیان ناشتیان، منیشیان لەگەڵ بووم.

هەر لەو یادەوەرییە زۆر تەلیسماویانەم بە منداڵی وەک دایکم بۆی گێڕاومەتەوە بە کفتەم وتووە تۆپ، حەزم لێبووە، بیرم دێت نیوەڕۆیەک ئامۆزای دایکم شەهید (عومەری ڕەسام) کە منی زۆر خۆش دەویست، هەر ئەویش ناوەکەی بۆ هەڵبژاردبووم، نیوەڕۆیەکیان بە باوەشیەوە بووم بردمی بۆ ماڵی خۆیان کە کفتەیان لێنابوو، هەر لە یادەوەری منالیم زۆر جار خاڵەکانم دەستیان دەگرتم و دەیان بردم بۆ بازاڕ، یان تەمەنم سێ چوار ساڵ بوو، باوکم دوکانی عەتاریی هەبوو لە پیرمحەمەد لەدوکانەکانی شارەوانی، جارجاریش کێک و شەکرلەمەی دروست ئەکرد، یەکێک بوو لە هەرە دوکانە جوانەکان، کە پڕ بوو لە لە چکلێت و نوقڵ و فستق وجۆرەها چەرەسات وشەربەت وپێداویستی قوتابخانە لە دەفتەرو قەڵەم و جانتا، بیرم نایەت بەس وەک ئەیان گێڕایەوە ساڵێکیان دوکانەکەی سووتاوە.

تەمەنم سێ ساڵان بووە شۆڕشی چواردەی تەموزی (١٩٥٨) روویداوە لەو کاتەدا ئازادی سیاسی بوونی بووە، وە حیزبەکان چالاک بوون بەتایبەتی شیوعی و پارتی و شەڕو ئاژاوە لە نێوانیان درووستبووە، چەندین ڕێکخراوی کرێکاران،لاوان، قوتابیان و جوتیاران گەشەیان کردووە.

یەکێک لەکۆنترین ئاوازلەبیرم بێت هەمیشە دایکم بۆی دەگوتم (ئەمڕۆ سەیرە لە گەنجان .. عەسکەری تۆین، کەریم گیان) یان ئاوازێکی تری کۆن (عبدالکریم تۆی پاڵەوانەکەم) یان سروودی (من شەڕم ناوێ) کە ئاوازێکی ئیبراهیم خەیات بووە، ئەوانە یەکەمینترووسکایی ئاواز بوون کە لە بیرم بێت.

هێندەی بیرم بێت ساڵی (١٩٥٩) بوو، لەگەڕەکی کانی قوڵکە، باوکم (٣٠٠) مەتر زەوی کڕی، جاران هەر بە (پەت) دەپێورا، لەگەڵ عوسمانی وەستا مەردان کە بەنایەکی کارامە بوو، هەمان ساڵ بەرامبەرمان ئەویش زەوی کڕیبوو، ئیتر ئەو زۆربەی خانووەکانی ئەو گەڕەکەی درووست دەکرد بە بەرد، کە شێوازی ڕۆژهەڵاتی بوو، دیوارەکانی بەردو سەرەکەی گڵی عەبابەیلێ بوو، کە گڵێکی سپی باو بوو، بۆباران بارین خۆڕاگر بوو دژی دڵۆپە، ئیتر ڕۆژانە دایکم ئەوکاتە تەنها من و کاوەی برام بووین پێکەوە لەگەڵ ماڵی (توحفەخان)و کچەکانی شەوبۆ و پرشنگ و پێکەوە نانمان دەخوارد کە هەمووومان شیری یەکترمان خواردبوو وە خوشک و برای شیری بووین.

دێتە یادم کە چووینە ئەو خانووە دیوارەکانی حەوشەکەی قامیش بەند بوو، دوای یەکساڵ زیاتر ئینجا کردیان بە دیواری بەرد. ئەوەی لە یادم بێت زۆربەی کاتەکان بە یاری کردنەوە خەریک بووم لەگەڵ کوڕان و کچانی گەڕەک. ئیتر یاری کردن بووبوو بە تانوپۆم، ڕاکردن و تەپ و تۆزی ئەو کۆڵانە تەسکانە کە کاتی خۆی جولەکەکان تێیدا ژیابوون، سەرەتای ساڵانی پەنجاکان هەموو شت ومەکیان فرۆشتبوو و بە گریانەوە بە جێیان هێشتبوو، چونکە پەیوەندییەکی قووڵی کۆمەڵایەتیان هەبووە لەگەڵ دانیشتوانی هەڵەبجەدا، کچێکی جوانیان هەبووە بە ناوی (شێوە) کە پەیوەندییەکی سۆزداری هەبووە لەگەڵ (عارفی حاجی فەرەج) کە ڕۆشتبوون و دەوڵەتیان بۆ دروستکرابوو هەتا بەغدا لەگەڵیان ڕۆشتبوو.

ئەو دەمـانە گـۆرانی و یـاری منـاڵان بووبـووە خولیـام، بە شـەو و ڕۆژ لەو گۆرانی مناڵانەو یارییانە وەک: (سابوونی ڕەقی پشتم تەقی . عەلیم بەگ لام بەگ کە شیعرەکانی هەندێکیانم لە بیر ماوە: مناڵەکان چوون بۆکوێ . باخی میر چیان خوارد بوورمە چی تریش خورما. وە هەیاران و مەیاران یاخوا داکاتە باران بۆ فەقیرو هەژاران. ئاخچی و بۆخچی دایەو بابە سندووق چی، ئاگری شینی گیایی بۆ مەیلی برایی . یاری موشێن .هەلوکێن . خەت خەتێن . هەڵمەقۆ کە زیاترکچان دەیـان کـرد . حەمـامۆکێ مـوم بـۆ دەرکـێ) و چەنـدین یـاری و گـۆرانی تـر کە زۆربەیانم نووسیوەتەو کردوومە بە کتێبێک و لەژێر چاپدایە، ئەم یادەوەرییانە سەرەتای پێنج تاشەش ساڵی مناڵیم بوو لەگەڕەکی جولەکان.



ماڵی دایەگەورەم گەڕەکی جولەکان ١٩٦٠/٤/٧. لەگەڵ کاوەی برام، بەکامێرای خاڵە عەلیم گیراوە.

پـاش ئەوە واتە سـاڵی (١٩٦١) چـوومە قوتابخـانەی سـەرەتایی کە ئەحـمەدی ڕەشیدی قەساب پێش من بوو، لە قوتابخانە وەرگیرا بووم، بیرم دێت بەیانییەکیان دایکم (تەسکەرە) واتە پێناسەی کەسـی منـی دا بـە ئە حمەدی ڕەشـیدی قەسـابی دراوسـێمان و لەگەڵ خـۆی بردمـی بـۆ قوتابخـانەیەک کە ماڵێـک بـوو لە خـوار مزگەوتی دار الاحسان، دواتر ماڵی شاعیر (شاهۆ)بوو، لەوێ داخڵی قوتابخـانەی

کردم، لەو قوتابخانەیە ماوەی هەفتەیەک لەوێ بووین، بەڕێوەبەرەکەی مامۆستا (ئەحمەدی مەلا حسین) بوو باوکی هۆشیار و بەختیار، پاشان بیرم دێت ڕیزی کردین، بەڕیز بەرەو کانی عاشقان چووین کە تازە بینای قوتابخانە (التقدم) درووست کرابوو، وە ماوەیەکی کەم لەوێ بووم چونکە دوور بوو تاقەتم لێنەبوو، باوکم شێخ فاتح عەبابەیلێی دەناسی کە بەڕێوەبەری قوتابخانەیەک بوو لە پشت سەرا وماوەی یەک دوو هەفتەش لەوێ بووم، لەوێش تاقەتم نەبوو، پاشان چونکە باوکم دوکانی لە پیر محەمەد بوو حەزم دەکرد نزیکی ئەو بم و گواستمەوە بۆ قوتابخانەی (ئاشتی) لە پیرمحەمەد لە سەرو کتێبخانەی گشتی، بەڕێوەبەرەکەمان ناوی (فەرەج ئەفەندی) بوو ماوەیەکی کورت لەوێ بوو، پاشان گواسترایەوە بۆ بەغدا، پاش ئەوە مامۆستا (ئەحمەد مەحمود) ناسراو بە (ئەحمەدی مەحمودی مام عەزیز) ئیتر من ئەو شەش ساڵەی قوتابخانەی سەرەتایی لەوێ بووم .





**مامۆستا و قوتابیانی هاوپۆلم لە ساڵانی شەستەکان کێ بوون؟**

لەو مامۆستایانەی لەوێ بوون سەرەتای ساڵی (١٩٦١) مامۆستا (حەوێز) ناوێک بوو وەرزشی پێ دەگوتین، دوای ماوەیەک دیار نەما، پۆلی یەکەمی سەرەتایی لە قاتی سەرەوەی قوتابخانەکە بووین کە تازە عبدالکریم قاسم دروستی کردبوو، مامۆستایەک کوردی پێ دەوتین ناوی (بورهانە ئەفەندی) بوو، لە پۆلەکەدا وێنەی وانەکانی کوردی بەڕەنگاو ڕەنگ هەڵواسرابوو کە هەمووی لە کتێبی کوردی (ئیبراهیم باڵدار) چاپ کرابوو، زۆر سەرنجی ڕاکێشام، هەر لەو ساڵەدا ئەومامۆستایەم بە بیر دێت .

ئەو قوتابیانەی لەگەڵم بوون لە پۆلی یەکەم ئەوەی لە بیرم بێت شەوکەتی حەمە مراد و حەمە عەلی برای بوون لەگەڵ ئاری دیاری بەگ وە چەند قوتابییەکی تر، لە پۆلی دووهەم چووینە ژووری کۆتایی قاتی سەرەوە، ئەو مامۆستایانەی لە بیرم بێت مامۆستا نەجات ناوێک بوو خەڵکی سلێمانی بوو، زاهیر ئەفەندی وە مامۆستا سەلاحی حیلمی (١٩٤٤-٢٠١٩) تازە بۆ (تطبیق) کردن لەوێ بوو.

## دەستپێکردنی شۆڕشی ئەیول

ساڵی (١٩٦١) شۆرشی ئەیلول دەستی پێ کردبوو، زۆر ڕۆژ پێشمەرگە بە عەسران تەقەیان لەو پۆلیسانە ئەکرد کە پێیان ئەوتن (قوەی سەیار) واتە گەڕۆک کە لە سەربانی قوتابخانەکەمان ڕەبایەیان دانابوو، لە پۆلی سێهەم چووینە قوتابخانە کۆنەکەی نزیک فولکەی پیر محەمەد ناوی قوتابخانەی سیروان بوو کە پێیان دەگووت قوتابخانەی پەڕۆ، ئەمە لە ساڵی (١٩٦٣) بوو، لە ژوورێک بووین کە زۆر پەڕپوت بوو، تەنانەت کات زستان بوو زۆر سارد بوو، بیرم دێت دەرگای پۆلەکەمان بە لێفەیەکی کۆن گیرابوو، بۆ ئەوەی سەرما نەیەتە ژوورەوە، لەو ساڵەدا چەندین کەس پێکەوە بووین و لەوێ مستەفای کەمال خەفاف و ئەحمەد عبدالقادرو ڕەوان شاد سارەوان حاجی کەریم ئەوبەریم ناسی، لەو مامۆستایانەی بەبیرم بێت مامۆستا حەمە عەلی بەگ بوو وانەی کوردی پێ دەگوتین، لەو قوتابخانەیەدا گۆڕەپانێکی کراوەی گەورەی هەبوو کە هیچ سیاجێک یان دیواری نەبوو، هەروەها عەسرێکی هەتاوی بەهار بوو بۆ یەکەمین جار لە ژیانم شێخ عەلی واتە (خولە کەشکۆڵ)م بیر دێت لەگەڵ چەند کەسێکی تر یاری باسکەیان ئەکرد و سەیری ئەو یاریەم ئەکرد، هەر لەو ساڵەدا بەعس کودەتایەکی ڕەشی کرد لە ڕۆژی (١٩٦٣/٢/٨)، دەستی کرد بە کوشت و کوشتاری کەسانی ئازادیخواز بە تایبەت شیوعییەکان و شۆڕشی چەکداری کورد، ئیتر کەوتە هێرش کردن بۆ سەر شوێنە ڕزگار کراوەکانیان، لە هاوینی ئەو ساڵە واتە لە (١٩٦٣/٦/٩) لە ڕۆژی ٩ ی حوزەیرانی ئەو ساڵە لە شاری سلێمانی قەدەغەی هاتووچۆیان ڕاگەیاند، چەندین کەسیان زیندە بە چاڵ کرد لەوانەی لەبیرم بێت مامۆستا یاسین و ئەنوەر سەعید دارتاش و چەندینی تر کە وەرزشەوان بوون، لە نزیک حامیەی سلێمانی لەڕێگای چوارتای کۆن زیندە بە چاڵی کردن، بەو بۆنەشەوە ڕەفیق چالاک لاواندنەوەیەکی تۆمارکردوە، ئیتر ئەوە خەڵکی تۆقاند، هەروەها لە شاری کۆیەش هەمان کرداری کرد کە سەرکردەیەکی سەربازی بەعسی ئەو کاتە بە ناوی (زەعیم سدیق) بە دڕندەیی سەرپەرشتی ئەکردن، کەحاکمی عەسکەری سلێمانی بوو لەو کاتەدا.

هەر لەو هاوینەدا بە هۆی ئەو بارودۆخە ناهەموارەوە خەڵکی لە شارەکانی تر زۆر ئەترسان بۆیە ئێمەش بە خاوو خێزانەوە بە هۆی ئەوە کە مامی دایکم ساڵح بانەیی بە هۆی دوکانداریییەوە بەهارات و وشتی وای ئەفرۆشت دوکانێکی هەبوو لە قەیسەری حامید بەگ دوکانەکەی لە ڕوکنێک بوو، خەڵکی دێی سازان و دەورو بەری ئەناسی، پەیوەندی کرد بەو ناسیاوانەیەوە چەند هێستریکیان ئامادە کرد وە پێیان ئەوت (قاتر) هەمووومان ڕومان کردە گوندێک بە ناوی (تلەوەرێ) بۆ ماوەی مانگێک بە هەمووومانەوە لەوێ ماینەوە کە ئەو گوندە ژیانی زۆر جیاواز بوو لە شار، کە ئێواران ڕانە مەڕ ئەو ناوەیان ئەکرد بە تەپ و تۆز ودیمەنێکی سەرنج ڕاکێشی هەبوو، جار جارەیش ئەچووینە سەر کانییەکەی، لەوێوە دایک و کەس و کارمان ئاویان بە تەنەکە ئەهێنا بۆ چێشت لێنان، ئەوەی لەگەڵمان بوون خاڵەکانم وە مامی دایکم (حەمە بانەیی) کە پێش ئەوە لە ماڵی خۆیان لە گەڕەکی کانی قوڵکە کە کۆتا ماڵەکانی هەڵەبجە بوو نزیک کانییەکەی کانی قوڵکە بە گولەی وێڵ قاچی بریندار کرابوو، زۆر دەترسا، هەروەها ماڵی کاکە عومەری ڕەسام ئامۆزای دایکم، چەند ماڵێکی تریش هەر ڕایان کردبوو بۆ ئەو گوندە یەکێک لەوانە ماڵی عومەر نەجاڕ بوو کە لەوێ هەر دوو کوڕەکەی (ئەحمەد و قانع)م ناسی، وە خوشکێکیان بە ناوی قومری و دایکیشیان ناوی شەفیقەخان بوو، من باوکم لە هەڵەبجە مابووەوە، بەڵام چونکە بەسەڵتی مابووەوە بیری منی ئەکرد، بۆیە ناردبووی بەشوێنما کە بۆ چەند ڕۆژێک بڕۆمەوە بۆ لای بۆ هەڵەبجە، بەیانییەک مەلا بانگدان بوو پیاوێک بە گوێ درێژێک هات و سواری گوێ درێژەکەی کردم و بە کاروانێک بەرەو هەڵەبجە ڕۆشتین، ئەوە یەکەمجارم بوو سواری گوێ درێژ ببم.

زۆر دەترسام چونکە ڕێگاکەی هەموو بەردەڵان و ڕێگای پیادەبوون، دوو سێ شەو لای باوکم مامەوە و زۆر خزمەتی ئەکردم پاشان گەڕاندمیانەوە بۆ ئەو گوندە، ماوەی مانگێک زیاتر لەو گوندە ماینەوە، وردە وردە ترس نەماو هەموو گەڕاینەوە بۆ ماڵ و جێگای خۆمان، ئەو مانگە و بەو هاوینە وەک سەیران وابوو لامان، پاش ئەوەی لە ١٨ی تشرینی دووهەمی (١٩٦٣) عبدالسلام عارف کودەتای کرد بە سەر بەعسیەکان و حەرەس قەومیدا تۆزێک بارودۆخ گۆڕدرا و لە (١٩٦٤/٤/١٠) ڕێکەوتنی لەگەڵ پارتی کرد بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفا کە بریتی

بوو لە داننان بە هەندێ مافی ڕۆشنبیری بۆ کورد لە باکوری عێراق کە ئەمەش هەنـدێ لە ئەنـدامانی مەکتەبـی سیاسـی پارتیـان ڕەنجانـد بەوەی کە حـوکمی (لامەرکەزی) هیچ دەسکەوتێکی تێدا نابێت و ئەوەش بووە هـۆی دابەش بوون و گەورەتـرین درز تێکەوتنـی باڵەکـانی پـارتی کە خـۆی لە بـاڵی مەکـتەب سیاسـی دەبینییەوە و تا ئەم ساتە وەختەش کاریگەرییەکانی بەردەوامە، گەر قوڵ بینەوە لە سەر ئەم بابەتە زۆر هەڵئەگرێت باسی لێوە بکرێت کە ئەمەش کاری من نییە.

### ساڵی (١٩٦٤)، سەرەتـای ئاشنابوونم بە ئامێری کەمان

لە سەرەتای ساڵی خوێندنی سـاڵی (١٩٦٤) گەڕاینەوە قوتابخـانەکەی خۆمـان بەڵام پاش ئەوە ناونرا قوتابخانەی (الانتصار) کەلە کاتی حوکمی عبدالکریم قاسم ناوی قوتابخانەی ئاشتی بوو، چونکە ئەو ساڵە مامۆستایەکمان بۆ هـات بە نـاوی (حەمەی دادە ڕەعنا) کە پێیـان ئەوت (حەمە چکل) دەرچـووی بەشـی شـێوەکاری پەیمانگـای هـونەرە جوانەکـانی بەغـدا بـوو، بەڵام مۆزیکیشـی دەزانـی، وانەی سروودی پێ دەووتین.



ماڵەکەیان لە خانوی حەمەلەی کەبابچیدا بوو کە شوکریە خانی خێزانی خوشکی بوو، ماڵەکەیـان لەپـاڵ مـاڵی کـەمـال خەفـاف بەرامبەر تەلبەنی فەرمانگەی ئینحسارەکە لە گەڕەکی پیر محەمەد بوو، ئیتر هەر ڕۆژێک وانەی سـروودمان هـەبـوایە لەگەڵ خـۆی کەمـانەکەی دەهێنـاوگۆرانی سـروودی بـۆ دەژەنـدین لەوانە: خـوایە وەتەن ئـاواکەی، جەژنی دارو درەختە و ئەرێ لەیلێ.

که گۆرانییەکـانی دەژەنـد دەیگـوت بـزانم کـێ دەزانێـت ئەمە چ گـۆرانییەکە یەکسەر دەستم هە ڵئەبڕی دەمزانی کە چی دەژەنێت، چونکە من ڕۆژانە لە دوکانی باوکم گوێم لە گۆرانی دەگرت، تا وای لێهات ئیتر بە منی دەوت ئازاد بڕۆ لە ماڵەوە کەمانچەکەم بۆ بێنە، منیش لە ڕێگا کەمـانەکەم بە دزییەوە دەرئەهێنا جانتـاکەیم دەکردەوە و سەرسام بووم پێی، شێوازێکی ئەندازەیی جوان و ڕەنگێکی قـاوەیی کاڵ، بەرگێکی قەدیفەی سەوزی هەبوو، مارکەی ئەڵمانی.

پاشـان وای لێهـات تیپێکـی کۆرسـی لـێ دروسـتکردین، مـن بـووم، سـەرکۆی ئەحمەد ئەفەندی کە بـاوکی بە ڕێوەبەرمـان بـوو، ئەفراسـیابی سـاڵحی ئیبراهیمـی ڕەزا، کۆزادی حەمەی نانەوا، بە هۆی شەڕی پارتی و حکومەت، ئەم هەراو بەزمە ناوە ناوە لەکاتی عەسر پێشمەرگە هەڵیان ئەکوتایە سەر قوتابخانەکەمان، چونکە قـاتی سـەربان کرابـوو بە ڕەبایـەی پۆلیسـی(سـەیار)، واتە گەڕۆک کە هـەموویـان عەرەب بوون بەس وا ڕاهێنرابوون نەیەنە ناو قوتابییەکان هەر واش بـوو، دەمـان بینی لە سـەربان ماسییان وشـک ئەکردەوە، سـەیر بـوو لامـان، چـونکە لای ئێمە شتێکی نامۆ بوو،



ئەوەی لە بیرم بێت ساڵی (١٩٦٤) بوو کە گۆرانی (أنت عمری)کە ئوم کەلسوم بۆ یەکەمین جار وتی، لە ئاوازی محەمەد عبدالوهاب و هۆنراوەی (ئەحمەد شەفیق) بوو، هاوینی ئەو ساڵە بوو لە دوکانی باوکم بووم لە پیر محەمەد و چەند دوکانێک لەسەری دوکانی باوکمەوە کاک حەمەی فەرەج نەقلیاتی هەڵەبجە ـ سلێمانی هەبوو، هەرچی قەمەرەی دۆجی ساڵانی (١٩٥٤) یان (٥٥) یان (٥٦) ئەو کاتە لەوێ ئەوەستان بۆ نەفەر سوارکردن، لە مزگەوتی خانم ئەهاتمەوە، بینیم کاکە حەمە لەدوکانەکەی دانیشتووە و ڕادیۆکەی کردۆتەوە و بە دەنگی بەرز و ڕادیۆکە گۆرانی (أنت عمری) پەخش ئەکرد و منیش هێندە کاریگەر بوو لەسەرم، وەستام و گوێم لێگرت بە تایبەت ئەو ڕستەیەی (یا أغلی من أیامي ..یا أحلی من أحلامي......خدني لحنانک خدني.. عن الوجود وابعدني) کە هیچ لێی تێنەئەگەیشتم، بەڵام ئاوازو دەنگەکە سەرنج ڕاکێش بوو لام.



**سەیرانێکی مامۆستا حەمەی دادە رەعناو هاوڕێکانی، ئەو کەمانچەیەی کە لەخوارەوە دانراوە، لەساڵی ١٩٦٤ بۆیەکەمجار پێی ئاشنابووم و ڕێڕەوی ژیانمی وەک بناغەیەک بۆ کاری هونەری گۆڕی.**

دوای ئەوە لە ناو پۆلەکەماندا وێنەی عبدالسلام عارف هەڵواسرابوو کە چەند ئەستێرەیەک و چەندین مەدالیای بە بەرۆکەوە بوو، وێنەکە ڕەنگاو ڕەنگ بوو بە عەرەبی لەخوارەوە نوسرابوو (المشیر الرکن عبدالسلام محمد عارف ـ رئیس جمهوریة العراق)

ئەوەی لە بیرم بێت لە ساڵی (١٩٦٥) کە تەمەنم ١٠ ساڵان بوو لە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بووم، چەند مامۆستایەکی نوێم بەدی کرد لەوانە مامۆستا شێخ عومەر عەبابەیلێی وانەی کوردی پێ دەگوتین، مامۆستا ئەکرەم شێخ فەرەج وانەی جوگرافیا، مامۆستا ڕەوفی ئەخلی بارام وانەی ئینگلیزی، مامۆستا مەلا باقی وانەی ئاین، مامۆستا حامد بیرکاری، مامۆستا مەهدی نەقشبەندی و مامۆستا عەبدولاسوور، مامۆستا نوری مەحمود ئەفەندی و عوسمانی خالۆ ئەحمەد ،مەلا ساڵح و زۆری تر کە بیرم نەماوە، وە ئەوکاتی مفاوەزاتە لەگەڵ پارتی و هەروەها جیا بوونەوەی باڵی مەکتەبی سیاسی و چوونیان بۆ ئێران و وەک پەناهەندە لە شاری (هەمەدان) داڵدە درابوون.



ئازاد صاڵح لە تەمەنی ١٠ ساڵیدا

## دوکانەکەی باوکم لە پیرمحەمەد و دراوسێکانی

مـن بیـرم نـایەت کەی بـاوکم چـۆتە ئەو گەرەکەو کەی ئەو دوکـانەی گرتبـوو بەکرێ، بەڵام لەوەتەی فامم کردۆتەوە لەو دوکانەدا بووە، دوکـانەکە لەو شـوێنە بووە کە دەچیت بۆ فولکەکەی خوارەوە کە پێیان دەوت (شورتی شارع) کە ئێسـتا پێـی دەڵـێن فـولکەی (عـومەری خـاوەر) لەپـاڵ دوکـانی بـاوکم لە سـەرەوە مـاڵێکی قامیش بەنی لێ بوو دەرگاکەی تەنەکە بوو ماڵی (ئامەی فەتە) بوو کە بێوەژنێکی پۆشـتەو پەرداخ و دڵـتەڕ بـوو. لە سـەرووتر دوکـانی عەلـی پەنچەرچـی و دوایـش دوکانی عبدالکریمی ئوتوچی کە بەخەڵوز ئوتوەکەی گەرم ئەکرد و دواتر دوکانی حەمە بەکراوایـی و پاشـان دوکـانی عەبە هەورامـی و پـاش تـر دوکـانی حەمەی مەحمود ئەفەنـدی و سـەرووتر نەقڵیـاتەکەی کـاک حەمەی فەرەجی قـاله سـوورو پاشان ماڵی (ئاغا) مەحمود بەگی ئەوڕەحمانە فەنی. بەرامبەر ئەو دوکـانی حـاجی ئەوڕەحمان و خوار ئەو دوکانی عەبدوڵای سەڕاج لە پاڵیدا دەرگـای قوتابخـانەی ئیسـلامی کە لە قـاتی سـەرەوە بـوون و مەلا عەلـی عبـدالعزیز بەڕێـوەبەری بـوو، خـوارتر عوسـمانی زەڕەنـگەرو خـوارتر کەبابخـانەی بـراله مەحمـود و ئەولا تـر تۆمارگای فاخری عەبدوڵای حەمەخـانە ڕۆڵەو خـوارتر دوکـانی حـاجی فەرەجـی زەڕەو لەپاڵیدا کتێبخانەی عومەری کاکی و پاشان وێنەگری عوسمان و بەرامبەر دوکانی باوکم چاخانەی ئەوڕەحمانی چایچی و دواتر عەلی تەبە و خوارتر دەلاک خـانەی فەرەجـی حـاجی کەریـم کوردسـتانی و چایخـانەکەی مەلای شـەرعی و نانەواخــانەی عەبەی چــۆپی و مەعمەلــی ســەهۆلەکەی حــاجی حەمە کەریــم گێلدەرەیی و دوکـانی عەلـی حـەمە کەریـم. ئەم دوکانـانە زۆر تـا کەم ئـاڵ و گـۆڕ ئەکران و ئەبوو بە دوکانی شتی تر.

لە خـوار دوکـانی باوکیشـمەوە دەلاک خـانەی مسـتەفا بەختیـار بـوو، خـوار ئەویش لێفە درووی مەحمود و عەلی شەفە هەلاج بـوو خـوارتر حـاجی ئەحمەدی قەدەفەری و خولە سورو عەبەی پەری و عەبدوڵای برای عـومەری گۆڵتەڕەش و سەراجی حاجی کەرەم خان. بابێمە دوکـانەکەی بـاوکم، بـاوکم عەتـار بـوو بریتـی بوو لە دوو دوکان پێکەوە بوون، موڵکی شارەوانی بوو، وەستا مەقسودی کـوڕی وەستا ئەلیوەیس دارتاشێکی دەسـت ڕەنگین بـوو ئەو رەفەو قەفەس و مەعرەزو جامخانەی بۆ کـرد، زۆر بەجـوانی بە چـوار دەوردا رەفەی بـۆ کردبـوو بـۆ ئەوەی

نوقڵو چکلێت لە ناو شوشەی تایبەتدا دانێت و شەربەت و بسکیت و چەرەسات، لەبەردەمیشدا مەعرەزێکی شوشەی جوانی بۆ دروست کردبوو، جۆرەها شتی دەفرۆشت، بە فەردە ناوکە کولەکەو فستق و نۆک و گوڵەبەڕۆژەی دانابوو، چەندین یاری منداڵان، تەنانەت پێداویستی مکیاج و بۆیەی نینۆک و کۆکلەو ئەتەمین و ئۆیەو سانتیم و تەنانەت حەبی کۆکەو وە حەبێکی گەورە هەبوو پێیان ئەوت حەبی (کالمین) جۆرەها پاکەتی جگەرەی جموری و غازی و پێداویستی قوتابخانە لە دەفتەرو قەڵەم و جانتا و بۆیەی وێنەکێشان ئەوانەی هەموو ئەفرۆشت، من هەموو شتێکم لە بەردەست بوو بە ئارەزووی خۆم چکلێت و نوقڵم ئەخوارد جۆرە چکلێتی خۆشی هەبوو بە ناوی (أبومنير) بە چنگ ئەمخستە گیرفانم، کە بچومایە بۆ قوتابخانە گیرفانم پڕ ئەکرد لە فستق و ناوکە کولەکە زۆرجار بەشی هاوڕێکانم لێ ئەدا، لە بەردەستم دەخیلەی دوکانەکە چەکمەجەیەک بوو پڕ بوو لە پەنجا فلسی و بیستو پێنجی و دەفلسی وپینج فلسی، بەقەرزیش شتی دەفرۆشت و دەفتەریکی هەبوو قەرزەکانی تێدا دەنوسی و ڕادیۆیەک کە هەمیشە لە سەر گۆرانی بوو کە سەیری ئەو مەعرەزم ئەکرد پڕ بوو لە شتی جوان ئامێرێکی مۆسیقا هەبوو پێیان ئەوت (هارمۆنیکا) هەموو جارێ دەرم ئەهێناو هەر لە خۆمەوە دەمژەند، دواتر لە دوکانی دووهەم (کورە)یەکی دروست کرد کێک و شەکرلەمە و چۆرەکی دروست ئەکرد کە منداڵان زۆر تامەزرۆی بوون، زۆر جار ئەچوو بۆ بەغداد لە (شۆریجە) شتی ئەکڕی وپاش یەک دوو هەفتە بە لۆری ئەگەشتە لای.

لە ساڵانی ناوەڕاستی شەستەکاندا ئۆتۆمبیلمان هەبوو باوکم ئەیدا بە دەست شۆفێرەوە و ئیشیان پی ئەکرد، پاسمان هەبوو بۆدیەکەی تەختە بوو شۆفێرەکەی (عەلی جولەکە) بوو، سەکنێکی هەبوو ناوی عەبدول بوو، جێبمان هەبوو شۆفێرەکەی (سەعەچاوشین بوو) جێبێکی تر شۆفێرەکەی (عومەر تۆپەڵ)بوو تا سەرەتای حەفتاکانیش، دوا جار جێبێکی ئەمەریکیمان هەبوو (سەعید حەمە عەلی) شۆفێری بوو. لەو کارەدا هەمیشە زیانی ئەکرد شۆفێرەکان هەرچیان دەست کەوتایە یان بۆ چاک کردنەوەی ئۆتۆمبیلەکان بوو یان بۆ خۆیان بوو، زۆر ئێواران دراوسێ دوکانەکان کۆ ئەبوونەوە ئەیبردن بۆ خورماڵ یان بۆ راوی پۆڕ لە دەشتی شارەزوور تا بۆردومانی ساڵی ١٩٧٤ لەو دوکانەدا بوو، کە بۆردومان کرا ناپاڵمێک نزیک دوکانی حاجی ئەوڕەحمانە فێلە کەوت و چەندین کەسی

کوشت و دوکانەکە ڕووخا بە سەریاندا، ئەوەی کە ڕزگاری کردن ئەو (کورە) بوو کە لە خوارەوە وەجاخێکی هەبوو سەرەکەی ڕووخا بوو، بەڵام ژێرەوەی نەڕوخا و ئەوە بوو باوکم و سەربەستی برام بە سوکی بریندار بوون،.



**لەڕاستەوە، باوکم تەنها قۆڵی دەرچووە، خاڵە حەمە عەلی، مامۆستا ئازاد حەمدی، بەردەمی دوکانی باوکم، ساڵی ١٩٥٤ هەڵەبجە.**



**سەیرانی خورماڵ دراوسێ دوکانەکانی باوکم ساڵی ١٩٦٧**

**لەڕاستەوە: حەمەی زەڕەنگەر، سەروەتی حاجی حەمە کەریم کورسانی، عوسمانی زەرەنگەر، ئاسۆی حەمەی زەرنگەر، دواوە فەرەجی ئەورەحمانی چایچی دواتر کاوەی برام، شێخ ئەحمەد، مناڵەکەش ناوی عبدالباقی بوو، باوکم ساڵحی مەلا سابیر دواتر ڕەشیدی پەنچەرچی، عوسمانی رەسام، ئازاد ساڵح**

## ناوی هەندێ یاریزانی هەڵەبجە لەساڵانی شەستەکاندا

لەساڵی (١٩٦٥) لە هەڵەبجە کەمێک بواری وەرزش تەنانەت هونەریش بوژایەوە وە هەندێ یادەوەریم لە ساڵی (١٩٦٥) هەیە کە پەیوەندی بە مۆزیکەوە هەیە لە ناوەڕاستی شاردا گۆڕەپانێک هەبوو پێیان ئەوت حەوشەی تاهیر بەگ بەرامبەر ماڵی ڕەشید عەزیز، چەند تیپێکی وەرزشی تۆپی پێ هەبوون لەوانە (هیوا، بێستون، ئاکۆ، خەبات) لە هەموویان بەتواناتر تیپی هیوا بوو کە هەفتانە تیپەکانی سلێمانی وەک (کەمال سەلیم، کارگەی جگەرە، دیمەن، دەرسیم). لەیاریزانە بە تواناکانی سلێمانی حەمەی عەبۆل، فایەقە سوور. لە هەڵەبجەش کەمال رەشید عەزیز، جەمال رەشید عەزیز، جەباری رەشید عەزیز، سیف الدینی برای شێخ لەتیف، عارف محەمەد ئەمین، ساڵح ئەحمەد باول، حەمە فەرەجی شاسوار، حەمە ئەمین (پیچۆ). بە ناوبژیوان واتە حەکەمەکەیان ئەوت باشچاوەش.



بیرم دێت یاریزانێکیان کە ناوی (کەمالی ساڵح لوو بوو) کە دەستی لە یاری کردندا شکابوو، وێنەکێشێکی باشیش بوو دەنگیشی باش بوو بۆ موعەلیق لە سەرووی ساحەکە بەرزاییەک هەبوو توویەکی تێدا بوو بەڕادیۆیەکی گەورە کە بە گڵۆپ ئیشی ئەکرد، ئەمپریفایەرێکی درووستکردبوو، موکەبەرەیەکی خستبووە ناو سنوقێکی گەورە و بە شیفۆنێکی سوور پێچابووی، یاریەکەی دەگواستەوە و

هانی تیپەکەیانی ئەدا، لە پشووی گێمی یەکەم منالێکی هێنایە سەر تووەکە ناوی نەجیمی ئەحمەدی باول بوو، دەستی کرد بە گۆرانی وتن کە گۆرانییەکی عەرەبی بوو هی حضيری أبو عزيز (سلم عليه بطرف عينه وحاجبه أدى التحية زين يعرف واجبه سلم عليه) زۆر سەرنج ڕاکێش بوولام، ڕۆڵی چایخانەکانیش دەوری بەرچاویان هەبوو لە بڵاوبوونەوەی چێژ لە گۆرانی و مۆزیک وەرگرتن، لە کانی قولکە خوار ماڵێ ئێمە کۆڵانی ئێمە کەوتبووە کۆڵانی بەرامبەر مزگەوتی دار الاحسان بۆ سەرەوە، چایخانەی حەمە کەچەڵ و قالەی ڕەمەزان گۆڕەپانێکی گەورە بوو، هێشتا نەکرابوو بە خانوو دوای حەفتاکان خانووی تێدا درووستکرا، کردبوویان بە کەپرێکی گەورە بە گڵۆپی ڕەنگاو ڕەنگ ڕازاندبوویانەوە، لەولاترەوە ماڵی عەبەسوور بوو ڕوکنەکەی کە لە سێ لاوە کرابووەوە چاخانەی ئەسکەندەر بوو، لە ناو بازاڕیش چاخانەی عەلی سەلیم عومەری گۆڵتە ڕەش کە تەسجیلێکی گۆرەندیکی لەبەر دەم بوو هەمیشە گۆرانی لە سەر بوو، ناوبازاڕ چایخانەی عارفی حاجی فەرەج بوو سەرووتر چاخانەی عوسمانی ئازادی کە سەربانەکەی نووسابوو بە ماڵی نەنکم واتە دایکی باوکم ناجی خان.



## ڕۆڵی ڕادیۆ لەبەغدا و کاریگەری لەسەر من

لێرەدا ئەبێت ڕۆڵی ڕادیۆی کوردی بەغداو ئیزگەی کرماشان لە یاد نەکەین کەڕۆڵێکی بەرچاویان هەبووە لە پەرەپێدانی چێژی هونەریم هەر لە سەرەتای منالیمەوە.

بۆیە بەباشم زانی کە مێژووی دامەزراندی یەکەمین ڕادیۆ بکەم لە عێراقدا....

لە ساڵی (١٩٣٢) یەکەمین جار لە ماڵی مەلیک غازی بووە لە کۆشکی (الزهور) پاشان ساڵی (١٩٣٦) لە گەڕەکی (الصالحية) لە بەغدا دامەزراوە یەکەمین بێژەر (محەمەد عەلی کەریم) بووە، یەکەمین جار پەخشی ڕاستەوخۆ بووە وە دەنگ تۆمار نەکراوە، یەکەمین گۆرانی بێژ تیایدا (محمد القبانچی) بووە و هەر لەو ساڵەدا (ساڵح الکویتی) بووە بە سەرۆکی جووقی مۆسیقا لەو ئیزگەیە کە زۆربەیان جوولەکە بوون لەوانە (داود الکویتی) برای و چەندینی تر، لەو گۆرانیبێژە سەرەتاییانە (عفيفة اسکندر، زکيه جورج، سليمةمراد) پاشان لە ساڵانی پەنجاکان لەمیعە تۆفیق و ناظم الغرالي، زهورە حسین، ئەحلام وەهبی، مائدە نزهت) ولەو ئاوازدانەرانەش (عەباس جەمیل، ودیع خوندە، ڕەزا عەلی، ئەحمەد الخلیل، کەمال السید) کە ڕەزا عەلی کوڕێکی فەیلی خەڵکی بەغدا بوو، کە چەندین ئاوازی بۆ گۆرانی بێژە کوردو عەرەبەکان داناوە، ئەحمەد خەلیلیش کوردێکی خەڵکی بامەڕنی بوو، کە برایەکیشی هەبوو بە ناوی ئیبراهیم خەلیل کە لە تیپی مۆسیقای ئیزگە، دەف ژەن بوو، کە ئەحمەد خەلیلیش چەندین ئاوازی بۆ گۆرانی بێژە عەرەبەکان داناوە وەک گۆرانی (یا حلو یا أسمر) بۆ عەفیفە ئەسکەندەر کە ئافرەتێکی ئەرمەنی بوو، وە گۆرانییە بە ناوبانگەکەی (هەر بژی کوردو عەرەب رمز النضال) کە سەرەتای شیعرەکەی بەم شێوە دەست پێ دەکات :

(من تهب أنسام عذبة من الجبال. وعلى ضفاف الهور تتفتح الگلوب. لو عزف على الناي راعي من الشمال. على الربابة يجاوبها راعي الجنوب)و چەندینی تر، وە مۆزیک ژەنەکان خضیر الیاس ئەو شمشاڵ ژەنە نابینایەی لەگەڵ ناظم الغزالي بوو، سامي عبدالاحد، سالم حسين، نازم نعيم، خضير الشبلي، حاج هاشم الرجب، شعوبي ئیبراهیم) چەندینی تر، کەمن ناوی زۆربەیانم لە یادە بەڵام رەنگە خوێنەر مەبەستی نەبێت، ساڵانی شەستەکانیش چەندین گۆرانی بێژی تر هاتنە ئارا لەوانە

(جاسم الخياط حسين، السعدي ، فاروق هلال، ياس خضر، فاضل العواد، سعدون جابر، حسين نعمة، فؤاد سالم، ئەحلام وەهبي، غادة سالم، مستەفا الكريدي) تا کۆتایی ساڵانی شەستەکان من گوێگری رادیۆ بووم، کاتێک لە دوکانی باوکم ڕادیۆیەکی(سیرا)ی مارکە ئەڵمانی هەبوو لە تاقەکە دایبنابوو، ئیتر من گوێگری ئەو دەنگانە بووم جگە لەوەی من جار جار میللی رادیۆکەم دەجوولاند و گوێم لە (صوت العرب من القاهرة) ئەگرت و لەوێوە گوێم لە دەنگی(محمدعبدالوهاب، ئوم کەلسوم، عبدالحليم حافظ، فردید الاطرش، ئەسمەهان، فائزة ئەحمەد، ئاوازەکانی سید درویش، محەمەد القصبچی، زەکریا ئەحمەد، ریاض السنباطي، محمد الموجي، بەلیغ حەمدي) چەندینی تر، ئەمەش سوودیکی زۆرم بینی بۆ فێربوونی زمانی عەرەبی بە شێوەیەکی سەرەتایی.

ئیزگەی کوردی هەر لە ساڵانی شەستەکاندا و لە سەرەتاییدا حەزم لە گوێگرتن لەڕادیۆبوو، یەکەمین رادیۆی کوردی لە بەغدا ساڵی (١٩٣٩) دامەزرا و یەکەمین بێژەری (کامیل کاکەمین)بوو، کاتەکەی یەک چارەک بوو لەگەڵ بەرنامەی عەرەبی پەخش ئەکرا، یەکەمین رادیۆ کە هاتۆتە سلێمانی ساڵی (١٩٣٢) لە چایخانەی حەمە رەق بووە، لەو کاتانەدا هونەرمەند عەلی مەردان کۆنترین گورانی بێژ بوو لەگەڵ مریەم خان کە لە سوریاوە هاتبوو، دوای ئەو محەمەد عارف جەزیری، حەسەن جەزراوی، پاش ئەوانیش چەند کەسێکیتر لەوانە ساڵی (١٩٤٨) بوو، کەریم کابانیش لە بەغدا لەخولی بەشی بێتەل و مۆرس بوو واتە (لاسلكی) لە خولی نائب زابت، پاشان عیسی بەرواری و سێوە، نەسرین شیروان، پەخشی رادیۆکە ڕاستەوخۆ بوو، کەریم کابان یەکێک لەو گۆرانییانەی ئەوتەوە وەک (بەری بەیانە، کفرە لای من لە یار ڕەنجان، بڵێن بەیار) زۆربەیان هۆنراوەی شاعیر (گۆران) بوون، چەندینی تر.. پاشان ساڵانی پەنجاکان چەندین گۆرانی بێژی تر لەوانە ڕەسوڵ گەردی و تاهیر تۆفیق، گوڵبەهار و نەسرین شیروان، دایکی جەمال، مۆزیک ژەنەکان قادر دیلان و ئەنوەر ساڵح وچەندینی تر، گۆرانی بێژان شەماڵ سائیب کە (٢٧) گۆرانی تۆمارکردووە لەو ماوەیەدا بۆ ڕادیۆی کوردی بەغدا، لێرەدا ئەمەوێ باسی یادەوەرییەک بکەم لە ساڵی (١٩٧٥) من قوتابی پۆلی یەکەمی زانکۆ بووم لە کۆلێجی بەڕێوەبردن و ئابووری، زوو زوو دەهاتمەوە ئەو کاتە ماڵمان لە سلێمانی بوو وە ئەحمەدی ڕەشید قەساب قوتابی

پۆلی یەکی کۆلێجی ئاداب بوو بەشی کوردی وە شەماڵ سائیب لە ئەمەریکا ماستەری هینابوو لە مێژوو وە مامۆستایان بوو منیش حەزم ئەکرد شەماڵ سائیب لەنزیکەوە ببینم هەر ئەو جارەش دیومە و ئەو کاتە ئاسایی بوو ئەت توانی وەک میوان بچیتە وانەکەیەوە منیش لەگەڵ ئەحمەد چوومە ژورەوە ئەو کاتە بینای کۆلیجی ئاداب نزیک گەرەکی ئیسکان بوو، شەماڵ سائیب بە دەمی خۆی یادەوەرییەکی گێڕایەوە لێرەدا باسی ئەکەم، وتی تازە گۆرانی (ئەرێ لەیلێ)م لە ئیزگەی بەغدا تۆمار کردبوو وە ناوبانگی دەرکردبوو تەنانەت عەرەبەکانیش لەبەریان کردبوو، وتی لەڕێگای بەعقوبەوە ئەچووم بۆ بەغداد لە بازگەی بەعقوبە خەڵکیان زۆر ئەپشکنی چونکە شەڕی مەلا مستەفا هەبوو لە گەڵ حکومەتی عێراقی، لە بازگەکە سەربازێکی عەرەب سەیری کردم و ناسیمیەوە وتی تۆی گۆرانی (ئەرێ لەیلێ) ئەڵێیت ؟ وتم بەڵێ وتی تۆ شەماڵ سائیبیت ؟ وتم بەڵێ، وتی توخوا یەک تۆز لەو گۆرانییەم بۆ بڵێ ئەویش وتی گۆرانییەکەم بۆ وت و یەکسەر بێ پشکنین هەموومان لەو بازگەیە دەرباز بووین، ئەمە من خۆم لە زمانی شەماڵ سائیبەوە ئەو یاداشتە ئەگێڕمەوە، دوای ئەو(جەمال جەلال، محەمەد قەدری ، عبدالله زێڕین، عەبدوڵا دڵسۆز، تەحسین تەها، یەحیا مەرجان و جەلال کۆچەر وە (سێوە) کە لە دیاناکانی کۆیە بوو، هەروەها لە سلێمانی و هەولێرەوە گۆرانی بێژی تر دەچوون، ساڵەکانی (١٩٥٦) بە بۆنەی مام جەلالەوە کاتێک مامجەلال لە بەغدا بووە لە ئوتێلێک گیرساوەتەوە، حەسەن زیرەک کارمەند بووە و بیستوویەتی دەنگی خۆشە بردوویەتی بۆ ئیزگەی بەغداو لە لیژنەکە دەرچووە کە عەلی مەردان لەو لیژنە بووە، بۆ گۆرانییەک برێک پارەی وەرگرتووە کە لەو بارە ناهەموارە رزگاری بووە، حەسەن زیرەک، ساڵح کویتی کە جولەکە بووە و مۆزیکی بۆ ژەندووە و لە گۆرانییەک باسی دەکات، چەندین گۆرانی وتووە کە بە گۆرانییەکانی ئیزگەی بەغدا (٥٣ و ٥٦) بە ناوبانگە.

ئیتر ئەم ئیزگەیە چەندین بەرنامەی هەبوو لەوانە ئاینی کە عومەر دیبەگەیی پێشکەشی ئەکرد و هەروەها عبدالحمید ئەتروشی کە کاتی خۆی لە هەڵەبجە قازی بووە وەک دایکم باسی کردوە بۆم هاورێی باپیرم میرزا حسین بانەیی بووە، بەرنامەی کشتوکاڵی بورهان قانع بە زمانی شارەزووری پێشکەشی ئەکرد و هەروەها لەو بێژەرانە لەوانە عەزیز کافرۆشی، عبدالله عباس و شیرین عەباس،

بەشی بادینی سکڤان عبدالحکیم، وە تیپی مۆزیک قادر دیلان بەشداربووە، هەروەها عادل جەمال عیرفان و خێزانەکەی کە لە بنەماڵەی یامولکی بوون.
ئەم هەموو گۆرانی و یادەوەرییانە هەمیشە گوێگری ئەو رادیۆیە بووم، بە تایبەت بەیانیان باوکم ڕادیۆکەی ئەکردوە پێش کردنەوەی ئێزگە کە بە دەنگی خوێندنی بولبول دەستی پێئەکرد ئینجا قورئان بە دەنگی(عبدالباسط، حمید القیسی ، عبدالوهاب اسماعیل، صدیق المنشاوی، وچەندینی تر). ئینجا گۆرانی (بەری بەیانە، بڵێن بە یاری کەریم کابان، پەچەت لادەی عەلی مەردان و فاتمە دوو چاوی مەستت وئەڕۆی ئۆغر و دەنگی تایەر تۆفیق و تەنانەت محەمەد عارف جزیری، حەسەن جەزراوی دەنگیان زۆر ڕەسەن بوو، پاشان گۆرانییەکانی شەماڵ سائیب کە تازەگەری تێدا بوو لەوانە ئەرێ لەیلێ و شوانە هۆ شوانە و پاشان محەمەد قەدری و هەروەها عومەر ڕەزا کە چەندین ئاوازی(ع .ع شەونم) ی بردبوو بۆ ئێزگەی بەغدا و بێ ئەوەی ئاگادار بێت وەک گۆرانی (هاتم هاتم)، وە دەنگی گوڵبەهارو گۆرانی (بولبول مژدە بەهارە). هەر ساڵی (١٩٥٦) محەمەد ئیبراهیم عەبدول وەک بۆی گێڕاومەتەوە .. وتی بە دزی ماڵەوە چووم بۆ بەغداد وە گۆرانیم تۆمار کردوە لەوانە (داد هەی داد هەیڕۆ ڕۆ)کە ناظم نعیم سۆلۆی کەمانەکەی ژەندووە و هەروەها حەمە ساڵحی حاجی سەعید لە هەڵەبجەوە چووە بۆ بەغدا دووگۆرانی تۆمارکردووە و دوای ئەوانە ڕەشۆل عبداللە و محەمەد تۆفیق شلک و چەندینی تر.
لە پێشدا ڕادیۆ باتری بوو کە باتریەکی شینی لەگەڵ بوو، لە هەڵەبجە عەلی حاجی فەرەج دەیفرۆشت، هەروەها حەمەی عەبەی کەریمە سوور من باتری ڕادیۆم لێکڕیوە...
پاشان بوو بە کارەبایی و کە لامپی هەبوو تا دەگیرسا ماوەیەکی دەویست تا گەرم دەبوو و گڵۆپە سەوزەکەی دائەگیرسا و قەبارەی زۆر گەورە بوو، پاشان بوو بە پیلی گەورە کە باوکم پیلی رادیۆو لایتی ئەفرۆشت مارکەی فیل بوو ڕەنگی زەرد بوو، ڕادیۆکان مارکەی فلێبسی هۆڵەندی سلڤەر و سیرا و تۆشیبا و پاشان ناشناڵ و سۆنی و ڕادیۆ کارەباییەکان هەوایی ئەویست بۆ شەپۆلی کورت، من وایەریکی درێژم لە پەنجەرەکەی دەرەوەی ژوورەکەوە ئەخستە دەرەوە و قامیشێکم ئەبردە سەربان و وایەرێکەم لێ ئەبەستوو تاڵەکانیم بڵاوئەکردوە و لە

دواوه و له ژوورەوه دەمکرد به شوێنی ئه نتێنای رادیۆکەوه و ئیتر ئیزگەی بی بی سی و ئەڵمانیاو ئیزگه دوورەکانی ئەهێنا و چەندین بەرنامەی هەبوو لەوانه (السیاسـةبین السـائل والمجیب و موزایک و ڕادیوی ئیسـرائیل هەواڵ و کەش و هەواو وه جوولەکه عیراقییەکان لەوانه سالح الکویتی و داودی برای و گۆرانی بێژانی وەک فلفل کورجی و حسقیل القصاب و چەندینی تر .....)

له بواری نواندن سالانی پەنجاکان ڕەفیق چالاک و ئەحمەد دلاوەر و ڕەئوف یەحیا و چەندینی تر تەمسیلیان به ڕادیۆ پێشکەش کردووه، لەوانه چیرۆکی (ژن به ژن و گلگۆی تازەی لەیل)که ساڵی (١٩٥٧)هێناویانه بۆ هەڵەبجه.

خۆم له ماڵی عەلی سالح سەلیم له گەڕەکی باخی میر که ماڵەکەیان له پاڵ ماڵی (حەمه ئەمینی کاکه سەعه)دا بوو، له هاوینی ساڵی (١٩٧٠) یەک دوو ڕۆژ چلورەم فرۆشت لەگەڵ عەبدوڵای پوره نەجیبەم چووم بۆ ماڵیان عەلی سالح سەلیم چلوەی دروست ئەکرد سەیرم له قاڵبەکانی ئەهات که به تەنەکه نەخشەی بیست چلورەیەک درووست کرابوو به تەنەکه و یەک یەک چلوورەی تێ ئەکرد بەڕەنگی سەوزو سوور له گەنجینەی ماڵەکەیان دیکۆری ئەو شانۆگەرییه و وێنەی گڵکۆکەم دی و نازانم چۆن کەوتبووه لای ئەو ..

### ئاشنابوون و گوێگرتن لەڕادیۆی کرماشان

هەر له سەرەتای ساڵی شەستەکان بوو، گوێم له ڕادیۆی کوردی کرماشان دەگرت بەڵام نازانم کەی درووست بووه، ئاشنابوونی من بەو ئیزگەیه له ڕێگای بەرنامەی چیرۆکی شەوان که کارەبا نەبوو، رادیۆ تەنها بواربوو بۆ گوی گرتن و هەروەها چیرۆکی حەمه شوان و بەرنامەی هەوارگەی دڵانی سەید هاشمی قورەیشی و شوکرەڵای بابان و پەروینی موشیر وەزیری و ئەسعەد نەقشبەندی و محەمەدی کەمانگەرومیدیای زەندی هاوسەری حەسەن زیرەک و لووتکەی گۆرانی کوردی مەزهەری خالقی و محەمەدی مامڵێ کەمانچەکەی موجتەبای

میرزادە و یاحقی و کلارنێتەکەی محەمەدی صەمەدیی، کەمانەکەی حەسەنی کامگار و هەموو هەستمیان داگیرکرد، ئیتر کەمانچەکەی میرزادە کە ئەو کاتە نەشم ئەزانی ئەو پەنجە سیحراویانە کێیە کە ئاوێزانی هەستم بوو کە ئێستاشی لەگەڵ بێت هەمیشە گۆرانییەکانی حەسەن زیرەک وەک قومری سەر باڵم شینە، ئەسمەرێ دولبەرێ، جوانی لای بانە، گەوهەرێ و دەیان گۆرانی وەک شیرین تەشی دەرێسێ، ئەی ئاوێنەی دولبەری و لووتکەی هە موویان پە پولەی ئازادی لە گۆرانییەکانی مەزهەری خالقی بوون ......لە ساڵی (١٩٩٧) وتارێکم لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ نووسی بە ناوی (کەمانچەکەی موجتەبای میرزادە زیاتر گۆرانییەکانی حەسەن زیرەکی ڕازاندۆتەوە) لەم کتێبەدا لەبەشی وتار و لێکۆڵینەوەکان بڵاوبۆتەوە.

**پەیدابوونی تەلەفزیۆن**

لە دوای ڕادیۆ و تەسجیل و گرامەفۆن بۆ گوێ بیستی گۆرانی و زانیاری سەرچاوەیەکی گرنگی زانیاریتر هاتە ئاراوە ئەویش تەلەفزیۆن بوو، مێژووی سەرهەڵدانی تەلەفزیۆن لە جیهان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی سییەکانی سەدەی بیستی ڕابردوو لە ئەمریکاو بەریتانیاو فەرەنسا و ژاپۆن....

مێژووی یەکەمین تەلەفیزیۆن لە عێراق دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٥٦) کاتێک کۆمپانیای (پای)بەریتانی پێشانگایەکی کردەوە لە (کرادة مریم)لە بەغدا و تیایدا وێستگەیەکی تەلەفیزیۆنی وچەند ئامێرێکی تەلەفیزیۆنی نمایش کردبوو، مەلیک فەیسەلی دووهەم لەگەڵ سەرۆک وەزیرانی ئەو کاتەی عێراق نوری سەعید پاشا کە خۆی زۆر هونەرو مۆزیکی بە لاوە گرنگ بوو.

یەکێک لە ناودارترین گۆرانی بێژی ئەو کاتە جولەکە بوو بە ناوی (سەلیمە موراد) ژنی ناظم الغزالی، کە بیست ساڵێک لە ناظم گەورەتر بووە. لە ساڵی ١٩٣٦ بە هیمەتی (الشریف محی الدین حیدر ) کە عود ژەن و پیاوێکی خانەدان بووە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدا دامەزراوە. یەکەم بەڕێوەبەری تەلەفزیۆن (عدنان احمد راسم النعیمی) بووە و یەکەم بێژەریش (محمد کریم ) بووە و یەکەمین بێژەری ژنیش (صبیحە المدرس)بووە، لەگەڵ دەستپێکردنیدا بە وتەی

مەلیک فەیسەڵ کرایەوە. دوای ئەوەش قورئان و دوای ئەوەش گۆرانی و پارچە مۆسیقا. بەم شێوەیە لە پێشدا هەر لە دەوربەری بە غدا وەرئەگیرا، دوایی گەیشتە بەسرە و موسڵ کە مەودای پەخشەکەی زیاد کرا، ڕۆڵێکی گەورەی بینی بۆ پێشخستنی ئاستی زانستی و ئەدەبی و هونەریی و وەرزشی و کۆمەڵایەتی.

هێندەی من لە بیرم بێت چەندین گۆرانی بێژ لە کوردو عەرەب ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبوو بۆ پێشخستنی گۆرانی و ئاواز، لەوانە لە ساڵانی شەستەکان چەندین ئاوازدانەر و گۆرانی بێژ ڕۆڵیان بینی تیایدا لەوانەی کە من لە یادم مابێت بەرنامەکانی (العلم للجمیع)کە کامل الدباغ لە ساڵی (١٩٦٠) تا ساڵی (١٩٩٤) پێشکەشی کرد کە بەرنامەیەکی زانستی بوو کە هەموو چوار شەمەیەک پێشکەش ئەکرا وبەرنامەی (الریاضة في اسبوع)کەبەرنامەیەکی وەرزشی بوو هەموو سێ شەمەیەک(مؤید البدری) پێشکەشی ئەکرد لە ساڵی (١٩٦٣) تا ساڵی (١٩٩٣) کە مۆسیقایەکی بە ناوبانگی ڕۆسینی بە ناوی (سەرتاشی ئەشبیلیە) ببووە هێمای دەست پێ کردنی ئەو بەرنامەیە، بەرنامەی (سیرة وذکریات) کە (ابتسام عبداللە) لە ساڵانی شەستەکان پێشکەشی ئەکرد و لەگەڵ ئەدیبان و نوسەران، ژیاننامە و یادەوەرییانی باس ئەکرد لەوانە (دکتۆر عەلی الوردی، محمد مهدی الجواهری، عبدالوهاب البیاتی، بلند الحیدری، مصطفى جواد) و چەندینی تر و بەرنامەی(عدسة الفن) کە بەرنامەیەکی هونەری بوو کە (خیریة حبیب)پێشکەشی ئەکرد ساڵی (١٩٦٩)تا ساڵی (١٩٨٠) کە بەرنامەیەکی هونەری گشتگیر بوو وە ئێستا (خیریة حبیب) لە ڕادیۆی(نەوا) لە سلێمانی کار ئەکات و بەرنامەی (زوایا الکامیر) کە(شمیم رسام) پێشکەشی ئەکرد وباسی کێشەی کۆمەڵایەتی ئەکرد و یەکەمین بێژەری زمانی ئینگلیزی بوو، هەروەها چەندین بەرنامەی تر.

لە یادەوەری مندا چەندین گورانی بێژی ئەو کاتەم لە یادە لە کۆنترینیان لە عێراقییەکان (سلیمە پاشا مراد) چەندین گۆرانیم لە یادە لەوانە (علی شواطی دجلە مر) و (گلبک صخر جلمود)، (هذا مو انصاف منک)کە زۆربەی ئاوازەکانی صاڵح الکویتی بوون و شیعری (عبدالکریم علاف) و (عفیفە ئەسکندر)بوون کە زۆربەی ئاوازەکانی لە دانانی (صاڵح الکویتی و ئەحمەد الخلیل)بوون کە کورد بووە و خەڵکی بامەڕنی بووە و لە بەغدا ژیاوە و(مائدە نزهت و لمیعە توفیق) بە گۆرانی (یا عمە) هەروەها ساڵانی دواتر (ڕەزا عەلی وعەباس جمیل)و چەندینی تر ئەمانە

هەمووی لە یادەوەریمدایە.. تا ساڵی (١٩٦٧) کە سەرۆک وەزیرانی عێراق تاهیر یەحیا لە کاتی سەرۆک کۆماری ئەو کاتە عبدالرحمن عارف سەردانی کەرکوک ئەکات وئەبینێت خەڵکی کەرکوک هیچ دەربارەی تەلەفزیۆن نازانن، بۆیە بریار ئەدات بە کردنەوەی ویستگەی تەلەفزیۆنی کەرکوک و پەخشی دەگاتە سلێمانی وهەولێر، بەم شێوە وردە وردە تەلەفزیۆن کەوتە ناو شارەکانی کوردستان و بوو سەرچاوەیەکی گرنگی چێژو زانیاری، من خۆم ئەو فلیمەم دیوە کە تاهیر یەحیا تەلەفزیۆنی کەرکوکی کردەوە و بە بەرنامەی عەرەبی و کوردی و تورکمانی و ئاسووری دابەش کرابوون، هاتنە ناوەوەی تەلەفزیۆن لە چایخانەکانەوە دەستی پێکرد، هەوڵ ئەدەم یادەوەریم و بەرنامەکان بەوەی لە بیرمە و لەیادەوەریمدا ماوە باسی بکەم.

### مێژووی سەرەتای تیپە هونەرییەکان لە عێراق و کوردستاندا

هەوڵ ئەدەم لەم بەشەدا مێژووی درووست بوونی تیپە هونەرییەکان لە عێراق و کوردستان بە پێی زانیاری و خوێندنەوەم بڵێم و ئەو خولە هونەرییانەی کە کراونەتەوە لە سەردەمە جیاوازەکاندا.

وەک ئاشکرایە مۆزیک کارێکی خۆرسکە و لە هەست و نەستی مرۆڤدایە، لە ساڵانی ١٩٠٠ بە دواوە بۆی دەگەڕێمەوە، خۆ ئەگەر باسی(زریاب، فارابی ، الارموی) بکرێت، کە دەڵێن زریاب کورد بووە، زۆر لە کتێبەکانی (أبی فرج الاصفهانی) کتێبەکەی بە ناوی (الاغانی)یان (أبن خلدون) یان (سیبوەیە) یان (الاسحاق الموصلی) کە هەموویان مۆزیکزان بوون، زۆری دەوێت.

لە بەغدا لە سەردەمی عەباسییەکانەوە کە پایتەختی رۆشنبیری بووە، چەندین کەڵە هونەرمەندی تێدا بووە بە تایبەتی لە سەردەمی هارون الرشید و الامین والمامون. قیبلەگای هونەرمەندان و شاعیران و نوسەران بووە لەوانە (المتنبی، أبو علاء المعری، أبو نؤاس) بیرمەندەکان أبو بکر الرازی وأبن سینا، ابن خلدون)و چەندینی تر.

لە ساڵانی (١٩٠٠) بەدواوە تیاترۆخانەکان (الملاهی اللیلیة) ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبووە بۆ پێشخستنی مۆزیک و گۆرانی، جولەکە و دیانەکان لەم بوارەدا پێشەنگ بوون، لە کۆمەڵگاشدا ڕێزی تایبەتی خۆیان هەبووە.

یەکەمین تیاترۆخانە واتە( الملهی) – کە شوێنی سەماو گۆرانی و کەیف وسەفا بووە لە بەغدا – لە گۆڕەپانی (المیدان)بووە. لە سەردەمی عوسمانیەکان لە ساڵی ١٩٠٨ خاوەنەکەی ژنێک بووە بە ناوی (بدریة السواس) گروپێکی مۆسیقای هەبووە پێیان ئەوت (الجوق) کە وشەیەکی تورکییە بە مانای تیپی مۆسیقا، هۆتێلێکی تر بە ناوی (نزهة البدور) لەم تیاترۆخانە وهۆتێلانەوە چەندین گۆرانی بێژ گۆرانییان تێدا وتووە، کەواتە ئەوانە ڕۆڵی بەرچاویان هەبووە بۆ هاتنە ئارای چەندین مۆزیکژەن و گۆرانی بێژ، لەو گۆرانیبێژ و سەماکارانە کە زۆربەیان یان جولەکە بوون یان ئەرمەنی، دیانا، هەر لەو گۆرانی بێژ و سەماکارانە وەک (منیره الهوزوز کە دایکی گۆرانی بێژ أحلام وەهبی بووە، سلطانه یوسف، صدیقه الملایه، نجاة، زکیةجورج، عفیفە أسکندر و بدریه السواس ، سلیمة مرادیش خاوەن تیاترۆخانەیەک بووە، کە بۆ یەکەمین جار ئوم کەلسوم لە ساڵی ١٩٣٢ هاتۆتە بەغدا زۆر سەرسام بووە بە گۆرانی (گلبک صخر جلمود) سلیمه مراد و لە ئاهەنگێکدا لە بەغدا ئەو گۆرانییەی وتۆتەوە، تەنانەت کاتێک شاعیر معروف الرصافی کە ساڵی (١٩٠٩) لە ئەستەنبوڵ ئەگەڕێتەوە ، ئەبینێت بەغدا پڕ بووە لە شوێنی ڕابواردن و گۆرانی و سەما، بەو بۆنەیەوە شیعرێکی ڕەخنەگرانە ئەنوسێت و ئەڵێت: "أری بغداد تسبح بالملاهی ـ وتعبث بالاوامر والنواهي".

زۆر بوونی ئەم جۆرە شوێنانە بووە هۆی ئەوە کە کە چەندین مۆزیک ژەن و گروپی مۆزیکی (الجالغی البغدادی) دروست ببێت کە زۆربەیان جوولەکە بوون. مەقاماتی عێراقی لە چەندین چایخانە شەوانە مەقام بچڕن وەک چایخانەی (العزاوی) لە شەقامی الرشید چەندین گۆرانی هاتنە کایە وەک (یاگهوتک عزاوی، یاصیاد السمچ، أفندی، مروبینا من تمشون. الهوزوز، یانبعة الریحان و چەندینی، الهجر موعادة غریبة أیها الساقی الیک المشتکی، خدری الچای خدری) وچەندینی تر. جگە لە مانەش چەندین شوێنی سەما دروست بوون و چەندین سەماکەری شۆخ و شەنگ تێدا سەما بکەن و شەوانە پڕ بن لە هەوادارانی لەوانە (بدیعة عطش) کە وای کرد لە شاعیر محمد مهدی الجواهری جوانترین شیعری غەزەلی بەسەردا

هەڵدات وبنووسێت :

هزي بنصفك وأتركي نصفا          لاتحذري لقوامك القصفا
أبديعة ولأنت مقبلة          تستجمعين اللطف والظرفا

ئەمە بووە هۆی پەرەسەندنی گۆرانی و موزیک و درووست بوونی چەندین مۆزیک ژن و گروپ، ئەمە لە لایەک لە لایەکی ترەوە لەگەڵ دامەزراندنی سوپای عێراق کە لە سێ بەش پێک هاتبوو:

(المشاة . المدفعية . الخيالة) پاشان پێویستی بە گروپی مۆزیک هەبوو بۆ ئەوەی کاتێک هەر شاندێک بێت یان کاتی نمایشی سەربازی کە ئەو تیپە مۆزیکە ئامادە بێت کە پێیان ئەوت (الجوق) کە لە ساڵی (١٩٢٢) یەکەمین بونیادی دامەزراوە، یەکەمین کەس کە یەکەمین جوقی مۆسیقای سەربازی دامەزراند ئەفسەرێکی بەریتانی بوو بە ناوی (کولدفیلد)وە بۆ ئەم مەبەستەش لە بەغداو موسڵ چەندین مۆزیک ژەنی سەردەمی عوسمانی خانەنشینی کۆکردەوە و خولی نوێی کردەوە بۆ فێربوونی ئامێرە هەواییەکانی جوقی مۆسیقی لەوانە (محمد علی محمد چاوش، عبدالواحد مصطفی) و چەندینی تر و قوتابی نوێش حنا بطرس وە صالح الکویتی وداود الکویتی وچەندینی تر دوای ئەوە لە ساڵی (١٩٣٨) مۆزیک ژەنێکی بە توانا هات بە ناوی (البیر رزوق شفۆ)کە سەرپەرشتی ئەو تیپەی کرد تا ساڵی (١٩٥٢) کە سەرسام بوو بە مۆزیکی رۆژئاوایی دوای ئەوعقید سعید قاسم العبیدی تا ساڵی (١٩٦٨) و دوای ئەوعبدالمجید نوری الحیالی و دوایی عبدالرزاق العزاوی و تا ساڵی (١٩٨٠) .

کەواتە ئەندامانی جوقی سەربازی ڕۆڵێکی بەرچاویان دی بۆ درووست کردنی چەندین توانای هونەری و بوونە هێزو توانای تیپی ئۆرکسترای سەمفۆنی عێراقی کە سەرەتاکەی لە ساڵی (١٩٤٨) درووست بوو بەڵام لە ساڵی (١٩٦٢) بە فەرمی کارە مۆزیکیەکانیان ئەنجام ئەدا و چەندین سەمفۆنیای بیتهۆڤن و باخ و مۆتزارت و چایکۆفسکسیان ئەنجام ئەدا و هەروەها ئەمەوێت ئەو زانیاریانە ببەستمەوە بە یادەوەرییەکی خۆمەوە کە لە پاش بەیانی یانزەی ئازار لە سەید سادق نمایشکی سەربازی لە پێشبرکێی گۆڕەپان و مەیدان کە سەربازگەیەکی تێیدابوو، جوقی مۆسیقای کەرکوک بوون، هاتبوون بۆ ژەندنی مۆزیک لەگەڵ یارییەکان و بەرزاییەکیان درووستکردبوو، بیرم دێت بە زیلی سەربازی هاتبوون بۆ بردنی

خەڵک لە هەڵەبجە، من کە لۆرییەکانم دی لای پیرمەحمەد وەستا بوون، خۆم هەڵدایەوە ناو زیلێکی سەربازی و چووم بۆ سەیری ئەو نمایشە، بێئەوەی پرس بەماڵەوەش بکەم، جل و پۆشاکێکی تایبەتی سووریان لەبەربوو، لەگەڵ شەبقەیەکی سپی و سوور و ئیقاعی هەمەجۆر و من یەکەمین جارم بوو لەو شێوازە تیپە ببینم، یەکەمین جارم بوو ئامێری کلارنێت و هۆرن و ترامپیت ببینم و لەگەڵیدا مۆسیقای جوانیان ئەژەند من ئەو کاتەش سەیری یارییەکانم نەئەکرد، یەکێک لەوانە شەوکەت رەشید بوو کە کلارنێتی دەژەند، بۆ ئێوارە کە نمایشەکە تەواوبوو هەموومانیان هێنایەوە بۆ هەڵەبجە، ئەوەی لێرەدا مەبەستمە مۆزیک تێکەڵاوە لە هەموو شێوازەکان، ئامێرەکان لە مۆزیکی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی وسەربازی و میللی کە هەموو یەک پرد پێکەوەیان گرێ ئەدات ئەوەش خودی مۆزیکە.

پاش دامەزراندنی ئیزگەی بەغدا لە ساڵی ١٩٣٦ یەکەمین تیپی مۆزیک دروست بوو کە دوای ئەوە ساڵح کویتی وازی لە تیپی سەربازی هێنا سەرپەرشتی تیپی مۆزیکی ئیزگەی بەغدای کرد کە هەموویان جوولەکە بوون جگە لەئیقاعەکە، بریتی بوون لە: صالح الکویتی کەمان . داود الکویتی عود . یوسف زعروری گەورە، قانون . حوکی بتۆ سەنتور ، یعقوب مراد العماری نای، ناحوم یونا جۆزە.. ابراهیم طقۆ چەلۆ.

من بۆیە ئەم گروپانە باس ئەکەم بۆ ئەوەی پەیوەستی بکەم بە دروست بوونی تیپە هونەرییە کوردییەکان و گۆرانی بێژە کوردەکان و مۆزیک ژەنەکان بۆ ئەوەی ببێتە سەرچاوەیەکی زانستی بۆ لێکۆڵینەوە دەربارەی نوسینەوەی مێژویی تیپە هونەرییەکان کە تا ئێستا هەست ئەکەم کەسانێکی کەم نەبێت لەبواری لێکۆڵینەوەی مۆزیک، زۆربەی خەڵک شارەزاییان نییە.

هەر لە منداڵییەوە لە سەرەتای ساڵانی شەستەکان بە وردی لە ساڵی (١٩٦١) کە لە قوتابخانەی (ئاشتی) و دوای کودەتای بە عسییەکان لە ساڵی (١٩٦٣) ناوەکەی گۆڕدرا بۆ (الانتصار)و بەڕێوەبەرەکەمان لەپێشدا حەمە فەرەجی حاجی حەمە عەلی بوو، کە هەر ئەو ساڵە خۆی گواستەوە وابزانم بۆ بەغدا، دوای ئەو مامۆستا ئەحمەدی مەحمود عزیز، بوو بە بەڕێوەبەرمان، دوکانی باوکیشم لە پیر محەمەد بوو، تا ساڵی ١٩٧٤ کە هەڵەبجە بۆردومان کرا و دوکانەکەمان ڕووخا بە سەریاندا و بریندار بوو لەگەڵ سەربەستی برام، ئیتر لەو گوزەرە لە ناو بازاڕەوە تا فولکەی شورتی شارعەکە کە فولکەیەکی تێدا بوو بە هەمان نەخشەی فولکەی سەرای سلێمانی، کاک مەولود کە پۆلیسی هاتوو چۆبوو، ماڵیان لە سەرووی ماڵی خۆمان بوو بە جل و بەرگ و کڵاوەکەی سەرسام بووم، دوایش وای لێهات کرێکاری ئەکرد، قوڕی ئەگرتەوە بۆسواغ دانی سەربان، بەیانیان دەڕۆشت بۆ دەوام و لەو فولکە هاتووچۆی ئۆتۆمبیلەکانی سەرپەرشتی ئەکرد، ئەو کاتە حکومەت هەبوو و نەک سەرگەردانی، نەقڵیاتی شارەزوور بەرامبەری بوو، کە لە چایخانەکەی سەید عوسمان پیاوێکی سووری نورانی مشکی بە سەر چاخانەکەی لە سەرەتای شەقامەکە بوو، بەرامبەر دوکانی دارتاش سۆفی ساڵح کە دەسکە خاکە ناز و مزراحی درووست ئەکرد، کەواو سەڵتەی لەبەر بوو، باوکی عەلی و ڕەشیدی سۆفی ساڵح، لە بیرم دێت مەهدی حسەین جەلیلەیی پیاوێکێ قسە خۆش لە قوتابخانەی سەرەتایی بووین بە ئاوازێکی زۆر خۆش، سۆفی ساڵح فەرەجی کوڕی ون بووبوو و بە هەڵە و داوان بە دوایدا ئەگەڕێت و بە هاوارەوە ئەڵێت [هۆ منداڵە شارستانیانە، هۆ منداڵە شارستانیانە فەرەجی کوڕمتان نە دیگە فەرەجی کوڕمتان نەدیگە، عەلەم ناردووە بۆ سەراو ڕەشەم ناردگە بۆ گونە ئەوەی بیدۆزێتۆ مزرۆحی بۆ ئەکەم وبە چزووی خۆمۆ – مەبەستی تەمتەمەی مزارح بوو ئەوەی مزراحی پێ دائەکوتی)، ئێستاش ئەو ئاوازەی مەهدی و تۆنەکەیم لە گوێچکەدایە، نازانم کێ لێی تێئەگات، خانەکەی حاجی عەبدوڵا کە کەواو سەڵتەی لەبەر ئەکرد لەولاشەوە لە پاڵیدا ماڵی جەلالی خونچە فەیلی، ماڵی کەمال و جەمال

و جەعفەرو خاوەر دایکیان ناوی فەیمە بوو کە شارەزووربیەکان لەو نەقلیاتە هاتووچۆی هەڵەبجەیان ئەکرد و لەو فولکەیەدا ساڵی ١٩٦٣ ئەڵماسی مەلا قادر خوشکی جەمالی مەلا قادر لەوێ بەگولەی وێڵ، ئەڵماس کوژرا، دوای ئەویش کافیەی خوشکی بە نەخۆشی مرد و نەسرینی مەلا قادر شووی کرد بە هۆگر گۆران و نەفیەش شووی کرد بە ئەژی گۆران، چەند جێبێکی لاندرۆفەری بچوک و گەورە وئاسکی مۆدیل (ئاسکی مۆدێل جۆرێکە لەجێبی لاندرۆڤەر) هاتوو چۆیان ئەکرد وهەمبەرەکەی حەسەنی حەمە مینە لارەش کە بە هەندل ئیشی ئەکرد(هەمبەر: جۆرێکە لەجیبی کۆن بە هەندل ئیشی ئەکرد) لەو شۆفێرانەی لە بیرم بێت مەحمودی وەستا قادر، نوری وەستا قادر، عەلی وەستا قادر و حەمە پارە پیس کە هەموو برا بوون، چەندینی تر کە نایەتە یادم، باوکم لە ساڵانی شەستەکان ئۆتۆمبیلی کڕی و ئەیدایە دەست شۆفێر لەو شۆفێرانە کە ئۆتۆمبیلەکەی ئیش پێئەکرد، عەلی جولەکە، سەعەچاوشین، عومەر تۆپەڵ، سەعیدی حەمە عەلی ناسراو بوو بە سەعە (گلۆڵەموو)

ئەهلی شارەزوور بەیانیان ئەهاتن و بۆ ساغ کردنەوەی بەروبوومەکانیان لە تەماتە و بامێ و ترۆزی و شوتی و کاڵەک و دەیان بەرهەمی شیرو ماست و ..... هتد. زۆربەشیان لای دوکانی باوکم کە دوکانێکی عەتاری ناوازەی هەبوو، نوقڵ و چکلێت و شەکر و چا وچەندین شتی تریان لێئەکری هەندێکیشیان بە قەرز دوایی پارەیان ئەدا، دەفتەرێکی هەبوو بۆ نوسینی قەرزەکانیان هەرچەندە خویندەواریشی کەم بوو بەس کاری خۆی پێ ڕایی ئەکرد و هەمیشە سوعبەتی خۆشی لەگەڵ ئەکردن ئەیووت (شکاوە) بۆیان ئەسەندەوە ئەیانوت لە بنا .. ولەچایخانەکەی کاک ئەورەحمانی چایچی وازۆڵێ باوکی حەمید و فەرە ج کە زۆر هاورێ بووین بە منداڵی. دوای ئەویش عەلی تەبە چایخانەکەی گرتە دەست، زۆربەشیان لای مامە حەمەم (حەمەی مەلا سابیر) سەریان ئەتاشی وکوڕەکانی لەتیف و فەرەج و رەئوف، سەریان ئەگرتن و بە گوێزان سفریان ئەکرد، یان گودلەیان بۆ ئەهێشتنەوە[1].) ئەویش سوعبەتچی و هیوایەتی بیتاقە کڕین بوو. لە نەقلیاتی شارەزوور دەلاڵ بوو، ناوی تۆفیق بوو ئەسمەرێکی چاوشینی مشکی

[1] گودلە: واتە کاتێک کە سەر سفر دەکرا، تۆزێکیان لەپێشەوە ئەهێشتەوە،

بەسەربوو، هاواری ئەکرد: دوجەیلە . بەشارەت . خێڵی حەمە . شەکرالی، خاکو خۆڵ . دوانزە ئیمام. ئیمامی زامن . شەشک . تەپی سەفا. تەپە کوڕە هتد من ئەو ناوانەم هەر بەگوێ بیستبوو، ئەو هاوارکردنە ڕۆژانە بوو بە تایبەتی بە هاوین وەک زرنگانەوەیەک لە گوێچکەمدا پێی ئاشنا بووم. هیچ کام لەو دێیانە ڕێگای قیرتاوی نەبوو بە زستان قوڕ و بە هاوین تەپو تۆز، جێب نەبوایە هیچ دەرەقەتی نەدەهات . ئەوەی کە من لە بیرمبێت رۆژێکیان دایکم و دراوسێکان جێبێکیان گرت چوون بۆ پرسەی کەسێک خزمی میرزا فەرەجی دراوسێمان کە ژنەکەی ئافتاو خانی ناو بوو، خەڵکی سلێمانی بوو، مناڵیان نەبوو دادە ئافتاو کچێکی خوشکی خۆی لابوو ناوی پەروین بوو، دوایی بووە خێزانی شێخ کەمالی شێخ حەمە ساڵح عەبابەیلێی، بۆ جاری دووهەم لەگەڵ دایکم وڕەوان شاد ئامۆژنە ئامینەم بە جێبێک چووین بۆ قاجر بۆ ماڵی پوورە رەعنام دایکی عەلی و جەمال و عوسمانی مەلا حەسەنی پورزام و چووین قەلێکی بۆ سەربڕین. جارێکی تریش لەگەڵ ڕەوان شادان لەتیفی مامم و ئاوازی خوشکی چووین بۆ قاجر و مەلەمان ئەکرد لە چەمەکەیدا، بەڵام سەربەستی برام زوو زوو ئەچوو.

لە ساڵی ١٩٦٧ خاڵە عوسمانم لەگەڵ مامۆستا حەمە فەرەج ئەحمەد پێکەوە مامۆستا بوون، سەرەتای دامەزراندنیان لە تەپی سەفا بوو. خاڵم بە هەموو کەسوکارمانی وتبوو کە سەردانیان بکەین بە میوانی. هەموومان، ماڵی دایەگەورە و پورەکانم ڕۆشتین و لەگەڵ خۆیشماندا خواردنمان بردبوو بە گەورەو بچوکەوە ٢٠ کەس زیاتر ئەبووین کاتەکەش زستان بوو، تەپی سەفا بینای قوتابخانەی حکومەتی نەبوو، ماڵی حاجی مستەفا ناوێک بوو کرابووە قوتابخانەیەکی چەند پۆلی، خاڵم و حەمەفەرەج لە ژورێکی قوتابخانەکەدا دەژیان و خواردنیان دروست ئەکرد، زۆر شەویش لە ماڵان میوان بوون . ئەو شەوە هەموومان ماینەوە و بۆ شەوی دوایی خاڵم وتی تۆ مەڕۆرەوە، منیش مامەوە و بۆ شەوی دواتر چەند میوانێک هاتن و لەبەر چرا فەزایەکی زۆر خۆشیان خولقاند و دەستیان کرد بەقسەی خۆش و نوکتە کردن لەگەڵ خاڵم و مامۆستا حەمە فەرەج. یەکێکیان جامانە بەسەرێک بوو ناوی ڕەحیم بوو زۆرقسەی خۆشی ئەکرد و پاشان دەستیان کرد بە یاری کڵاو کڵاوێن و گۆرەوی بازی و جار جارەش گوێیان لە ڕادیۆی کرماشان ئەگرت. تا ئێستاش ئەو شەوەم لەبیر ناچێتەوە . بۆ بەیانیەکەی

قوتابییەکان هاتن و من چوومە سەریان وەک چاودێر و هەمووسەیریان ئەکردم، ئەو کاتە من لە پۆلی یەکی ناوەندی بووم . ئەم یادەوەریانە وایان لێ کردم کە ئەو دەشتە بەرینەم لا شیرین ببێت. بە گۆرانی و داب و نەریت وسەخاوەتی شارەزوورییەکان، میوانداریيان، سەرسام بووم، بەتایبەتی شێوازی قسە کردنیان، مۆسیقایەکی خۆشم تێدا بەدی دەکرد کە جیاواز بوو لە ئاخاوتنی ئێمە، لە هەمووی کاریگەر تر گۆرانی و ئاوازەکانیان و پیاهەڵدانیان بە بەژن و باڵای کیژانی شارەزوورو جل و بەرگی ئاڵ و والآیان و گۆرانی وتنیان لە سەر کار و کاتی توتن کردن و مەرەزە و پەموو چنین و پاچە کۆڵە لەسەر دەشتێکی بەرین و سەوز و خاکێکی بە پیت و بەرەکەت، ئەو هەموو کانی و ئاوە و دارو درەختە کە بۆنی ژیانی ئەدا، باعەی مەڕو ماڵات و گا جووت و قیرەی قازو مراوی و بارەی مریشک و قووقەی کەڵەشێر و گەمەی کیژە دەم و چاو لەبەر خۆر سووتاوی و مەچەک و دەست وپەنجە زبرو ماندوو و ئارەقی ماندوو بە لەشیاندا دەهاتە خوارەوە، هەروەها ڕەنج و ماندووبوونیان و ئاوێتە بوون لەگەڵ خاک و خۆڵ و پاچ و بێڵ و خاکە نازدا، بۆنی بارانی پایزە و ئەمانە هەموو کاریگەرییان تێ کردوم و قەریحەی ئاوازم وەک قارچکی ناو دارەبییەک، هەورە تریشقە لێی ئەداوبە گرمەکانی و بریسکەی ترسێنەری و هەورە گرمە هەڵئەتۆقێ و کانییەکی لە بن نەهاتووی ناو مەزرایەک و بێستانێکی ناو بامێ و تەماتە و باینجان و بیبەر و جۆرەهای بەرهەمە.

بۆیە هەمیشە کارە هونەرییەکانم ئەو دەنگ و ڕەنگەیە، ئەو هەناسەیە، ئەدی خۆ هەست ئیلهام نییە لە ئاسمانەوە ببارێت، کاری هونەرمەند ئەوەیە ئەو یادەوەرییانە، ئەو بینینانە، ئەو گەڕان و ئالوودە بوونە، بکاتە کارێکی هونەری و ستاتیکای هەستی بە شێوازێکی جوانتر، بە چێژتر وباڵاتر لە خۆی رەنگ بداتەوە لە کارەکانیدا.

## کێ یەکەم کەس تەلەفیزیۆنی هێنایە هەڵەبجە؟

یەکەمین کەس لە بیرم بێت زستانیساڵی (١٩٦٨)بوو چایخانەی (عەلی سەلیم)تەلەفزیۆنی هێنایە هەڵەبجە وەک چایخانە و یەکەمین کەسبوو، شەوانە دەڕۆشتین، شەوێکیان باوکم من و کاوەی برامی برد بۆ سەیری تەلەفزیۆن قورئانی عبدالباسط بوو، پاشان (أفلام کارتون) بوو (میکی ماوس) بوو، دەبوایە بە (١٠فلس) سەیرت بکردایە.

ماوەیەکی تری پێچوو (عومەر عەلی) واتە (گوڵتە ڕەش) تەلەفزیۆنی هێنا، شەوێکیان چووین بۆ سەیری تەلەفزیۆنەکەی ئیشی نەئەکرد هەر دەڕابەی ئەکرد، وەستایەکی هێنابوو لە سلێمانیەوە، لە دواوە هەرخنە خنی بوو دەستکاری ئەکرد خەریکی بوو بۆی چاک نەکرا و ئەو کاتانە کارەبای هەڵەبجە (دی سی) بوو کارەبا کزبوو، شاشەکەی  پڕ نەئەکردەوە و ئەیکرد بە دەڕابە یان ئەگەر شەپۆلەکان بەهێز نەبوایە تەرزەی ئەکرد یان ڕووی(ئاریەلەکە) ڕووی لە کەرکوک نەبوایە وەری نەئەگرت، پاش ئەوە چایخانەی (عارفی حاجی فەرەج)و پاشان چایخانەی عوسمانی ئازادی و  وردە وردە کەوتە ئەو ماڵانەی توانای داراییان باشبوو، ئیتر شەوانە یان ڕۆژانی هەینی بە نیوەڕوان تەلەفزیۆن هەبوو دەچووم بۆ چایخانەکان چایەکم ئەخواردەوە و جاری واش هەبوو چاکەشم  نەئەخوارد هێندە تامەزۆری تەلەفزیون بووم، ئیتر لە چایخانەکانیش چەندین فیلم و گۆرانیم بینی، لەوانە لە چایخانەی کاک عومەر گۆرانی (الله الله من عیونک احلام وهبی)و(فلیمی محمود مەلیجی و فرید شوقی) پاڵەوانی بوون و گۆرانی (محمد ڕوشدی(عدویە) و گۆرانی (أجل بنک ی لمیعە توفیق (الهجع)ی (حمدیة صالح و کچەکانی) کە کاولی بوون، لە چایخانەی (عارفی حاجی فەرە ج)هەینیەک بوو گۆرانی (احبک) ی (عبدالحلیم حافظ) و گۆرانی(الربیع)ی(فرید الاطرش) و (لیالی ألانس)ی (ئەسمەهان و فائزە احمد و شریفە فاضل) و(عیرتنی بالشیب ناظم الغزالی)وحیدە خلیل (أنا و خلی تسامرنا وحچینا) و(یا حلو یا اسمر)و (رسالة من ولف)ی (هەیفا حسین) و (أسعد ومحەمەد وحسین بشری و عدویة)ی (غادة سالم) و(فاروق هلال و حسین نعمة و یاس خضر) و چەندینی تر.

له چایخانەی عوسمانی ئازادی کە دیوارەکەی بە سەربانی ماڵی نەنکم ناجی خان و مامە تایەرمەوە بوو، کاک عوسمان کونێکی کردبووە دیوارەکەی بۆ هەواکێش، هەموو جارێک بە شەو من و نەوزادی مامم بە سەعات لەو سەربانە ئەماینەوە و سەیری تەلەفزیۆنمان ئەکرد،



لەراستەوە: کەمالی مەلا قادر، مامۆستا ئازاد حەمدی، مامۆستا حەمەعەلی، مامۆستا عوسمان حسێن بانەیی، نەزانراوە، ئەوەی جلە کوردییەکەی لەبەردایەو لایکردۆتەوە بریتییە لە خاوەنی چایخانەکە کە عوسمانی ئازادییە.

ساڵی (١٩٦٨) بیرم دێت زستان بوو، خاڵە عوسمانم تازە دامەزرا بوو بە مامۆستا لە گوندی تەپی سەفا، چوو بۆ بەغدا بە قەرز مانگی دینارێکیان لێ ئەبڕی، تەلەفزیۆنێکی مارکەی (تەلەفۆنکەن)ی کڕی کە دۆلابێکی گەورەبوو بە دەرابە لەلاوە شاشەکەی دائەخرا، ئیتر نانی من کەوتە ڕۆنەوە زۆر شەو لە کانی قوڵکەوە کە ماڵی خۆمان لەوێ بوو هەر شەوەی بە بیانویەک، شەوێک بۆ سەیری تەلەفزیۆن، شەوێک بە میوانی، شەوێک بە بۆنەی سەعیکردنەوە، ئەچووم بۆ سەیری تەلەفزیۆن و لە داڵ بۆ داڵ سەیرم ئەکرد. لەوێ چەندین گۆرانی (نجاة الصغيرة و عبدالحليم و ام كلثوم)و چەندین فلیمی (فاتن حمامە و زنجیرەی (بنت

الحتة) له نواندنی (عادل شعبان وزیزی مستەفا و توفیق الدقن) و(فرید و محمود المليجی) و(رقصة البمبوطيه)و (فاروق هلال، فؤاد سالم)گۆرانی (الله الله شحالاته العمر) و گۆرانی (يانجمة) ی حسين نعمة كه ئاوازی (كوكب حمزه) بوو، وه گۆرانی (لاخبر)ی فاضل عواد له ئاوازی (حسين السعدی) و شیعری طارق یاسین كه ببووه ویردی سەر زمانی خەڵك و تەنانەت قوماشێك دروستبوو بۆ ژنان ناویان نابوو(لا خبر)كه هۆنراوەكەیم له بیر ماوه (لا خبر لا چفیه لا حامض حلو لاشربت) هەروەها زنجیره تەلەفزیۆنی عێراقی (تحت موس الحلاق) له دەرهێنانی عمانۆئیل رەسام و نووسین و نواندنی(سليم البصری) كەڕۆڵی حاجی راضی دەبینی (حمودی الحارثی)كەڕۆڵی (عبوسی) دەبینی و (راسم الجميلی، خليل رفاعی، سهام السبتی) له گۆرانییه كوردییەكانیش، گۆرانییەكانی (عەلی مەردان و قادر مەردان و فوئاد ئەحمەد و قادر ئەحمەد و یەحیا مەرجان و شەوكەت ڕەشید وتاهیر تۆفیق) و چەندینی تر بووبوونه هەوێنی گیانم، تا ساڵی (١٩٧٠) باوكم چوو بۆ سلێمانی له لای دوكانی (عەلی شەرعی)كه دوكانەكەی بەرامبەر (چاپخانەی شەعب) بوو تەلەفزیۆنێكی كڕی ماركەی (ئۆریۆن) كه یەكەمین ماڵ بووین لەو گەڕەكە تەلەفزیۆنمان هەبوو، یوغوسلافی بوو، ڕەنگێكی فۆرمیكای قاوەیی زەردباوبوو  بۆ داپۆشینی ڤۆلیۆمەكانی دەڕابەیەكی  بچووكی هەبوو له لای ڕاستیەوە، ئیتر من و كاوەی برام بەو تەمەنه چووین بۆرییەكی سێ روبعمان كڕی و بەرمیلێك بۆ سەربان و پڕمان كرد له بەردوئاریەلمان دانا وئیتر بووین بەخاوەن تەلەفزیۆنی خۆمان و شەوانه چەندین دراوسێمان دەهاتن بۆ سەیری وتەلەفزیون،  ئیتر  بووە سەرچاوەی زانیاریم و مۆسیقا وگۆرانی و فلیم و بەرنامەی هونەری، هۆیەكی باش بوو بۆ فێربوونی زمانی عەرەبی لەهجەی عێراقی و میسری و ورده ورده زۆرماڵ تەلەفزیۆنیان  كڕی ، بیرم دێت ساڵی حەفتا باوكم ته سجیلێكی گۆرۆندیكی له مەزادخانەی خوارەوەی سلێمانی كڕی، شەوانه له تەلەفزیۆن گۆرانی و فلیمم تۆمار ئەكرد یەكێك لەوانه گۆرانییەكی عبدالحليم(حلوة و كذاب ليه تخاصمنی) ئیتر چەند تەمسیلیەكی كوردی له تیپەكانی سلیمانی برا بۆ بەغدا بۆ تۆماركردن لەوانه (كێچ)و (جەنابی موفەتیش) هی كۆمەڵەی هونەرو وێژەی كوردی ئەوسا و له نواندنی فوئاد محەمەد ئەمین، ڕەوف یەحیا و عەلی توانا و عەبدولی حەمەجوان و ئازاد محەمەد بچكۆل و

ئەحمەد سالار وعومەر چاوشین رۆڵی ژنی ئەدی و چەندی تر وساڵی (١٩٧١) تیپی کرێکاران ومەکی عەبدوڵا، باوەژن خوا بناسە کە گۆرانییەکی هەورامی کەیکاوس بە لەنجە گیان پێشەکی تەمسیلەکە بوو، پاشان هەر ساڵی (١٩٧٠) تیپی مۆسیقای سلێمانی بەبۆنەی یانزەی ئازار چوون بۆ بەغدا لە هۆڵی خولد چەندین گۆرانی وێنەگیرا، لەوانە(گوڵی خوێناوی) بۆ (عومەر دزەیی)، (ئێمە کوردین نابەزین) بۆ(فوئاد ئەحمەد) و(یانزەی ئازار جەژنی کوردان)بۆ (عەدنان جەمال)و پارچە مۆسیقای(مەم وزین) دانانی م. ئەنوەر قەرەداغی و (ئەی شەمی شەوان) بۆ (قادر کابان)ودوایش تۆمارکردنی چەند گۆرانییەکی فولکلۆری بۆ(تۆفیق عەلی)گۆرانی (سۆیلە باڵا بەرز) وکۆرس، لەو گۆرانییانە (هەی بەلار وبەلار، ئامینی نازەنینی) و پارچە مۆسیقای (فریشتە)ی خالید سەرکار، پارچە مۆسیقای (چۆپی) ولیەم یۆحەنا کە یەکەم جاربوو جەمال شادان باڵەبانی تێدا ئەژەند و (هەی خانم خانم خانمی) کۆرسەکان ئەوەی ناویانم لە یاد بێت(جەمال سابیر، محەمەد نوری ، حسین قەرەداغی، دلێر مستەفا)و چەندینی تر وئەندامانی تیپی سلێمانی ئەنوەر قەرەداغی، خالید سەرکار، فەرەنسیس داود، عوسمان محەمەد ئەمین، محەمەدی شمشاڵ، فەرەیدون دارتاش، ئەلبێرت عیسی، فەرید عیسا، ولیەم یوحەنا، صباح محەمەد ئەمین، نوری قەرەداغی، پاشان م. ئەنوەر قەرەداغی خۆی چوو بۆ بەغدا پارچە مۆسیقایەکی تۆمار کرد بە ناوی (هەوارگە) و ئەوانە بوونە هەوێنی گۆرانی فولکلۆری بۆ من وهەمیشە ئەمگووتنەوە .....

### قۆناغی خوێندنی ناوەندیم لەشەستەکان و سەرەتای حەفتاکاندا

لە ساڵی خوێندنی (١٩٦٦-١٩٦٧) لە پۆلی شەشەمی سەرەتایی بووم، ئەو کاتە تاقیکردنەوەی (بەکالۆریا)هەبوو، تاقیکردنەوەکەمان لە هۆڵی ئامادەیی هەڵەبجەی کوڕان دا، هۆڵێکی هەبوو لە ناوەوە نەک لە دەرەوە چونکە هۆڵەکەی دەرەوە لە ساڵی (١٩٧٠) دروستکرا، ئەو هۆڵە سەرەکەی جەمەلۆن بوو، ستەیجێکی هەبوو لەگەڵ چەندین دارو تەختەو دیکۆری کۆنی لە سەربوو، چونکە لە ساڵانی

پەنجەکاندا مامۆستا ع.ع.شەونم شانۆگەری تێدا ئەنجام دابوو، بۆ سەرەتای ساڵی (١٩٦٧) چووومە پۆلی یەکەمی ناوەندی، ئەوەی سەیر بوو لام هەموو وانەکانمان عەرەبی بوون هەر لە مێژوو تا جوگرافیا و جەبرو هەندەسەو فیزیاو کیمیا، ئەو مامۆستایانەی لە بیرم بێت سالم جەرجیس بوو مەسیحی بوو خەڵکی موسڵ بوو وە (دەواح)ناوێک بوو عەرەب بوو، وە سەلاّح ناوێک بوو، مێژووی پێ دەگووتین، هەروەها مامۆستا (ئەنوەر مەرقۆس) کە مەسیحی خەڵکی سلیمانی بوو، وە مامۆستا (نزار) . مامۆستایەکی تر عەرەب بوو ناوی (سالم) بوو نازانم قوتابی ئەو کاتە ناوو ناتۆرەیان لە مامۆستا دەنا پێیان دەگووت (سالمە کەتیرە) یان مامۆستایەکی بەڕێزی ترمان هەبوو زۆر زیرەک بوو ناوی ئەحمەد بوو پێیان دەگوت (ئەحە سرێش)هەروەها مامۆستایەکی ترمان هەبوو ناوی (جەمال) بوو ئەویش هەر مەسیحی بوو، هەروەها مامۆستایەکی بادینیمان هەبوو خەڵکی زاخۆ بوو پێیان ئەوت (عەبە زازا) چاو شینێک بوو، دراوسێمان بوو، جل وبەرگی خێزانەکەی جیا بوو لە جل و بەرگی دایک و کەس و کارمان ئەیان ووت ئەمە جلو بەرگی ژنانی بادینییە، مامۆستایەکی ترمان هەبوو ناوی سەلاح بوو بیرم دێت تاقی کردنەوەی مێژوومان هەبوو مامۆستا سەلاح و مامۆستا ئەنوەر باسی گۆرانی ئوم کەلسومیان ئەکرد و بەراووردیان لە نێوان گۆرانی (أنت عمري و الأطلال) یان ئەکرد ئەیان وت کامیان لە کامیان خۆشترە و من گوێم بۆ گرتبوون، زۆربەی مامۆستایانی ئەو کاتە ئاستی ڕۆشنبیری هونەری و چێژی گوێ گرتنیان بەرز بوو، ئەو قوتابیانەی لەو ساڵە لەگەڵم بوون بریتی بوون لە ئەفراسیاب ئیبراهیم ساڵح، سەرکۆ ئەحمەد ئەفەندی، سەروەتی حاجی عیزەت، حەمیدی مەلا نوری، بەمۆی سەلاّح بەگ، ئیبراهیمی عەلی میرزا تۆفیق، ئازادی مەحمودی سەڕاج، حەمە هاواری، بارام حەسەن، ئەحمەد عبدالقادر، سارەوان مەلا کەریم ، فاروق الله کەرەم وچەندینی تر کەناوەکانیانم لە بیر نەماوە، ئەوەی جێگای سەختی بوو بۆ ئێمە وەک وتم هەموو وانەکانمان عەرەبی بوون و ناچار بووین کتێب هەبوو پێیان ئەووت (موجز)واتە کورت کراوەی وانەکان، ئیتر من بۆ وانەی مێژوو و جوگرافیا ئەو کتێبانەمان لەبەر ئەکرد واتە (دەرخ)، ئیتر دوای نیوەڕوان ئەچووین بۆ دەشتی دەورووبەری هەڵەبجە، چونکە ئێمە ماڵمان لە گەڕەکی کانی قوڵکە بوو ڕێگای عەنەب نزیک بوو بۆم، چونکە هەڵەبجە شارێکی بچوک بوو،

کۆتا ماڵ کەوتبووە ئەو شوێنەی ئێستا پێی ئەڵێن پەیکەری (مامۆستای نەناسراو) ئیتر لەوەودوا چۆڵ بوو، خەڵکی ئەو گوندانە بە پێ هاتووچۆیان ئەکرد، جادەکەی هەمووی چەو ڕێژ بوو، تاک تاکە ئەگەر جێبێکی لاندرۆڤەر یان پیکابێک یان گوێ درێژێک بە بارەوە گوزەری بکردایە، بەو شێوازە سەعیمان ئەکرد، کە لای من ئەو ساتانە خۆشترین کاتەکانی ژیانم بوون.



لە ساڵی (١٩٦٧- ١٩٦٨) لە پۆلی یەکەمی ناوەندی بووم، زۆربەمان (ڕاسب) بووین، من لە قوتابخانە هەر ئەوساڵە دەرنەچووم.

لەو ساڵەدا بە تایبەتی (١٩٦٨) لووتکەی شەڕی نێوان جەلالی و مەلایی بوو، زۆربەی ئێواران مەلاییەکان بە تۆپ هەڵەبجەیان تۆپ باران ئەکرد و چەندین خێزان بوونە قوربانی ئەو شەڕە نەگریسە و چەندین کاری تێرۆر کردن ڕووی دا، کە زۆر لە هاوتەمەنەکانم شاهیدی ئەو بارودۆخە نالەبارەن.

ئەوەی جێگای باس کردن بێت لە ساڵی (١٩٦٨) بوو یان (١٩٦٩) مامۆستا تەها خەلیل لە قوتابخانەی (سیروان)کە خاڵم مامۆستا حەمە عەلی میرزا حسین بانەیی بەڕێوەبەری بوو، مامۆستا تەها خۆی شانۆکار بوو، دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدا بوو، عەسرێکی بەهاری درەنگ بوو لە قوتابخانەی (التقدم) لە کانی عاشقان شانۆگەریەکیان پێشکەش کرد هێندە قەرەباڵغ بوو من بە ئاستەم چەند دیمەنێکیم دی لەسەر دیواری قوتابخانەکەوە ئەوەی کەدیم چەند ئەکتەرێک بوون لەوانە کەمالی عومەر مەغدوور، سەروەتی حەمە کەریم کوردستانی بوو، ڕووناکی حەمەی لاسلکی بوو، ئیتر نازانم ناوی ئەو شانۆگەرییە چی بوو.



لەڕاستەوە : م. تەها خەلیل . م. حەمە عەلی میرزا  حسەین بانەیی .١٩٦٧/٤/٢٩ لەکاتی کردنەوەی پێشانگای قوتابخانەی شنرویّ لە هەڵەبجە

لە ساڵی (١٩٦٩) لە پۆلی دووهەمی ناوەندی بووم  ئەم وێنەیە لە ساڵی ١٩٦٨تازە عوسمانی ڕەسام دوکانی وێنەگری دانابوو  یەکەمین وێنەی کارەباییم بوو.

هەروەها ئەوکەسانەی قوتابیش بوون وە کەس و کاری ئەو پیشمەرگانەی باڵی مەکتەب سیاسی بوون و تەنانەت دەمانچەشیان لە پۆلدا پێبوو، تاقی کردنەوەی وانەی (زیندەوەرزانی)مان هەبوو، یەکێک لەو قوتابیانە قۆپیەی کرد و

مامۆستاکەشمان لە قۆپیەکە گرتی ویستی بیکاتە دەرەوە بەڵام نەچووە دەرەوە و دەمانچەی لە مامۆستاکەمان دەرهێنا، بەڵام مامۆستاکەمان پەلاماری داو دەمانچەکەی لێ سەندوو کردیە دەرەوە، ئێمەش هەموو لە ترسا رامان کردە دەرەوە، هەموو قوتابخانەکە بە مامۆستاو قوتابییەکانەوە هاتنە پۆلەکەمان بە هۆی ئەو ڕووداوە، ئەمە یەکێک بوو لە چەندین ڕووداوی نەخوازراو.

لە سەرەتای ساڵی (١٩٧٠) قوتابخانەیەکی نوێ کرایەوە لە بینای ئەو قوتابخانەی کە خوێندنی سەرەتاییم تێدا تەواو کرد لە بینای قوتابخانەی (ئاشتی) لە پیرمحەمەد، ڕۆژێکیان مامۆستا شێخ ساحێب هاتە سەرمان و چەند قوتابیەکی هەڵبژارد بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆی بمانبات بۆ ئەو قوتابخانەیە، زیاتر ئەو کەسانەی هەڵبژارد کە گرنگیان بەخوێندن و کەسانی گوێ ڕایەڵ و کەس و کاریانی ئەناسی، ئەوانەی بیرم بێت، سەرکۆی ئەحمەد ئەفەندی بوو، ئەفراسیاب ئیبراهیم، کۆزادی حەمەی نانەوا، عەباسی حاجی شەفە هەلاج ، صەباحی ئەحمەد ئەفەندی، عەبدوڵای ئەوڕەحمانی خەلیفە، نەوزادی حاجی ئەمین، ئەردەڵانی ئەحمەد ئەفەندی، حەمەی زارا، سەلامی شێخ تاهیر، حەسەن عەلی، سارەوانی حاجی مەلا کەریم، ئیبراهیمی عەلی میرزا تۆفیق بوو، فوئادی حەمەی مەحمود ئەفەندی بوو، بەهادینی شێخ جەلال بوو، مەحمودی ئەمینی عەدە، عەلی حەمە ساڵح، عوسمانی حەمەی سەید ئەحمەد، لەتیفی مام ئەمین، وە چەندانی تر لە یادم نەماوە، ئەوەی جێگای سەرنجە یەکێک لەو قوتابیانە کە ناوی عەلی حەمە ساڵح بوو زیاتر لە ١٠ ساڵ تاقی کردنەوەی پۆلی سێهەمی دووبارە کردەوە ئینجا دەرچوو وازی نەهێنا تا دەرچوو من ئەو کاتە گەیشتبوومە کۆلێج ...

لەو ساڵەدا چەندین مامۆستای نوێمان بۆ هات یەکێک لەوانە مامۆستا ئازاد حەمە ئەمین کاردۆخی کە جوگرافیا و مێژووی پێ دەگووتین، مامۆستا حافظ ئەنوەر مائی، وە مامۆستایەکی عەرەبی درێژکۆلە ناوی عبدالمنعم بوو، مامۆستا جەلال ناوێک کوردی پێ دەگوتین، ئەو ساڵە تازە بەیانی یانزەی ئازار دەرچوو بوو شەڕو شۆڕ نەمابوو.

## دەرچوونی بەیانی یانزەی ئازاری ١٩٧٠

ساڵی (١٩٧٠) تەمەنم ١٥ ساڵ بوو ئەو شەوە لە ماڵی وەستا عوسمانی وەستا مەردانی دراوسێمان بووین، بیرم دێت باوکم و وەستا عوسمان ڕادیۆکەیان خستبووە بن گوێیان چاوەڕێی دەرچوونی بەیانەکە بوون، وتیان ئەرێ وەڵا دنیا خۆش بوو، بۆ بەیانی یانزەی ئازار بۆ سبەینێکەی بوو بە خۆپیشاندان، پارتییەکان هاواریان ئەکرد (پێشرەوی کورد پارتیە .... سەرۆکمان بەرزانیە) و (کێ بوو خۆی کرد بەشەکر ..کاک ئەحمەد حەسەن بەکر) بیرم دێت حەمە سەعیدی حاجی عینایەت ئەندامی یەکێتی قوتابیان بوو، من ئەو کاتە لە پۆلی دووی ناوەندی بووم، هەموو قوتابی پۆلەکەیان ڕیز کردو بردیانینە سەر شەقام و هوتافیان ئەکێشاو پێیان دەوتینەوە، حەمە سەعید کە لە خوار پیر محەمەد بووین ئەم شیعرەی محەمەد مەهدی الجواهری خوێندەوە و بە حەماسەوە هە موو دەم و چاوی سور هەڵگەڕابوو ئەم بڕگە شیعریەی دەوتەوە (شعب دعائمە الجماجم والدم ...تتحطم الدنیا ولا یتحطم ) کە شیعرێکی درێژی جەواهیریە بە ناوی (کردستان موطن الابطال) پاش تەواو بوونی ئەو خۆپیشاندانە گەڕامەوە بۆ سەرەوە بە ڕێکەوت کەوتمە ناو قەرەباڵغی خۆپیشاندانی ئەندامان و هەوادارانی حیزبی شیوعیەوە و لە سەر ئاڵای سوور چەندین نووسینیان نوسیبوو، بیرم دێت کەریمی حاجی مەحمود، هاواری ئەکرد (جبهة جبهة وطنية ..لا أقطاع و لا رجعية) منیش دوای دوو سێ جار وتنەوەیان بەو هات و هاوارە منیش فێر بووم دەمسەندەوە و لە ماناکەشی تێدەگەیشتم چونکە خوێندنی سەردەمی من لە پۆلی یەکەمی ناوەندییەوە هەموو وانەکانمان بە عەرەبی دەخوێند، ئیتر لەم کۆلان لەو گەڕەک شایی لۆغان بوو،

بۆ یەکەمین جار بوو هەڵپەرکێ ببینم، گۆرانی بێژی میللی(خولەی شیرالی، ئەحمەدی مشکی فرۆش، مینەی لولک ژەن) بە دەنگی ئەوان و شمشاڵەکەی مینە زیاتر جۆش و خرۆشیان ئەدایە ئەو هەڵپەرکێیانەوە، هەروەها دەهۆڵ و زوڕنا ژەنیشیان هێنابوو، ئیتر ماوەی ئەو چەند ڕۆژە واتە لە یانزەی مانگەوە تا نەورۆز هەموو ڕۆژێک لە گەڕەکێک یان دەشتێک هەڵپەڕکێ و خۆپیشاندان بوو،



ڕۆژێکیان دەنگۆیەکیان بڵاوکردەوە وتیان ئەمڕۆ (برایانی زیزی) لە ئێرانەوە هاتوون و ئەچن بۆ عەبابەیلێ بە دەهۆڵ و زوڕناوە گۆرانی ئەڵێن، منیش و سەدان کەس بە پێ کەوتینە ڕێگا، چووین بۆ عەبابەیلێ، بەڵام نە برایانی زیزی لێبوو نە هیچ، ئیتر نازانم کێ ئەو دەنگۆیەی بڵاوکردبووەوە، بۆ من سەد هێندەی تریش ماندوو بوومایە گوێم نەئەدایە، لەڕێگا بیرم لەوە ئەکردەوە چۆن گوێم لە گۆرانی (شەمامەو خاڵ خاڵ، زاوا لە بوکێ مەدە، موبارەک بێ تەدارەک بێ زاوا لێی بێ موبارەک) و چەندین گۆرانی تر، هەر بۆ نەوروزی ئەو ساڵە پارتی ئاهەنگێکی گێڕا لە خورماڵ خەڵکیان بە لۆری ئەبرد بۆ سەیری، چەندین بەرهەمی گۆرانی وسروودیان پێشکەش کرد بۆ نمونە (باجەی ڕەشید عزیز) گۆرانی وت و چەپکێ گوڵی بەدەستەوە بوو، گۆرانییەکە ناوی (هەی گوڵ هەی گوڵ) بوو، من لەم دواییانە زانیم کە گۆرانییەکی دەروێش عەبدوڵایە، هەروەها تیپێکی کۆرسیان درووست کردبوو، بێ ئامێری مۆزیک ئەوەی لە بیرم بێت ئومێدی حەمەی لاسلکی یەکێک بوو لەو کۆرسانە و سروودی (سڵاو لە پارتی دیموکراتی کورد، ئەو پارتەی ئاڵای شۆڕشی هەڵکرد)یان ئەوتەوە، هەر لەو ئاهەنگەدا بۆ یەکەمین جار بوو عوسمان کەیمنەیی ببینم گۆرانی بڵێت کە ڕۆژانە لە چایخانەکان گوێم لە

دەنگی ئـەبـوو، چاخـانەی عـومەری گوڵتـەڕەش، عەلـی سـەلیم، حـەمە یوسـف، ئەسکەندەر، کە پاشان بووە چایخانەکەی ئەوڕەحمانی سـەعە گۆچـان ناسـراو بە (خـاڵە) چایخانەکـەی حـەمە کەچـەڵ و قـالەی ڕەمەزان کە لە خـوارەوە بـوون لە گەڕەکی خۆمان ڕێک بەرامبەر مزگەوتی دار الاحسان .



وێنەیەکی ئاهەنگەکانی (١١)ی ئازار : ١- مامۆستا ملا محمد ی تەکیە .٢- ملا کریمی مۆردینی ٣- محمدحاجی علی ٤- عسمان کێمنەدی ٥- حمە امین دەرویش حمە علی ٦- شیخ سعید مفتی

هەر لەساڵانی شەسـتەکاندا دوای ڕادیۆ کە سـەرەکیترین سـەرچـاوە بـوو بـۆ گوێبیستی هەواڵ و زانیاری و مۆزیک و گۆرانی، سەرچاوەی تریش هەبوو لەوانە گرامە فۆن کە لە سەرەتای ساڵانی بیستەکانی سەدەی ڕابردوو هـاتۆتە عێراق و ئێـران و کوردسـتانییش وەک بەشـێک لـە عێـراق، چەنـد کۆمپانیـایەکی گرامەفـۆن هەبوون لەوانە کۆمپانیای(بیزافۆن، مارکۆنی، چەقمـاقچی)کە کـۆنترین یـان چەنـد گۆرانییەکیان بۆ سەید عەلی ئەسغەری کوردسـتانی لە لایەن کۆمپانیـای بیزافـۆن بۆ تۆمار کردووە لە ئێران و پاشانیش بـۆ مەزهەری خـالقی و حـەسـەن زیـرەک و عەلی مەردان و چەندینی تر.

لە ساڵانی چلەکان بە دواوە لە بەغدا کۆمپانیای چەقماقچی کە کاتێک خوێندکار بووم لە بەغدا سـاڵانی حەفتاکان کە ئەو کاتە باوی گرامەفۆن نەمابوو دوکانەکەی لە نزیک (حافظ قاضی) لە بەغداد مابوو، وە لە سـاڵانی (١٩٤٨) لەگەڵ مۆزیک ژەنی

به توانا جەمیل بەشیر ستۆدیۆیەکیان دروست کردبوو کە چەندین گۆرانی ناوازە یان بۆ(ناظم الغزالي ومحمدالقبانچی و یوسف عمر و لمیعە تۆفیق و عفیفە اسکندر، زهورە حسین، وەحیدە خلیل رەزا عەلی) بە هاوکاری مۆزیک ژەنان جمیل بشیر، منیر بشیر، نازم نعیم، سالم حسین ، نای ژەن کە لە تیپەکەی نازم الغزالی بوو (خضر الیاس ،خضیر الشبلی) کە قانون ژەن بووە و ئاوازدانەران (عەباس جمیل ، ودیع خوندە، کە کوردی موسڵ بووە و یەحیا حلمی و چەندانی تر، کەواتە گرامە فۆنیش سەرچاوەیەکی تر بووە بۆ مۆزیک و گۆرانی و لەو ماڵانە دا هەبووە کە ڕۆشنبیرو خاوەن چێژی مۆزیکی بوون .

بیرم دێت هاوینی ساڵی (١٩٧٦) بوو خاڵە عوسمانم گرامێکی کڕیبوو ڕەنگەکەی چەرمێی زەرد بوو، سەرەکەشی بە جیا دائەنرا، چەند قەوانی گۆرانییەکانی عەلی مەردان کە گۆرانی (پەچەکەت لادە) بوو، وە حەسەن زیرەک گوڵدوور و مەزهەری خالقی شیرین تەشی دەڕێسێ، وە عەرەبی ناظم الغزالی وەک گۆرانی (احبک) زهورە حسین، کە پێش دەست پێکردنی بێژەرێک ئەیگوت اسطوانات چقماقچی ناظم الغزالي یان زوهرە حسین، دوایش مۆسیقای گۆرانییەکە دەستی پێئەکرد وچەندینی تر...

### تەسجیل وەک سەرچاوەی سەرەکی بۆ گوێگرتن لەگۆرانی

یەکێکی تر لە سەرچاوەی بیستنی گۆرانی تەسجیل بوو، کە لە زۆربەی چایخانەکانی هەڵەبجە، ڕۆژانە گوێ بیستی دەبووم، لەوانە چایخانەی عومەری گۆڵتە ڕەش و عەلی سەلیم کە لە پیر محەمەد بوون و چایخانەی حەمەیوسف وئەسکندەر و عبدالله و قالەی رەمەزان و حەمە کەچەڵ و عوسمانی ئازادی کە زۆربەیان تەسجیلێکی گەورەی گۆرەندیک یان فلێبسیان دانابوو چەند شریتێکی بەکرەی گەورەیان هەبوو، گۆرانی حەسەن زیرەک، ئەحمەدی خولەسنەیی (ئەحمەد شەماڵ)، عوسمان کەیمنەیی، ساڵح دیلان و چەندینی تر.

## هاتنی حەسەن زیرەک بۆ هەڵەبجە و شەوە ئاهەنگێک لەماڵی کاک فازیلی خەیات

ساڵی (١٩٦٧) بوو، مانگی ١٠بوو، چوارەم رۆژی جەژنی قوربان بوو، حەسەن زیرەک و شەوکەت ڕەشید و سەلاح رەشیدی برای و چەندانی تر سەرەتای پایز بوو، چوون بۆ سەرای سوبحان ئاغا و ئەحمەد ئاوا و ئێوارە گەڕاونەتەوە بۆ هەڵەبجە و هاتوون بۆ ماڵی فازیلی خەیات کە دراوسێی ماڵی مامە تاهیرم و نەنکم بوون، کە شەو لە ماڵیان بووە، چونکە فازیلی خەیات دەنگی خۆش بوو، حەزی لە گۆرانی بووە و من شریتی دەنگیم لایە ، بۆ بەیانی چووم بۆ ماڵی نەنکم و وتی ئازاد ئەمشەو هەرچی مناڵە هاتوونەتە سەربانی ماڵی ئێمە و گوێیان لە دەنگی حەسەن زیرەک گرتووە و جەمالی کاک مەجیدی دەلاک و نەوزادی مامە تاهیرم بینوویانە و حەمیدی مەلا خەرامانیش هەر لەوێ بووە، حەکیمی مەلا ساڵحیش لە کانی عاشقانەوە چووە بۆ سەیری، خۆی کەبۆی گێڕامەتەوە، بەڵام من ئەو ئاهەنگەم نەدی، من ئەو گۆرانییانەی لە ماڵی فازیلی خەیات گووتویەتی لامە ....جگە لە تۆمارگەکان کە نزیک دوکانی باوکم، عبداللەی حەمەخانە ڕۆڵە، تۆمارگەی(فاخری) دانا بوو، هەمیشە تۆمارگەکەی گۆرانییەکانی ساڵح دیلان وڕەفیق چالاکی دەخستە سەر بۆ گوێ گرتن، بیرم دێت ساڵانی کۆتایی شەستەکان بوو، وە هەروەها کاک عومەری برا بچوکی لەسەربازی هە ڵاتبوو لە دوکانەکەیدا سەعاتی چاک دەکرد، عەبدوڵڵای حەمەخانە ڕۆڵە هێندە عاشقی گۆرانی بوو، بیرم دێت جارێکیان وتی کە مردم لەگەڵ قورئانی عبد الباسط و مەقامی (دوو ئاوانەکەی) ڕەفیق چالاک بمبەنە سەرقەبران

**پەیدابوونی سینەما لەعێراق و کوردستان**

یەکێک لە کاریگەرترین هۆی تر سینەما بوو، لە ساڵانی بیستەکانەوە هاتبووە عێراق و لە بەغدا چەندین هۆڵی سینەما کە لە ساڵانی چلەکاندا لە چل زیاتر بووە، لەوانە سینەما ڕۆکسی، بەغدا، سمیرامیس ، النصر، خیام و السندباد و أطلس وغرناطة و النجاح.

وە چەندینی تر کە فیلمە جیهانی و هیندی و میسرییەکانیش و هیندی و فیلمی عێراقی پەخشدەکرا، لە سلێمانیش کۆنترین سینەما، سینەما ڕەشید بوو کە ساڵحی ڕەشە ساڵی (١٩٥٠)و سینەما سیروان کە تا ئێستاش ماوە وە دوای ساڵانی حەفتاکان سینەما دڵشاد لە جادەی کاوە کرایەوە، منداڵ بووم لە سینەما ڕەشید خێزانەکان بە شەوان دەچوونە سینەما، جگە لە ڕۆژ کە کرابووە چەند بەشێک لە خوارەوە پێیان دەگوت چلی واتە بە چل فلس بوو بۆ گەنجان بوو، سەرووتر ٦٠ فلس دوایش چەند شوێنێک جیا کرابووەوە پێیان دەگوت لۆج کە بۆ خێزان بوو، بیرم دێت لە سەرەتادا سینەما چەندین گۆرانی دەخستە سەر گرامە فۆن یان تە سجیل وە دوایی جەرەسی لێدەدا نیشانەی دەست پێکردنی فیلم بوو، دوایش تاریک ئەبوو، لە پێشا موقەدیمە واتە چەند دەقیقەیەک پێشەکی وەک ڕیکلام لێدەدا وە پاشان فیلم دەستی پێدەکرد تا نیوەی دوای پشوو هەبوو خەڵک دەچووە دەرەوە یان ساردی یان چلورە یان چەرەساتی دەکڕی و پاشان دەست پێئەکرایەوە، فیلمەکان ئەو کات یان هەرقل بوو ماجستی تەڕەزان یان عەسابەی ئەمریکی یان هیندی فیلمی سنگام و زۆری تر، لە عەرەبی بیرمە ساڵی (١٩٦٥) بوو شەوێکیان چووین بۆ سینەما ڕەشید ڕیکلامی بۆ تایت ڕۆنی ڕاعی یان جلو بەرگ ئەکرد، تەنانەت نازم الغزالی پێش مردنی لە لوبنان سالی (١٩٦٣) فلیمیکی لەگەڵ نجاح سەلام دەرکردبوو بە جلی بە غدادییەوە گۆرانی (مەیحانە مەیحانە)ی ئەگووت..

ساڵی (١٩٧٠) پاش یانزەی ئازار کاک محەمەدحاجی حەمەکەریم کوردستانی واتە حەمەی لاسلکی کاتێک لە تەوێڵە بووە وەک پێشمەرگە سینەمایەکی لە ئێران کڕیبوو کە هاتەوە هاوینەکەی لە پاڵ ئوتێلەکەی سەعید خەڵەف شوێنێکی کردبوو

به سینەما و لەگەڵ براکانی کاک عوسمانی ڕەسام و کاک عەلی حەمە کەریم بەشدار بوون لەو سینەمایە، شەوێکیان کاکە حەمە کە دراوسێمان بوو زۆربەی گەڕەکی کۆکردەوە بە دایک و خوشک وە زیاتر لە (١٠) خێزان ئەبووین بە خۆڕایی سەیری فلمێکی میسریمان کرد، ئەوە یەکەمین شەوی هاوینی (١٩٧٠) بوو، وە سەید ئیبراهیم لەسەر بلیت فرۆشتن و سینەما ئیش پێکردن بوو، سەلاحی حەمە ئەمینی خولەی (چل پینە) ڕیکلام و خەڵکی ئەکردە ژوورەوە، سینەماکە هاوینە بوو واتە سەر(سەقف)ی نەبوو، دیوارەکانی بەگونیەی (جامفاس) داپۆشرابوو، بۆیاخێکی شینی کردبوو، وە جوانترین کار کە سەید ئیبراهیم کردی زۆربەی گۆرانییەکانی ئوم کەلسوم لەوانە (الاطلال، هذه لیلتی، أغدا القاک، أمل حیاتی، فات المیعاد، فكرونی) زۆری تر کە لە ماوەی ئەو ساڵانە دا بەردەوام بوو، ئەو ساڵانە هەڕەتی لاویم بوو، ئەو کەسەی کە خۆش نووسی بۆ ناوی فیلمەکان دەنووسی (نەوزادی حاجی ئەمین ساڵح)ی هاوپۆلم بوو زۆر جار پێم دەگوت نەوزاد لێت داوە بە خۆڕایی ئەچیتە ژوورەوە، نەوزاد تا ساڵی (١٩٧٤) تا هەڵەبجە بۆردوومان کرا خۆشنووسییان بوو، لەوێ زۆرفلیمم دی لەوانە فلیمی (الکذابین الثلاث. أبی فوق الشجره . حەسەن کەچەڵ) (من نصر الی نصر، جیڤارا و چەندین فیلمی عەرەبی فەڕەنسی لەوانە فلمێکی ڕۆمانسی فەرەنسی بە ناوی (أمرأه عاشقه) وتورکی وفارسی..وە ئەم فلیمانە جار جار گرتەی وروژێنەری تێدا بوو.

چەندین کەس شەوانە لەوێ بوون لە بیرم دێت (کونە لەیلی) کە ناوی خۆی فەرەج بوو، سەڵت بوو و چەندینی تر

وە لە ساڵی (١٩٧٣) سینەماکە سەری بۆ دروووست کرا ئەویش کاک عومەری خەزان وبە هاوکاری بەختیاری کوڕی بە جەمەلۆن سەریان گرت و ئیتر بە ڕۆژیش ئیشی دەکرد.

## ئاهەنگ و شانۆکانی دوای یانزەی ئازاری ١٩٧٠

پاش بەیانی یانزەی ئازاری (١٩٧٠) کە ئاشتی بەرقەراربوو، ئیتر لەم شار لەم گەڕەک چەندین تیپ و گروپ دروستبوون لە بواری شانۆ و مۆزیک، بیرم دێت ساڵی (١٩٧١) بۆ یەکەمین جار تیپی مۆسیقای سلێمانی هاتن بۆ هەڵەبجە لە هۆڵی سانەوی کوڕان ئاهەنگێکیان ساز کرد، ئەوان هەر لە سەرەتاوە دەست بەکاربوون، لە هۆڵی (خولد) لە زانکۆی(المستنصرية) (یانزەی ئازار جەژنی کوردان ئۆتونۆمیمان وەرگرت بۆ کوردستان) ئەمە یەکێک بوو لەو گۆرانییانەی کە (عەدنان جەمال) ئەیگووت و بە ڕەش و سپی تۆمارکران بۆ تەلەفزیۆن، دوای ئەوە (ئەحمەد الخليل) هەر بژی کوردو عەرەب رمز النضال) هەروەها گۆرانی (هەی شەمی شەوان) قادر کابان وتی. ...

یەکەمین شانۆگەری دوای بەیانی یانزەی ئازار لە هەڵەبجە ساڵی (١٩٧١)بوو، لە نوسینی (مۆلێر)کە نووسەرێکی فەرەنسی بوو وەرگێڕانی (مەلا لەتیف بامۆکی) شانۆیەکە ناوی (بە زۆر کراوە بە دکتۆر)بوو، بەشەو نمایش دەکرا، جەمالی مەلا قادر دەرهێنەری بوو، مامۆستا حەمە فەرج حەمە مراد دیکۆرێکی زور جوانی دروستکردبوو، سەید تەهای شێخ محەمەد ئەمین و حەمە سەعید مەلا محەمەد ومستەفای ئەحمەد شیرین، کەمالی عومەر مەغدور، سەروەتی حەمە کەریم کوردستانی، سەباحی حەمەچاوەش، جەلالی رەشید عەزیز، ئەمانە دەورییان دەبینی، کە هەندێکیان کۆن قوتابی ع.ع. شەونم بوون، هەر هاوینی ساڵی (١٩٧٠) بوو خەڵک دڵی خۆشبوو، باوکم ڕۆژێکیان چوو بۆ سلێمانی لەگەڵ خۆی تەسجیلێکی گۆرەندیکی ئەڵمانی کڕیبوو لە مەزادخانەکەی خوارەوە وە چەند شریتێکی بەکرەی لەگەڵ بوو چەند گۆرانییەکی تێدابوو وەک(ئای یەزن یەزن یەزن) (ئای بەلەنجە بەلەنجە بەلەنجەکەی ئەو بەرۆ– هۆ کچە بەجێم مەهێڵە دوو ماچت ها وە سەرۆ) (ئای بەلەنجە بەلەنجە بە لەنجە.. بەلەنجەم پێ نەماگە دوێکە لە ماڵی ناهی دەسرەکەم لێجێ ماگە)، (ئای بە لەنجە بە لەنجە.. بەلەنجەکەی تەنکە ..بە قوربانی تۆی ئەکەم گرێزەو کانی پانکە) دوایش لای تەسجیلاتەکەی عەبەی حەمەخانەڕۆڵە چەند شریتیکی عوسمان کەیمنەیی و جەمیلی کڕی وەک گۆرانی

(شیرین هەلامە و هەوری لە کۆڵ)ی تێدا بوو، سەیر بوو دەنگی ئەو تەسجیلە زۆر پاک بوو ناخی ئەسمی، ئەو کاتە خزم و دۆست سەردانی یەکتریان ئەکرد، شەوێکی هاوین بوو ماڵی حاجی عیزەتی خاڵی باوکم هاتن و هەموو کوڕو کچەکانیان، شەوکەت، سەروەت، سەرکاو ، لوتفی، ڕووناک، نیشتیمان ، کاک شەوکەت گۆرانییەکی حسین نعمەی وت لەگەڵ سەرکاو(نخل السماوه یگول طردنی السمرة سعف و کرب ظلیت ما بیها الثمرة)زۆر جوانیان وت دوایی وتی بڵاوی نەکەنەوە بەس من لای خۆم هێشتمەوە و زۆر جار چێژم لێ وەرئەگرت.



تیپی نواندنی هەڵەبجە ١٩٧٠
شانۆگەری بڕیارو ئەنجام
ئەکتەرەکان لەڕاستەوە بۆ چەپ:- جلال رەشید عەزیز، کەمال عومەر مەغدور، طه شێخ حەمە ئەمین، عەلی حسین، شێخ غەریب، حەمەی حاجی عەلی، صباح حەمە چاوەش، عومەری خاوەر، عبدالله حەمە خان، مصطفی احمد شیرین.

## ساڵی ١٩٧١ بۆ یەکەم جار مامۆستا ئەنوەر قەرەداغیم دی

پاش بەیانی یانزەی ئازار ئاهێک هاتەوە بەسەر کوردستاندا و چەندین گروپی مۆزیک زیندوو بوونەوە لە شارەکانی کوردستان  بە تایبەت لە سلێمانی و هەولێرو کۆیە، من لەو ساڵەدا لە پۆلی سێهەمی ناوەندی بووم لەگەڵ چەند قوتابییەک کە بۆ یەکەمین ساڵ بوو ناوەندی شارەزوور بکرێتەوە و هەموومان لە ئامادەیی کوڕانی هەڵەبجە بووین، ڕۆژێکیان مامۆستا شێخ ساحێب هاتە پۆلەکەمان ئەو کاتە وانەی بیرکاری پێ دەگوتین، چەند قوتابییەکی جیا کردەوە ئەوانی کە بەدڵی بوون و ئەیزانی کە مەبەستمان خوێندنەو زۆربەمانی ئەناسی، پۆلی سێهەمی بۆ کردینەوە، لەوانەی لە بیرم بێت: سەباحی ئەحمەد ئەفەندی ، عبداللەی ئەوڕەحمانی خەلیفە، ئەردەڵانی محمەدە ئەفەندی، نەوزادی حاجی ئەمین، کۆزادی حەمەی نانەوا، فوئادی حەمەی محمود ئەفەندی، مەحمودی ئەمینی عەدە، کە لەپاڵ من دادەنیشت لە دواوە، حەمەی زارا، عەلی حەمەساڵح، بەهادینی شێخ جەلال موفتی، سەرکۆی ئەحمەد ئەفەندی ، فاروقی حەمەی باول، بورهانی شێخ عزالدین، ئەفراسیاب ئیبراهیم ساڵح ، ئیبراهیمی عەلی میرزا تۆفیق، ڕەئوف حەمەعەلی و دوایش لەتیفی مام ئەمین، چەندینی تر، ئەو ساڵە یەکەمین جار بوو کە مامۆستا ئازاد شێخ محەمەد ئەمین کاردۆخی وانەی جۆگرافیای پێدەگوتین، مامۆستا حافز وانەی کوردی پێدەگوتین، هاتنە سەر پۆلەکەمان و وتیان کە بە نیازن گەشتێکی زانستیمان پێ بکەن بۆ بەنداوی دوکان و دەربەندیخان، وتیان ئەوەی ئارەزوویەتی با بەشدار بێت و ئەبێت خۆتان خواردن بێنن وپارەی ئۆتۆمبیل بدەن و لەدایک و باوکتان بپرسن بزانن ڕازی ئەبن؟ من خواخوای شتێکی وا بووم، ئەشم زانی باوک و دایکم ڕەزامەندن و یەکسەر ناوی خۆم نووسی و دوایش ئەوانەی هاتن پڕ بە پیکابێک ئەبووین و مانگی چواری ئەو ساڵە بوو، کات سەر لە بەیانی بوو بەیانییەکی نیمچە بارانـاوی، پیکابێک لەبەردەمی ناوەندی شارەزوور ئامادەبوو، لە پیرمحەمەد، شۆفێرەکە ناوی عەلی بوو برای شۆفێریکی تر کە پێیان ئەوت (زیول) هەموومان سوار بووین بەرەو سلێمانی بەڕێ کەوتین و دوایی بەرەو دوکان و جار جارەش باران ئەباری، من دایکم کە تازە تەباخی غاز هاتبوو مریشکێکی بۆ برژاندبووم وتی لەگەڵ

هاوڕێکانت لە ڕێگا بیخۆ، جل و پاڵتۆی دامێ و باوکیشم چەند دینارێکی دامێ، بەڕی کەوتین هەموو دەستیان کرد بەگۆرانی وتن لە دوای پیکابەکە و منیش سەرسام بووم گۆرانیم لەبەر نەبوو، ئەوان چییان ئەوت منیش وەک کۆرس بە یەک دوو جار فێر ئەبووم، سلێمانیمان بڕی و هاتینە ڕێگای دوکان منیش یەکەمین جارە ئەو شاخانە ببینم، نزیک شاخەکان بووینەو لەوێ من مریشکم دەرهێناو لەگەڵ یەک دوو هاوڕێم خواردمان و لە شاخەکەی نزیک گوندی تیمار پیکابەکە وەستاو سەیری شاخەکەمان ئەکرد بەردێکی درێژ بە شاخەکەدا وەک مار وابوو کابرایەکمان دی وتی ئەوە مارە بەو شاخەوە ڕەق بۆتەوە، زۆر سەیرم لێهات، دوایی سوار بووین و بەرەو دوکان و مامۆستاکان ئیزنیان لە پاسەوانەکان وەرگرتبوو چووین بۆ سەیری بەربەستی دوکان سەیرم لەو دیمەنانە ئەهات کە بۆ یەکەم جار بوو ئەمبینی، پاش عەسر گەڕاینەوە و بۆ ئێوارەیەکی درەنگ گەشتینە سلێمانی، وە پیکابەکە لای بەردەرکی سەرا وەستا کە نزیک بوو لە چێشتخانەکانەوە و هەموومان خۆمان کرد بە چێشتخانەی (عەلی سوور) و من چوومە قاتی سەرەوە، یەکەم جارم بوو لە چێشتخانە نان بخۆم، چێشتخانە بە گڵۆپی ڕووناک ڕازابووە و شاگردێکی دەنگ بەرزی لێبوو هاواری ئەکرد: برنج و شلەی سادە ،دوو کەباب، مریشک لەسەر برنج، برژاوێک، من لە قاتی سەرەوە دانیشتبووم، شاگرد هاواری کرد، قۆزیەک، ئەم دەستەواژە لای من تازە بوو، یەکەم جار بوو ببیستم کە هاتە لای من وتم قۆزیەکم بۆ بێنە باکم نەبوو پارەم پێ بوو، بۆ شەوەکەی من ماڵی پورەکانم لە سلێمانی بوون کەس وکارم لەوێ بوون، بەس وتیان نابێت کەس بڕوات بۆ ماڵی خزمەکانی، بەشی ناوخۆیی هەبوو لە ئامادەیی کشتوکاڵی بەکرەجۆ، بردینیانە ئەوێ بۆ خەوتن و کۆمەڵێک قوتابی هەڵەبجەیی لێبوو، وەک نوری عومەری کاکی، دلێری مەلا محەمەدی باش کاتب، پێشوازی گەرمیان لێکردین، کوڕێکی خەڵکی سلێمانی لێبوو گۆرانییەکی خۆشی وت بە ناوی (لەیل گیان لەیلی ـ لەیلێم تۆراوە ـ بە خودای مەزن ـ یار لێم ڕەنجاوە) ئەو کاتە مامۆستا حەسەن گەرمیانی مامۆستای ئامادەیی کشتوکاڵی بەکرەجۆ بوو، ئەو شەوە هەورە تریشقە زۆر بوو، بارانێکی بە خوڕ بوو زۆر ئەترسام لە هەورە تریشقە، ئەو شەوە مێژوویی بوو لام، بۆ بەیانییەکەی هاتینەوە بۆ ناو شاری سلێمانی و پیکابەکە لە سەرووی مزگەوتی گەورە وەستا نزیک کات ژمێر ١٠ی بەیانی بوو پیکابەکە پەنجا مەترێک لە سەرووی مزگەوتی گەورە وەستا،

ئێمەش لە ناو پیکابەکە بووین، لەو کاتەدا دیمەنێکی سەیرم بینی، ئەبینم ئەنوەر قەرەداغی کەمانچەیەکی بەدەستەوەیەو وەستاوەو تەوقە لەگەڵ کەسێک ئەکات، بەوەدا ناسیمەوە کە لەپێشەوەی سەری کەمێک سپی بوو، ئەو دیمەنە گەڕاندمیەوە بۆ پێش حەوت ساڵ لەوەو پێش کە مامۆستاکەم حەمەی ڕەعنا، ئەیوت ئازاد بڕۆ کەمانەکەم بۆ بێنە لە ماڵی شوکریە خانی خۆشکم خێزانی حەمەلەی کەبابچی، لەو کاتانەدا ئەمویست دەستم بەر کەمانەکەی مامۆستا ئەنوەر بکەوێت و نەک هەر ئەوە، دەستم بەر دەستی بکەوێت، هەرچەندە لەو گەشتەدا فوئادی خوشکەزایمان لەگەڵ بوو بەس نازانم ئەوان یەکتریان دی یان نا؟ بەس من لەو ساتەدا تەزویەک بە گیانمدا هات، ئەوە یەکەمین جار مامۆستا ئەنوەر ببینم، باوەڕ ناکەم هەر لە یادیشی بێت، بەڵام ئەوە ڕاستییەکە لای من، وا بزانم ئەڕۆشت بۆ بینای تۆفیق قەزاز بۆ پرۆڤەکردن لەگەڵ تیپی مۆسیقای سلێمانی، بەوەدا ناسیمەوە چونکە لەوەو پێش لە تەلەفزیۆن دیبووم.



**مامۆستا ئەنوەر قەرەداخی ساڵی ١٩٦٧ لە کتێبخانەی گشتی سلێمانی لەگەل چەند قوتابییەک ئاهەنگی جەژنی دارو درەخت.**



**لەڕاستەوە :عوسمان عەنەبی، نەوزادی فاتە خان، سەباح ئەحمەد، ئەفراسیاب ئیبراهیم.**
**ناوپیکابەکە: ئازاد سالّح، بورهان عزالدین ، لەتیف مام ئەمین، ئیبراهیم عەلی میرزاتۆفیق، کۆزاد ئەحمەد، سەرکۆ ئەحمەد، رەئوف حەمەعەلی**
**دواوە: عوسمان محەمەد ئەمین، نەبەزشێخ مەحمود، فوئاد محەمەد**

## تیپی مۆسیقای سلێمانی و ئاهەنگێک لەهەڵەبجە

**هێندەی بیرم بێت لە مانگی(٩) ورد تر بڵێم لە (٩/٥/ ١٩٧١) تیپی مۆسیقای سلێمانی هاتن لە ئێوارەکەی لە هۆڵی ئامادەیی کوڕانی هەڵەبجە ئاهەنگێکیان سازکرد لەو ئاهەنگە زۆربەی هونەرمەندانی ئەو تیپە ئامادەبوون وەک مامۆستا ولیەم یۆحەنا، ئەنوەر قەرەداغی، خالد سەرکار، عوسمان محەمەد ئەمین، فەرەیدون دارتاش، جەمال شادان، ئەمانە کەمان ژەن بوون ئەو کاتە وابزانم مامۆستا سەلاح رەئوف نەچووبووە ئەو تیپە لەوان تەمەنی کەمتر بوو.**

ئه لبێرت عیسی(ئۆکوردیۆن)، حسین جەمبوش مامۆستا سەباحێک هەبوو کەرکوکی بوو لەگەڵیان ئیقاعی دەژەند وەگۆرانی بێژان : حەسەن گەرمیانی، گۆرانی کەمەرە شل، مەیلەنگێنە)ی گووت، منالێک تازە ناوبانگی دەرکردبوو گۆرانی (سۆیلە بالاّ بەرز)ی وت بە ناوی تۆفیق عەلی ..

سالّح کارگەچی گۆرانی (باران بارانە)ی گووت، بۆ یەکەمین جار کە بزانم عومەری خەزان گۆرانی بێژ، هاتە سەرەوە ومەقامی (هەمایون) لەگەڵ گۆرانی (کۆچی یارم)ی وت، بێ پرۆڤەکردن، سەیر بوو لام کە ئەو مۆسیقا زیندووەم گوێ لێدەبوو زۆر چێژ بەخش بوو لام، چونکە ئەوە یەکەم جارم بوو کە گوێم لە تیپێکی مۆزیک بێت بە زیندوویی، کە ئەو ئیقاعەی دەژەند وام ئەزانی لە ناو هەستم دەنگ دەداتەوە، لە ناوەڕاستی ئاهەنگەکە پیاوێکی کەواو سەڵتە لەبەر لەدەرگای ناوەڕاستی هۆڵەکەوە هاواری کرد (ئادەی کورە دەی ئەودەرگایەم بۆبکەنەوە، پیاوێک بە کەواو سەڵتە و مشکی و گالۆکێک بە دەستەوە خۆی کرد بە ناو حەشاماتەکە، هۆڵەکە پڕ بوو وە زۆربەی خەڵک بە پێوە وەستابوون، هاتە ژوورەوە چووە سەر شانۆکە مامۆستا ئەنوەر هەستایە سەرپێ و وتی ها کاکە چیت ئەوێت؟ بە زمانی شارەزووری وتی منیش هاتگم لەو شارەزوورەوە گۆرانی ئێژم و هۆرە ئەکەم هەرچەند ویستی بچێتە خوارەوە نەچوو دەستی کرد بە هۆرە کردن، ئەویش دەستی کرد بە کەمان لێدان بۆی، دوای زانیمان کە ئەمە هونەرمەند (سمکۆ عەزیز)ە، خۆیان ئەم بەزمەیان بۆ درووست کردبوو بۆ ئەوەی بەزمانی ئەمڕۆ سۆپرایسیان بۆ درووست کردین.

دوای ئەوەی ئەمان تەواوبوون تیپی نواندنی سلێمانی شانۆگەری (نرخی ئازادی)یان پێشکەشکرد، نواندنی: عومەر دڵپاک، عەلی نوری وسەلاح بالاّ بەرز و دەرهێنانی غازی بامەڕنی بوو، ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام و ترسام، عەلی نوری ڕۆڵی ئەفسەرێکی ئەدی و (عومەر دڵپاک)ی ئەشکەنجە ئەدا، هێندە عومەر دڵپاک وای ڕۆڵ ئەبینی وام ئەزانی ڕاستییە وا ئەشکەنجە ئەدرێت، ئەو کاتانە وا بوو کە نمایشی جاران ئەکرا کە مۆزیک و شانۆ پێکەوە ئاهەنگیان دەگێڕا، ئێمەش دوایی هەروامان ئەکرد، شەوێک بۆ پیاوان شەوێک بۆ ژنان، پاشان سالّی (١٩٧٢) تیپی یەکێتی قوتابیانی کوردستان لە سلێمانی هاتن، کە یەکەمین ڕۆژی جەژنی قوربان بوو بەفرێکی زۆر ئەباری بەیانییەکەی کات ١٠ ئەبوو، بەردەم هۆڵەکە زۆر

قەرەباڵغ بوو هەرچەند پاڵم ئەنا نەمئەتوانی بچمە ژوورەوە، دەرگای پێشەوەی هۆڵەکە لە سەرەوەی دەرگاکە پەنجەرەیەک هەبوو، لەدوورەوە قەوسی کەمانچەکانم ئەدی خەریک بوو دەست پێ بکەن و بە پاڵە پاڵ دەرگایان کردەوە چوومە ژوورەوە بە پێوە ڕاوەستام، بیرم دێت کەمانچەکان دوو کەسبوون، یەکەم سۆران سەڵتە کە قوتابی بازرگانی بوو، کە ئاواز دانەریش بوو وباڵەبانیشی دژەند، بەداخەوە لە ساڵی (١٩٧٤) لە بۆردومانی قەڵادزێ شەهیدبوو، لەگەڵ چەندین خوێندکاری زانکۆی سلێمانی، دووەم کەمان جەمال سابیر، سیروان ناوێک ئۆکۆردیۆنی دەژەند، سامی حەنا برای ماموستا ولیەم یۆحەنا شمشاڵی دەژەند، شەش کەسێک ئەبوون، ئەوانی ترم بیر نایەت، گۆرانی بێژ (عەبدولقادر حەسەن) گۆرانی (لایە لایەت بۆ ئەکەم)ی وت کە گۆرانییەکی حەسەن زیرەک بوو کە ئەوکاتە لە ژیاندا بوو مەبەستم حەسەن زیرەکە . (خەلیل عبدالرحمن) گۆرانی (ئەی گوڵی من، بولبولی من)ی وت (کامەران عوسمان) ئاوازێکی سۆران سەڵتەی وت کە لە شیعری عوسمان شارباژێڕی بوو، شیعرەکەیم تا ئێستاش لە یادە (تۆ وا ئەکەی کە هەڵبەستێ بنووسم تۆی تیا ڕاوەستێ جوانیتی تیا کۆبێتەوە بە گۆناتا بشنێتەوە، پرشنگی ڕووتی بەرکەوێ جوانیەکەتی تیا دەرکەوێ).

پاشان تیپی شانۆی قوتابیان نمایشیکی شانۆیان پێشکەشکرد، ناوەکەیم بیر نەماوە لە ئەکتەرەکان ڕەوان شادان حسین قەرەداغی، ڕزگار سدیق، دلێر مستەفا وچەندینی تر، ئیتر گروپ دوای گروپ ئەهاتن، هەرهەمان ساڵ لە هاویندا واتە (١٩٧٢) تیپی نەقابەی کرێکاران هاتن کە تیپێکی مۆزیکیان لەگەڵ بوو ئەوەی سەرنجی ڕاکیشام عود ژەنێکیان لەگەڵ بوو نەمئەزانی کێیە تا لەم دواییانە زانیم ڕەوان شاد (سالار سەڵتە)یە، باوکی هاوڕێم هونەرمەند مامۆستا پێشکار سەڵتەیە، گۆرانی بێژێکی هەرزەکار ناوی (ئاوات مەحمود) گۆرانی ئامینێ نازەنینێی وت، سالەی سمایل دوو گۆرانی وت بە ناوی ئۆخەی ئۆخەی لەو باڵایە و وەک قومری سەربالم شینە، هەندێکی تریش کە بیرم نەماوە، پاشان هونەرمەند حاجی مەکی عبدالله و ئیسماعیل بەرزنجی کە ئەو ساتانە زۆر ناوبانگی هەبوو شانۆگەرییەکی پێکەنین ئامێزیان نمایش کرد، ئیتر گوڕو تینێکی تریان دا بە ئێمەی هەرزەکار.

لەناو هەڵەبجە فەرمانبەرێک هەبوو لە نەخوشخانە برین پێچ بوو بورهانی موزەمیدیان پێ ئەوت عودی دەژەند وساڵی (١٩٧٢) پێش ئێمە لە باخی عەلە بەڕانی بەرامبەر شارەوانی ئاهەنگێکیان ساز کرد، بیرم دێت ساڵح هەژار و مەلا لەتیف بامۆکی پێشکەشکاربوون، بورهانی موزەمید بە عود وئەسعەدی کەبابچی تەپڵی لێئەدا، سروودێکیان وت بە ناوی (خۆشم ئەوێ ولاَتەکەم)



ساڵانی شەستەکان، جەژن لە باخچەی عەلی بەڕانی – هەڵەبجە

ئەوانەی وەک کۆرس بەشدار بوون (عەزیزی مەحمودی مستەفا بەگ) و فەرمانبەرێک هەبوو تەنها دەژیا. فەرمانبەرێکی تریش بە ناوی عەباس پێیان ئەوت عەباسی موختار، فەرمانبەری مالیە بوو لە گەڕەکی جولەکان بە تەنها ئەژیا، خەڵکی سلیمانی بوو، ئۆکۆردیۆنی دەژەند. دوای ئەوە لەم کۆڵان و ئەو کۆڵان شانۆگەری نمایش ئەکرا، بیرم دێت بۆ یادی نەورۆز هەر لەو ساڵانە عەلی مەجیدی حەماڵ لە سەرووی ماڵی خۆمانەوە تیپێکی لە منالاَن درووست کردبوو بۆ شانۆگەری و لەم گەڕەک و ئەو گەڕەک چەندین تیپی شانۆیی منالاَنی سەرپێی دروست کرابوون.

ئیتـر ژیـان خـۆی کـارو کـاردانەوەیە لە هـەمـوو بوارەکـان، چ هـونەر چ بـاری کۆمەڵایەتی، چونکە ئاشتەوایی باڵا دەستبوو، هەموو یادەکان بەرهەمـی هـونەری تێدا نمایش ئەکرا، هەر لە ساڵی (١٩٧٢) چەنـدین شـانۆیی نمـایش کـرا، تیپـی لاوان دروسـتبوو، تیپـی قوتابخانەکـانیش دروسـتبوو، زسـتانی (١٩٧٢) بـوو، ئومێـدی نـوری حەمەی نـانەوا ناسـراو بە (نـوری باتـا)، چـونکە یەکەم کەس بـووە دوکـانی پـێڵاوی مـارکە باتـای لە هەڵەبـجە دانـابوو، ئومێـد شـانۆییەکی نووسـیبوو ئەو ئەکتەرانەی ڕۆڵیان تیادا ئەدی بریتی بـوون لە(سـەیف الـدین) بـرای شـێخ لە تیفی نانەوا، سەید تەهای شێخ حەمەئەمین، نەژادی شێخ عارف وچەندانی تر، هەروەها شانۆییەکی کۆمێدی ئاسایان پێشکەش کرد بە ناوی (کێ کـردی و کـێ خـواردی)، بـۆ یەکەمـین جـار گروپێکـی مۆزیـک لەگەڵیـان دابەزی مـن ئەو نمایشـە مـۆزیکیەم نەدی، چـونکە یەکەم شـەو ئامـادە نەبـووم، ئەو گـروپە بریتـی بـوون لە بورهـانی موزەمید (عود)، فوئادی حەمەی مەحمود ئەفەندی(شمشـاڵ)، ئەسعەدی کەبـابچی (تەپڵ)، عەبدوڵای حەمە خـانە ڕۆڵە خـاوەنی تۆمـارگەی فـاخر (دەف زنجـار)، بـۆ نمایشی ڕۆژی دووهەم باوکی فوئاد واتە حەمەی مەحمود ئەفەندی لە مزگەوتی خانم ویستبووی دەست نوێژ بگرێت، نازانم نیوەڕۆ بووە، یان عەسرەکەی جەڵتە لێـی دابـوو کەوتبـووە نـاو حەوزی مزگەوتـی خـانم، چـونکە ماڵیـان بەرامـبەر مــزگەوتەکە بــوو کــۆچی دوایــی کــرد، ئیتــر بــۆ شــەوی دووەم چــووم هەر شانۆگەرییەکان پێشکەشکران

هـەر لە بەهـاری (١٩٧٢) بـوو مـانگی ٤، عوسـمان چێـوار لە هەڵەبـجە ببـووە مامۆستا لە قوتابخانەی شنروێ لە کانی قوڵکە، کە خاڵم حەمە عەلی حسین بانەیی ئەویـش گروپێکـی شـانۆگەری دروسـت کردبـوو لە گەڵ شـێخ عەلـی (خـولە کەشـکۆڵ) شـانۆنامەیەکی جەلالـی میـرزا کەریمیـان نمـایش کـرد لەو ئەکـتەرانە: جەزای حـەمە کەریمـی چـایچی، ئەکرەم محـەمـەد، کـاوەی شـێخ مستەفا، ئـازادی مەحمودی سەراج، ڕێبواری ئەحمەدی غولام، چەندینی تر کە ناویانم بیر نەماوە .



مەحمود کەشکۆڵ، عوسمان چێوار  ساڵی ١٩٧٢  شانۆیی داسەکەی شاسوار

### سەرەتای ئاشنابوونم بە ئامێری کەمان

ئەو ساڵە من ئەمویست ئامێرێکی مۆزیکم هەبێت، نەورۆزی ساڵی (١٩٧٢) بوو، ئێوارەی ١٩٧٢/٣/٢٠بوو، کاک عوسمانی ڕەسام بەهۆی خزمایەتی لەگەڵ مامۆستا عوسمان محەمەد ئەمین لە تیپی مۆسیقای سلێمانی هاتووچۆیان هەبوو ئۆکۆردیۆنێکی هەبوو یەک دوو گۆرانی دەرئەهێنا، جاران هەر کەس یەک دوو گۆرانی بزانیایە لەباتی ژەنین ئەیانوت دەرهێنان وەک گۆرانی (گەردوون من چی بکەم چیم دەسەڵاتە ...چاو کاڵ خوێن شیرین دڵ موبتەلاتە) لە دوکانی خۆی لە پیرمحەمەد ئەی ژەنی کە دوکانی وێنە گرتنەکەی بەرامبەر دوکانی باوکم بوو، وتم باوکە بۆم بکڕە باوکم وتی بۆت ئەکرم، بەڵام بە قیست بە (٢٠)دینار، بەڵام کاک عوسمان نەیدامێ، ئەو بیست دینارە ئەو کاتە زۆربوو، پێشتر لە ساڵی (١٩٧١) لەگەڵ باوکم کە ئەچوو بۆ سلێمانی منی ئەبرد لەگەڵ خۆی کاتێک شت

وەکی ئەکڕی بۆ دوکانەکەی لە بازاڕی (عەسری)کەمانچەیەکی تەنەکەی بۆ کڕیم بە (١٤ پەنجایی)، ئیتر هەر لە خۆمەوە قەوسم بە کەمانەکەدا دەهێنا، هەر چوار ژێکانی وەک یەک بوون، قەوسێکی نایلۆنی هەبوو، ڕەنگ قاوەیی چۆکێکی لەگەڵ بوو کەتەواو بوو، ئیتر دەنگی نەما بۆم لێنەئەدرا، چی بکەم چی نەکەم !!

لە حەوشەکەمان دار سنەوبەرێک هەبوو جیوەی دەرئەدا تاقیمکردەوە دام لە قەوسی کەمانەکە، کەمان هاتە دەنگ لە خۆشیدا شاگەشکە بووم، ئیتر بە هەر چوار پەنجەم ئەجولاند هیچ دەرنەئەچوو لەهەمووی ناخۆشتر من چەپە بووم.

مستەفا هاوڕێی تەلەبایەتیم بوو لە پۆلی ٣ی سەرەتایی هەردووکمان لە پۆلێک بووین لە قوتابخانەی سیروان پێیان ئەوت (مەکتەبی پەڕۆ) بەرامبەر فولکەی ئێستای عومەری خاوەر، من لە قوتابخانەی ئاشتی بووم، بەڵام ئەو ساڵە قوتابخانەکەمان گواسترابوویەوە بۆ قوتابخانەی سیروان ساڵی (١٩٦٣) کرابوو بە ڕەبایەی جاش، پێیان ئەوتن (فرسان صلاح الدين) کە هەمووی خەڵکی دەوروبەری هەڵەبجە بوون، گوندەکان کە ژیانیان لە خەڵکی شار هەراسان کردبوو خە ریکی شەڕە عەشایەر بوون، هەر ئەو ساڵە مستەفام دی واتە ساڵی (١٩٧٢) وتم ئەو کەمانچەم با حەفتەیەک لا بێت، وتی باشە، بەڵام لە ماڵی قادری خەیاتە لای کاوەی کوڕی و هەر ئەو ئێوارە چووم بۆ لای کاوە ماڵیان بەرامبەر سەرا کۆنەکە بوو، یەکسەر کاوە هاتوو کەمانەکەی دامێ، ئای لەو ساتە خۆشە! کەمانم هێنا بۆ ماڵەوە تا سەعات ١٢ی شەو ئاوێزانی بووم، هیچ گۆرانیم نە ئەزانی، هەر قەوسم پێدا ئەهانی پەنجەشم وەک چۆن کەبابچییەک کەباب دروست ئەکات ئاوا بەکارم دەهێنا، هەر چوار پەنجەم بەکاردەهێنا، ئاخر ناهەقم نەبوو چونکە مامۆستایەک نەبوو هیچ زانیاریەکم بداتێ.

هە ر ساڵی (١٩٧٢) بوو هاوینەکەی چووم بۆ سلێمانی لە ئۆرزدی باک ئۆکۆردیونێکم کڕی بە (٧) دینار، بچوک بوو، هەر دوگمەی سپی لەسەر بوو، من ئەو کاتە لەگەڵ هەندێ برادەرم لە گەڕەکی ماڵی (مامە حەمە)م تیپیکی فوتبۆڵێنمان درووست کردبوو بە ناوی تیپی وەرزشی مەهاباد کە ناوی ئەندامەکانی هەندێکیانم لە یادە (لەتیفی مامە حەمەم، ئەدهەمی مەلا عەلی، ئەحمەدی حەمە عەلی نانەوا، ئەحمەدی قادر، جەمالی شێخ حەسەن) هتد ، ئەو کاتە لە پۆلی چواری گشتی بووم، ئۆکۆردیۆنەکەشم هەبوو، ئیتر شەوان دوای یاری فوتبۆڵێن

کۆئەبوینەوە، نزیک باخی گشتی بەرامبەر شارەوانی. من دوو سێ گۆرانی فێر بووبووم لەوانە (گەردوون من چی بکەم چیم دەسەڵاتە – چاو کاڵ خوێن شیرین دڵ موبتەلاتە) یەک دوو گۆرانی تر. یاریگایەک هەبوو پشت قوتابخانەی ئەحمەد موختار جاف لەوێ یاریمان ئەکرد پێش ئەوە لەپۆلی چوار لەگەڵ قوتابیانی پۆلەکەمان تیپێکمان پێک هێنابوو، ئەو کاتە یاریگاکە نزیک لە گولان بوو، یاریەکی ترمان کردبوو، من گۆڵێکم کرد لە (بورهانی جیهادە فەنی)کە گۆڵچی بوو، هاوڕێکانم ئەو کاتە لە پۆلەکەمان (حەمیدی مەلا خەرامان، سەرکۆ ئەحمەد، ئەفراسیاب ئیبراهیم ، ئەمین حەیدەر، زۆر هانیان دام، ئیتر لە تیپی مەهاباد زۆر یاریمان کرد تا ڕۆژێکیان لەگەڵ تیپی وەرزشی (ناتیق) کە حەکیمی مەلا ساڵح سەرپەرشتی ئەکردن لەپاڵ مندا تۆپەکە هات و بەرزبووەوە ... حەکیم و جەمالی شێخ حەسەن خۆیان هەڵدا بۆ تۆپەکە و هەردووکیان بەرز بوونەوە و سەریان بەر یەکتر کەوت، ئای لەو ساتە وەختە حەکیم زوو هەڵسایەوە بەڵام جەمال نا ...کەوت ئیتر دوای یاری برا بۆ نەخۆشخانە وە هەموومان چووین لەگەڵی، هەر چاک نەبووەوە، نەخۆش کەوتوو، چەندین دکتۆریان برد تا بەغداش بردیان، من لەو ڕووداوەوە زۆر ترسام، ئیتر ببڕای ببڕا هەرگیز توخنی تۆپ نەکەوتمەوە، خەریک بوو حەکیم بدەن بە دادگا، بەڵام باوکیان شێخ حەسەن وتبووی خۆ بەئەنقەست نەبووە، ئەمە قەدەرە...



یادەوەرییەکی وێنەیی
ساڵی ١٩٧٢

گەر تۆزێـک دوور کەومەوە لە مۆزیـک هەر لە ســاڵی (١٩٧٢)زۆرانبــازێکی (مصارع)عێراقی کە لە ئەمریکاوە هاتبووە، زۆر ناوبانگی هەبوو، هەموو عێراقی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردبوو، ئەو زۆرانبازی لەگەڵ زۆرانبازانی جیهانی ئەکرد، چەندین (زۆرانباز)یان میوانداری ئەکرد بۆ ئەوەی زۆرانبازی بکەن.

ئەوی لەبیرم بێت(جۆن لیز) کە بەریتانی بوو،جۆ فرێری کە قەڵەوێکی کەتەبوو، فەرەنســی بــوو) و چەنــدینی تــر ناوەکانیــانم لەبیــر نەمــاوە، زیــاتر بەشــەو تەلەفزیۆنەکان یاریەکانیان پەخش ئەکرد، ئەو کاتە تەلەفزیۆن کەم بوو، ئێمە هەمان بوو، ئیتر ئەو گەڕەکە لە سەر تا خوار بەژن و پیاوو منالەوە ئەهاتن بۆ ماڵمان بۆ بینینی ئەو یارییە کە پێش نمایش کردن تەلەفزیۆن ڕێکلامی بۆ ئەکرد، ئەو کاتانەش تەنها یەک کەناڵ هەبوو ئەویش تەلەفزیۆنی کەرکوک بوو، پێش دەست پێکردنی یارییەکە ڕێکلامەکە پێشەکی مۆسیقای گۆرانی (زی الهوی)ی عبدالحلیم حافظ کە ئەو کاتە باوی بوو کە ساڵی (١٩٧٠) (بەلیغ حەمدی) ئاوازی بۆ دانابوو تەنانەت شەو خەڵکانی لادێکانی نزیک هەڵەبجە و شارەزوور بە سواری جێب ئەهاتن بۆ بینینی ئەو یارییانە، چونکە زۆرسەرنج ڕاکێش بوو، لە چایخانەکان سەیری ئەویارییەیانەیان ئەکرد، هەموو جارێکیش عدنان القیسی ئەو یاریانەی ئەبردەوە، ئیتر حکومەتی ئەو کاتەی بەعس کە ئەو کاتە ئەحمەد حەسەن بەکر سەرۆک کۆمار بوو نازانم بۆ سەرقاڵ کردنی خەڵک هێنابووی یان شتی تر، ئەم یارییانەیان دەبرد بۆ پارێزگاکانی عێراق لە پێشدا بۆ بەسرە، موسڵ، نەجەف، حلە. مانگی شەش بوو تەلەفزیۆن ڕیکلامی کرد کە ئەو یارییانە دەهێنن بۆ سلێمانی، منیش زۆر حەزم لەوە ئەکرد کە عەدنان قەیسی ببینم و پێش ئەوە بە یەک دوو ڕۆژ چووم بۆ سلێمانی بۆ ماڵی پورە فاتمم خوشکی باوکم ئەو کاتە ماڵیان لە ئیبراهیم پاشا بوو، بۆ ڕۆژی نمایشەکە لەگەڵ فاروقی پورم کە(ئێستا دکتۆرە) لە ئیبراهیم پاشاوە تا (مەلعەبەکە)لە گەڕەکی چوارباخ بە پێ ڕۆشتین تا ئەو یارییە ببینین، کە گەشتینە ئەوێ هەرچی پلیکانەکانی بوو پڕ بووبوو لە خەڵک لە گەنج و پیرو منالّ هیچ شوێنێک نەمابوو بۆ دانیشتن، لە ناوەڕاستی یاریگاکە ستێجی زۆرانبازییەکەیان درووست کردبوو(حلبة المصارعة) بەپاڵەپەستۆ لە تەلبەنەکانەوە خۆمان کرد بە ناو یاریگاکە و لەسەر زەوی دانیشتین ویاری

دەستی پێکرد، بیرم دێت جلەکانی عەدنان قەیسی سوورێکی جەرگی بوو، سەیرم لێ دەهات، چونکە لە تەلەفزیۆن ڕەش و سپی بوو وام ئەزانی هەر جلی رەشی لەبەرە، چونکە ئەو کاتە تەلەفزیۆن ڕەش و سپی بوو، وە ئەسمەرێکی کەڵەگەت بوو، لەگەڵ دوو سێ کەسیان یاری کرد لەوانە جۆن لیز و جۆ فرێری و یاری زانێکی تری سورو سپی کەچەڵ بوو. ئیتر هەموو هاواریان ئەکرد عەدنان . عەدنان. ئەوە یەکەمین جارم بوو یاری مصارعة ببینم چێژێکی زۆرم لێدی. ئێوارە هەر بە پێ گەڕاینەوە بۆ ماڵی پورم و چەند ڕۆژێک لە سلێمانی مامەوە لەگەڵ فاروق ئەچووین بۆ سینەما ڕەشیدو سیروان و دڵشاد کە ئەو کاتە باوی فلیمەکانی (ماجستی، هەرقل، تەڕەزان) واتە فلیمی عەسابە بوو دوای ئەوە گەڕامەوە بۆ هەڵەبجە.



## دامەزراندنی تیپی مۆزیکی هەڵەبجە

زستانی ساڵی (١٩٧٣) لە پۆلی پێنجەمی ئامادەیی بەشی وێژەیی بووم، ئەو کاتە حسێن عبدالکریم برای مەلاباقی لە قوتابیان بوو..مستەفای کەمال خەفاف لە مامۆستا ناسری حاجی تۆفیق کەمانێکی لێکڕیبوو بە پارەی مەلاریا، مانگی بە دینارێک قیست، ئەو کاتە هاوینان تەلەبە یان چەند تەلەبەیەک خۆیان ناونووس ئەکرد بۆ ماوەی چەند مانگێک ئەچوون بۆ لادێکان دەرمانی دژی مەلاریا کە نەخۆشی لەرزو تابوو دەڕژاند، کە تەواو دەبوون موچەیەکیان دەدانێ.

ئیبراهیمی حەمە سەعیدی حەمە ئەمینی حەلاو، تۆزیک شمشاڵی ئەزانی، تەپڵێکیشیان بۆ من پەیدا کرد، من ومستەفا و ئیبراهیم پێکەوە چەند گۆرانییەکمان لە گۆڕەپانی سانەوی کوڕان ژەند، مستەفا، گۆرانی ئامینێ نازەنینێی دەزانی بژەنێ، هێندەی لێدابوو لەماڵەوە کەمال خەفافی باوکی بێزار کردبوو هەزار جوێنی بە هەرچی ئامین ونازەنین ناوێک دابوو، ئەم باسە ئومێد دواتر بۆی گێرامەوە، لەوێدا ئەوە یەکەمینجار بوو من ئیقاع بژەنم، چونکە خۆم حەز لەناخم هەبوو، جارجار بە قووتوی شەکرو چا پرۆڤەم دەکرد، کە تەپڵەکەم گرت بە دەستمەوە دوای یەک دوو جار پرۆڤە لە گەڵیان ڕاهاتم .. ئیتر مستەفا زانی کە من توانام هەیە، هێندەی نەبرد ڕێک لە ڕێکەوتی ١٩٧٣/٤/٢٥ ئێوارەیەکی هەور بوو، ئەو عەسرە نمایشی وەرزشی قوتابخانەکان دەکرا لە پشت قوتابخانەی ئەحمەد موختارجافی ئێستا، گۆڕەپانی یاری بوو، لەوێ دەگەڕامەوە لە کانی قوڵکە بەرامبەر بارەگای پارتی کە ئەو کاتە شێخ سەعید موفتی بەرپرسی بوو، ئومێدی نوری حەمەی نانەوا و موستەفا لەسەر کورسییەکی تەختە بەرامبەر بارەگاکە دانیشتبوون، مستەفا منی بانگ کردو وتی ئازاد ئەمانەوێت تیپێکی مۆسیقا دروستبکەین، سبەی وەرە پێکەوە کۆدەبینەوە، من ئومێدم نەئەناسی، چونکە پێنج ساڵێک لە من گەورەتربوو، ئەو ئۆکۆردیۆنەی کە من ویستم بیکرم، جەمالی مەلا قادر پارەی دابوو بە قەرز بە ئومێد لە عوسمانی ڕەسامی کڕیبوو، منیش ئامێرم نەبوو، بۆ ڕۆژی دوایی شوێنمان نەبوو، مستەفا، ئومێد، من. ئەوان بە حیکمەتی

حـاجی تۆفیقیشـیان وتبـوو تـۆزێ شمشـاڵی ئەزانـی، منـیش دراوسـێیەکمان بـە حەســەن ڕەشــید قەســابم وت ئەویــش حەزی لێبــوو، ئــازادی مــەحمــودی سەڕاجیشـمان لەگەڵ بـوو، چـووین بـۆ نزیـک حەمەوغـان لە ژێـر سـێبەری دار تووییەک دانیشتین، پێکەوە سەعاتێک زیـاتر لەوێ بووین، دوایی چووین لە سـەر ئاشەکەی شێخ وەلی لە گوڵان دانیشتین، من ئەوە یەکەمین جارم بوو گوڵان ببینم سـەیرم لەم هـەمـوو بـاخ وباخـاتە ئەهـات، هـەر ئەوەنـدە بـووین، لە ڕێگـای کـانییە کوێرە بووین، ئومێد وتی ڕۆژێک ئەبێت ئەڵێن ئێمە یەکەمـین تیپـی مۆزیکمـان لە هەڵەبجە دامەزراندووە !! ئیتر جار جار پێکەوە ئەچووینە ئـەم قوتابخـانە یـان ئەو ژوور، خۆمـان بە مۆسـیقاوە خەریـک ئـەکـرد چـوارپێنج کەس بـووین، چـونکە حەسەن ئامێری نەبوو ئیتر ئەو دابڕا تـا سـاڵانی (١٩٧٧) مـاوەیەک هـاتەوە دوایـی وازی هێنا، پاشـان حەمەی ئـەحمـەدی مسـگەریش لەگەڵمـان بـوو کە فەرمـانبەری فەرمانگەی کشتوکاڵ بوو زۆر لە ئێمە گەورەتربوو دوایی وازی هێنا، ئیتـر تـا ئەو کاتە کە شوێنمان نەبوو لە هاوینەکەی لە بارەگای یەکێتی قوتابیان کۆ ئەبووینەوە لە پاڵ ماڵی سەعید خەڵەف، ئەو کاتە کاک محەمەدی غەفور شـەریف لێپرسراوی قوتابیـان بـوو، ئیتـر لەوێ پرۆڤـەمـان ئەکـرد وتیپەکەمـان ناونـا (تیپـی مۆسـیقای هەڵەبجە)و چەند کـەسـێکی تـر هـاتن لەوانە حیکمەتـی حـاجی تۆفیـق بـۆ شمشـاڵ، فوئادی حەمەی مەحمود ئەفەندی قوتابی پیشەسازی بوو لە سلێمانی هاتەوە ئەو مامۆستا ئەنوەر قەرەداغی خاڵی بوو لە زانکۆی سلێمانی بوو کەمـانێکی ئـەڵمـانی ڕۆژهەڵاتی خستە ئەستۆی و٣ ژێی پێوە بوو ناچـار ژێـی صـۆل بە پەتـی تـەزبیح بۆمـان قـایم بەسـت، منیش دایکم یەک لیرەی ڕەشـادی بـۆ فرۆشـتم بە(٥) دینـار باوکیشم (٥)دیناری تری دامێ بـوو بە (١٠)دینـار ئیتـردوای ئەوە کە پـارەکەم پـێ بـوو بـۆ کەمـان ئەگەڕام مـانگی ٥ی هەمـان سـاڵبوو، حەمەی ئەحمـەدی مسـگەر کەمانێکی چیکۆسلۆفاکی لەگەڵ ئۆکۆردیۆنێک هەبوو، نیوەڕۆیەکی هاوین بوو من و ئومێد چووین بۆ ماڵی کاک محەمەد و هاتە دەرەوە سەودای کەمانەکەمان کـرد بە(١٠) دینار پێی فرۆشتم، کەمـانچەیەکی چیکۆسـلۆفاکی ڕەش بـوو زۆر دڵـم پـێ خۆش بوو، ئیتر دوای ئەوە هەندێ ئەنـدامی تـر هـاتن بـۆ لامـان وەک مـۆزیکژەن : شـازادی شـێخ کەریـم کە پـێکەوە لە پۆلێـک بـووین، عەزیـزی مسـتەفا بەگ کە خوێنـدکار بوولەئامـادەیی کشـتوکاڵی بەکرەجـۆ، سـەروەتی حـەمە کـەریـم

کوردستانی ماوەیەک هات بەڵام بەشدار نەبوو لە چالاکی، دواتریش وەک گۆرانی بێژ : سەرکۆی ئەحمەدە فەنی، سیروانی عەلی ڕەزا هاواری، بورهان عبدالرحمن چاوەش، سەربەستی رەئوف تەوێڵەیی، بەختیاری وەستا هاشم، دوایش هەندێک کۆرس هاتن کە ناوەکانیان لە وێنەکان ئاماژەی پێدەدەین .

سەیر لەوەدا بوو کە ئێمە ئەمانویست ناوی تیپی مۆسیقای هەڵەبجە بێت بە ناونیشان، قوتابیانیش ئەیانوت ئەبێت ناوی قوتابیانی لەسەر بێت، ناچار بووین کە بە وردی لێی بنووسین، نەوزادی حاجی ئەمین خۆی خۆشنووس بوو پێکەوە لە یەک پۆل بووین ئەو تابلۆکەی بۆ نووسین، ئەم وێنەیە یەکەمین وێنەی ئەو تیپەیە کە لە مانگی ٦ی ئەوساڵە بە کامێرای سەروەتی حاجی حەمە کەریم کوردسانی گیراوە.




لەڕاستەوە مۆزیک ژەنەکان: عەزیز بابان، سەروەت حەمە کەریم، ئومێد نوری، فوئاد محەمەد مەحمود، ئازاد ساڵح

ئەوەی بە پێوە کەمان دەژەنێ: مستەفا کەمال

کۆرسەکان: ئەسکەندەر حەمە فەرەج کوێخا، خەلەف سەعید خەلەف، نەوزادحاجی ئەمین، سەرکەوت

## هەڵبژاردنی سەرۆکی تیپی مۆسیقای هەڵەبجە

ئیتر ئێمە بە درێژایی ئەو چەند مانگە پرۆڤەمان کرد، هیچ کاممان نۆتەی مۆزیکمان نەدەزانی مستەفا ناوی ژێکانی کەمانی دەزانی نازانم لە کوێوە فێرببوو؟، هەروەها شوێنی پەنجەکانیش، وەک وتم لە بارەگای یەکێتی قوتابیان پرۆڤەمان ئەکرد، من و فوئاد و مستەفا ئامێری کەمان و حکمەتیش شمشاڵ، شازادی شێخ کەریم نەقشبەندی بۆ ئیقاع، بەڵام ئامێری تەپڵمان نەبوو، ناچار سەرکۆی ئەحمەد ئەفەندی چوو بۆ سلێمانی تەپڵێکی شەربەی بۆ کڕین، بە پارەی خۆمان یەکی سێ پەنجاییمان دا.

لەو کاتی پرۆڤەدا مامۆستا ماسری حاجی تۆفیق سەردانی کردین کەمانی دەزانی بیرم دێت گۆرانی بەلەنجەی دەژەنی، من بە دەستی چەپ کەمانەکەم دەگرت وتی نابێت گەر بە دەستی چەپ بیژەنیت کەوانەکە ئەچێت بە چاوی هاوڕێکەی ترت، ئەوە بۆ من ئاسان نەبوو کە لە دەستی چەپەوە قەوسەکە بە دەستی ڕاست بگرم، بەڵام ناچار بووم خۆم بکەم بەڕاستە، دوای ئەو مامۆستا عوسمان محەمەد ئەمین کە لە تیپی مۆسیقای سلێمانی بوو وە خزمی ماڵی عوسمانی ڕەسام بوو هات بۆ لامان بۆ یەک ڕۆژ باسی نۆتەی کرد بۆمان ، من پرسیم مامۆستا بۆچی کەمان چوار تەلە و پێنج هێڵی مۆزیک هەیە؟ وتی دوایی ئەزانیت، دوای ئەوە چەند گۆرانییەکی ژەند وەک سۆیلە باڵا بەرز، وتی ئەم گۆرانییە چارەکە تۆنی تێدایە، هەر نەشم ئەزانی چارەکە تۆن چییە تا دوایی، ئیتر من بە شەو و ڕۆژ کەمانم بە دەستەوەبوو، تا ڕاهاتم بە گوێ چەند گۆرانییەک فێربووین، پاشان هاتنە سەر دەست نیشان کردنی کەسێک بۆ سەرۆک تیپ من لە هەموویان منداڵ تربووم کێبڕکێ لە نێوان ئومێدو مستەفا زۆر بوو، یەکێتی قوتابیان مستەفایان تەزکیە کرد ئەو کاتەش حزبایەتی بوو، من هە ر گاڵتەم لێ ئەهات، بۆیە لە وێنەکەدا مستەفا بە پێوەیە وەک سەرۆک تیپ خۆی نمایش کردووە، پاشان قوتابیان ویستیان ئاهەنگیک بگێڕن، ئیتر کەسانێک کە حەزیان لە گۆرانی بوو سەردانیان ئەکردین، لەو لاشەوە محەمەدی غەفور شەریف کە

لێپرسراوی قوتابیان بوو، شانۆگەرییەکی نیشتمانیی نووسیبوو بە ناوی (وزەی بیر و بازوو) لە هۆڵی سانەوی کوڕان جەمالی مەلا قادر دەرهێنەری بوو لەگەڵ شانۆگەرییەکی کۆمیدی ناوکەییم لە بیر نەماوە، دوای ئەوە سەباحی ئەحمەد ئەفەندی برا گەورەی سەرکۆ، چوو بۆ سلێمانی بلیتی چاپ کرد، بلیتی بە(٢٥٠)فلس، ئیتر خۆمان ئامادە کرد بۆ نمایش کردن، ئامێری دەنگ هەر ئەمپریفایەری مزگەوت بوو، فوئادی حەمەی مەحمود ئەفەندی لە ئامادەیی پیشەسازی بوو بەشی کارەبا، چەند مایکێکی بە موکەبەرەی رادیۆ دروست کرد، لای ئاسنگەریش بە لەحیم چەند ستاندێک بۆ مایکمان دروستکرد، هەندێ خوێدانیش هەبوو لە شێوازی هێلکە، مایکەکانیشی خستە ناویان، سێ چوارێکی دروستکرد، بۆ کەمان و شمشاڵ، ئۆکۆردیۆنەکەی ئومێد دەنگی بەرز بوو پێویستی پێی نەبوو، گۆرانی بێژ مایکی سەرەکی جهازەکە بوو، تەپڵ و دەفیش پێوستی نەبوو، ئیتر چەند شەوێک لە هۆڵی سانەوی کوڕان جەنەڕال پرۆڤەمان کرد شەوێکیان جەمالی مەلا قادر لە یانەی فەرمانبەرانەوە عوسمان چێواری لەگەڵ بوو هاتن بۆ لامان زۆر هانیاندادین، شەوێکیش مامۆستا حەمە فەرەج ئەحمەد حەمە مراد هات، ئەویش زۆر هانی داین ، کاتی نمایش نزیک بووەوە ، شەوێک پێش ئەوە مستەفا هێندە ورد بوو بە بۆیاخی ڕەش شوێنی ئەو کورسییانەی دیاری کردبوو کە لە سەر شانۆکە لە سەری ئەمان ویست دانیشین، بۆشەوی ١٩٧٣/٧/١٤ یەکەمین نمایشمان ئەنجام دا بۆ ماوەی ٥ شەو بەم شێوەی خوارەوە کە کاتی خۆی بە وردی نووسیومەتەوە:

| مۆزیک ژەن | ئامێر |
|---|---|
| ئازاد سالح | کەمان |
| فوئاد محەمەد مەحمود | کەمان |
| مستەفا کەمال خەفاف | کەمان |
| ئومێد نوری | ئۆکۆردیۆن |
| حیکمەت تۆفیق | شمشاڵ |
| عزیز بابان | دەف زنجار |
| شازاد نەقشبەندی | ئیقاع |

| ئاواز | ناوی گۆرانی | گۆرانی بێژ |
| --- | --- | --- |
| ئومێد نوری | سروودی کوردسان | کۆرس |
| فۆلکلۆر | هەلامە | سەرکۆ ئەحمەد شیرین |
| ئاوازێکی میسری بوو | مەمکوژە بە ناز | سەرکۆ ئەحمەد شیرین |
| حەسەن زیرەک | جوانی لای بانە | هۆشیار ئامەی زەریف |
| عەلی مەردان | ڕاستەی خیابان | بەختیار هاشم |
| حەسەن زیرەک | لایە لایەت بۆ ئەکەم | بورهان عبدالرحمن بارچاوەش |
| سیروان | ڕەفیقان | سیروان عەلی ڕەزا |
| فۆلکلۆر | بەلەنجە گیان | سەربەست رەئوف تەوێڵەیی |

کۆرسەکان : بەختیار محەمەد مەحمود، ئیبراهیم شێخ ساحب، کامەران کەمال خەفاف، واحید مەلا ئەحمەد خەرامان، سەرکەوت ئەحمەد مەحمود

**یەکەم ئاهەنگمان پێنج رۆژ بەردەوام بوو**

پاش ئەوەی کە بۆماوەی (٥) ڕۆژ ئەو ئاهەنگەمان گێڕا، لەگەڵ شانۆگەرییەکە کە هەندێ ئەکتەر بەشداریان تێدا کرد لەوانە (نەژاد شێخ عارف، غازی مەلا عەلی، ئەکرەم محەمەد، سەعدی نەقشبەندی، عەبدولی حسەینی نانەوا) چەندینی تر کە ناویانم لە بیر نەماوە.

لەبەرواری ١٩٧٣/٧/٢٠بە پیکابێکی (شۆفرلێت)کە خاوەنەکەی ناوی عەلی بوو برا گەورەی (زیوول) بوو، چووین بۆ تەوێڵە، لە قوتابخانەی ناوەندی تەوێڵە، دوو شەو لە ناو گۆرەپانەکەی، نمایشمان کرد، ئێمە نێوان دوو پایەمان کردبوو بە شانۆ و پەردەمان بۆ دروستکردبوو، یەکەم شەو شازاد لەبەر ئەوەی لە شێخانی نەقشبەندی بوو بۆ ئەوەی کەس وکاری لە تەوێڵە نەزانن کەئیقاع لێدەدات بەشدار نەبوو، من لە جیاتی ئەو ئیقاعم دەژەند چونکە پێشتر خۆڕسکانە دەمزانی بیژەنم، وە پیاوێک بە ناوی عەلی کە شۆفێر بوو، برای حسەشا، بەشدار بوو لەگەڵمان گۆرانی (داد هە ی دادە هەی ڕۆ ڕۆ)ی وت، کوڕێکیش هەبوو ناوی ناسر بوو

پرۆڤەی کرد لە گەڵمان، بۆ نیوەڕۆکەی فەتاح ئاغا کە لێپرسراوی هێزی خەبات بوو لە قوتابخانەکە داوەتی نیوەڕۆی کردین.

بۆ شەوی دووەم شازاد شێخ کەریم بەشداربوو، بەڵام لە پشت پەردەکەوە ئیقاعی دەژەند بۆ ئەوەی نەبینرێت، ئەم ئاهەنگانە بۆ ژن و پیاو بوو پێکەوە.

بۆ ڕۆژی دووهەم لەگەڵ سەعدی نەقشبەندی چووین بۆ باخێک چەقۆیەکم کڕیبوو فە ریکەگوێزم لەت دەکرد، نەمزانی چەقۆکەم کرد بە ناو لەپی دەستی خۆمدا تا ئێستاش شوێنەوارەکەی دیارە، ئەوەیەکەمجار بوو من لە ماڵەوە دوور بکەومەوە.

شەوی دووهەم کە تەواو بوو، چوومەوە بۆ هەڵەبجە، بۆ ڕۆژی دوایی گەڕامەوە بۆ خورماڵ کەئەوانیش هاتبوون، شەوێکیش لەقوتابخانەکەی نزیک ناو بازاڕی خورماڵ نمایشمان کرد، وە جەباری حاجی کەرەم خان پێی وابوو دەنگی خۆشە هاواری نوری حەلاو ناردبووی بۆ لامان لەگەڵمان گۆرانی (هەلاڵە وزەمزەمەی)ی حەسەن زیرەکی گووت.

بۆ شەوی دواتر چووین بۆ پێنجوێن، ڕێگاکەی قیرتاو نەکرابوو جادەکەی زۆر سەختبوو هەموو گیانمان بوو بە تۆزو خۆڵ، دوو شەویش لەوێ بووین لە قوتابخانەکەی پێنجوین زۆر دڵگیر بوو، فوئادی حەمەی مەحمود ئەفەندی کە لە پیشەسازی بوو هاوڕێیەکی پێنجوێنی لەگەڵی قوتابی بوو ناوی محەمەد بوو بردینی بۆ(بلکیان)باخ وباخاتێکی زۆردڵگیر بوو، یەکەمجار بوو بیبینم، لە پێنجوێن خواردن هەرزانتربوو، دوو چا بە پێنج فلس بوو، لای خۆمان یەک چا بە پێنج فلس بوو، دوای ئەوە هاتینەوە .

### ئاهەنگی دووەمی تیپی مۆسیقای هەڵەبجە

لە مانگی هەشت لە ١٦ی ئابی هەمان ساڵ (١٩٧٣) لە گۆڕەپانی دواوەی سانەوی کوڕان، ئاهەنگێکی ترمان کرد بەبۆنەی دامەزراندنی (پ.د.ک) ئەو کاتەش بۆ بۆنە حیزبییەکان ئێمەیان بەکار دەهێنا، هەرزەکار بووم گوێم لەو شتانە نەبوو، چەند سرودێکمان پێشکەشکرد بۆ یەکەمجار عومەری خەزان گۆرانییەکی وت

زیاتر مەقامی همایۆنی ئەوت: (مانگی کورد لە ئاسمان دەرکە)ی وت، بەم شیعرە دەستی پێ دەکرد، لەوکاتە کوڕێکی خۆش مەشرەب پەیمانی حسەینە ئەفەندی کە خەڵکی سلێمانی بوون باوکی لە شارەوانی فەرمانبەر بوو بەشدار بوو لە گەڵمان حەزی لە ئیقاع بوو نەمان بوو نازانم (صنج)ێکیان پەیدا کردبوو کە ئامێرێکە وەک ساج وایە دوودانەن دەیکێشن بەیەکدا دەنگی دێت، زیاتر لە مۆزیکی سەربازی و کەشافەی قوتابخانەکان بەکاردێت، ئەوەی لە بیرمە لە کاتی نمایشەکە کورسی بۆ فوئاد نەمابوو لەسەری دانیشێت لە پاڵ مندا ڕاوەستابوو، باڵا بەرز بوو کە قاچی لەگەڵ ئیقاعەکە دەدا بەزەویدا هەموو گیانی منی کردبوو بە تەپوتۆز.

ئیتر هەر لە یادەوەری حزبی بەشداربییان پێ دەکردین لە (١١/٩/ ١٩٧٣) بەردەرگای لاوان بە بۆنەی ١١ی ئەیلولەوە یادی دەست پێکردنی شۆڕشی ئەیلولی ساڵی (١٩٦١) بەرامبەر ئۆرزدی جاران ئاهەنگێکیترمان سازکرد لەوێدا مستەفای کەمال خەفاف گۆرانییەکی حەسەن زیرەکی وت (کەویار)، لای خەڵک خۆشبوو، دوای ئەوە تەواوبووین چووین بۆ چایخانەی ئەوڕەحمان (خاڵە)دەست خۆشی لێکردو وتی بەخوا مستەفا مەقامەکەیت خۆش وت، جاران کە ئاهەنگێک دەکرا خەڵک و خوا هەمووی کۆ دەبوونەوە و چێژی هونەری سەرنجڕاکێش بوو.

مستەفا و خاڵە سوعبەتیان هەبوو، منیشیان فێری چایخانە کرد تا ئەو کاتە نە ئەچوومە چایخانە، جار جاریش من و فوئادو مستەفا دەمە وعەسر لای غەفوری سەموونچی سێ چوار سەموونی گەرممان دەکڕی و بەچای گەرمەوە دەمانخوارد.

من و مستەفا و فوئاد و چەند برادەرێکی تر زۆر ڕۆژ پێکەوە بووین، تەنانەت ڕۆژێکیان وتمان با سەیرانێک بکەین لە باخەکەی شێخ وەلی لە گوڵان، کانییەکی لەخوارەوە تێدابوو مانگی ئابی (١٩٧٣) بوو، من و مستەفاو فوئادو یاسین مەحمود و ئیبراهیمی عەلی میرزا تۆفیق کە هاوڕێی من و دراوسێی فوئاد بوو، چووین بۆ سەیران لەو باخەدا وە کەمانیشمان بردبوو وە سەیرانێکمان پێکەوە کرد، ئەو وێنانەش لای کاک ئیبراهیمی عەلی میرزا تۆفیق بوون کە بە سوپاسەوە بۆی ناردم و بڵاوی ئەکەمەوە.



**شوێن: هەڵەبجە، گوڵان، لە ڕاستەوە: ئیبراهیم عەلی میزا تۆفیق، ئازاد ساڵح. ساڵی ١٩٧٣**



## بەزۆر کردیانم بەسەرۆکی تیپی مۆسیقای هەڵەبجە

پاش ئەوەی ئەندامان لە قوتابیان نەماین ئیتر ماوەیەک شوێنمان نەبوو، ئومێد بە حوکمی ئەوەی پاسەوانی سنوور بوو لە بارەگای پارتی دەوامی ئەکرد، لەکانی قوڵکە خانوویەک هەبوو لە دوو بەش پێکهاتبوو بەشی ژێرەوەی ژێر زەمینێکی هەبوو دیوارەکانی بەرد بوون وەک کەڵەک لەسەر یەک ڕیز کرابوون زۆر کۆن و ناخۆش بوو وەک تەویلە وابوو پڕ بوو لە کێچ، ماوەیەک لەوبارەگایە بووین دوایی چووینە بینای لاوانماڵێک بوو بە شێوازی ڕۆژهەڵاتی دروست کرابوو بەڵام کۆنکرێت بوو، لەو کاتەدا وابزانم قادری سۆفی سەعید یان فەرەجی حەمە ساڵح، لێپرسراوی لاوان بوون، ئەمە سەرەتای ساڵی (١٩٧٤) بوو، ئیتر ئومێدو مستەفا ڕکابەر بوون لە سەر ئەوەی کامیان ببنە لێپرسراو ..من هەرگیز لەو بیرکردنەوانەدا نەبووم هەر هەستم پێ نەدەکرد ئێوارەیەکیان دەمویست بچم بۆ دوکانی باوکم لە پیرمحەمەد لای ماڵی حاجی عیزەتی خاڵی باوکم کە خانوویەکی دوو قات بوو بەرامبەر کۆڵانی هەورامییەکان، ئومێدو مستەفام دی، هاتن بۆ لام وابزانم کەسیان قبوڵی ئەوی تریانی نەکردبوو، ئومێد وتی هەردووکمان گەیشتوینەتە ئەو بیرۆکەیەی کە تۆ بکەینە لێپرسراوی تیپەکە، من هەرئەو شتانەم لە خەیاڵ نەبوو لە هەمووشیان منداڵتر بووم، بە تۆپزی سەپاندیان بەسەرمدا، هیچم لە ئیدارە نەدەزانی، مەبەستی من بەس مۆزیک بوو، دوای ئەوە وتیان خۆمان ئامادە ئەکەین بۆ یادی قوتابیان لە مانگی (٢)ئیتر لە لاوان کەوتینە پرۆڤە کردن، لەو کاتانە حیکمەت لە دار المعلمین لە دهۆک وەرگیرابوو لەگەڵ مامۆستا جەمال محەمەد ناسراو بە جەمالی حەمە ڕێوی و حەمەی سەید قادر، فوئادیش لە پیشەسازی سلێمانی بوو لە دەوام بوو، کاتی هاوین پەیمانمان لەگەڵ بوو، بووە ئیقاع ژەن، کوڕێکی ڕۆح سووک بوو، دوایش کاوەی قادری خەیات هات کەمێک شمشاڵی دەزانی دەستمان کرد بە پرۆڤە، ئومێد شیعرێک و ئاوازێکی سروود ئامێزی دانا تا ئێستاش ئاوازەکەیم لەبەرە بەم هۆنراوە دەستی پێ دەکرد (پارتی پێشرەوی گەلە/ هەڵقولاوە لەم گەلە/بە پشتیوانی سوپا/ نانەوێ قەت ئەم گەلە)هتد، مستەفاش پارچە مۆزیکێکی دانا بەناوی(شنروێ) منیش لە منداڵیەوە هۆگری شمشاڵەکەی مینە ببوم لە

کتێبخـانەکەی عـومەری کـاکی کە بەرامـبەر دوکـانی بـاوکم بـوو ڕۆژنـامەی ژینم دەکڕی .شیعرێکی(لەتیف شێخ عارف) ناوێک سەرنجی ڕاکێشام کردم بە ئاوازێک کە سوودم لە هـەندێ لـەمیلۆدییەکانی شمشـاڵەکەی مینە وەرگـرت، کۆرسـەکان وتیان، لەو کاتەدا کامەرانی ئەحمەدی کارەباش هاتە لامان بوو بە کۆرس و عەلی سەعید جەواهر بۆ دەنگی حەسەن زیرەک باشبوو، ئازادی مەحمودی سەڕاجیش چ وەک گۆرانی چ وەک دەف بەشداری کرد، حەمە سەعید برای مـەجید حـەسـەن زیرەک، کەمال محەمەد ئەمین وهەندێکی تر .

پێشکەشکاری ئاهەنگەکە دوو کەس بـوون شـێخ عە لـی : (خولـە کەشـکۆڵ) و مامۆسـتا حەمە سـەعید ، نـازانم لـە کـاتی پێشـکەش کردنـدا بـوو بە دەمەقاڵەیـان، نازانم لە سەر چی بوو ڕۆژێ ١٩٧٤/٢/١٨واتە یادی دامەزراندنی یەکێتی قوتابیان نمایشـەکە دەسـتی پێکـرد، چەنـد گـۆرانییەکی تێـدا بـوو، لەوانە گـۆرانی خـاڵەی ڕێبوار: ئازاد سەڕاج و عەلی جەواهیر و سیروان کاکەیی دەیان گووت هەر کەسە و پـارچە یەک، بیـرم دێت کە خولـە کەشـکۆڵ پێشکەشـی کـردن و وتـی ئێسـتاش لـەگەڵ جەواهیـری و کـاکەیی و سـەڕاج گـۆرانی خـاڵەی ڕێبوارتـان پێشـکەش ئەکرێت، ئەوەی شایانی باسە دوو سێ ڕۆژ پێش کاتێ نمایش پێستی تەپڵەکەمان تەقی، دەی کێ بەردووگی تێبگرێت؟، مستەفا عـەلی، گەوهەر نـاوێکی ئەناسـی کە کرێکاربوو، دنیا باران بوو زۆر سـارد بـوو، عـەلی لـە چایخـانەکەی بـاقی چـایچی دادەنیشت پاڵ نـانەواکەی عـەلی حـاجی حـەمە شـەریف دوکـانێکی دوورو درێژ، عـەسـرێک بـوو عـەلـیش چـاوێکی کـوێر بـوو جـگەرەی زەلـی یەک لـەسـەر یەک دائەگیرسان، سۆپای دار گیڤەی دەهات نزیکەی دەخولەک لـەوێ بـووین گیانمـان ببوو بە ئارەقی شین و مۆر، وەعدی داینێ بۆمان تێگرێت، بۆ سبەی چووینە ماڵی عەلی لەگەڕەکی جوولەکان لە خانوویەکی گڵی دوقاتی کۆن لـە ژورێکدا دەژیـا لە قاتی سەرەوە تەنها خۆی بوو، ڕەبەن بوو، واتە ژنی نەبوو، تەپڵ نیوە وشک نیوە تەڕ، ئەو ئێوارە بەهەر حاڵ بردمانەوە، پەیمـان عەلادینێکی لـە پـاڵ خـۆی دانـابوو زوو زوو گەرمـی دەکـردەوە، بـۆ مـاوەی ١٠شـەو بەردەوام نمایشـمان کـرد، بـۆ پیاوان و ژنان، شەو دوای شەو خەڵک زیاتر دەهات، ئیتر ئێمە چەندین دیاریمـان پێشکەشکرا، کراس، پاندان ،جل، من ست هەتاوی حەمە سەعید فەنی کە ئـامۆزای دایکمـە، پاندانێکی شیڤەرزی پێشکەشکردم، قـادری سۆفی سـەعید کراسێک، لـە

ناوەڕاستی شەوانی ئاهەنگەکە دوو کچی لاوی ئەو کاتە (ئاوازی جەمالی ئەمین عەلی و ڤیانی حەمە پایدەر) بۆ یەکەمین جارگۆرانییان لەگەڵ وتین بە ناوی (هەی کوێستانی خۆشە گەرمێن)، تیپی نواندنی هەڵەبجە شانۆیی (لە ڕێی وڵات)ی پێشکەش کرد، لە دەرهێنانی جەمال مەلا قادر، نازانم کێ نووسیبووی ئەمەش ئەو بەرهەمانەیە کە پێشکەشمان کرد.

| ناوی گۆرانی بێژ | ناوی گۆرانی | ئاواز |
|---|---|---|
| کۆرس | سروودی پێشڕەوی گەل | ئومێد نوری |
| ئازاد مەحمود سەراج<br>عەلی سەعید جەواهیر<br>سیروان کاکەیی | خاڵەی ڕێبوار<br>ئەم گۆرانییە بە سێ قۆڵی وتراوە | فۆلکلۆر |
| مستەفا کەمال | پارچە مۆسیقای شنروێ | مستەفا کەمال خەفاف |
| عومەر خەزان | مەقامی هەمایۆن وگۆرانی کەتانە | فۆلکلۆر |
| کۆرس | هیوای ژیان | ئازاد سالح |
| ئاوازجەمال<br>ڤیان محەمەد | ئەی کوێستان خۆشە گەرمیان | فۆلکلۆر<br>فوئاد ئەحمەد |
| کۆرس | تابلۆی دەمەو بەیانە | ئەحمەد دەنگ گەورە |

شیعری ئاوازی (دەمەوبەیان) دوایی من لە ڕۆژنامەی ڕزگاری لە کتێخانەی گشتی خوێندمەوە کە شیعری (فەتاح کاوە) بوو، ئومێد ئەم ئاوازەی هێنا کە کاتی خۆی لە سلێمانی پرۆڤەیان لەسەر کردبوو بەم شێوازە ماوەی ١٠ شەو نمایشکرا.

من ئەوکاتە لە پۆلی شەشی ئامادەیی بووم خوێندنم هەبوو، ئەمویست نەڕۆم بۆ نمایشەکە، ڕۆژێکیان دانم کێشابوو کردم بە بیانوو نەڕۆم، هەر هەموو هاتن بۆ ماڵەوە، بیرم دێت کۆڵانەکە قوڕو چلپاو بوو وازیان نەهێنا بە زۆر بردیانم بۆ نمایشەکە. مستەفا وتی با ئەمجارە قات لەبەربکەین، هەموو وامان کرد هەر کەسە و قاتی خۆی هەبوو.

دوای ئەو دە ڕۆژە لە نمایش لەساڵی (١٩٧٤) لە هۆڵی سانەوی کچان، چونکە یەکەمین ساڵ بوو قوتابخانەی سانەوی کوڕان چوونە بینایەکی نوێ کە ئێستا پێی دەڵێن سانەوی ئەحمەد موختارجاف بەڕێوەبەرەکەمان شێخ ساحێب بوو.




**لە ڕاستەوە : پەیمان حسین ، ئازاد مەحمود سەڕاج ، کاوەقادر، ئومێد نوری، مستەفا کەمال، من لە پاڵ مستەفادا بووم لەوێنەکەدا دەرنەچووم**

**گۆرانی بێژەکان : کەمال محەمەد ئەمین، عەلی سەعید، سیروان عەلی، حەمە سەعید**

**کۆرسەکان : ڕزگار عبدالله، سۆران حسەین، بەختیار محەمەد مەحمود، ئەسکەندەر حەمە فەرەج، کامەران ئەحمەد**

کاتێ کە لە پۆلی شەشی ئامادەیی بووم هاوپۆلەکانم: سەرکۆ، ئەفراسیاب، شازاد، حەمە ساڵح بیارەیی بوو، چیرۆکێکم هەیە لەگەڵی ساڵی (١٩٧٣) هەندێ ئێوارە کەمانەکەم لەگەڵ خۆم ئەبرد بۆ دەشت کاتی سە عیکردن دوای بانگ بوو لە گەڕەکی لای مزگەوتی شافعی هەمووی دەشت بوو، کەمانەکەم پێبوو، حەمە ساڵح لە نوێژی ئێوارە هاتبووە دەرەوە لە مزگەوت منی دی وتی چۆنیت وتم سوپاس کەمانە کەی منی دی وتی چەندت کوشتووە وتم چی؟ وتی چەند(کەو)ت کوشتووە ؟ وتم بۆ؟ وتی ئەی ئەوە تاپڕ نییە بە دەستەوە؟ وتم ئەوە کەمانچەیە، وتی وەڵا وامزانی تاپڕت پێیە !! کەسی واش هەبوو، بەڵێ وا فێر کرابوون مۆزیک بڤەیە .

دوای ئەم ئاهەنگە ئیتر دەنگۆی شەڕو ڕێک نەکەوتنی پارتی و بەعس هێدی هێدی بڵاوبووەوە، دنیا بۆنی شەڕی لێدەهات، ئیتر بە سەدان خەڵک ڕوویان کردە هەڵەبجە وقەڵادزێ، هاتنە پاڵ شۆرشی کورد، لە هەڵەبجە ئامادەیی بازرگانییان

کردەوە لە قەڵادزێ زانکۆی سلێمانی، ئیتر هەر ماڵە و چەند کەسێکیان دابەش دەکرد بە سەریاندا بۆ نان خواردن و شەومانەوە، هەر لە سلێمانی، خانەقین، بەغداد، هاتبون پە یوەندیان کرد بە ڕیزی شۆرشە، زۆری نەبرد لە ١٩٧٤/٤/٢٤قەڵادزێ بۆردمان کرا زیاتر لە سەدو پە نجا کەس بوونە قوربانی دوای دوو رۆژ واتە لە ٢٦ /٤ /١٩٧٤ دوای ساڵێک لە دامەزراندنی تیپ هەڵەبجەش بۆردمان کرا .

**بۆردومانی هەڵەبجە لە ساڵی ١٩٧٤ دا**

دوای یانزەی ئازاری (١٩٧٤) ئیتر بارودۆخەکە ئاڵۆز بوو وەک باسم کرد، زۆربەی شارەکان هاتبوونە هەڵەبجە و قەڵادزێ، تەپڵی شەڕ ئامادە بوو بۆ لێدان. ئێمەی قوتابیانیان خستبووە خولی (بەرگری میللی) ڕۆژێک لە گۆڕەپانی سانەوی کچان کۆیان کردینەوە فێری فریاکەوتنی سەرەتاییان دەکردین (الاسعافات الاولیة)و چۆنیەتی دەرهێنانی بریندار وکوژراوەکان، دابەشیان کردبووین بە چەند تیمێکەوە، دوو سێ ڕۆژ خەریکی چاڵ هەڵکەندن بووین، بە بیرم دێت چاڵێکمان هەڵکەند بەرامبەر خانوویەکی دووقات هەبوو لەکانی قوڵکە بەرامبەر ماڵی حاجی عەلی مایجان، زۆر بێزار بووم لە پاچ وەشاندن، دوای عەسرێکیش چووینە سەیری دژە فڕۆکەکە وەک تۆپ وابوو لەگەڵ چەند دۆشکەیەک بە نیازی ئەوەی فڕۆکەکان بخەنە خوارەوە بۆ بەرزکردنەوەی ورەی خەڵک دایان نابوو کەواش نەبوو، ئەو عەسرە کە بۆردومانکراین، هەوربوو پێشتر بە دایکم وت من لەگەڵ ئەحمەدی ڕەشیدی قەساب وموعتەسەمی مەلا زاهیر دەچینە دەرەوەی شار، من وئەحمەد تازە فێری شەترەنج ببوین کەخۆم بە بەکرەی خەیاتی داشەکانم دروستکردبوو چونکە هی ڕاستیمان نەبوو..

دوای تۆزێ مۆزیک لێدان وشەترەنج کردن چەند فڕۆکەیەک هاتن، خۆمان کرد بە ژێر چاڵە بەردەکانەوە وەک ئەشکەوت وابوو، ئەسپێک نزیکمان بوو لە ترسی دەنگی ناپاڵم و تەیارە ئەیحیلان، موعتەسەم بە بەرد دووری خستەوە لێمان، کە بۆردومان تەواو بوو هاتینە دەرەوە سەیرمان کرد دنیا بووە بە دوکەڵ بە تایبەت

لای کارگەی پووختە کردنی توتن و گەڕەکی سەرا، یەکسەر وتم دوکانی باوکم پێوە بووە، بە فڕکان ڕامان کرد، من کەمانەکەم پێبوو، شەترەجەکەمان فڕێدا لە لای گڵەجانەکە خۆمان پێدا کرد، شەرمم ئەکرد خەڵک بریندارو تەرم بگوازنەوە منیش کەمانم پێبێت خۆم کرد بەماڵێکدا لەسەر شەقامی سەرەکی تا گەیشتینە ماڵەوە ئەبینم هەموو کەس و کارم و دراوسێ هەموو لە ژێر زەمینی ماڵی فەرەجی عەلی موراد دان. پاش کەمێک ئەبینم عەبدوڵای پورم کوڕی وەستا ڕەشید، باوکم و سەربەستی برامی بە برینداری هێنایەوە.

تومەز سەقفی دوکانەکە ڕوخاوە بە سەریاندا بەڵام دوکانی باوکم تاقی خشتی هەبوو، کورەیەکی کێک و شەکرلەمەی دروست کردبوو، وەجاخی هەبوو چووبوونە ژێر وەجاخەکە لەگەڵ پیاوێک ناوی جەمیل بەگ بوو سەربەستیش چوو بووە ژێر مێزی کێک درووست کردنە، بۆیە بریندار بوون ئەگینا ئەمردن، لە هەیوانی ماڵی کاک فەرەج دەمو چاوی باوکم ئەشت وپاکم ئەکردەوە سەری خوێن بوو لەو کاتەدا یەک تاک پێڵاوی لە پێدا مابوو وتەیەکی وت هەم مایەی پێکەنین و گریان بوو، وتی ئازاد برۆ تاکی پێڵاوەکەم بۆ بێنەرەوە وا وڕوکاس ببوو، ئیتر دوای ئەوە بۆ شەوەکەی بیرمان ئەکردەوە بچین بۆ کوێ؟ بەڵام هەر کەسەو ڕووی لە لادێ یان تەوێڵەو بیارە دەکرد، چونکە شوێنێکی سەخت بوو پاش ئەوەش هەرچی بارەگای پ.د.ک هەمووی لەو ناوچانە بوو چونکە پاڵی دابوو بە سنووری ئێرانەوە، چونکە شای ئێران پاڵپشتیان بوون، نەک ئەوە بەڵکو کاتی بۆردومان کردنی فڕۆکەی ئینگلیز بۆ سەر سلێمانی و هەڵەبجە ساڵانی (١٩١٩) ماڵی شاعیر (گۆران) لە باخەکانی بیارە خۆیان حەشاردابوو، هەر ئیلهامی ئەویادەوەرییانە لە نەستی گۆراندا پەنگی خواردبووە و شاکاری (گەشتی هەورامان)ی کردە تابلۆیەکی شیعری ناسک و جوان، یان هەر بەدرێژایی ساڵانێ کە ناوزەند دەکرێت بە شۆڕشی ئەیلول لە ساڵی (١٩٦١) تا (١٩٧٠) ئەو ناوچانە لە ژێر دەسەڵاتی پ.د.ک بوو، لەساڵانی جیابوونەوەی باڵی مەکتەبی سیاسی کە هەڵەبجە لە ژێر کۆنترۆڵی ئەم باڵەدابوو ئێوارە نەبوو تۆپ باران نەکرێین وچەند کەسانی سڤیڵ لە ژن و منداڵ و پیر بەڵکو تیاچوونی چەندین خانەوادەی بێگوناە لە پێناو دوو بەرەکی کە پێویستی بە وردەکاری و شیکاری هەیە ، من لەبواری سیاسەت کار ناکەم بەڵکو خۆم تێیدا شاهیدحاڵ بووم.

تەنانەت ئەو گۆڕستانی شەهیدانەی کە ئێستا هەیە بیرم دێت لە ڕێکەوتی ١٢/٥ /١٩٦٨ لە سنوری بیارەوە بە تۆپی گەورە دراینە بەر تۆپ، ڕەمەزان بوو چەندین کەس بە ماڵ و مناڵەوە شەهید بوون خێزانێک کە ماڵیان لە گەڕەکی هەورامییەکان بوو ماڵی کاک حەمە ڕەشید ناوێک هەموو خاو و خێزانی شەهید بوون کوڕیکیان هەبوو ناوی مەهدی وچەند کچ و خێزانی هەموویان تیا چوون هەرخۆی مایەوە لە گەڵ کوڕێکی لە دار المعلمین بوو لە سلێمانی بە ناوی هادی هەروەها وەستا بەنایەک بە ناوی وەستا غەریب و چەندینی تر، ئیتر کوژراوەکان هێند زۆر بوون بۆ سبەی ئەو گۆڕستانەیان کردەوە، تەمەنم سیانزە ساڵ بوو کە منیش ڕۆشتم بۆ ناشتنی ئەو تەرمانە، یادەوەرییەکان گەڕاندمیەوە بۆ دواوە ودێمە لای ڕوداوەکانی پاشتر.

**دوای رووداوەکەی ساڵی ١٩٧٤ هاتینە سلێمانی**

ئیتر ئەو شەوە لە ماڵی خۆمانماینەوە ماڵی ئێمەو ماڵی پورم فەخریە خێزانی عومەری وەستا مەردان لەگەڵ ماڵی پورزام سەرگوڵ خێزانی مامۆستا عوسمانی خالۆ ئەحمەد، بۆ بەیانیەکەی زوو لەماڵ هاتینە دەرەوە ڕووەو دەشتی حەمەوغان کەوتینە ڕێ، تا نیوەڕۆ لە پاڵ کانیەکەیدا ماینەوە، ئیتر دەمەو نیوەڕۆ بوو خەڵک لە سلێمانیەوە ئەهاتن بۆ سۆراخی کەس و کاریان چونکە زۆر خەڵکی سلێمانی هاتبوونە پاڵ ڕیزەکانی شۆڕش، من و سەرچڵی پورم کە پێنج ساڵێک مناڵ ترە هاتینە ناو بازاڕ بە ڕێکەوت لە چەقی ناو بازاڕ شۆفێرێکمان بەدی کرد ناوی ئەنوەر بوو دۆجێکی پەنجاو شەشی پێ بوو دەستمان لێراگرت و هات بە هانامانەوە و بردمان بۆ نزیکی دەشتی حەمەوغان و هەموو سوار بووین، من و سەرچڵ وکاوەی برام لە سندوقی دواوە سواربووین، نەوەستاین تا گەشتینە سلێمانی ئیتر کەس و کارمان هاتن بە هانامانەوە و لە سلێمانی گیرساینەوە، دوای ئەوە گۆڕانکاری چ لە بواری هزرو بیرکردنەوە وهەڵس و کەوتم دا ڕوویدا.

لە سلێمانی لەگەڵ ماڵی پورم خانوویەکمان لەگەڕەکی ئیبراهیم پاشا بەکرێ گرت نزیک ماڵی خزمەکانمان لە ماڵی خاڵۆ ژنمان مەلا تووبا دایکی خاڵە خالدو خاڵە مەجیدم . . و نزیک ماڵی پورە فاتمەم خوشکی باوکم، خاڵە عوسمانیشم لە گەڵ ماڵی عوسمانی خاڵە ئەحمەد لە هەمان گەڕەک خانوویەکیان گرتبوو پێکەوە، لەو ساتانەدا خزمانمان هاوکاریان دەکردین باوکم بریندار ببوو، من ئەو ساتانە لە پۆلی شەشی ئامادەیی بووم، دوای ماوەیەک زانیم چەند قوتابیەکی تر ماڵیان هاتبوو.

وەک سەرکۆی ئەحمەد ئەفەندی، نەوزادی حاجی ئەمین، ئەحمەد ڕەشید قەساب کە پێکەوە لەیەک پۆل بووین .

لە بەشی زانستیش هێمن عبدالقادر کە باوکی بەڕێوەبەری بانکی هەڵەبجە بوو و خەڵکی سلێمانی بوون، ئەویش گەڕابووەوە، دوایی نەمان ئەزانی کە چۆن خۆمان بناسێنێن کە ئێمە قوتابی شەشی ئامادەیین وەهیچ شتێکی باوەڕپێکراومان پێ نەبوو! بەڵام پەروەردەی ئەوسا نوسراوێکی گشتاندبوو کە هەر کەس تاقی کردنەوە بکات و وەڵامی پرسیارەکانی پۆلی خۆی بداتەوە بۆی هەیە بچێتە تاقی کردنەوەی بەکالۆریا، ئێمەش چووینە ئامادەیی سلێمانی کوڕان ئەو کاتە مامۆستا حەمە عەلی ناوێک بەڕێوەبەریان بوو، ئیتر وانە بە وانە تاقیان کردینەوە بیرم دێت ماموستا ڕەئوف عوسمان کە ئێستا ئەندامی خانەی ڕاپەڕاندنی (گۆڕان)ە، وانەی عەرەبی ئەگوتەوە تاقی کردینەوە و دەرچووین و هەموومان کارتی چوونە ناو تاقی کردنەوەمان وەرگرت و ماوەیان داینێ خۆمان ئامادە بکەین، من زیاتر لە ماڵی خاڵم سەعیم ئەکرد لەو دیوی حەوشەکەیان لای توونی حەمامەکە سێبەر بوو، ڕۆژانە کۆششم ئەکرد یان بەیانیان زوو سەرو گەڕەکی ئیبراهیم پاشا بەربەستێک هەبوو تا نزیک گردی مامە یارە دەڕۆشتم بە تەنها، لە مانگی شەش تاقی کردنەوەمان لە ناوەندی سەلاحەدین ئەنجام دا.

هەر لەم ساڵەدا کە ماڵمان لە سلێمانی بوو ئاشنا بووم بە چەند کەسێکی هاوتەمەنی خۆم یان کەمتر، لە گەڕەکی دارۆغا ئەحمەدی ڕەشیدی قەساب ماڵی خاڵیکی لەوێ بوو بە ناوی (مەحمود کزەل)کەشاعیر بوو کوڕێکی حەزی لە مۆزیک ئەکرد بە ناوی ئازاد، ئەویش هاوڕێیەتی هەبوو لەگەڵ (گۆرانی ئیبراهیم خەیات) واتە کوڕی ئیبراهیم خەیاتی گۆرانی بێژ، کەمانێکی ئەڵمانی ڕۆژهەڵاتی بۆ کڕیبوو ئەویش فێری مۆزیک ببوو بیرم دێت هاتبوو بۆ ماڵی ئازاد پێکەوە

گۆرانییەکانی حەسەن زیرەکمان دەژەنی، لەو کاتەوە یەکمان ناسی، ماڵی فوئادی حەمەی مەحمود ئەفەندی هاتبوونە سلێمانی چووبوونە ماڵی خەتیبی برای مامۆستا ئەنوەر قەرەداغی، چونکە خاڵی بوو، نزیک پارکی (دایک)ی ئێستا، کە ئەو خانووانە ڕوخاون، جار جار هاتووچۆی ئەوانم ئەکردو پێکەوە مۆزیکمان دەژەند، م. ئەنوەر چووبووە دەرەوە، چونکە لەسەرەتای چوونە دەرەوە زۆربەی ئەندامانی تیپی مۆسیقای سلێمانی چووبوونە دەرەوە، تیپی مۆسیقای شۆرشیان دامەزراندبوو، لەگەڵ خالد سەرکار، سەلاح ڕەئوف، عومەر سەرکارو هەندێ ئەندامانی تیپی باواجی کۆیە و هەولێر وەک وریا ئەحمەد، سەردار ئەحمەد، ئیبراهیم سابیر، سابیر عبدالرحمن، فوئاد ئەحمەد، حەسەن گەرمیانی، کەریم کابان کە ئەو گۆرانی (یاران وەسیەتم)ی لەدەرەوە بۆ یەکەمین جار تۆمارکردبوو، لە ئێران لە ئۆردوگاکان ئاهەنگ و سروودیان پێشکەش دەکرد وەک ئۆردوگای سەریاس و ئەنزڵ و چەندینی تر.

لەوساڵەدا لە سلێمانی ژیانمان زۆر ناخۆشبوو لە ڕووی ئابورییەوە، باوکم ماوەیەکی زۆر بێ ئیش و کار بوو، تا بەهۆی خزمێکیەوە ناوی شێخ سدیق کە دوکانی بەقاڵی هەبوو لە ژێر پردەکە ڕۆژانە چەند سندوقێک تەماتەی ئەبرد بۆ کەرکوک و ئەهاتەوە و قازانجی باشی ئەکرد، ئیتر چووین بە تەنها لەگەڕەکی تووی مەلیک خانوویەکی سەربەخۆمان گرت بە کرێ، ڕێک پشتی مزگەوتی ساڵح بۆسکانی، مانگی بە دینارو نیوێک وە ئەو کاتە ئێمە هیچ شت و مەکمان نەهێنابوو هەمووی هی خزم وکەس و کارمان بوون، دایکم لە ڕێگای بێستان سوورەوە چووەوە بۆ هەڵەبجە چونکە تا کانی پانکەش بەدەست شۆڕشەوە بوو، وە زۆر شەو ئەهاتنە سەر سلێمانی و تا بەیانی تەق و تۆق بوو، ئیتر دایکم سەلاجەو تەلەفزیۆن و تەباخ و شتەکانی هێناو ئاهێکمان پێدا هاتەوە، پاش ئەوەش باوکم لەژێر پردەکە دوکانێکی گرت بە کرێ و کردی بە چایخانەو لە ڕووی ئابوورییەوە بووژاینەوە.

## ئەنجامی تاقیکردنەوەکانی پۆلی شەشەمی ئامادەیی و چوونم بۆ زانکۆی بەغدا

کە ئەنجامی تاقیکردنەوەکان هاتەوە من بە یەکەمی سلێمانی لەبەشی وێژەیی دەرچووم. ئەو کاتە هەموو کۆلێجێک وەریدەگرتم، وە فاروقی پوورم دووهەمی بەشی زانستی بوو، (ئێستا فاروق دکتۆرێکی بەتوانایەو ناسراوە بە دکتۆر فاروق حەسەن فەرەج کوردە و لە سلێمانی کاردەکات و نیشتەجێیە) (هەروەها من وەکو مەریوان سەلاح حیلمی کە بەم کتێبەدا چوومەوەو پاشان هەڵەبڕیم کرد، حەزم کرد ئەوە لەسەر دکتۆر فاروق بڵێم کە ساڵی (١٩٩٧) بەفەرمی چوو بۆ بەریتانیا و پاش بەدەستهێنانی بڕوانامەیەکی بەرز لەبواری پزیشکیدا، دوای ماوەیەک گەڕایەوە بۆ کوردستان، ئەو کات کە دکتۆر گەڕایەوە کۆچی بەلێشاو هەبوو بەرەو ئەوروپا، بەڵام دکتۆر فاروق ئەو دەرفەتەی کە لەبەردەمیدابوو، رەدی کردەوەو هاتەوە بۆ کوردستان بۆ ئەوەی خزمەتی خەڵک بکات، بەکورتی دکتۆر فاروق یەکێکە لەدکتۆرە هەرە باش و بە ویژدانەکانی کوردستان کە نمونەی کەم و دەگمەنە نەک لەکوردستان بەڵکو لە هەموو جیهانیش)

من حەزم لە بەشی مۆزیک بوو لە کۆلێجی هونەرە جوانەکانی بەغدا، بەڵام ئەو کاتە بەشی مۆزیکی تێدا نەبوو، ناچار وتیان کۆلێجی بەڕێوەبردن و ئابووری هەڵبژێرە، دوای مۆزیک حەزم لە یاسا بوو، ئیتر قەدەرو قسەی کەس وکار وایکرد ئەو کۆلێجە هەڵبژێرم، بۆ پڕ کردنەوەی فۆرمەکان بۆ ئەوەی لە کۆلیج وەربگیرێین،

عەسرێکی ڕۆژێکی مانگی ئابی (١٩٧٤) من و نەوزادو هێمن عبدالقادر پێکەوە چووینە پشت هەیکەلی خانوویەکی تەواو نەکراو لە گەڕەکی تووی مەلیک، چونکە ماڵی هێمن لە سەر شەقامە سەرەکیەکەی تووی مەلیک بوو، نەوزاد فۆرمەکانی بۆ پڕکردینەوە (چونکە دەست و خەتی لە هەموومان خۆشتر بوو، خۆشنووس بوو، تەنانەت ئەو بوو خۆش نووسی بۆ سینەمای هەڵەبجە ئەکرد بۆ پڕوپاگەندەی فلیمەکان و لە بری ئەوە هەر جارێک بهاتایە بۆ سینەماکە بە خۆڕایی دەچووە ژوورەوە)، من یەکەم هەڵبژادەم کۆلێجی بەڕێوەبردن و ئابووری بوو لە زانکۆی بەغداد، بۆ پڕ کردنەوەی فۆرمەکەش پێویستی بە وێنەی کارەبایی بوو،



پـێش ئەوە چـوومە لای (سـتۆدیۆ جەزا) لەشـــەقامی کــاوە نزیــک خانەقــا ئەم وێـنە کارەبابییەم گرت و هـاوپێچم کرد بە فۆرمی پـڕ کـرنەوەکەوە، ئەمەش ئەو وێـنەیەیە کە سـاڵی (١٩٧٤) لە سـتۆدیۆ جەزا گرتـوومەلە سلێمانی.

نەوزادی حـاجی ئـەمین لە ئـاداب بەشـی ئینگلیـزی وەرگیـرا، سـەرکۆ لە پەروەردە بەشـی میـژوو، ئـەحمەد لە ئـادابی سلێمانی بەشی کوردی، هێمن لە ئەندازیاری سلێمانی.

من و سـەرکۆ و نەوزاد پێکەوە بووین هەندێ قوتابی تر وەک مەحمودی برای مامۆستا ئـەمین سـەپانیش لە پەیمانگایەک وەرگیرابوو، لە پێشـدا هـیچ شـتێک لە بەغدا شارەزا نەبووین، من بە منالّی لەگەڵ باوکم بەغدام دیبوو ساڵی (١٩٦٥) ئەو کات بۆ یەکەمین جار تەلەفزیونم دی، مـاوەی یەک دوو حـەفتە لە ئوتێل سیروان ژورێکمـان گرتبـوو لە شـەقامی (الأمـین). کـۆلێجەکەی مـن لەو گەڕەکەوە لــە هەموویـان دوورتـر بـوو لە گەڕەکی (راغبـة خـاتون) ئەوەی سـەرکۆ و نەوزاد لە (باب المعظم)نزیک بـوو، دوای مـاوەیەک دایکـم هـات بـۆ لام ئیتر لەگەڵ یەک دوو ژنـی تـر کە یەکیـان دەناسـی، پاشـان ژوورێکمـان گرت لە خـانوویەکی چەنـدین ژووردا لەخـــانووە کۆنەکـــانی گەڕەکـــی (الفضـــل) لە(قنبرعلـــی) ئیتـــر لەوێ گیرسـاینەوە، چـونکە یەکەم سـاڵ تـا دوای نیـوەی سـاڵ بەشـی نـاوخۆیی دابەش نەئـەکرا، ئیتـر وردە وردە تێکەڵـی ژیـانی زانکـۆ بـووین و گۆڕانکـاری گەورەی لە هزرو نەستی مندا دانا، هەم ژیانی ڕۆشنبیری، تێڕامـان لە ژیـان و ئاشـنا بـوون بە ژیانی پایتەخت و قوتابیانی بەغداو هەمـوو عێراق و تەنـانەت وڵاتـانی عەرەبی و هاوڕێیەتیمان ئەکردن، کوڕێکی سودانی بە ناوی (المعز الجمری أبـو نـوره) بـوو، بووە هاوڕێم، کە بیری چـەپ بـوو، دوای ئـەوەش چـەندین هـاوڕێی کـورد، بە پێـی ئـەوەی کە ئێمە کۆلێژی ئـابووری بـووین ماموسـتاکانمان هـەمووی دکتـۆری بە ئـەزموون بـوون، دکتـۆرێکمـان هـەبوو بە نـاوی (محمـد سلمان حسـن) ئـابووری

سیاسی پێ دەگووتین کە خۆی کتێبیکی نووسەرێکی فەرەنسی (أوسکار لانگە) وەرگێڕابوو (مبادیءالاقتصاد السیاسی) کاتی خۆی لە کاتی عبدالکریم قاسم وەزیری نەوت و چاککردنی کشتوکاڵ بوو. (أبراهیم کبة) کە ئەویش لە کاتی عبدالکریم قاسم وەزیری ئابووری بوو، چەندینی تر لەوانە (یعرب فهمی سعید) کە کوڕی یەکێک بوو لەو ئە فسەرانەی کە لە شۆڕشی ڕەشید عالی گەیلانیدا بەشداربوو، ئەو وانە نوێیانە بۆ من شتی تازە و نوێ بوون، بۆ من گومانیان لا دروست کردم بەو کتێبانە، خوم دایە خوێندنەوەی دەرەکی لە بواری ئابووری فەلسەفە، زانستی کۆمەڵایەتی و هەندێ وانەی تریشمان هەبوو وەک ژمێریاری، بەڵام ئیتر کەوتمە خوێندنەوەی بیری چەپ بە هەموو شێوازەکانیەوە، دوای ئەوەش بەغدا بۆ خۆی ژیانی شارستانی بوو، کاتی ئێمە تا نیوەشەو بازاڕو دوکان، شوێنی گەشت و سەیران، شەقامی ئەبونەواس بە شەوان و باب الشرقی و چەندین شوێنی ڕابواردنی شەوانە، بەڵام ئامانجی من خوێندن بوو، پاش ماوەیەک کە چاوم کرایەوە زانیم کە زانکۆ مەڵبەندی ڕۆشنبیرییە، بەشێکی بۆ مۆزیک هەبوو، چەند مامۆستایەک پاش دەوامی زانکۆ خولیان بۆ ئەو قوتابییانە دەکردەوە کە لە زانکۆن و حەزیان لە مۆزیکە، شوێنەکەی لە باب المعظم بوو، ئیتر دوای دەوام سەردانم دەکردو خولی مۆزیکیان کردەوە دکتۆرێک دەرسی دەوتەوە بە ناوی(خالد) ئیتر بواری مۆزیکم جارێکی تر بۆ ڕەخسایەوە، ئەمانە لە کۆتایی ساڵی (١٩٧٤) بوو، سەرەتای ساڵی(١٩٧٥) .

دوای ئەوە کە من و سەرکۆ و نەوزادی حاجی ئەمین لەو ژوورەدا پێکەوە بووین لە گەڕەکی الفضل نزیک بەو بەری چایخانەی (الکندی) لە شەقامی الجمهوریة لە بەغدا، بەڕاستی ئەو خانووە سەیربوو وەک لانەوازن وابوو خانوەکە دوو نهۆم بوو لە خانووە کۆنەکان لەناوەڕاستی حەوشەیەکی تێدا بوو ژوورەکانی بە چوار دەوریدا بینا کرابوون، چەندین خێزانی تێدا بوو، لەگەڵ چەند کەسانی ڕەبەن، لەخوارەوە ژنێک تەمەنی لە چلەکان بوو ناوی (أم عباس) کە خاوەن ماڵەکە بوو، مێردەکەشی لەگەڵی دەژیا، لە پاڵیدا مامۆستایەکی زمانی ئینگلیزی بوو بە تەنها بوو، خێزانێکی تریشی لەگەڵ بوو کچێکیان هەبوو ناوی (أمل) بوو، قەڵەوێک بوو لە مێردەکەی تۆرابوو لەگەڵ دایکی دەژیا وکچێکی منداڵیشی هەبوو، زۆر هۆگری ئێمە ببوو، زۆر جار ژوورەکەی بۆ پاک

دەکردینەوە، هۆگری من ببوو هەموو جارێ ئەیوت ..أحبک، بەڵام من زۆر ئاسایی سەیرم ئەکرد، هەر گاڵتەم پێ ئەهات، لە ژوورەکەی پاڵمان پیاوێکی تر دەژیا بە تەنها بەشەو دەردەکەوت ژورەکەی وا ڕازاندبووەوە هەمووی وێنەی ئافرەت بوو بە ڕووتی بە چواردەوردا هەمووی هەڵواسیبوو هەمووی گرتبووە ناو چوار چێوە بە شێوازێکی هونەری هەڵیواسیبوون، شەوێکیان بانگی کردین وتی وەرن سەیری ژوورەکەم بکەن، لەو لاتر یەک دوو شۆفێر یەکێکیان ناوی (أبو علی)قەڵەوێکی ئەسمەر بوو کە بەڕۆژ لەماڵەوە بوون بە شەو کاریان دەکرد لەڕێگای (حلة) وابزانم داوا کراو بوون، چونکە خەڵکیان کردبوو بە ژێرەوە، هەمیشە تەسجیلی کاسێتەکەیان کردبووەوە و گۆرانی (سعد الحلی، سعدی البیاتی)یان لێدەدا، لە سەریشەوە لە هەورەبانەکە ژوورێکی بچووک بوو پیاوێک کە کوردی کەرکوک بوو ناوی حەمید بوو بۆیاخچی بوو شەوان دەهاتەوە. ماڵێکی سەیر دنیایەکی سەیر کە هەرگیز شتی وام نەدیبوو ئەم هەموو کەسە لە ناو خانوویەک بوون هەر یەکەو لە شوێنێک هاتبوون. بەڵام کەس لە کەس نەئەکەوت، هەر کەسەو لە دنیای خۆی دەژیا و کەس بەر ئەوی تر نەئەکەوت، ئێمە نزیکەی چوار پێنج مانگ لەو خانووەدا بووین بێ ئەوە کەسێک بێزارمان بکات، ئیتر لەو ژووره زۆر ئێواران خواردنمان بۆ خۆمان دروست دەکرد، یان دەچووینە دەرەوە، ماوەیەکی پێچوو ئیتر (هێرشی محەمەدی مەلا ئەمین) لە کۆلێجی(أصول الدین)وەرگیرابوو بەشی ئێواران ئەویش زوو زوو سەردانی ئەکردین لەگەڵ براکانی، چونکە لە پۆلی شەش لەگەڵ ئێمە بوو، بەڵام درەنگ تر گەڕابووەوە و لە خولی دووهەم تاقی کردنەوەی کردبوو، دنیایەکی سەیر بوو، ئیتر ماوەیەکی پێچوو هێرش لە دەزگای ڕۆشنبیری کوردی دامەزرا لە ڕۆژنامەی هاوکاری لە گۆڕەپانی (الخلانی) وبە ڕۆژ دەوامی فەرمانگەی ئەکردو بە شەویش لە کۆلێج دەوامی ئەکرد، ئەو ساڵە ئیتر کە سەرەتای خۆێندنمان بوو زۆر شتی تازەو نوێ لە ژیانم بەدی کرد، من ئامێری کەمانم نەمابوو، هەرچۆنیک بوو لە (ئۆرزی باک)ی بەغدا لە شەقامی (الرشید) کەمانێکی چینیم کڕیەوە بە (٥)دینار و لە ژوورەکە لێم دەدا جار جارەش سەرکۆ و نەوزاد گۆرانییان دەوت، ئیتر وەک خۆیان دەیان وت مێشکم خستبوون، بەیانیان هەر کەس بۆ دەوامی خۆی دەڕۆشت من بە پێ تا (باب المعظم) یان (ساحة المیدان) دەڕۆشتم یان بە پاسی

پۆلۆنی کە ئەو کاتە ئەو پاسانە ئیشی ناوخۆیان دەکرد یان لە (ساحة المیدان)بە پاسی دوو قات بۆ (راغبة خاتوون) دەچووم، کە پاسی ژمارە (٦)بوو. لەو کاتانەی کە لەو ژوورەدا بووین کەسانی هاوڕێمان کە دەهاتن بۆ بەغدا یان بۆ گەشتی قوتابخانە، شەوێکیان هاوڕێی کۆچ کردووم جەباری وەستا مەجیدی دەلاک لە ئامادەیی کشتوکاڵی سلێمانی هاتبوون بۆ گەشت شەوێکیان لامان مایەوە بۆ سبەی بەیانی من چووم بۆ کۆلیج و ئەو بۆ لای هاوڕێکانی، کامێرایەکی پێبوو پێکەوە وێنەیەکمان لە شەقامی الجمهوریة گرت، شەوێکی تریان ڕەوان شاد جەمالی دەلاکی برای سەربازبوو لە سەربازگەی(ئێچ ثری) بۆ شەو چووین بۆ پیاسە جلی مەدەنی پێ نەبوو، ناچار جلەکانی سەرکۆی لەبەرکرد، سەرکۆ وێنەکی بۆ ناردم لای مابوو، شەوێکیان مامۆستا رەئوف محەمەد عەلی هات، لامان بوو، وە جار جارەش هاوڕێکانی سەرکۆ ئەهاتن شەوان ئەچوون بۆ سەیرو سەفا.



ئەم وێنەیە ئاهەنگی یەکتر ناسینی خوێندکارانی زانکۆ لە هۆڵی (خولد)لە زانکۆی (المستنصریة ) کۆتایی ساڵی (١٩٧٤)
لەراستەوە : خزمێکی هێمن عبدالقادر. هێمن عبدالقادر . ئازاد ساڵح . هێرش محەمەد ئەمین . نەوزاد حاجی ئەمین.

لەو ئاهەنگە (یاس خضر و سعدون جابر) گۆرانییان وت، سعدون جابر گۆرانی (عینی عینی) وە گۆرانی (ئەرێ لەیلی)ی وت و (یاس خضر) یش گۆرانی (عزاز)ی وت .من وێنەم لەگەڵا گرتن، بەڵام بە داخەوە فەوتا .



بەغدا شەقامی جمهوری
لە ڕاستەوە ئازاد ساڵح ـ جەبار مەجید سەرەتای ساڵی (١٩٧٥)



هەڵەبجە هاوینی (١٩٧٥) ماڵی مستەفا بەختیار بە کامێرای جەبار مەجید

له وكاتانه زۆر هاوڕێی نوێمان ناسی له كوردو عەرەب وەک باسم كرد له هەموو شارەكان لەوانه: ئاراس سەعید دارتاش، سیروان، یەكەمەكانی ئامادەیی له سلێمانی لەو كۆلێجه وەرگیرا بوون لەوانه: ئازاد قادر دەروێش ، محەمەد رەسول، حەمید مەلا نوری كه خەڵكی هەڵەبجه بوو له ناوەندی پێكەوه بووین و ماڵیان له سلێمانی بوو، حەمه غەریب قادر تەگەرانی، عوسمان ساڵح ژاژڵەیی و چەندینی تر، چەندین بیرو بۆچوون و كلتوری جیا جیا، دوای ئەوه له چەندین ئاهەنگی یەكتر ناسین بەشدار بووم و له كۆلێج، كه كۆلێجەكەی ئێمه پڕ بوو له كچانی شۆخ و شەنگی بەغدا، من تا ئەو كاتەش كوڕێكی شەرمن بووم، مەگەر له دوورەوه سەیری كچێكم كردبێت، هەر لەناخی خۆم بوو چەندین شۆخ لەوانه سەرنجیان ڕاكێشاوم، ڕۆژێكیان له سەر كورسیەكەم دانیشتبووم كچێكی هاوڕێم دائەنیشت لام درزی سنگیم دی تا ئێستاش ئەو گرتەیه له خەیاڵمدا له یاد ناچێت، من زیاتر تینووی هونەر بووم هەر چەند هێدی هێدی ڕوانینم بۆ ژیان گۆڕا وگوڕانكاری له بیركردنەوەم بۆ خودی ژیان و بوون چەكەرەی كرد له ناخم، بەڵام شتێك هەبوو له ناخم ناوی ویژدان بوو، كه هەمیشه زیندووبوو، كه ڕۆژانه دوای دەوام پیاسەمان دەكرد به نێو شەقامی الرەشید چەندین موغازەو كۆگای ڕازاوەی لێبوو، كامێرایەكی سینەماییم له دوكانێك بەدی كرد، بووه خولیام، ئیتر هێند توانای مادیم نەبوو به ٤٠ دینار بوو، بۆیه له سەرەتای ساڵی (١٩٧٥) بوو، وردە وردە شەڕ گەرمم ببوو له نێوان پارتی و بەعس، ئەوه بوو له مانگی ٣ كه سەدام و شای ئێران ڕێكەوتنی جەزائیریان ئیمزا كرد به نێوانگیری (هواری بۆمیدیان) سەرۆكی الجزائر و گەورەترین نسكۆ بەسەر شۆڕشی كورد هات و گەورەترین ئاشبەتاڵ ڕووی دا، بووه هۆی ماڵوێرانی بەسەر هەموو تاكێكی كورد و كارەسات و هەرەسیان به ناخی تاك به تاكدا هێنا، به دەیان هەزار پێشمەرگه به خۆیان و چەكەكانیان ڕادەست كردەوه و ئەوی هاتەوه عێراق هات، ئەوەی له ئێران مایەوه خرانه ناو ئۆردوگا، ئەوانەشی كاربەدەست بوون چوون بۆ هەندەران و چەندین فەرمانبەرو ئەفسەر و ڕۆشنبیر و نووسەرو شاعیر دوور خرانەوه بۆخواروو و ناوەڕاستی عێراق وچەندین قوتابی زانكۆ به دڵشكاوی گەڕانەوه بۆ خوێندن و دوای ئەوەی ساڵێكیان بۆ ئەژمار نەكراو بووه هۆی ماڵ وێرانی و هەرەسی ناخ و جەسته ئیتر قۆناغێكی تر له چەرمەسەری زیاتر دەستی پێ كرد..

پاش ئەوە کە لە کۆلێج ئەهاتمەوە بۆ سلێمانی لای چوارباخ مەڵبەندی لاوانی لێبوو، کەسێکی عەرەب کە بەڕێوەبەری بوو بە ناوی (عەلی الودی)چەندین هاوڕێی مۆزیکژەنم ناسی لەوانە (محەمەد ڕەشید شەریف) کە دوایی چووە تیپی مۆزیکی سلێمانی، ئۆکۆردیۆنی دەژەنی، کەسێکی مەسیحی کە لە تیپی مەولەوی بوو جمبوش و کەمانی دەژەند بە ناوی جۆرج، مامۆستا نامدار قەرەداغیش یەک دوو جار لەوێ سەردانی ئەکرد، ئەوانە تروسکایی خەیاڵی زەمەنی دوورو درێژە لە یادەوەریمدا تروسکایی ماوە.

پاش ئەم ڕوداوە ناسۆرە ئیتر چەند قوتابییەک گەڕانەوە کە لەوە پێشتر نەم ئەناسین لە زۆربەی کۆلێجەکان، لە کۆلێجی بەڕێوەبردن لەوانە چالاک ڕەفیق چالاک، کاک عوسمان ژاژڵەیی کە تا پێش ماوەیەک بەڕێوەبەری گشتی بانکی هەرێم بوو، ڕەوان شاد عومەر کەریم ، کاک بەکر، چەندینی تر.



لەڕاستەوە: سەرکۆ ئەحمەد . نەوزاد حاجی ئەمین . ئازاد سالح

بیرم دێت لەو دەورەی خۆمـان کچێک خەڵکی سلێمانی لەگەڵمـانبوو بە نـاوی ئـەخـتەر، زۆری تـریش، یەکێکـی تـر نـاوی شـیرین بـوو وە ئەو سـاڵانەش مـاڵی مەدهۆشی شاعیر لە بەغدا بوو کچەکەی ناوی (ئـاراس) بـوو لە کۆلێجەکەی ئێمە وەرگیرابوو، من کە لە بەغدا وەرگیرام کوڕی پورم وبـرای شـیریم دکتـۆر فـاروق حەسەن فەرەج کوردە لە کۆلێجی پزیشـکی وەرگیرابـوو لە بەشـی نـاوخۆیی بـاب المعظم بوو، جار جار دەچووم بۆ لای و لە بەشی ناوخۆیەکەی ئەوان چاکتر بوو، لەوێ خـۆم دەشـت، چەنـدین کەسـی تـرم ناسـی لەوانە: شـێرکۆی حـەمە ئـەمـین کاردۆخی، لە کۆلێجی صیدلیە کاک جەلال کە خەڵکی هەڵـەبـجە بـوو لەوەو پێشـتر ئەمناسـی، وە کـاک غـەفـار کە ئـەویشـم پێشـتر ئەناسـی کـوڕێکی زیـرەک بـوو، کە کەسێکی چەپ بوو بە داخەوە پاش ماوەیەک گرتیان و دیار نەما ..یادەوەرییەکان زۆرن لەوانەیـە بـۆ کەسـێک کە لەو ڕوداوانە نەژیابێت سـودێکی ئـەوتۆی نـەبێت، بەڵام بڵێیت و نەڵێیت لە یادەوەریم تۆمار کراوە ناتوانم نەیڵێم.

### سەردانی مەڵبەندی رۆشنبیری لەبەغدا

ئیتر من سـەردانی مـەڵبەنـدی ڕۆشـنبیریم دەکـرد و چەنـدین هونەرمەنـدی تـرم ناسـی لە عەرەبەکـان، کە لەو مـەڵبەنـدە کاریـان دەکـرد لەوانە: شمشـاڵ ژەنێـک بە ناوی عبدالسمیع و هەروەها ئیبراهیم، کەمان ژەنبوو، کە هەندێ زانیاری دەدامێ، ئێمە ژێی کەمانەکەمان بە کۆکی ڕۆژئاوایی کۆک دەکرد. صولْ .ڕێ .لا .می . پێی وتم بیکە بە کۆکی شەرقی: صـول .ڕێ .صـول .ڕێ بە گـوێم نەکـرد وتـم لای ئێمە وایە، وتی تۆ تەسک بیرئەکەیتەوە، ئێستا ئەزانم کە وتەکەی ئەو ڕاستبوو، چونکە وانەبوایە هەر ئەوکاتە فێری چەندین مەقامی ڕۆژهەڵاتی ئەبووم، چونکە ئاسانبوو بۆ ئەو کۆکە، هەر لەگەڵ من کاک ئاراس سەعید دارتاش جار جار لەگـەڵـم ئەهـات حەزی لە ئۆکوردیۆن و عوود بوو، کە ئێسـتاش دکتـۆرە لە بـواری ئـابووری جـار جـار و ئێسـتاش پەیوەنـدیمان هـەیە، کـوڕیکی تـریش نـاوی ئـەنـوەر بـوو لە

پەروەردەی وەرزش لە ساحەی الکشافة خەڵکی سلێمانی بوو، ئیتر بینای مەڵبەندەکە گوازرایەوە بۆگەڕەکی (الوزیریة) بۆ من نزیک تربوو بۆ هاتووچۆ، ڕۆژانە دوای دەوام دەڕۆشتم لە کولێجی وەرزش چێشتخانەی کۆلیجەکە هەبوو لەوێ نانم دەخواردو دوایی بە پێ دەپەڕیمەوە ئەوبەر، سەد مەترێک دووربوو، ماوەیەکی پێچوو وابزانم مانگی ٤ بوو بەشی ناوخۆییمان وەرگرت و بڕی شەست دینارم وەرگرت، خەیاڵی من لای کامێرا سینەماییەکە بوو، هەرچەندە خاڵە عوسمانم نامەی بۆ ناردم کە دەست بەو بڕە پارەوە بگرم بۆ خەرجی بەڵام من هەر لەسەر خەیاڵی خۆم بووم، چووم کامێرا سینەماییەکەم کڕی بە چل دینار کە فلیمی ٨ ملیمی بەکرەی دەخوارد و لە جیاتی پیل بە قوڕمیش زەمبەلەکێکی هەبوو کە قوڕمیشت ئەکرد ئیشی دەکرد چەندین عەدەسەی لەگەڵ بوو ئەو کامێرایەم تا ساڵی (١٩٨٨) مابوو، دوای کیمیابارانکردنی هەڵەبجە لەگەڵ ماڵەکەم تالآنیان کرد، ئیتر هەر کەسەمان کەوتینە بەشی ناوخۆیی، من لەگەڕەکی (حی الضباط)لە نزیک راغبة خاتون گیرسامەوە و چوومە بەشی ناوخۆیی. هەر لەو ساڵەدا چەندین کۆنسێرت دەڕۆشتم لە هۆڵی الشعب کە تیپی ئورکسترای عێراقی سازیان ئەکرد و ئەو ساتانە ئاشنا بووم بە سەمفۆنیەکانی بیتهۆڤن و مۆتزارت و باخ و چایکۆفسکی و هایدن، زۆربەی دەلیلەکانم مابوو بە داخەوە ئەوانیش فەوتان لە کاتی کیمیاباراندا، چەندین مۆزیکژەنی بیانی و عێراقی تێدا بوو تەنانەت کوردیش لەوانە دڵشاد محەمەد سەعید دهۆکی، ئاسۆ سەڵتە کە ئەو کاتە ئاواتەخواز بووم لەو تیپە بەشدار بم، بەڵام قەدەر منی تووشی پاشە ڕۆژێکیتر کردبوو، تیپی میللی نەتەوەیی بۆ هونەرە میللیەکان کە جوانترین تابلۆی هونەرییان پێشکەشدەکرد و چەندی کچی شۆخ و شەنگی بەغدادی تێدا بوو لەوانە هناء عبدالله کە صۆلوی تابلۆکانی وەردەگرت وە لەیلا محەمەد و چەندین تابلۆی جوانیانم ئەدی بەو لەش و لارە جوانانە وەک ماسی مەلەیان ئەکرد لە گیانما و تابلۆی (الهجع)و چەندینی تر.

بۆ هاوینەکەی ماڵمان هاتەوە هەڵەبجە و لە پشووی هاوین مستەفای کەمال خەفافیش لە ئێران گەڕابووەوە، ئەو کاتە ئەو لە پۆلی سێهەمی ناوەندی بوو ئیتر کەسمان لەگەڵ نەبوو بە دوو قۆڵی هەردووکمان کلیلی دەرگای ناوەندی شارەزورمان لە مامۆستا فەیروز وەرگرتبوو، دوو بە دوو تەمرینمان ئەکرد بە

نۆتە، ڕۆژانە لە حەوشـەی مەکتەبەکە تـا ئێوارە تەمرینمـان ئـەکرد، دوو هـاوڕێم کەمانیان کڕی بۆ فێربوون و ئەویش هێرشـی محـەمـەد حـەمەی مەلا ئـەمـین کە ئیستا دکتۆرە لە زانکۆی سلێمانی و مامۆستا جەمال محەمـەد کە ئێسـتا ئـە ندامی گشتی جڤاتی بزووتنەوەی گۆڕانە بەڵام بەردەوام نەبوون .

مستەفا کتێبێکی فارسی هێنابوو بەنـاوی دەسـتور مقدماتی ویلـن. دانەرەکەی روح الله خالقی بوو، وە پارچە موزیکیکی تێدابوو بە ناوی (نەو بەهار) ئەوکاتە ئەو پارچە مۆزیکەم لەبەرکرد دوایی چەند ساڵێک ئەو کتێبەم بە ڕێکەوت دی و کڕیم و ئێستاش لام ماوە، ئەو هاوینە هاوێیانم سەردانیان کردین، بیرم دێت کاک هێمنی عبدالقادر کە هاوڕێ بووین ئەو کاتە ماڵیان لە سلێمانی بوو هاتبوو کامێرای پێبوو تازە فلیمی ڕەنگاوڕەنگ هاتبوو، لە گورەپانی ناوەندی شـارەزوور بەو گەرمـای هـاوینە وتـی بچـۆرە بەر هـەتـاوەکە و بۆ یەکەمـین جـار لە ژیـانم وێنەی ڕە نگـاو ڕەنگم گرت، تا ئێستاش ئەو وێنەم لاماوە لە هاوینی (١٩٧٥)گیراوە.



هەڵەبجە هاوینی ساڵی (١٩٧٥)
قوتابخانەی ناوەندی شارەزوور لە پیرمحەمەد،
ئەو قوتابخانەیە ئێستا پێی ئەوترێ
(مەرزەبۆتۆ) بە کامێرای هێمن عبدالقادر

## لە قۆناغی دووەمی کۆلێژ لەزانکۆی بەغدا و هەندێ چالاکی هونەری لە هەڵەبجە

ساڵێ (١٩٧٦) چوومە قۆناغی دووی کۆلێج هەرچەندە من حەزم لەئابووری دەکرد زۆربەی هاوڕێکانم چوونە بەشی ژمێریاری وبەڕێوەبردن، منیش چاوم لەوانکرد، وانەکانمان زیاتر گران و ئاڵۆز بوون، هەندێ وانەشمان بە ئینگلیزی بوو وەک بیرکاری، بەهەر حاڵ لەو ساڵەدا قوتابی تازە هات وئازاد مەحمود کە خەڵکی سلێمانی بوو کە ناسراوە بە ئازادی خولەی پاقلە کە ساڵی ڕابردوو مۆڵەتی وەرگرتبوو، چونکە ژنی هێنابوو ژنەکەی فەوزیە خزمی ماڵی مامۆستا ئەحمەدی عەلی جەواز بوو لە پۆلی یەک دەرچوبوو هاتەوە بۆ دەوام، ئازاد حەزی لە گۆرانی بوو و بووینە هاوڕێ، ئەچوو بۆ ناوچەی (الصالحیە) کە ئیزگەی کوردی لەوێ بوو، چەند گۆرانییەکی لەگەڵ تیپی ئیزگە تۆمار کرد و ئاوازیشی دادەناو لە ڕۆژنامەی هاوکاریش شیعری مناڵانیشی دەنووسی و دوایش گۆرانییەکی تۆمار کرد، کەمان ژەنێکی کوردی هەولێری هەبوو ناوی نورالدین ئیبراهیم بوو ئاوازی ئەوبوو، شیعری ئەحمەد ڕەشوانی بوو (چاوی کاڵێ یار)و هەر گۆرانییەکی تۆمار بکردایە بیست دینارێکی وەردەگرت، ئێمە مانگی (١٠) دینارمان هەبوو، بە منیشی دەوت وەرە، دەموت من مۆزیک بۆ پارە ناکەم. هاوڕێتیمان بەردەوام بوو، زستانی (١٩٧٦) هات بۆ ماڵمان لەهەڵەبجە پێکەوە بووین چەند گۆرانییەکەی وت بە کاسێت تۆمارمان کرد نازانم بۆ فەوتا؟ ئەو گۆرانییە بە ناوبانگە (ئەم ئێوارەیە زۆر ساردە) ئاوازو هۆنراوەی خۆی بوو، کە دواتر محەمەد ئیبراهیم وتیەوە.

ساڵی وابزانم دوو هەزار بوو لەگەڵ عەلی کەریم و کامەران ڕەفیقی شانۆکار تووشی ڕوداوی ئۆتۆمبیل بوون، کامەران و ئازاد کۆچیان کردو عەلی کەریمیش بە سەختی بریندارببوو. من ئاوازێکی ئەو کاتەیم لەبیرە کە تا ئێستاش نەبیستراوە، بە ناوی (ئارامە ئارامی دڵ و گیانمە خۆشیم نەدیوە لە ژینم هەمیشە خەم میوانمە).

لە مەڵبەندی زانکۆ قوتابییەکی عەرەبم ناسی لە کۆلێجی پەروەردە بەشی بیرکاری ناوی صباح بوو، چەپبوو، بوو بە هاوڕێیەکی نزیکم کەمان ژەنێکی چاک بوو، حەزی لە گۆرانی کوردی بوو وەپارچە مۆزیکی (سۆلاڤ)ی کە لە ئاوازی

غانم حداد بوو چاک لەبەری بوو دوایش کەمانێکی ئەڵمانی کۆنی لە هاوڕێیەکی خەڵکی بەغدای بۆ کڕیم بە ١٧ دینار تا ساڵانی (١٩٨٧) مابووم ، نازانم دوایی چی لێ هات؟

هەر لەوساڵە مستەفای کەمال خەفاف لە خانەی مامۆستایان وەرگیرابوو لە سلێمانی لەگەڵ فاروقی وەستا فەتاحی خاڵی کە دەستی شیعری هەبوو لە گەڕەکی گاوران لە ماڵی خزمێکیان ژوورێکیان گرتبوو کە دەگەڕامەوە جارجار سەردانم ئەکردن، بەردەوام هەرچی کۆڕی مۆسیقی یان فلیم و سینەما یان شانۆ هەبوو دەڕۆشتم، ئەوساڵە هەندێ هاوڕێم لەوانە جەباری وەستا مەجید و ئەکرەمی ڕەشە خڕە و عومەر مەجید، کاک لەتیف مەحمود(گۆران هەڵەبجەیی) و حەمەی زارا، ئامادەیی کشتوکاڵیان تەواوکردبوو و ببوونە سەرباز لە مەعەسکەر تاجی و ژووریان گرتبوو لە حەیدەرخانە، چونکە دادەبەزین، زۆرجار شەوان پێکەوە پیاسەمان ئەکرد و مامۆستا حەمە سەعید حاجی عینایەتیش گەڕابووەوە دوای ئاش بە تاڵ لە کۆلێجی پەروەردە بوو بە شی بیرکاری و م.سەعدی نەقشبەندی لە بەشی بایۆلۆجی بوو، هەروەها قەدری حاجی و قەدری مەلا زاهیر ساڵێک پێش ئێمە بوون، هەروەها پرشنگی وەستا عوسمانی وەستا مەردان کە خوشکی شیریمە لە کۆلێجی التمریض بوو، کاک محەمەدی حسێن عەلی جەوتە لە بەغدا دامەزرا بوو، زۆر جار نیوەڕوان و شەوان بە دۆمینە و تاوڵەوە خەریک بوون لەگەڵ سەرکۆ، ئەو ساڵەش ئەفراسیاب ئیبراهیم ساڵح لە کۆلێجی یاسا وەرگیرابوو زۆر جار پێکەوە بوین، جار جار ئەیوت ئازاد واز لە م (جیق و فیقە بێنە) بیرم دێت ئەم وشانەی کاتێ وت پێکەوە لە شارع الرشید نزیک ئۆرزدی باک عەسرێک پیاسەمان ئەکرد، ئێمە گەنج بووین زۆر جار پیاسەمان ئەکرد بە شارع النهر کە ناسرابوو بە شارع البنات، کە جل وبەرگ و پێداویستی ژنان لەوێ بوو، چەندین موغازەی جوانێ تێدابوو، عەسران جمەی دەهات لە کچی شۆخ و شەنگی بەغدادی، جارجارەش هێندە قەرەبالغ بوو بەر یەک کەوتنێک هەبوو بۆ چرکە ساتێک تەزوویەک بە جەستەدا دەهات، هەر ئەو ساڵەبوو کچە شۆخێک سەرنجی ڕاکێشام چاو بڕکێم لەگەڵ ئەکرد ناوی (آ.ە .ک) بوو هەرچەندم کرد ڕووم نەهات هیچ بڵێم، ئەو هەستە بەبێ دەنگی هەروا کپ کرایەوە.

ڕۆژێکیان کچێکی مەسیحی جەژنی لە دایکبوونی بوو ناوی ئەلیس بوو، کەمانەکەم هێنا بۆ پۆل، من چەند گۆرانییەکی کوردیم بۆ ئازاد مەحمود ژەند، ئەو کاتە زانییان من مۆزیکژەنم، هێندە شەرمن بووم وایان دەزانی لە ڕووی مادییەوە بێتوانام، ڕۆژێکیان لێپرسراوی قوتابیانی ئیتحاد ناوی جاسم بوو، خەڵکی ڕومادی بوو بردمیە ئەولاوە وتی هەست ئەکەین هەمیشە دوورە پەرێزیت؟ وتی پێویستت بە پارە و هاوکاری نییە؟ وتم نا هەر خۆم وام.

جاران وا باو بوو کە هەموو ساڵێک چالاکی قوتابخانەکان لە هەموو عێراق، ڤیستیڤاڵی ساڵانەی لە ئاستی هەموو عێراق ساز دەکرد لە بەغدا، چالاکی قوتابخانەکان هاتبوون لە سلێمانییەوە لە مانگی چواری (١٩٧٦) ئۆپەرێتێکیان نمایش کرد لە نوسینی ع.ع.شەونم و ئاوازی ولیەم یوحنا، خالد سەرکار، فرەنسیس داود بوو، مامۆستا ئەنوەر قەرەداخی دوورخرابووەوە بۆ سەماوە لە خواروی عێراق لەگەڵ ئەحمەد سالار و نوری وەشتی، وە شێرکۆ بێکەسی شاعیر دوورخرابووەوە بۆ ناحیەی بەغدادی لە ڕومادی، ئەو ئۆپەرێتە یەکەم بوو لەسەر ئاستی عێراق، بۆ تەلەفزیۆن تۆمارکرا بە ڕەنگاو رەنگ، بۆ پشووی هاوین گەڕامەوە و مستەفاش هەروەها، ئومێد بۆ ماوەی دوو هەفتەیەک بوو بەسەربار، چونکە عائدون بوو لە بەسرە، لەو کاتە ناچار بووین بچینە لاوان کە بیناکەی لە ماڵی مەلا نوری بوو نزیک دەرگای دووهەمی باخی گشتی، نیازمان بوو ئاهەنگێک ساز بکەین لەم ساڵەدا چ وەک مۆزیک چ وەک گۆرانی چ کۆرس هاتنە لامان لەوانە: محەمەد حاجی حەمە کریم گێڵدەرەیی شمشاڵی کەمێک دەزانی، بەختیار عبدالله مەلا محەمەد گوڵچین کە خزمێکی خۆمە، ڕزگاری برای ، ئازادی تۆفیقی باوەیس، لەیلای تۆفیقی موختار چەند کۆرسێکی بۆ هێنایین، لەوانە ڕۆشنای خوشکی کە مناڵ بوو، بژاری دارای ئیسعاف، پەروین وەستا هاشم، چەندینی تر، ئیتر دەستمان کرد بە پرۆڤە، ئومێد چوو بۆ سەربازی، کەس نەبوو ئۆکۆردیۆن بژەنێت، من لەخۆم ڕادەبینی لەماوەی دوو هەفتە هەموو ئەو گۆرانییانەم دەژەند کە ئامادەمان کردبوو، ئومێد لە سەربازی تەسریح بوو، من چوومەوە سەر کەمانەکە، ئەو گۆرانییانەی هەڵمان بژارد زۆربەی ئەوانەی تیپی سلێمانی بوو، چونکە ئەو ساڵە کاسێتێکیان بڵاوکردبووەوە لەوانە باڵابەرز حەسەن گەرمیانی، ڕوومەتی وەک گوڵی بێگەردی قادر کابان، وە مستەفاش لەئاهەنگی خانەی

مامۆستایان م، خالد سەرکار (سروودی واوەرن) ی لەبەر کردبوو لەگەڵ پەلکە ڕەنگینەی ئێوارەی بەهار شیعری گۆران و ئاوازی م، ئەنوەر قەرەداغی، لەو لاشەوە جەمالی مەلا قادر شانۆگەرییەکی ئامادەکردبوو بە ناوی(مەشخەڵ) وا بزانم نووسینی حەکیمی مەلا ساڵح بوو، چونکە ئەوە یەکەمجار بوو حەکیم ببینم بەشداربێت لە کاری شانۆ، ئەکرەم محەمەدیش لەنواندن بوو، ئێمە ئەم بەرهەمانەمان ئامادەکرد، ئەو ساڵە ماڵی فوئادی حەمەی مەحمود ئەفەندی لەسلێمانی بوو حەزمان دەکرد بەشدار بێت، من نامەیەکم بۆ نووسی وفوئاد حەزی لە هەنجیری باخی شیخ وەلی بوو لە گولان، وتم وەرە پێکەوە ئەڕۆین بۆ باخەکەی شێخ وەلی و هەنجیر ئەخۆین، ئیتر هات بە شداربوو لەگەڵمان، شەو لە ماڵی ئێمە بوو، هاوین بوو شەو لەسەربان خەوتین بە داخەوە ساڵی (٢٠٢١) بە نەخۆشی شێرپەنجە کۆچی دوایی کرد، تا دواهەمین ساتی ژیانی هاوڕێ بووین بۆ دواجار بە نەخۆشی تەلەفۆنی بۆ کردم وتی ئازارم زۆرە، بەڵام خۆڕاگرم و دوای چەندین ساڵ وتی خۆزگەم بە پیاسەیەکی لای گولان و شارەزوور و وتی چەند ساڵە لە لەندەنم ئێستاش دڵم لای کوردستانە، بە داخەوە بە غەریبی سەری نایەوە.

ئەو بەرهەمەی لەو ساڵەدا پێشکەشمان کرد لە هۆڵی سانەوی کچان بەم شێوەیە بوو:

مۆزیک ژەنەکان، کەمان: ئازاد ساڵح، مستەفا کەمال خەفاف، فوئاد محەمەد مەحمود، ئۆکۆردیۆن: ئومێد ، شمشاڵ: محەمەد حاجی حەمە کریم، ئیقاع: سەروەتی حاجی حەمە کەریم کوردسانی...

| بەرهەمەکان | ئاواز | هۆنراوە | وتنی |
|---|---|---|---|
| سروودی واوەرن | کۆن | زێوەر | کۆرس |
| گوڵی بێ گەرد | قادرکابان | کامەران موکری | ڕزگار عبدالله |
| پەلکە ڕەنگینە | ئەنوەر قەرەداغی | گۆران | پەروین هاشم |
| مریەم باوانم | فۆلکلۆر | فۆلکلۆر | ئازاد تۆفیق باوەیس |
| باڵا بەرز | ئامادەکردن ئەلبیرت عیسا | فۆلکلۆر | بەختیار عبدالله |

## چەند بەرهەمێکی تر لە بیرم نەماوە

گۆرانی پەلکە ڕەنگینە، ئەم گۆرانییە دەبوایە بە جواب واتە تیژبوترایە، بەڵام پەروین بە قەرار واتە گڕ دەیوت لە کاتی پرۆڤە هەرچەند پێمان دەوت بە تیژ بیڵێ نەیئەوت تا کاتی شەوی نمایش چووە تۆنی خۆی بە تیژ زۆر جوانی وت ..

شەوی ١٩٧٦/٧/١٧کە دەبوایە لەوبۆنانە نمایش بکرایە، پەردەی شانۆکەی سانەوییان دڕاندبوو لە کاتی شۆڕشی ئەیلول نازانم لەوێ خەڵکیان خەواندبوو بەتانیان پێوە نەبوو لە ئەسڵدا پەردەیەکی سووری هەبوو کە پەردەیەکی قەدیفەی سووربوو، شانۆکە پەردەی نەبوو، ئەم نمایشە دەبوو یەک هەفتە بەردەوام بێت، بەڵام شانۆکە سیاسی بوو، تازە یەکەم مەفرەزەی کۆمەڵە چووبوونە دەرێ، لەوانە مەحمود کەشکۆڵ، شەوکەتی حاجی موشیر، تۆفیقی رەعنا و حەمەی حاجی مەحمود، عەلی شیعە... هتد

دوای ئەوە نەیانهێشت نمایش بکرێت، دوای چەند ڕۆژێک بە داهاتی ئەو نمایشە پەردەیەکی ڕەنگی سەوزی کاڵمان کڕی بۆ شانۆکە.....

دوای ئەم کاتە بە هەموو شانۆکار و ئەدیب بیرمان کردەوە بەشێکی کۆمەڵی هونەر و وێژەی کوردی بکەینەوە لە هەڵەبجە، بۆ ئەم مەبەستە چەند کەسێکم بیرماوە کە چووین بۆ سلێمانی : سالح هەژار، جەمالی مەلا قادر ، سەید تەهای شێخ حەمە ئەمین، حەکیم مەلا سالح، مستەفای ئەحمەد شیرین، لەوانەی کە لە سلێمانی کۆبوونەوە لەگەڵمان تەها خەلیل، بیرم دێت سالح هەژار بە تەها خەلیلی وت بەهەرکەسێکیان وت خەڵکی کوێیت وتی هێشتا ژنم نەهێناوە، مەبەستی تەها خلیل بوو کە زەکێ خانی کچی ڕەشید عەزیز خێزانی بوو، هەڵەبجەیی بوو، بیرم دێت کە گەڕاینەوە بە جادەی تازەی عەربەت کە تازە درووست کرابوو هاتینەوە، کەهەموومان بە سواری جێبێکی لاندرۆڤەری ستەیشن کە شۆفێرەکەی عوسمانی حەمە کەریمی چاپچی بوو، من لە هە موویان مناڵتر بووم لە دواوە دانیشتبووم..

هەر لەو ساڵەدا کە هاوین بوو لای کاک عوسمانی ڕەسام ئەم دوو وێنە کارەبابییەم گرت لە ڕێکەوتی ١٩٧٦\٦\١٢ کە تازە سەید قادر ئەم جلە شاڵە ڕەنگ شینکییانەی بۆ درووبووم، وا بزانم بایی ١٤ دینار بوو دایکم حەزی ئەکرد جلی شاڵم هەبێت کە هەموو کەس نەیبوو.



**هەڵەبجە ستۆدیۆ عوسمان  هاوینی  ساڵی ١٩٧٦**



**هەڵەبجە ستۆدیۆ عوسمان   هاوینی ساڵی ١٩٧٦**

## قۆناغی سێیەمی کۆلێژ لەزانکۆی بەغدا

ساڵی(١٩٧٧)من لە قۆناغی سێهەمی کۆلێج بووم لەبەغدا و هەمیشە بەردەوام بووم لە کڕینی سەرچاوە و کتێبی مۆزیک و دەمخوێندەوە و لە بەشی ناوخۆیی دوو برای هونەرمەندی هەولێریم ناسی کە گچکەکەیان ناوی ساماڵ بوو کە لە کۆلێجی خۆمان بەڕێوەبردن بوو، گیتارو کەمانی دەزانی پێکەوە لە ژورێکدابووین، ئێمە ساڵانە شوێنی بەشی ناخۆییەکەمان دەگوازرایەوە، ئەو ساڵە لە گەڕەکی ڕاغبەخاتون بووین نزیک کۆلێجەکەمان کە بەرامبەر کۆلێجی یاسا بوو، براکەی تری ناوی نضال بوو لە کۆلێجی ئاداب بەشی ئینگلیزی، کەمانژەنێکی چاکبوو هاوڕێی ڕزگار خۆشناوی عودژەن بوو. ئەو ساڵە کۆتا ساڵی (لە معهد الدراسات النغمیة)بوو لە بەغدا، ڕەنجبەری برای کە قوتابی پەیمانگای هونەرە جوانەکان بوو لە بەغدا بەشی کەمان، ئەمان هاوڕێ بوون لە هاوینی ڕابردوودا لە ئاوازی ڕزگار خۆشناو گۆرانییەکیان بۆ قادر زیرەک تۆمار کردبوو لە ستۆدیۆکانی تیپی مۆسیقای سلێمانی و لەتەلەفزیۆن لە باخچەی زەورا قادر زیرەک وێنەی گرتبوو بە ناوی: دوورم لە یاران.. ڕۆژێکیان ڕزگار هات بۆ لامان لە بەشی ناوخۆیی، ئیترجار جار دەمبینی و ڕۆژێکیان پێکەوە لەگەڵ هەموویان چووین بۆ دوکانی عود دروستکەری بە توانـاو بە ناوبانگ محەمەد فاضل دوکانەکەی دەکەوتە گەڕەکی حەیدەرخانە لە کۆڵانێکی دواوە بوو بەرانبەر مزگەوتی حەیدەرخانە لە شارع الرشید، دوکانێکی کۆن، کردبووی بە دوو قات، قاتی سەرەوەی کردبوو بە گەنجینە، دارو تەختەی فرێ دابووە سەرەوە، تەمەنی حەفتا ساڵێک ئەبوو خۆی و کوڕەکەی خەریکی ئیش کردن بوون، من تا ئەو کاتە نەمدەزانی هێندە بە ناوبانگە لە دروستکردنی عود، وتی من چەندین عودم بۆ مۆزێک ژەنە میسرییەکان دروستکردوە، عودەکانی فرید الاطرش من دروستمکردوون، ماوەی نیو سەعاتێک لای بووین، ئیتر بەردەوام بووم لە چوون بۆ کۆڕی مۆسیقی وکۆنسێرتی تیپی سەمفۆنی عێراقی، ڕۆژێکیان لە ڕۆژنامەی (طریق الشعب) من ئەو کاتە ڕۆژانە دەمکڕی ولە چایخانەی الکندی لە شارع الجمهوریة لەگەڵ هاوڕێکانم دانیشتبووم، بڵاوکرابووەوە کە کۆڕێک لەسەر مۆزیکی منالان لە لایەن حسین القدوری کە ماستەری هێنابوو لە هەنگاریا لەسەر

توێژینەوە لە گۆرانی منداڵان کە کتێبێکی بە دوو بەرگ چاپ کردبوو بە ناوی (لعب واغانی الاطفال فی العراق) کە هەرچی یاری و گۆرانی منداڵانی تێدا کۆ کردبووەوە بە وێنەی ڕەنگاو ڕەنگەوە، توێژەرێکی تر ناوی (هادی النعمان الهیتی) کە ئەویش کتێبێکی هەبوو بە ناوی (أدب الاطفال)دوایی من ئەو کتێبانەم کڕی، بۆ ڕۆژی دوایی بە پاس چووم بۆ کۆڕەکە لە بەشی الکرخ بوو، من شارەزای شوێنی کۆڕەکە نەبووم، دوور دابەزیم عەسربوو ڕێگام هەڵە کرد، نزیک القصر الجمهوری بوومەوە کە ئەو کاتە ئەحمەد حەسەن بەکر سەرۆک کۆمار بوو، کاتێ نزیک بوومەوە ئینزباتێکی تەپلە سوورم دی، پاشە و پاش گەڕامە دوا، تا هۆڵەکەم دۆزییەوە و ئامادە بووم، باسەکە سەرنجی ڕاکێشام، چونکە منداڵێک ناوی بلقیس بوو گۆرانییەکەی دەگووت و پیانۆ ژەنێکی ئافرەتی کریستیان بە ناوی (بیاتریس أوهانسیان)کە مامۆستای پەیمانگا بوو کارەکانی جێ بە جێ ئەکرد، ئەو کۆڕە وای لە من کرد کە گرنگی بدەم بە گۆرانێ و ئۆپەرێت و ئاوازی منداڵان، تەنانەت من چەندین ساڵە نزیکەی زیاتر لە ٣٥ گۆرانی ویاری منداڵانی فۆلکلۆریم تۆژینەوە بۆ کردووە و (جوان)ی خوشکم وێنەکانی کێشاوە.

جارجارە بۆ مۆڵەت دەهاتمەوە بۆ هەڵەبجە ئاگاداری چالاکی هونەری بووم لە شانۆش، ئەوساڵە واتە (١٩٧٧) کۆمەڵێ گەنج هەبوون کە لە گەڕەکی خۆیان شانۆییان پێشکەش ئەکرد، دیارترینیان عەبدوڵای حەمەلاو بەگ، فەرهەنگی حەمەی سمایل، بەهادینی حاجی بەکر، فوئادی حەمە فەرەجی نانەوا و چەندینی تر، تیپێکی شانۆییان دامەزراند بە ناوی تیپی میللی وەفایی، شانۆیەکیان نمایش کرد بە ناوی (شێتی نیشتمان)، کەهەستی نیشتمانی تێدا بوو، لە نووسین و دەرهێنانی فوئادی حەمە فەرەج بوو، لە بەغداش هێرشی حەمەی مەلا ئەمین لە ڕۆژنامەی هاوکاری ببووە فەرمانبەر، خۆی بەشەو لە کۆلێجی اصول الدین بوو بە ڕۆژیش خۆی دامەزراندبوو مووچەی هەبوو جار جار وتاری هونەری یان ڕاپۆرتی دەنوسی، لە کۆلێجی خۆیان چەند کەسێک دەستی نووسین و شیعریان هەبوو لەوانە شێخ ساڵح و بورهانی شێخ مستەفا کە دەستی شیعری هەبوو، بووە هاوڕێمان ناسراو بە فەرهاد دوایی چووە دەرەوە لە ڕاگەیاندن بوو بە داخەوە لە بۆردومانی سەرکردایەتی بە فڕۆکە شەهیدبوو، هەڤاڵ کوێستانی لە کتێبەکەی (ئەو کاتەی نیشتیمان هی هەمووان بوو)باسی چۆنیەتی شەهید بوونی دەکات.

هەر لە هاوینی ئەو ساڵە چەند هاوڕێیەک سەیرانێکمان ڕێکخست بۆ ئەحمەد ئاوا شەوێکیش لەوێ ماینەوە بریتی بوو لە: سەرکۆ ئەحمەد. ئەفراسیاب ئیبراهیم . ئەحمەد حەمە سوور. جەمال وەستا مەجید. ئەردەڵان محەمەد حسین . مامۆستا جەمال(ناسراو بە جەمالی حەمەڕێوی) هێرش محەمەد ئەمین . نوری عومەری کاکی . فوئادی حاجی خڕە . لە سلێمانیش هێمنی مامۆستا حەمە سەعید بانەییشمان لەگەڵ بوو. ئەم وێنەشمان لە سەرچاوەکەی زەڵم گرتوە .



دانیشتووەکان لە پێشەوە (ئازاد صالح . کڵاو لەسەرەکە: فوئادی حاجی خڕە، مامۆستا جەمال (جەمالی حەمە ڕێوی) ، هێرشی حەمەی مەلا ئەمین.

راوەستاوەکان لەراستەوە: ئەحمەدی حەمە سوور، ئیبراهیمی عەلی میرزا تۆفیق، نوری عومەری کاکی

هەموو ساڵێک چالاکی قوتابخانەکان چالاکیان دەکرد، ئەو کاتانە م.دلێر ئیبراهیم، عوسمان محەمەد ئەمین، سەلاح ڕەئوف، فێرخوازیان هەبوو لە هۆڵی وەزارەتی پەروەردە، تیپی مۆسیقای نەورۆز کە مامۆستا عوسمان محەمەد ئەمین ودلێر ئیبراهیم سەرپەرشتی ئەکردن ١٩٧٧/٤/١٣ کارزان و فەرمان و زانای مەحمود هەژار و سەباحی سەنتور و بەختیار سەرسپی و چەندینی تر کاری خۆیان نمایش کرد، ئەو شەوە من لەو هۆڵەبووم بە وێنەگرەکەم وت ناوی بەکر بوو خەڵکی قەڵادزێ بوو وێنەیان بگرە، ئەم وێنە تا ئێستاش لای من ماوە،

سروودی (چەند شیرینە لام، لە یلی لەیلێ کاڵەکەم)بە کامێرای ڕەنگاو ڕەنگ وێنەگیرا، کە لە دەرەوەی هۆڵەکە بوو لەسەر جادەکە، بۆ مێژوو ئەڵێم هێندە تامەزرۆ بووم بۆ مۆزیک وەک گۆران ئەڵێت (لەهەر باخێک گوڵێکی سوورم دیبێ/ بۆی چووم هەزار دڕک لە پێم چەقی بێ) هەروەها مامۆستا خالید سەرکار تیپی کیژانی دروستکردبوو، چەند گۆرانییەکی فۆلکلۆری بۆ ئامادە کردبوون وەک (گۆرانی لەرزانەکانی و دەنگی لایەلایەکەت)

لە هاوینی ئەو ساڵە کە پشوو دەستی پێکرد لەخوار هەڵەبجەوە، قوتابخانەی شاهۆم وەرگرت و ویستم نەوەی تازە فێری مۆزیک بکەم، ئەو هاوینە چەندین، فێرخوازم کۆکردەوە لەوانە، ئەحمەد و حەمە ئەمین عەلی سەعاتچی، کە ئەحمەدیان زۆر بە توانا و دەست و پەنجە پاک بوو، ڕزگاری فەرەجی سەعە گۆچان، ناسراو بە ڕزگارەسوور، ئەمانە ئامێری کەمان، بەهمەنی ئەحمەدی دەلاک کە بۆ ئیقاع هاتبوو، هەروەها دوایی بە هەمەن چەندین ئامێر فێر بوو کلارنێت ، فلووت ، باڵەبان، بەم شێوە توانیم کە چەند گەنجێک فێری مۆزیک بکەم لەو لاشەوە ئومێد لەلاوان بوو چەند منالێکی لە خۆی کۆکردبووەوە لەوانە عومەر حەمە ڕەحیم (دانا هە ڵەبجەیی) منالێکی زیرەک کە لە خانەقینەوە هاتبوو فەلاح حەسەن، هەروەها بەهار حەمە سەعید، پەیمان حەسەن گەلاڵی و دڵشادی خوشکی و چەندینی تر، بەم شێوە چەند کەسێکی تازەمان هێنایە بواری مۆزیک و گۆرانی.



دوای ئەوە من تامەزرۆی ئەوە بووم کە خاڵە مینەی لولک ژەن بناسێنم و لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانەوە ڕاپۆرتێکی لەسەر بکەم، ڕۆژی ١٩٧٧/١١/٣بەیانییەکیان لای مزگەوتی دارالاحسان لە چایخانەکەی تەنیشتی  دانیشتبوو من و هێرش و ئەحمەد ڕەشید قەساب جێبێکمان گرتوو بردمان بۆ لای تەقتەقانی گەورەی عەنەب نزیکەی یەک کاتژمێر ئەم دیو و ئەو دیوی کاسێتێکی پڕکردەوە بە پرسیارو شمشاڵ لێدان، من تەسجیلێکی سانکیوم پێبوو، هێرش کامێرا، هێرش لە مانگی دوانزە بڵاوی کردەوە بە ناوی خۆیەوە، کاسێتەکە کەوتە لای ئەو، کە من هەموو پرسیارەکانم ئەکرد، منیش دوای ئەو لە مانگی دوانزە یەکەمین وتارم لە ڕۆژنامەی هاوکاری بڵاو کردەوە دەربارەی تیپی مۆسیقای هەڵەبجە.



مینەو شمشاڵەکەی





سـالّی (١٩٧٨) لە قۆنـاغی چـواری کـۆلیج بـووم و جارجـارە ئـەهـاتمەوە بـۆ هەڵەبجە وئاگاداری کاری هونەری ئەبووم، ئەو کاتە بەشی چالاکی قوتابخانەکان دامەزرابوو. مامۆستا حەمە فەرەج حەمـە مـوراد لێپرسـراوی بەشـی شـێوەکاری بـوو، حیکمەتـی حـاجی تۆفیـق بەشـی مۆسـیقا. ئـەو کـاتە حیکمـەت لە بـامۆک دامەزرابوو وەک مامۆسـتا، ئەویش لەگەڵ ئێمە بوو، هەڵکەوتـی شـێخ محـەمـەد، حەمیـدی حـاجی ڕەشـید خوێنـدکار بـوون لە خـانەی مامۆسـتایانی سلێمانی و مامۆستا عەلی ڕەزا لە تیپی مەولەوی بوو، مامۆستای مۆزیک لەوێ هەندێ وانەی مـۆزیکی پێ وتبوون کـەمێک نـۆتە فێرببون، ئـەو کـاتە ئیسـتینسـاخ نەبوو حەمید کتێبی فێربوونی مۆزیک کەنـاوی (ڕۆلانـد) بـوو بە دەسـت نووسـیبووەوە، چـونکە خەتی خۆشبوو. هێدی هێدی تەمرینیـان دەکـردو بـۆ هـاوینی سـالّی (١٩٧٧) مـن و هەڵکەوت و حەمید و جار جارەش مستەفا غیاث، هەڵکەوت، شـێخ ئەنـوەری شـێخ ئیبراهیمی مامی بەڕێوەبەری ئامادەیی هەڵەبجەی کوڕان بوو کە ئێسـتا ناوەکـەی بووە بە ئامادەیی ئەحمەد موختارجاف، کلیلەکەی لێ وەرگرتبوو بە درێژایی ئـەو هاوینە تەمرینمان لە نۆتە ئـەکرد، پاشـان ئیسـماعیلی سـەید حـەسـەن سـەعاتچی دەنگـی خـراپ نەبـوو ئـامێری ئیقـاع و جازیشـی دەزانـی. مسـتەفا غیـاث دوکـانی خەیاتی پـانتۆڵ دروونـی هـەبـوو حـەزی لە گیتـاری (بـاص) بـوو، دانەیەکـی کـڕی،

ئازادی مەحمودی سەراجیش تۆزێ کەمانی دەزانی و گۆرانیشی دەوت، پاشان لە ئێوارەی ڕۆژی ١٩٧٨/٢/١٨ ئاهەنگێکمان سازکرد لە هۆڵی ئامادەیی کچان، چونکە ئەوە تاکە هۆڵ بوو لە وکاتەدا، بگرە تائێستاش دوای چل ساڵ زیاتر ئێستاش هۆڵێکی شایستەی تێدا نییە ... ئەو کەسانەی وەک مۆزیکژەن بە شدارییان کرد ئەمانە بوون

| ژ | ناوی مۆزیک ژەن | ناوی ئامێر |
|---|---|---|
| ١ | ئازاد ساڵح | کەمان |
| ٢ | هەڵکەوت محەمەد | کەمان |
| ٣ | حەمید حاجی ڕەشید | کەمان |
| ٤ | ئازاد مەحمود سەڕاج | کەمان+ گۆرانی وتن |
| ٥ | ئومێد نوری | ئۆکۆردیۆن |
| ٦ | ئیسماعیل سەعید | شمشاڵ |
| ٧ | ئیسماعیل حەسەن | دەف زنجار |
| ٨ | ڕزگار صدیق | ئیقاع |



**ساڵی ١٩٧٨ هۆڵی سانەوی کوڕانی هەڵەبجە**

**لەراستەوە: ئومێدی نوری حەمەی نانەوا، ئازاد صالح، ئەوەی دەرنەچووە هەڵکەوتی شێخ محەمەد، حەمیدی حاجی رەشید**




ئیسماعیل حسن .ئیسماعیل سەعید ،ئومێد نوری، ئازاد ساڵح، هەڵکەوت محەمەد، حەمید رەشید



پێشکەشکاری نمایشەکە عومەر دڵخۆش



عەلی سەعید جەواهیر



بەختیاری وەستا هاشم



بەهار حەمە سەعیدی کەیخەسرەو

## ئەم گورانییانەمان ئامادە کردبوو:

| ژ | ناوی بەرهەم | ئاواز | هۆنراوە | وتنی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | گیانە دوێنێ شەو | ئازاد مەحمود | ئازاد مەحمود | ئازاد مەحمود |
| ٢ | لەبیرت دێ لەهەڵەبجە | هندی | نیهاد شێخ عارف | ئازاد مەحمود |
| ٣ | ئای لەمینا | فۆلکلۆر | فۆلکلۆر | بەهار حەمە سەعید |
| ٤ | کەژاڵێ | فەیزی نەژاد | فۆلکلۆر | بەختیار وەستا هاشم |
| ٥ | هەی بێنە | حەسەن زیرەک | فۆلکلۆر | عەلی سەعید جەواهیر |
| ٦ | چارۆکە هەولێرییە | حسن زیرەک | فۆلکلۆر | عەلی سەعید جەواهیر |
| ٧ | بارانە | فۆلکلۆر | فۆلکلۆر | ئیسماعیل سەید حەسەن |
| ٨ | مۆسیقای چۆپی | ولیم یۆحنا | ئەمە پارچە مۆسیقا بوو | |

١. ئـازاد مـەحمـود سـەراج ، گـۆرانی (گیـانە دوێنـێ شـەو بە خەو تۆیـان پـێ بەخشیم/ فرمێسکی شادی ژین ئەڕژا لە خۆشیم)

ئومێدی حەمەی نانەوا زۆر حەزی لە گۆرانی هیندی دەکرد ئـاوازێکی هیندی هی گۆرانی بێژی هیندی (محەمەد رفیع)وەرگێڕابوو بۆ کوردی لەو سەردەمەدا کوڕان و کیژانی عاشقی هەڵەبجەی جاران کە خەڵکە ڕەسەنەکەی خۆی تێدا بوو زۆر حەزیـان لێـدەکرد، بە نـاوی (لەبیـرت دێ لە هەڵەبـجە ئێـواران بەلارو لەنجە)ئێمەش پێشکەشمان کرد.

٢. کیژێکی منالّمـان لابوو بەهـار حـەمە سـەعید گـۆرانی ئـای لە مینـای وت کە چالاکی قوتابخانەکانی سلێمانی پێشتر بۆ کیژێکیان ئامـادە کردبوو لە تەلەفزیـۆن بە ڕەش و سپی ناوی سەباح محەمەد بوو.

٣. بەختیاری وەستا هاشم گۆرانییەکی وت بە ناوی (ئەزیـزم کەژاڵـی) ئەوەی شایانی باسە ڕۆژێکیان بەختیار ئەم گۆرانییەی دەوت لە ناوەڕاستی گـۆرانییەکە بـورایەوە، دوایی بـاش بـوو، ئاومـان کـرد بـە دەم وچاویـدا و هـاتەوە سـەر خـۆی نازانم لەبەر شەرم بوو یان چی بوو؟

٤.کاک عەلی سەعید جەواهیر کە لە ساڵی (١٩٧٤) لەگەڵمان بوو ناسراو بوو بە وتنەوەی گۆرانییەکانی حەسـەن زیرەک دوو گـورانی حەسـەنی وتەوە (چـارۆکە هەولێرییە) (هەی بێنە بۆم بێنە)

٥. ئیسماعیلی سەید حەسـەن گـۆرانی (بـارانە)ی وت، مـن کاسـێتی دەنگـی ئـەم ئاهەنگەم لایە کـاتی خـۆی هەڵکەوت و ئومێد تـەسـجیلێکی سـانکیویان لای قـاچی خۆیانەوە دادەنا و تۆماریان ئەکرد بەو شێوازە سەرەتاییە.

٦. پارچە مۆسیقای (چۆپی) دانانی ولیەم یوحەنا

پێشکەشـکاری نمایشـەکە عـومەر دڵخـۆش بـوو کە وێنەکێش و خەتخـۆش و دەنگیشی چاک بوو بۆ پێشکەشکاری. ئـەو دیکـۆرەی لە دوامـانەوەیە ئەو وێنەی کێشابوو، کامێرای سینەماییشی هـەبوو چەنـد فلمێکی گرتبـوو بە ڕەنگـاو ڕەنـگ، خۆی خەڵکی سلێمانی بـوو فەرمـانبەر بـوو لە بەدالەی تەلەفـۆنی هـەڵەبجە. وا بـاو بوو کە نمایشەکە شەوێک بۆ ژنان و شەوێک بۆ پیاوان بێت.

هەر لەگەڵ ئێمەدا باو بوو کە دوای مۆزیک، شانۆگەرییەک پێشکەش بکرێت کە تیپی شانۆیی ئەو کاتە نمایشیان کرد بە ناوی (لەدایک بوونێکی تـر) لە نووسـین و دەرهێنانی (بەهادین حاجی بەکر عومەر نەجاڕ) بوو .

لە نەورۆزی هەمان ساڵدا واتە ١٩٧٨/٣/٢١ بە هاوکاری چالاکی قوتابخانەکان:

١ـ من ئاوازیکی مامۆستا ئەنوەرم ئامادە کرد بۆ منالآن بە ناوی(دایکی شیرینم چەند خۆشەویستی... بۆ ژیانی من چەندە پێویستی... لە ناخۆشیدا ئەگەیتە فریام .....چارەسازمی کە وەختێ گریام .....ئەوەندەی کە تۆ منت خۆش ئەوێ ......من سەد ئەوەندە خۆشی تۆم ئەوێ) کچێکم هێنا بوو کردبووم بە دایک و بێشکەیەکیشی لە ماڵەوە هێنا بوو بوکێکی خستبووە ناوی و کڵاو و بەستەی ژنانی لەسەر کردبوو و خۆی کردبووە دایک و کۆمەڵێ منالّ بە دەوریدا دەسوڕانەوە.

ئێمە گروپی مۆزیک لەو کاتەدا لە خوار شانۆکەوە مۆزیکمان دەژەند بۆ ئەوەی ببێتە تابلۆیەکی هونەری، وە جێگای نواندنەکە بێتەوە وەک ئۆپەرێت ..

٢. ئومێد ئاوازێکی شێوە دڵداری ئامادە کردبوو لەسەر مۆزیکێکی هیندی بە ناوی (هانام بردە خالقی هەزارو یەکی ناوە.... لە جێیە وشک و دێمە لە جێیە کانی و ئاوە ..... دیم یارم دانیشتبوو لە سەر ئەو کانی و ئاوە هتد) ئەوانی ترم لە بیرنەماوە. بە دوو قولّی (عبدالباسطی مەلا جەلال کە ئێستا ئیمام و خەتیبی مزگەوتە لەگەڵ کچی کاک ئەمینە سوور بە ناوی(لەمیعە) ئەیان وتەوە خەڵکیان سەرسام کردبوو بە جوولەکانیان.

٣. کەژاڵی نوری حاجی حەمە کەریم کوردستانی، دەنگی خۆش بوو، بیرم دێت جلی کوڕانەی لەبەر کردبوو لەگەڵ مشکی وجامەدانە و گۆرانییەکی حەسەن زیرەکی وتەوە بە ناوی (ماڵی یارم بێ وەفا)

پاش ئێمە کچانی قوتابخانەکان چەند تابلۆیەکی هەڵپەڕکێی جوانیان پێشکەشکرد.

تیپی نواندنی هەڵەبجە شانۆگەرییەکیان ئامادە کردبوو بە ناوی (لافاو) ڕژێمی ئەو کاتە نەیهێشت نمایش بکرێت، چونکە ئەو کاتە ڕێکخستنەکانی ناو شار زۆر چالاک بوون زۆربەشیان کاری سیاسییان دەکرد و ڕێکخستن بوون، لەوانە حەکیم و بەهادینی حاجی بەکر. بۆماوەی ٤ ڕۆژ تەختەی ریکلام لە ناو بازاڕ مایەوە بە عەمودەکەی پاڵ دوکانی حەمەی سافە لە چەقی بازاڕ بوو، جاران تەختە ڕەشێک بۆیاخ دەکراو لێی دەنوسرا وەک ئێستا نەبوو بە فلێکس بێت، مانگی ٤ گەڕامەوە بۆ دەوام، چالاکی قوتابخانەکانی سلێمانی هاتن بۆ بەغداد و لە ساحەی

(علاوی الحلة) شانۆیەک هەبوو پێیان دەوت (المسرح الجوال)کە بەچادرێکی زۆر گەورە وکورسی مودەرجی ڕەنگاو ڕەنگ و شانۆیەکی گەورە کە هەڵئەدرا بە شەو ئۆپەریتێکیان ئامادە کردبوو لە ئاوازی دلێر ئیبراهیم کە منالآنی سلێمانی نواندن و مۆزیکیان دەژەند لەوانە کارزان و فەرمان و چەند منالێکی تر بە ناوی (بەیتی ڕێزانکێ) کە بۆ تەلەفزیۆنیش تۆمارکرا، بەداخەوە پاش ماوەیەک ویستیان بچن بۆ هەولێر لە دواوە پاسەکەیان، ئۆتومبیلێکی گەورە لێی دان و کارزان و فەرمان برا بوون ئازاد و یەکێکی تریان کە هەموو چوار بوون گیانیان لە دەستدا کە برینێکی خستە دڵی هەموو کەسێکەوە، بە جارێک سلێمانی بۆیان ڕەشپۆش بوو، تەنانەت زۆر کاریگەر بوو لە سەر مامۆستاکەیان دلێر ئیبراهیم، بەو بۆنەیەوە ئاوازێکی خەمناکی بۆ دانا، ئەسعەد قەرەداغی وتیەوە .

### ساڵی ۱۹۷۸ کۆلێژم تەواوکرد و کرام بەسەرباز

لە ساڵی (۱۹۷۸) پێش دەرچوونم لە کۆلێج وێنەی دەرچوونمان گرت و لەگەڵ ئەو قوتابی و مامۆستایانەی کە وانەیان پێ دەوتین بە داخەوە (گرتبوومە ناو چوارچێوە و فەوتا لە کاتی کیمیابارانەکە).

بۆ هاوینەکەی دەرچووم و وێنەی دەرچوونەکەم بە کڵاو و ڕۆبەوە گرت لە ستۆدیۆ هونەر لە سلێمانی لە کۆتایی شەقامی مەولەوی تا ساڵی (۲۰۰۵) مابووم، ئەویش دوایی فەوتا ...

ژیانی من هێندە هەڵبەزو دابەزی دیوە مەگەر خۆم بزانم، چاوەڕێی ئەوە بووم بکرێمە سەرباز هەرواش بوو بۆ سەرەتای مانگی حەوتی (۱۹۷۸) چەند کەسێکمان چووین بۆ تەجنیدی هەڵەبجەو سەوقیان کردین بۆ سەربازی لەوانە من بووم، سەرکۆ بوو، نەوزادی حاجی ئەمین بوو، حەمیدی مەلا نوری کە پێکەوە لە پۆلێک بووین . قاسم ناوێک کوڕی حاجی تاهیری بەزاز بوو بە ئەسڵ خەڵکی وارماوا بوون، خزمی جەمیل و کاملی حەمەو بەگ بوون، کە ئەویش تەجنیدی هەڵەبجە بوو کۆلێجی هەندەسەی تەواو کردبوو، لێرەوە دوای نیوەڕۆیەک بە

(مأموری سه ربازی) بردیانین بۆ ئینزیباتخانەی سلێمانی و ئەو کاتە دایکم هاتبوو بە دوامدا و لەگەڵ پوورە فەخریەم هاتن بۆ لام. ئەو شەوە لە حامیەی سلێمانی بووین بۆ سبەی سەربازێکی ترمان لەگەڵ بوو ناردیانین بۆ بەغداد ئەوسا وا بوو بە مأمور دەبرایت، زۆر ناخۆش بوو یەکەم جارم بوو شتی وا ببینم وکۆت و بەند و ئەمر کردنی تێدا بێت، دوای ئەوە ئێمە براین بۆ مەعسکەر الرشید بۆ کۆلێجی (الضباط الاحتیاط) جاران وابوو ئەوەی کۆلێجی تەواو بکردایە دەبرا ئەگەر بە دڵیان بوایە دەبوویتە ئەفسەر، چەند ڕۆژێک لەوێ بووین بەڵام خۆشبەختانە لە ناو بەغدا بووین، مۆڵەتیان دەداین کە دابەزین و شەو لە (ئوتێل شیرین)بووین لەگەڵ حەمیدی مەلا نوری لە شارع الجمهوریة، چەند ڕۆژێک لەو کۆلێجە هەموو جۆرە پشکنینت بۆ ئەکرا بۆ ئەوەی ببیتە ئەفسەری احتیاط، من لە هەموو پشکنینەکان دەرچووم و سەرکۆ بوو بە ئەفسەر، بەڵام ئەو کاتە عیراق بەرە و پێشکەوتن ئەڕۆشت پێویستی بە توانای گەنج و خوێندەوار بوو، ئەو کاتە ئەحمەد حەسەن بەکر سەرۆک کۆمار بوو بڕیارێکی دەرکرد بۆ دوو کۆلێج، کۆلیجی بەڕێوەبردن و ئابووری لەگەڵ ئەندازیاری بۆ ماوەی دوو ساڵ دواخراین (تأجیل) کراین و ئەو کاتە بە سیستەمی مەرکەزی دادەمەزرایت، من بەر وەزارەتی کارەبا کەوتم هەروەها حەمیدی مەلا نوریش ئەو لە بەشی (موختەبەری بیناسازی) .

ئەو کاتە محەمەد عایش وەزیری پیشەسازی بوو، دوای ساڵێک صەدام کە بوو بە سەرۆک کۆمار چەند کەسێکی لە ناو برد و کوشتنی، لەوانە محەمەد عایش، محمد محجوب و خالد عبد عثمان، نعیم حداد وزۆری تر، ئەم وەزیرە یەکێک بوو لەوان کە لەوەو پێش سەرۆکی نەقابەی کرێکارانی عێراق بوو، ئیتر وا نیاز بوو لە فەرمانگەی کارەبای سلێمانی دامەزرێم و ناوم چوو بۆدائیرەی ئەمن کە ئایا هیچم لە سەر نییە، بەڵام پێش ئەوە لە داخلی یادەوەرییەکانی جیڤارام ئەخوێندەوە و خەریک بوو تێکەڵی سیاسەت بم، بەڵام نەبووم بە هیچ، هەر چەندە هەواداری بیری چەپ بووم، بەڵام سەر بە هیچ ڕێکخراوێک نەبووم، پاش مانگێک ناوم هاتەوە ولەگەڵ عەبدولڕەحمانی جەلالە شەل کە دەرچووی پیشەسازی بوو ناومان هاتەوە و دامەزراین، من لە خەیاڵ بووم لە فەرمانگەی کارەبای سلێمانی دەوام بکەم، بەڵام ماڵمان لە هەڵەبجە بوو کە چووم بۆ لای بەڕێوەبەرەکە ناوی (حەسەن زێوەر) بوو پێموت دەمەویت لە هەڵەبجە دەوام بکەم، وتی ئارەزووی

خۆته و وای کرد و له مانگی یانزەی ئەو ساڵە دامەزرام بە (ی .ژمێریار) ئەو کاتە چەند کەسێکی تر دوای من دامەزران و خەڵکی عەبابەیلێ و دوو هاوڕێی یەک بوون ودوو کەسی قسە خۆش(شێخ  حەمە ساڵح و حەمە رەشید هۆمەر وە دوو کچ قـومری عبداللـه وفـاتمە سـبحان) زۆربەی فـەرمـانبەرانم دەناسـی لەوانە هونەرمەندان جـەمـال مەلا قـادر، حـەمە سـەعید مەلا محـەمـەد، کەمـالی ناهید، عومەری حاجی عیزەت کە باوکی خاڵی باوکم بوو، مەحمودی حەسەن موانی، حامیدی مە لا محەمەد – ئە مین صندوق بوو ئەوانی تر عداد بوون و دوایش محەمەدی ئەحمەدی کارەباو چەند کرێکارێک تا ئیستاش ماون بە ناوی ئەحمەد قاجری هەروەها عەزیزە سمێڵ و چەندانی تر و بە ڕێوەبەرەکەش شەهید تۆفیقی کـارەبـا بـوو کە زۆر هاوکـاری ئـەکـردم،  بە ڕاسـتی زۆر نـامۆ بـوو بـۆ مـن لە خانووەکەی حاجی خڕە دا بووین بەرامبەر چایخانەی شنروێ کە کۆن باخچەی عەلە بەڕانی بوو، من تاقەتی ئەو دەوامەو ئەو شوێنەم نەبوو، زۆر جار بیانووم ئـەدۆزیەوە بـۆ ئـەوەی کـاری هـونەری بـکەم و نـەچـم بـۆ دەوام، لەو کـاتەدا مووچەکەم ٤٩ دینار بوو، هەر بۆ خەرجی خۆم بوو، من پەیوەندیم لەگەڵ خێزانی حەمەی مەلا ئەمین چاک بوو بە تایبەتی هێرش، زۆر هاوڕێم بوو، مامیشی  کاک فەرەجی مەلا ئەمین سیاسییەکی چەپی تێکۆشەربوو، زۆر جار لای دادەنیشتم دوکـانەکەی لە شـوێنی ئەو شـوێنەی کە ئێسـتا پێـی دەڵـێن کتێبخـانەی هـەژار موکریـانی لەوێ بـوو وەکـالەتی (الاجهـزة الـدقیقه)ی هـەبـوو وەک تـەلەفزیـۆن و مەوادی کارەبـای تەسـجیلێکی(ڕایزنـگ)م بە قیسـت لێکڕی بـۆ خـۆم، دەنگی زۆر خۆش بوو لەگەڵ تەلەفزیۆنێکی توشیبا، مـن  شـەوانە هاوڕێکانم وەک حیکمەتـی حـاجی تۆفیـق، ئەحمـەد ڕەشـید بـرای ئـە سـغەر ئـەهـاتن بـۆ لام، دایکـم جـوانترین خزمەتی ئەکردن.

لەو ساڵەدا ئێمە لە مەڵبەندی لاوان لای سەرا لە ڕێگای بامۆک لە خانوویەکی گەورەدا بووین، لە سووچەکەدا، نـازانم ئێسـتاش ئـەو خـانووە مـاوە نـازانم هینـی کێیە؟ ئیتر ڕۆژانە قوتابی ئەهـات و ئێمەش پرۆڤـەمـان  پـێ دەکردن و هـەڵکەوت هەفتانە ئەچوو بۆ سلێمانی و لە لاوانـی ئـەوێ ئـامێری مـۆزیکی و پێداویسـتی بـۆ دەهێنـاین و  هەڵکەوتیش هەر ئەو ساڵە لە سیروان ببووە مامۆستا، تیپی نواندنیش هەر لەوێ بوون، چونکە هیچمان مۆڵەتمان نەبوو، چەندەها فێرخوازی تر هاتن بۆ لامان کە دواتر باسی دەکەم.

## چالاكییەكانی ساڵی ١٩٧٩

ساڵی (١٩٧٩) نزیک بووەوە و لە سەرەتای ساڵدا دەستمان کرد بە پرۆڤەکردن و لە ڕێکەوتی ١٩٧٩/٢/٢٠ توانیمان ئاهەنگێک ساز بکەین بەم شێوەی خوارەوە و ئەم ئەندامانە بە شداربوون کە چەند فێرخوازێکی تر فێرببون لەوانە: ئەحمەد عەلی کە دەست و پەنجەیەکی جوانی هەبوو لە ژەنین، ڕزگار فەرەج، محەمەد ئەحمەد کارەبا، بەهمەن ئەحمەد، عومەرحەمە ڕەحیم (دانا هەڵەبجەیی)، ئیسماعیل سەعید (ڕۆحی شاد بێت)، چەندینی تر.

ئەمە خشتەی ئەو بەرهەمانەیە کە ئاماژەم پێداوە

| ژ | ناوی ژەنیار | جۆری ئامێر |
|---|---|---|
| ١ | ئازاد صاڵح | کەمان |
| ٢ | هەڵکەوت محەمەد | کەمان |
| ٣ | ڕزگار فەرەج | کەمان |
| ٤ | ئەحمەد عەلی | کەمان |
| ٥ | محەمەد ئەحمەد کارەبا (حەمە قیادە) | کەمان |
| ٦ | ئومێد نوری | ئۆرگ |
| ٧ | ئیسماعیل سەعید | ئۆکۆردیۆن |
| ٨ | عومەر حەمە رەحیم (دانا هەڵەبجەیی) | مثلث |
| ٩ | بەهمەن ئەحمەد | ئیقاع |

ئێمە گۆرانی بێژەکانیشمان ئەکرد بە کۆرس و گۆرانیشیان ئەوت لەوانە بەختیار وەستا هاشم، سیروان عەلی ڕەزا، عەلی سەعید جەواهر، هەردی تۆفیق.... هتد.



ئەو کارانەی لەو ساڵەدا پێشکەشمان کردووەو بە کاسێت لەلام هەیە:

١. سروودی ئەی وەتەن چەند خۆشەویستی، هۆنراوەی زێوەر و ئاوازی کۆن

٢. عەلی سەعید جەواهیر دوو گۆرانی حەسەن زیرەک (نەسرین، کۆرپەی دڵەکەم ئارەزوو)

٣. دارا محەمەد عوسمان، تازە گۆرانی(ئای بە ناز)ی لە تەلەفزیۆن تۆمارکردبوو لەگەڵ تیپی مەولەوی و نامدار قەرەداغی بۆی ئامادە کردبوو ئەو شەوە لەو ئاهەنگە بوو بانگمان کردە سەرەوە  ئەو گۆرانییەی گوت...

٤. سیروان عەلی ڕەزا ئاوازێکی خۆی هەبوو من مۆسیقام بۆ ئامادەکردو ئیتر کەوتمە ئامادە کردنی مۆزیک و ئاوازدانان

٥. ئاوازێکی مناڵانم دانا و کردم بە تابلۆیەک بە (جلی شیفۆنی مۆر)، مستەفای خەیات کە دوکانەکەی نزیک دوکانی کاک دلێری مامە عومەر فەرەج بوو کە ئەویش دوکانی خەیاتی جلی ژنانی هەبوو بەرامبەر چایخانەی خاڵە و جلەکانی درووی و باڵی بۆ کرد وەک کۆترێک...

شیعرەکە بەناوی (کۆترێکی نەشمیلانە) بوو  لە شیعری لەتیف شێخ عارف و تیپەکە لە خوارەوە بوو، کچێکی تازە پێگەیشتوو کە دراوسێ و خزممان بوو(نەخشین کچی جەلالی وەستا مەردان) لە خواری شانۆکە دانیشتبوو لەگەڵمان و لەسەر شانۆ ئەو کیژێکی قژ زەردی جوان ناوەکەیم لە بیر نەماوە کچی مامۆستا شێخ ماجد عەبابەیلێی بوو جوڵەکانی دەکرد لەسەر شانۆ.

٦. ئاوازێکی فۆلکلۆریم بە ناوی (بەتۆری کرد بۆ تۆرای، هۆ گوڵە لەسەر چی تۆرای، ڕاوەستاوە لە دووی دەری، دوو گوڵی داوە تەوقە سەری، سەد ساڵ ئەبم بە نۆکەری، بە شەرتێ پێم بڵێ کوێنەری، نازدارەکەم کێ لێی دای) شێوازێکی وام دروستکردبوو کە کچێک  بەرامبەری بوو وەک ئەوەی دڵداری لەگەڵ بکات، هەمووشیان مناڵ بوون لەوانە کچەکانی حەمەی سۆفی زۆر جێگای سەرنجی بینەران بوون خۆم پێشەکی مۆسیقایەکەیم بۆ دانا.

دوای ئەم ئاهەنگە پەیامنێری هاوکاری ڕاپۆرتێکی نووسی لە سەری ئەوەی شایانی باسە کاک ئەحمەد عبدالله (ڕۆحی شاد بێت)  ستۆدیۆی وێنەگرتنی هەبوو لە کانی قوڵکە، دەهات وێنەی دەگرت و بۆ سبەی هەمووی لە جامخانەکەدا دادەنا کە زیاتر لە پەنجا وێنە دەبوو، ئیتر ئەندامەکان لە کۆرس و مۆزیک و گورانی بێژ

دەیـانکرد، هێنـدەی لە یـادەوەریم مـاوە گـۆرانی بێژێکی میللـی هـەبـوو (خـولەی شـێرالی)بـانگم کـرد و یـەک دوو گـۆرانی وت لەو ئـاهەنگە، بە نـاوی (هـەی زێنـی عەمـرم زێنـی / زێنـێم خەڵکـی گەرمێنـێ). ئـەمەش وێـنەو بە تۆمـاری دەنگـیش مامۆستا هـەڵکەوت بە تەسـجیلێکی سـانکیو لە ژێر کورسـیەکەی خۆی تۆمـاری کردوە.



عەلی سەعید جەواهیر







تابلۆی بۆ تۆرای (هەردی تۆفیق)

دوای ئێمەش تیپی نواندنی هەڵەبجە شانۆیی (مەسەلەی ویژدان) کە حەکیم مەلا ساڵح سوودی لە چیرۆکی مەسەلەی ویژدانی ئەحمەد موختارجاف وەرگرتبوو خۆشی دەرهێنانی بۆ کرد.

ئێمە لەگەڵ ئەندامانی تیپی شانۆ پەیوەندییەکی توندو تۆڵمان هەبوو کە (حەکیم ، ڕزگار سدیق (ڕۆحی شاد)، عبداللەی حەمە لاو بەگ، بەهادینی حاجی بەکر، شێرکۆ سەعید قەساب، کامەران ئەحمەد کارەبا، عومەری مینە، سەلاح حاجی عەلی، بەرزان عەینەدین، زۆری تر، تا ئێستاش ئەو پەیوەندییەم ماوە لەگەڵیان، دوایش عوسمان عبدالله وجەلال عوسمان و ڕێبوار و نزار نوری برای و چەندینی تر ..

## هاوینی (١٩٧٩) و هاتنی چەند ئەندامێکی تر

بـۆ هــاوین بەردەوام بــووین لە خــول کــردنەوە بــۆ فێرخوازانمــان و چەنــد قوتابیەکی ترمان هێنایە ڕیزی هونەرەوە ....

پاشان هەر لە ساڵی (١٩٧٩) کامێرایەکی سینەماییم لە سلێمانی کڕی کە فلیمی ٦ ملیمی ڕەنگاو ڕەنگی دەخـوارد مـاوەکەی ٣,٥ چـرکە بـوو چەنـدین گـۆرانیم پـێ وێنەگرت کە پاشان باسی دەکەم ...

ئـەم چـالاکییە سـەرکەوتوو بـوو، بـۆ هـاوینەکەی زۆر فێرخـواز و گـۆرانی بێـژ هاتنە لامان تا ئێستاش پەیوەندیمان هەیە لەوانە :

هۆشیار حەمە فەرەج خۆی دراوسێی ماڵمان بوون کە نانەوا خانەکەیان خوار ماڵمان بوو، لە گەڕەکی سەروو مزگەوتی دار الاحسان، نزیکی عەسـرێکی هـاوین بوو، هۆشیار لەگەڵ عەلی سەعید جەواهر هاتن، بیرم دێت لە سـەر دوو کورسـی دانیشتن کە بە چەرمی سوور داپۆشرابوو، من وشیارم ئەناسی نەمئەزانی حەزی لە گۆرانییە و زیاتر لەگەڵ رەوان شادان شاهۆی برای و حـەمە بـالاّ بەرزو عـەلی وەرزشی دەکرد، وتم شتێک بڵی و دەستی کرد بە گۆرانی وتن گۆرانییەکی خەلیل عەبدولرەحمانی وت (بۆ لێم زیزی نام دوێنی) و دوایش چەند گۆرانییەکی حەسەن زیرەکی وت، وتم دەنگت چاکە و تەمرین بکەو بەشداربە لەگەڵمان.

هۆشیار هەموو گیانی بوو بە عارەق نازانم شـەرمی ئـەکرد، ئیتر لەو سـاتەوە هاتە بواری هونەروقاڵ بووەوە و تا ئێستا گۆرانی بێژیکی سەرکەوتووە...

هەر لە هاوینەدا بوو نیوەڕۆیەکی گەرم بوو سەریاسـی حـاجی کـەریـم بـرای کـۆچ کـردوو سـارەوانی حـاجی کـەریـم ئـەوبەری کە بە ئـەسـڵ خـەڵکی سولاسـی باوەجانن، کە هاوڕێم بوو لە منداڵیەوە، کەمانێکی بۆ هێنام وتی کـاک ئـازاد کـۆکی بکە، وتم هی خۆتە وتی نا هی کوڕێکە ناوی عەزیزە، چووومە دەرەوە سەیرم کـرد مـاوەی سـەد مەترێـک دوور لە لای مـاڵی مسـتەفا بەختیـارەوە وەسـتاوە لەبەر سێبەرەکە بانگم کرد ئیتر بیرم نایەت هات یان نەهات، دوای چەند ڕۆژێک ئەویش دەسـتی کـرد بە هـاتوو چـۆی ئـەو مەڵبەنـدە و بـووە دۆسـت و ئـەنـدام لە تیـپ و چەندین ئامێری ئاڵ و گۆڕ کرد ،کەمان، عود، سکسافۆن، چەلۆ ...



**شوێن مەڵبەندی لاوان لە ڕێی بامۆک، لەراستەوە : نەوزاد محمد صۆفی، عەزیز حەمە کەریم، ئاراس شێخ جەمال، عومەرحەمە ڕەحیم (دانا هەڵەبجەیی)**

ڕۆژێکیان ئاراسی شێخ جەمال هات بۆ لامان نامەیەکی ئارامی برای پێ بوو کە تیادا نووسرا بوو وا ئاراسی برام دەنێرمە لاتان بەڵکو فێری مۆزیک بێت و ئاگاداری بن، چونکە باوکیان نەمابوو ئەو سەرپەرشتی دەکردن وەک برا گەورە، ئێمەش بە خۆش حاڵییەوە رەزامەندیمان وەرگرت، هەر بەهۆی ئاراسەوە شوانەی عەلی مەجیلان و نەوزادی حەمەی سۆفی نزیک بوونەوە و شوانە چووە سەر ئامێری کەمان و نەوزادیش ئۆکۆردیۆن، هەروەها کوڕێکی تر کە ناوی فەلاح بوو خەڵکی خانەقین بوو کە ئاوارە بوون کوڕێکی زیرەک و چاپووک و زیتەڵ هاتە سەر ئۆکۆردیۆن.

پاشان ڕزگاری شێخ سدیق کە ماڵەکەیان نزیک بوو، لە خێزانێکی ڕۆشنبیرو سیاسی بوون و برای ڕەوان شاد حەمە ئاوات هاتە هاتوچۆ کردن و تەمرینکردن، ژوورێکی بچوک هەبوو لە دواوە تەختەیەکی ڕەشمان دانا بوو، من یان هە ڵکەوت وانەی تێوریمان پێدەوتن، وردە وردە هەندێ ئە ندامی تازەمان درووست کردوو هەندێکیش دوورکەوتنەوە، ئەو ساڵە مامۆستا سەلاّح ڕەئوف کتێبی فێربوونی کەمانچەی چاپ کردبوو بە کوردی، زۆر سوود بەخش بوو، هەرچی پارچە

مۆسیقای وەک: لاوک و تانجەرۆ، ئەنوەر قەرەداغی: مەم و زین، کوێستانان، شایی ... هتد فریشتە و کاروان: هی خالید، نەسرین و سەما هی ولیم یوحنا و چەمی ڕێزانی هی حەسەنی حاجی قاسم ... زەردەخەنەی فرەنسیس داود، چەندینی تر کە هەموویم بە وردی لەبەر کردبوو. وە هەر ئەو ساڵە بوو هەڵکەوت لە لاوانی سلێمانی ئۆرگێکی هێنا و ئومێد چووە سەری زۆر دڵخۆش بوو پێی، ئەمانە یادەوەری ئەو ساڵەن کە لە یادمدا بێت، دوای لێبوردن ئەکەم کە ناوی هەر کەسێکم لە بیر چووبێت، چونکە زۆربەی ئەم کەسانە هاوڕێمن، هەر کەس هەر یادەوەری یان زانیاری یان ڕەخنەی هەیە ئەتوانێت ڕای خۆی بڵێ من هەموو شتێکم لە یاد نییە، لەوانەیە لە مێژووەکە پاش و پێش و لە بیرکردنم کردبێت نازانم .. سوپاس بۆ هەر زانیارییەک.

ئێمە (فۆرم)ێکمان چاپکردبوو بۆ وەرگرتنی ئەندام تا ئێستاش زۆربەی ماوە لە ئەرشیفی تیپی شنروێ.

**دروستکردنی تیپی منالانی (مامڵێ)**

ئێمە لە فێرکردنی فێرخوازان بەردەوام بووین و توانیمان گروپێکی منالانیش دروست بکەین کە خۆیان ناوەکەیان هەڵبژارد بە ناوی (مامڵێ)وە، هەر لەو شوێنەدا پرۆڤەیان دەکرد لەگەڵمان، ئەو کاتانە کەسێک بەڕێوەبەری لاوان بوو ناوی ئەنوەر محەمەد ڕەشید بوو کە شاعیر بوو و خەڵکی سلێمانی بوو کلێتەیەکی ڕەش وسپی لە سەربوو لە کاتی ئەودا زۆر چالاکی ئەدەبی و هونەری ئەنجام درا تەنانەت هەر جارەی کەسێکمان کۆڕەکەمان دەبرد بەڕێوە.

جارێکیان کۆڕێک بۆشاعیر و نووسەر محەمەد حەمە باقی بەسترا، من کۆڕەکەم بەڕێوە برد، هەر هەفتەی جارێ کەسێکی بانگ دەکرد لە شاعیرو نووسەرە بە ئەزموونەکان یان تازە پێگەشتووەکان، لەوانە: شێرکۆ بێکەس، ڕەئوف بێگەرد، جەمال غەمبار، بەرزان هەستیار، بەیاد عبدالقادر.

هەروەها لە هەڵەبجەش هەندێ شاعیری لاو هاتبوونە بواری شیعر، لەوانە جەباری حاجی کەرەم خان، فاروق فەتاح هەڵەبجەیی(ف .ف .ە) و دڵشادی عومەری کاکی، ئیبراهیم هەورامانی، جەلال عازەبانی، پاشان لە ساڵانی سەرەتای هەشتاکان سەلاحە ڕەش وەک شانۆکار پاشان وەک شاعیر دەرکەوت، جموجوڵێکی هونەری وئەدەبی زۆر کەوتە ناو هەڵەبجەوە، بە هونەرو ئەدەب و تەنانەت وەرزشیش .

کۆتایی ساڵی (١٩٧٩) بوو بەڕێوەبەری لاوانی سلێمانی ناوی (عەلی وودی) کە عەرەب بوو لەگەڵ حسین جمبوش کە لێپرسراوی بەشی مۆزیک بوو خۆی ئە ندامی تیپی مۆزیکی سلێمانی بوو. هاتن داوایان لی کردین کە بەشدار بین لە ئاهەنگی سەری ساڵ بۆ ١٩٨٠/١/١ لە ئوتێل حەسیب ساڵح، ئێمەش دەستمان کرد بە پرۆڤە کردن، سەیر بوو چونکە ئێمە یەکەم جاربوو لە یادێکی وا بەشدار بین یەکەمین کار سروودێکمان ئامادە کردبوو، چونکە شارەزای ئاهەنگی سەری ساڵ نەبووبووین، هەر لە سلێمانیش تازە بوو، هەردوای ئەوە بۆ شەوی ١٩٨٠/١/١ چووین بۆ سلێمانی لە ئوتێلێک دابەزین کە نزیک ئەوێ بوو لە بازاڕی سەعید تەها کۆیی ناوی ئوتێل هیوا بوو، ئێمە عەسر گەشتینە سلێمانی، دوای پیاسەیەک و نان خواردنی ئێوارە، نزیکەی کاتژمێر هەشت دەستمان کرد بە نمایش و هۆڵەکە چەند مێزێک و بە دەوریدا وچەند کورسییەک و شانۆکەش ڕازابووەوە بە گڵۆپ و دیکۆری جوان، هێندەی نەبرد پڕ بوو لە خێزان و کچ و کوڕی لاو و جلوبەرگی نیمچە ڕووتی کیژان و هێندەی نەبرد هۆڵەکە جۆش و خرۆشی تێکەوت و سەر مێز ڕازابووەوە بە چەندین خواردن و خواردنەوەی جۆراو جۆر هۆڵ جمەی ئەهات لە ئاوازو گۆرانی وردە وردە مەست ببوون، ئێمە کاری خۆمان ئەنجام داو لەو چالاکییەدا وشیاری حەمە فەرەجیشمان لەگەڵ بوو، ئیسماعیل سەعید فێری ئامێری کلارنێت ببوو من پارچە مۆزیکێکم دانا بوو ئەو شەوە دوای ئێمە تیپی جازی ڕۆژ ئاوایی وا بزانم تیپی مۆسیقای بابان بوون بە خۆیان و جازو گیتارەکەیان هاتنە سەر شانۆ و چەندین کیژو کوڕ هاتنە سەر شانۆ و جوانترین دانسیان ئەکرد لارو لەنجەی جەستە و بۆنی عەتر و دەنگی مۆزیک، جلی ئاڵووالا هەندێکیان بە پانتۆڵی ڕەشی چەرمەوە چەسپ ببون بە جەستەیانەوە وەک ماسی لە ئاودا سەمایان ئەکرد کە شیعرەکەی گۆرانم بیر ئەکەوتەوە بە ناوی (شەوێک لە عەبدولا)

ئەوشـەوە م.سـەلاح ڕەئـوف لەوێ بـوو لە هـۆڵی دانیشـتنەکە، کە هـاتە لامـان سەرسامی خۆی دەربڕی بە ژەنینی کلارنێت ژەنەکە، پاشان ئیبراهیم خەیات هاتە لامان، تۆزێ گۆرانی گیانەکەم بۆ وات لێ کردمی وت بۆمان، منیش کەمانەکەم پێ بوو، لە گەڵیدا من بە کەمان و ئیسماعیل بەکلارنێت دەمانژەند بۆی، بە ڕاستی لای من شەوێکی پەمەیی و ناوازە بوو کە هەرگیز لە یادم ناچێتەوە .

## چالاکی ساڵی ١٩٨٠

بۆ مانگی دووی ١٩٨٠ لەگەڵ تیپی شانۆ خۆمان ئامادەکرد بۆ چالاکییەکی تـر، کە بۆ ماوەی ٦ شەو نمایشمانکرد، ئـەو کـاتە تیپـی منالانیشـمان ئامـادەکردبوو لە ڕێکـەوتی ١٤/٢/تـا ١٩٨٠/٢/٢٠ بەردەوام بـوو کە شــەو دوای شــەو قەرەبـاڵغتر ئەبوو، ئەندامانی موزیکژەن بریتیبوون لە:

| ژ | ناوی ژەنیار | جۆری ئامێر |
|---|---|---|
| ١ | ئازاد ساڵح سەرپەرشتیاری گروپ | کەمان |
| ٢ | حیکمەت تۆفیق | کەمان |
| ٣ | هەڵکەوت محەمەد | کەمان |
| ٤ | ئەحمەد عەلی | کەمان |
| ٥ | عومەر حەمە ڕەحیم | کەمان |
| ٦ | ئومێد نوری | ئۆرگ |
| ٧ | مامۆستایەکی خانەقینی بوو ناوەکەیم لە بیر نەماوە | شمشاڵ |
| ٨ | ئاراس شێخ جەمال | دەف |
| ٩ | ئیسماعیل سەید حەسەن | جاز |
| ١٠ | بەهمەن ئەحمەد | ئیقاع |
| ١١ | ئیسماعیل سەعید | کلارنێت |
| ١٢ | عەزیز حەمە کەریم | سکسافۆن |

وەک  وتم سوودمان لە گۆرانی بێژەکان وەرئەگرت بۆ کۆرس کە نۆبەیان ئەهات دەهاتن گورانییەکەیان دەوت کۆرسەکانیش لە وێنەکەدا دیارن

لەوانە: بەختیار وەستا هاشم، شەهید (شاهۆ)، ئاراس حاجی سەعید سەعاتچی، هۆشیار حەمە فەرەج، شوان عەلی مەجیلان، ڕزگار سدیق، نەوزاد محەمەد سۆفی، ڕزگار خالیدی  ئامۆزام و چەندینی تر



ئێمە ساڵێک لەوەوبەر واتە هاوینی (١٩٧٩) ناوی تیپی مۆزیکی هەڵەبجەمان گۆڕی بۆ (شنروێ) ئومێدیش پیشنیاری کرد وتی (شنروێ) مامۆستا ع .ع شەونم ئەڵێت واتە شنەی شەو ڕەوێ، واتە کە بەشەو سەردەکەویت پیایدا شنەیەکی فێنک دێتە گیانت.

ئەم گۆرانی و سروودانە پێشکەش کران لەو ئاهەنگە:

١. لە خەو هەڵسن درەنگە، شیعری ئەحمەد موختارجاف، ئاوازی ئومێد نوری، ئامادەکردنی ئازاد ساڵح

٢. پارچە مۆسیقایەک بە ناوی (شنەی مۆردانە) من دام نابوو ئاوازەکەیم لە بیرماوە.

٣. هۆشیار حەمە فەرەج، گۆرانییەکی حەسەن زیرەکی وت بە ناوی (دەنگیان نایە)

٤. شاهۆ حسێن، دوو گۆرانی ناسری ڕەزازی وت، ساقی بۆم تێکە لەگەڵ ئەرێ بەناز

٥. بەختیاری وەستا هاشم (ئەزیزم کەژاڵێ مەتۆرێ مەڕۆ لەلام/ ئەزانی کە بەدەردی ئەوینی تۆ موبتەلام)

٦. سیروان عەلی رەزا (هەرمن بێکەسم ) کە گۆرانییەکی ناسری ڕەزازی بوو.

٧. گۆرانی نازەنین لەوتنی (سەباح مەریوانی) ئەم گۆرانییەی لە تەلەفزیۆنی کەرکوک وتبوو زاوای ماڵی سەعید چاوشین بوو کە لە کەرکوکەوە هاتبوو لەگەڵمان بەشداربوو. هەروەها دوو منداڵی عەرەبیش گۆرانییان وت کچ و کوڕێک گۆرانی (بین العصر والمغرب، مرت لمت خيالة. وعرفت فرس وليفي، لونها شگرة وميالة) کە گۆرانییەکی رضا الخياط بوو، ویستیان سروودێک بڵێن من وتم با گۆرانی بێت کچەکە ناوی رجاء بوو منداڵێکی ئەسمەر بوو ناوی کوڕەکەم لە بیر نەماوە.

پاش ئێمە تیپی منداڵانی ماملێ دابەزین کە بۆ یەکەمجاریان بوو بێنە سەر شانۆ وەک مۆزیک کە بریتیبوون لەمانە:

| ژ | ناوی ژەنیار | جۆری ئامێر |
|---|---|---|
| ١ | ڕوشدی تۆفیق | کەمان |
| ٢ | شێرکۆ جەعفەر | کەمان |
| ٣ | جەمیل سەید قادر | کەمان |
| ٤ | ڕزگار شێخ سدیق | ئۆکۆردیۆن |
| ٥ | نەوزاد محەمەد سۆفی | ئۆکۆردیۆن |
| ٦ | فەلاح حەسەن خەڵکی خانە قین بوو | ئۆکۆردیۆن |
| ٧ | سۆران کەمال | گیتار |
| ٨ | کەسێک لە خێزانی مایجانەکان بوو (ناوی نازانم) | ئۆکۆردیۆن |

من هەرچی خوشکەکانی خۆم: نیان، پەیمان، کچانی دراوسێی خۆمان: نەرمین حەمەی لاسلکی، جوانی خوشکی، نازەی حەمەی سابیر و خوشکەکەی نیاز و چەندینی تر هەمووی کۆرس بوون کە ئەو کاتە چەندین منداڵمان هاندەدا بۆ ئەوەی بێنە ناو بواری مۆزیکەوە.

هێندەی بیرم بێت ئەم گورانییانەمان بۆ ئامادە کردن:

١. پارچە مۆسیقایەک من دامنا بوو بە ناوی (یادی هاوار) کە بریتی بوو لە حەسرەتێک بۆ داگرتنی گوندەکانی سنوور و دروستکردنی موجەمەعەکان کە

دوو ئۆردوگا درووست کرا بوون لە عەنەب ، زەمەقی، سیروان، سەید سادق، شانەدەری، لە عەربەت و نەسرو باریکە کە بە پێی ڕێکەوتنی جەزائیری نێوان عێراق و ئێران، لادێکان داگیران و پێشتر ئاشبەتاڵی لێدروست بوو لە ساڵی (١٩٧٥) دا.

٢. گۆرانییەکی فۆلکلۆری بە ناوی (خاڵداری) هەردی تۆفیق وتی کە سەرکەوتوو بوو



تیپی منداڵانی مامڵێ

پاش ئێمە تیپی نواندنی هەڵەبجە شانۆگەری (میرات)ی پێشکەشکرد، نووسینی حەکیمی مەلا ساڵح بوو کە بە شدارانی شانۆکە دەتوانن ڕۆڵەکانیان بزانن، چونکە من لە یادم نەماوە ..

لە شەوی ١٤ لە سەر ١٥ /١٩٨٠/٦ی هەمان ساڵ لە هۆڵی کارگەی جگەرەی سلێمانی لە ڤیستیڤاڵی مەڵبەندی لاوانی کوردستان بەشداریمان کرد و ئەو کەسانەی لە تیپی مامڵێ بە توانا بوون بەشدارییان کرد لەگەڵمان، ئەم بەرهەمانەمان پێشکەش کرد:

١. هەمان مۆسیقای یادی هاوار

٢. گۆرانی خاڵداری، ئەمجارە کچێکی منداڵ بە ناوی گۆنا محەمەد ڕەشان

٣. شەماڵ بیشەنێ، وتنی: ڕزگار حەمە سەلیم، ئاوازی من بوو

٤. گورانی مەیرۆ مەیرۆ، وتنی: بەهار حەمە سەعید، فۆلکلۆر
٥. بۆ تۆرای، وتنی : گۆنا محەمەد

لەو بەشداربوونەدا فێرخوازێکی تر بەشداری کرد، ڕزگار محەمەد ڕەشان  بە ئامێری کەمان.

لیژنەی هەڵسەنگاندن بریتی بوون لەم بەڕێزانە: ئەنوەر قەرەداغی، خالید سەرکار، فەرەنسیس داود، بیرم دێت من سەرپەرشتیم ئەکردن کە تەواو بووین، م.ئەنوەر هاتە سەر شانۆکەو باوەشی پێدا کردم.

تیپی مۆزیکەکە  دووهەم دەرچوو، لەڕەواندوز تیپی پاشای گەورە یەکەم بوو.

کۆرس بە بەشداری لەگەڵ ڕەواندوز، دووەم بوو

لە جل و بەرگدا  چوارەم بووین

پاش ئەم کارانە لە ١٩٨٠/٦/٢٠ گەشتێکی هونەری و گەشتیاریمان کرد بۆ دهۆک و زاخۆو  ئامێدی و سۆلاف و هاوینە هەواری ئاینشکی بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک، من زۆربەی شوێنەکانم بە کامێرای سینەمایی وێنەگرت، بە داخەوە فەوتان، پاش ئە وە لە ١٩٨٠/٧/٢٠  چووم بۆ سەربازی کە دوای من مامۆستا هەڵکەوت سەرپەرشتی دەکردن و دوای من چوون بۆ موسڵ و بەشدارییان دەکرد لە ڤیستیڤاڵەکاندا

ئەمە وێنەی یەکێکە لەو چالاکییانە



## چوونم بۆ سەربازی لە ساڵی ١٩٨٠

لەوانەیە ئەم بەشە پەیوەندی نەبێت بە مۆزیکەوە، بەڵام هەر بەشێکە لە ئازارەکانی ژیان کە لە ١٩٨٠/٧/٢٠ چووم بۆ سەربازی کە دوو ساڵ دواخرابووم، ناردمیانەوە بۆ کۆلێجی ئەفسەرانی یەدەک (كلية الضباط الاحتياط) لەوێ وەرنەگیرام، بەڵام چونکە ئێمە دەرچووی کۆلیج بووین دەیان ناردین بۆ ئەو یەکانەی کە خولی تێدا بوو، وەک: تانک، چەکی دژە ئاسمانی، تۆپ، لاسکی، قەڵەم.

ئەو شوێنانەی بۆ سەربازی نەخوێندەوار نەئەکرا، ناردمیان بۆ (مدرسة الدبابات) لە تکریت لەگەڵ هاوڕێکانم یەکمان گرتەوە، لەوانە: حەمە غەریب قادر تەگەرانی، ئازاد مەحمود، حەمید مەلا نوری، دوای ئەوە لەگەڵ چەندین دەرچووەکانی زانکۆی سلێمانی و بەغدا و زۆرکەسی تر، بەڕاستی دنیایەکی سەیر بوولام، لە گەرمایەکی پڕوکێنەر لە پێشدا ئەو چەند مانگە، فێری خولی سەرەتایی و پیادەبووم.

حەمە غەریب ئۆتۆمبیلێکی مۆسکۆفیجی هەبوو زۆر جار دادەبەزین بۆ ناو تکریت و سامەڕا و چووین بۆ شوێنە ئاسەوارەکانی سامەڕا (ملويه سامراء) و تەنانەت چووین بۆ گوندەکەی ئەحمەد حەسەن بەکرو سەدام (العوجە) گوندێکی بچوکی پڕ باخ و باخات بوو، ئەو ساڵە تازە میدیا حسین وکەمال محەمەد لە زیندان، گۆرانی شێخ فەتاح شێخ محێدینیان وتبوو بەو گۆرانییانە ناسران .

ماوەیەکی نەبرد بیرم دێت شەوێکیان لە ناو سەربازگەی تکریت بووین سەدام ڕێکەوتنی الجزائری هەڵوەشاندەوە لەگەڵ ئێران، ئیتر دیاربوو دۆخەکە بۆنی شەڕی لێدەهات و خومەینیش ساڵێک بوو شۆڕشی ئیسلامییان کردبوو لە ئێران، ئەوەی پەیوەندی بە هونەرەوە بێت کە بە مۆڵەت ئەهاتمەوە سەردانی مەڵبەندی لاوانم ئەکرد و ئەو کاتەش کامێرا سینەماییەکەم هەبوو فلیمم بۆ دەکڕی مارکەی (کۆداک)بە دینار و نیوێک و پارەی شتنەوەکەشی لەگەڵ بوو ماوەکەی ٣,٥ خولەک بوو کە فیلمی ٦ملیمی دەخواردو ڕەنگاو ڕەنگ بوو، لە پێشدا بە دەنگ تۆمارمان ئەکرد بە تەسجیلێکی ڕایزنگ و من مۆزیکم لێدەدا و تایتڵەکەش بە کارتۆنێکی ئاسایی و وێنەم ئەگرت و زۆربەی ئەو منداڵانەم دەبرد بۆ باخەکانی گوڵان وێنەم دەگرتن و من خۆم دەرنەئەچووم، وێنەی ئەوانم ئەگرت و سەرباری سەربازیم لە ١٩٨٠/٨/٢١ وێنەی گۆرانییەکم بۆ (هەردی تۆفیق) گرت بە ناوی

(ئـامەکەو ئـامینم)و بە پۆسـتەدا ئەمنـارد بـۆ لەنـدەن، لەگەڵ ئـەوەشـدا چەنـدین کۆبوونەوەمان دەکرد بۆ چالاکی نوێ و ئابوونەشمان کۆ دەکردەوە لە گیرفانی خۆمان کە تـا ئێسـتاش وەک ئـەرشـیف ئـەو نوسـراوەم لامـاوە و بـڵاوی دەکەومە بـزانن چـۆن بە دڵپـاکی کارمـان دەکـرد گەر بەراوورد بکرێت بە ئیسـتا کـە هـەر کەسێک پێش ئەنجامدانی کارەکە ئەڵێت چەند پارەی تێدایە؟

پاشان لەوێ ئێمە تا مانگی ٩ماینەوە ئینجا گواستینیانەوە بۆ ناو فڕۆکەخانەی کەرکوک چەند ڕۆژێک لەوێ مـاینەوە هێندەی نەبرد ڕۆژی ١٩٨٠/٩/٢٢ شـەڕی ئێـران – عێـراق دەسـتی پێکـرد، ئاگامـان لێبـوو کە زوو زوو فـڕۆکەی میـک ٢١ و سۆخۆ، لە فڕۆکەخانە هەڵدەسان بۆ بۆردومان کردنی ئێران، بۆ ڕۆژی دوایی ئێمە لە سەربانی سەربازگەکە بووین درزی قیری سـەربانەکەیان پـێ پڕئـەکردینەوە، هێنـدەمان نەزانـی چەنـدین فـڕۆکەی ئێرانـی هـاتن و دەسـتیان کـرد بە بۆردومـان کردن، هێندە ترسناک بوو چ دەنگی فڕۆکەکـە هێنـدە نـزم بـوون هێنـدەی نەمـابوو خۆیـان بـدەن لە عەمـودی کـارەباکـان، مـەپرسـە بـوو بە ڕۆژی حـەشـر تـا عـەسـر چەندین جـار هـاتنەوە، بـۆ عـەسـرەکەی کـوڕێکم لەگەڵ بـوو نـاوی عیزەدین بـوو کەرکوکی بـوو ماڵیـان لە ڕەحیم ئـاوابوو خۆمـان دزییەوە و یـەکسـەرچووین بـۆ ماڵیان، من هەر چۆنێک بوو شەو لەوێ مـامەوە و بـۆ بـەیانیـەکەی جلی مـەدەنیم لـەبەرکـردو هـەرچـی جلـی سـەربازییە بە جێمهێشـت و مـن پێناسـەی سـەنـدیکای ژمێریارانی بەغدام پێ بوو هاتمەوە بۆ سلێمانی چووم بۆ مـاڵی پـورە فـەخـریم کە وەک دایکم دڵسۆزمە تا ئێستاش، ئیتـر لەگەڵمـا هـات بـۆ هـەڵـەبـجەو بـۆ ئـەوەی لە بازگەکان ئاگـادارم بێت، کە گەشـتمە مـاڵەوە ئیتـر دایکـم لە ترسـا نەیئـەزانـی چـی بکات؟ یانی گەر بۆم ئـەژمـار بکرێت مـن یەکەمـین سـەربازی هـەڵاتـووی شـەڕی ئێران ـ عێراق بووم، ئیتر هەموو ئامۆزاو پورزاکانم، حەمە فەرەج، حـەمە ڕەئـوف، کاک ئەوڕەحمانی مێردی شەوبۆی ئامۆزام، عـەلـی مەلا حەسـەن، عوسـمانی مەلا حەسـەن، ئایـاری مەلا حەسـەن، هـەمـوو کۆبـونەوە لـە دەورم، تـرس و لەزری دایکیشم لەو لاوە بوەستێ، من ئەو کاتە ئەمووت ئـەڕۆم بـۆ هەنـدەران، ئـەمـووت ئەچم بۆ لای لەتیفی ئامۆزام کە پێشمەرگە بـوو، دوای یەک دوو هـەفتە ئـەچـم بـۆ ئێـران و دوایـی ئـەڕۆم، وام لە خـەیـاڵ بـوو، بـۆ ئێـوارە چـوومە مـاڵی عـەلـی مەلا حەسـەنی پـورزام، بـۆ شـەوەکەی لای مـاڵی مامـە حەمەم، ئیتـر شـەڕ گەرم بـوو، منیش هەڵهاتوو، تا هەفتەیەک وابوو، بەڵام کەس وکـارم و دایکـم لە ترسـا هـەر بە

زۆر ناردمیانەوە، چونکە هەر ئەو چەند ڕۆژە بڕیارێک دەرچوو هەر سەربازێک هەڵبێت گولله باران ئەکرێت، دوای یەک هەفتە عوسمانی مەلا حەسەنی پورزام هات لەگەڵم بۆ کەرکوک، من جلی سەربازیم نەمابوو، کاوەی برام سەربازبوو تازە تەواوی کردبوو جلەکانی ئەوم لەبەرکرد، هەرگەشتینە ناو کەرکوک دیسان فرۆکە هاتەوە، هەر چۆنێک بوو کە چووموەوە ناو شوێنەکەی خۆم، نائب زابتەکەمان وتی ئەوە تۆ لە کوێی؟

باش بوو غیابی نەدابووم، وتی هاوڕێکانت گوازرانەوە بۆ هەولێر بۆ کەتیبەی مدرعات (ابن العاص) کە لەناو هەولێر بوون لە ڕێگای عەینکاوە، ئیجازەی هەفتەیەکی بۆ کردم وگەڕامەوە بۆ هەڵەبجە و دوایی چوومە هەولێر ماوەی دوو مانگ زیاتر لەوێ بووین و خولی تانک مان دی من کرام بە (المخابر) واتە لە سەر لاسکی و دۆشکە و چەندین وانەی زانستیمان خوێند، پاشان گوازراینەوە بۆ نزیک کەرکوک شوێنێک کە پێیان دەوت (دارەمان) و کەتیبەی دەباباتی ٢١ بوو، تازە درووست کرابوو، ئامرەکە زۆر تۆقێنەر بوو دەبوایە کە تۆی بدیایە یەکسەر ڕات بکردایە بە چاک و بە خراپ، زۆر بێتاقەت بووم، بە ڕێکەوت حیمایەیەکی لەگەڵ بوو کوردبوو، ناوی بورهان بوو خەڵکی هەولێربوو، بوو بە ناسیاوم، ماوەی دوو سێ هەفتە لەوێ بووین و چەندین کەسم ناسی کە ئەوانیش بێزار بوون لەوانە کوڕێک ناوی هەمزە بوو دەرچووی بەشی فیزیای زانکۆی سلێمانی بوو، کوڕێکی تر ناوی کەمال، بەیانییەکی پڕ تەم و مژی مەلا بانگدان بوو، یەکەی سەربازیەکەمان گواسترایەوە، هەموو خۆمان کۆکردەوە بۆ ئەوەی بڕۆین، سێ چوارێکمان بڕیارمان دابوو گەر بەرە و باشوور بڕوات بۆ ڕێگای بەغدا ئەوە خۆمان ئەدزینەوە، هێندەمان نەزانی تانکەکان هەمووی سواری ناقیلە کرابوون و ئێمەش لە ناو زیلی سەربازی دابووین، بۆ نیوەڕۆکەی ڕوویان کردە سلێمانی و نەوەستاین تا گەشتینە عەربەت ...سەیرمان لێهات، لە عەربەت گیرساینەوە، لەوەو پێش فڕۆکە چەند جارێک هاتبوو بۆ بۆردومانی ئەو سەربازگانە و ئێمەش لە بەیانی تا ئێوارە لە ناو چاڵدابووین، جگە لەوانەی خەفەر بوون لەسەر دەبابەکان، سەیر بوو ئیتر بە گەشتنی ئێمە فڕۆکەمان نەدی، کە لە

عەربەت بووین شەوێکیان لە ناو جێگا بووم، حمایەکەی ئامر منی ئەناسی وتی وەرە ئامر وتویەتی کەسێک ئەناسیت خەڵکی ئەم ناوچە بێت و بیناسیت، ئیتر من ئامرم ناسی پلەی ڕائد بوو ناوی (مزهر)بوو شەبەک بوو خەڵکی دەوروبەری

موصـڵ و وەک کـاکەیی سـمێلی هێشـتبووەوە، ئیتـر مـن نـانم کەوتە ڕۆنەوە، هەمووهەفتەیەک مۆڵەتی ئـەدامێ، منیش ئـەو کـاتە (موجـەمـەعی شـانەدەری)بە ناوبانگ بوو کە شت و مەک و کەل و پەلی ئێرانی دەفرۆشـرا لە ئێرانەوە دەهـات، ئیتر من نیوەی مووچەکەم زیاتر خەرج دەکرد بۆ ئامر هەر لە قوماشی ئـەنگۆرە، سـەمـاوەر وکـامێرای ڕەنگـاو ڕەنـگ تـازە هـاتبوو، کە خـۆی بە فەوری وێنەکەی دەشتەوە، تا ئەو کـاتەی ئەو ئـامرە لەوێ بـوو مـن هـەسـتم نـەدەکرد سـەربـازم و هاوڕێکانم زۆربەی لە باشـوور بـوون لە نـاو جەرگەی شـەڕ و چەنـدین مواليد بە دوای یەک بانگ کران، ئیتر هەرچی گەنـج بـوو هـاتە بەرەی سـەربـازی و چەنـدین کەس کوژران یان بەدیل گیران یـان کوردەکـان زۆربەی هـەڵاتن، مـن وەک خـۆم هەرگیز بـاوەڕم بەو شـەڕە نـەبوو، هـیچ ئامـادە نەبـووم ببمە سـووتەمەنی، هـەر کاتێکش هەستم بکردایە دەچوومە شـەڕ، هـەڵئەهـاتم و تاقـەتی پێشمەرگایەتیشـم نەبوو، چونکە نەم دەتوانی لەگەڵ ئەو شێوازی ژیانە ڕابێم.

هەموو هاوتەمەنەکانی من هـەر کەسـەو چیرۆکێکی تـایبەتی خـۆی هـەیە لـەو سات و کاتە دژوارەدا کە خۆشترین شت لە ژیانی ئێمە مۆڵەتی سەربازی بوو یان تەسریح بوونمان لەسەربازی بوو، چەندین چیرۆکی دژوارم لایە پێویست بە باس کردنـی ناکـات، مـن لە عـەربەت بـووم تـا ناوەڕاسـتی ١٩٨١ و زوو زوو مۆڵـەتم وەرئەگرت یەکێک لەو چیرۆکانە نیوەڕۆیەکی گەرمی هاوین بوو لە سەر تانکێک پاسەوان بووم بۆ ئەوەی گەر فڕۆکەی ئێران بهاتـایە تەقەم لـێ بکـردایە، لەسـەر تـانکەکە خەریکـی کلاشـینکۆفەکەم بـووم دەسـتکاریم دەکـرد، لەپـڕ دەسـتم بەر پەلەپیتکەکەی کەوتوو فیشەکێک دەرچوو لە دەستم، بـاش بـوو لەسـەر تـاک بـوو، سەربازێکی هاوڕێم خەڵکی کەلار بوو ناوی محەمەد بوو ئەو گولەیە لەسەر بێری سـەربازیەکەی چیغـی کـرد، بـاش بـوو ئـازاری نەگەیشـت، ئـامرە تازەکـەمـان لە گۆڕەپانی سەربازگەکە بوو گوێی لەتەقەکە بوو ئەو ئینزیباتەی کە حیمایەی بوو، نارد بەشوێنماو وتی بڕۆ زیندانەوە، بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ زیندانی سـەربازی بـووم، لە ژیانمدا ئەو جارە زیندانی بووم، بوو بە وانەیەک لە ژیانم هەمیشە ئاگام لە زامن کردنی تفەنگەکەم بێت، لەو کاتانەدا پێنجوێن و تەوێڵەش ببوون بە بەرەی جەنگ زۆر لە هاوڕێکـانم نێـردران بـۆ ئـەوێ بـۆ بەرەی شـەڕ، بـەڵام مـن مـامەوە تـا ئامرەکەمان گوازرایەوە، دوای ئەو کەسێکی تر هـات، ئیتـر مـن بێتـاقەت بـوومەوە تـازە لەزینـدانی سـەربازگە دەرچووبـووم نەقیبێکـی تورکمانمـان هەبـوو ڕێـزی

دەگرتم، سەربازگەی ناو هەڵەبجە پێویستی بە ٣ تانک بوو، منیش بە نەقیبەکەم وت بمخەرە ناویان وایشی کرد، ئیتر لەگەڵ ئەو تانکانە کە لە بواری سەربازی بە ٣ تانکیان ئەووت (ڕەعیل) هاتین بۆ سەربازگەی هەڵەبجە، سەیر بوو من ماڵم لێرە بوو لێرەش واتە هەڵەبجە سەرباز بووم، هەر وەک خەڵکی بەغدا یان بەسرە مۆڵەتم هەبوو.. ساڵی ١٩٨١ لە هەڵەبجە لەناو سەربازگەکەی سەرباز بووم تانکەکانمان دابەش ببون دوانیان لە ملەی سازان بوون ئەوی تر لەناو هەڵەبجە.





پایزی ساڵی (١٩٨١) بوو من هەر سەرباز بووم لە کەتیبەی دەبابات لە هەڵەبجە کە ئێمە وەک میوان بووین لە سەر یەکەیەکی پیادە و لە خوار عەبابەیلێ، کەتیبەیەکی تۆپ هاوێژ دانرابوو لە چاڵاییەک نزیک قوتابخانەکە، جار جار تۆپی

دەتەقاند ڕووەو ئێران، ئێمە ٣ تانک بووین بۆ ڕوون کردنەوە کەتیبەیەک نزیکەی ٤٥ تانک دەبوو کرابوو بە ٣ سریە، نەقیبێک کە سێ ئەستێرەی لە شان بوو کە بریتی بوو لە ١٥ تانک و هەر سریەیەک دەبووە ٣ (ڕەعێل)کە بریتی بوو لە ٣ دەبابە و ئەفسەرێکی یەک ئەستێرە، سەرپەرشتی دەکرد، ئێمە ٣ تانک بووین هاتبووینە هەڵەبجە بۆ هاوکاری ئەو فەوجی پیادەیە کە لەوێ بوو، چەند ئەفسەرێک گۆڕان لامان کە ئەفسەری یەدەگ بوون و دەرچووی کۆلێج بوون، وەک هاوڕێ هەڵس وکەوتیان لەگەڵ دەکردین، لەوانە ناویان: حسن معارج، باسم، من بۆ ئەوەی هاوکاریم بکەن هەموو جارێک دایکم خواردنی بۆ دروست دەکردن، لە یاپراخ، کولیچە، زۆر شتی تر، دەمبرد بۆیان و جار جار بە دزییەوە رەئیس عورەفایەکمان هەبوو ناوی مشعل بوو ئیزنی ئەدام بۆ ڕۆژێک تا ئێوارە، منیش خۆم دەکرد بەو دیوی ئەو بەربەستەی (ساتر)کە بە دەوری سەربازگەکە بوو، کەوتبووە سەرووی خەستەخانە کۆنەکە لە گەڕەکی سەرا بە دووری سەد مەترێک کەمتر، ئەو کاتە هەڵەبجە ئەوە سنووری بوو، هەر لەو ساڵەدا بۆیەکەمین جار لقی بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری جەماوەر کرایەوە کە هونەرمەند فوئادی حەمە ئەمین ئاغا کردیەوە و ئەو کاتە لە ماڵی حاجیە خڕە کرایەوە کە بەرانبەر گازینۆ شنروێ بوو شوێنی باخی عەلی بەڕانی کە کرابووە هۆتێل و چایخانە کە ئەو کاتە محەمەد ئیبراهیم عەبدول گرتبووی بە کرێ .



پاشان بۆ ساڵی (١٩٨٢) رۆشنبیری هەڵەبجە گوازایەوە بۆ کانی قوڵکە پشت گەڕەکی هەورامییەکان کە دەیکردە پشت فەرمانگەی تەجنیدی ئەوسا، هەرکەس دەڕۆشتە ئەوێ دەکرا بە سەرباز لەو نائب زابتانەی لەوێ بوون (فەتاح) کە هەر کەس توخنی تەجنید بکەوتایە دەرچوونی نەبوو یەکسەر سەوقی ئەکرد بۆ سەربازی، ئەنوەری عەبە خڕە ، عەلی حەمە مردوو، لەو ساڵەدابوو، من زۆر دابڕابووم لەمۆزیک، بەڵام ئەندامانی تر وەک عەزیز، ئاراسی شێخ جەمال، بەهمەن، عومەری حەمە ڕەحیم ، هۆشیار حەمە فەرەج، چالاک بوون، کاسێتێکیان بۆ هۆشیار تۆمار کردبوو، پاشان کوڕێکی مەریوانی ناوی (بەختیار مەریوانی) بوو هاتبوو بۆ ئەویش کاسێتێکیان تۆمار کردبوو کە زیاتر هەردووکیان گۆرانییەکانی ناسر و حەسەن زیرەک بوون.

ئەوەی جێگای گێڕانەوەیە هەندێ ڕوداوی سەیر، کە بە هۆی سەربازیەوە ڕووبەڕوم بووەوە یەکێک لەوانە ئێمە ٣ تانکمان چووە سەر شاخەکانی دەورو بەری هەڵەبجە هەمووی ڕەبایەی سەربازی بوو پێش چەند مانگیک ئێمە چەند تانکێکمان لە تەوێڵە بوو، نزیک شۆشمێ، شەوێکیان ئێران هێرشی کردە سەریان و یەک دوو سەرباز کوژران یەک دوانێک دیل بوون یەکێک لەو دیلانە ناوی حسناوی بوو خە ڵکی فەلوجە بوو، چونکە لە عەربەت ناسیبووم، بۆیە لێرەش بیریان کردەوە یەک تانکیان داوا کرد بۆ ملەی سازان لە نێوان دۆڵێکدا بوو هەر مانگەی چەند سەربازێکی بۆ دەچوو،بەکورتی دەگۆڕاین، زستانی (١٩٨٢) بوو زۆر سارد بوو، ئێمە لە ناو ڕەبایەیەک بووین لە قەد پاڵی یاڵێک درووست کرابوو بە گوێنی پڕلە خۆڵ سەرەکەی جەمەلۆن بوو، دەرگاکەی بە گوێنیەک گیرابوو، شەوێکی درەنگ بوو من پاسەوان بووم لە دەرگای ڕەبایەکە دانیشتبووم کڵا شینکۆفێکی موزەلی چیکیم پێ بوو لە پڕ سەری گورگێک هاتە ژوورەوە هەڵم لە لووتی ئەهاتە دەر، چونکە شوێنکەی ئێمە گەرم بوو شەو و ڕۆژ ئاگری تێدا دەسووتا، منیش هەر فریای ئەوە کەوتم هەڵسامەوە و یەک مەخزەنم خاڵی کردەوە تەقەم کرد بە دوایدا ئەو دۆڵە دەنگی دایەوە، ئیتر نازانم کوشتم یان نا ! هیچ دیار نەبوو، تاریک بوو، دوای ئەوە هاوڕێکانم هەڵسان لە خەو، وتم گورگ هاتۆتە سەرمان یەکێک لەوانە ناوی سەمیر بوو خەڵکی حلە بوو زۆر ترسا ئەیگوت (اجا ذیب ذیب) سەیربوو، بۆ یەکەمجارم بوو گورگ ببینم هەر لە هەڵەبجە بوو هەر ئەو زستانە شەوێکیان قیادەی موەقەتە(پارتی) چەندین

پاسداریان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، منیش لەو سەربازگەیە بووم، بە دەیان هاوەنی و دۆشکەیان نا پێمانەوە بە سەرماندا ئەتەقینەوە زیاتر لە ١٠ سەرباز کوژران، ئەو شەوە بۆ ئەوە هاتبوون دەست بەسەر ئەوێدا بگرن منیش بە هەر حاڵ خۆم گەیاندە ناو بورجی دەبابەکە، چونکە دەیان هاوەن بەسەر ژوورەکەماندا ئەتەقیەوە، سەرەکەی جەمەلۆن بوو پاڵتۆیەکی گەورەی سەربازیم لەبەر بوو، کاتێ چوومە ناو بورجەکە قۆڵم گیرایە بەلەپیتکەی دۆشکەکە کە وەک ئیستۆپی ماتۆڕ وابوو دۆشکەکە ڕووی کردبووە بامۆک یەک سندوق گولە دۆشکەم تەقاند، هەمووی ڕووەو بامۆک بۆ سبەی وتم بزانم کەس نەکوژراوە؟ هیچ نەبوو باش بوو، دوای ئەوەش نائب زابتەکەمان هات دەستخۆشی لێکردم و گوللەی زۆرتریان دامێ بە مەزەندەی خۆیان ئەو شەوە ڕووەو دوژمن تەقەی چاکم کردووە!

هەر لە هەڵەبجە بووم وەک سەرباز ئەفسەرێکمان هەبوو ناوی باسم بوو دەرچووی کۆلێجی کشتوکاڵ بوو، بەغدایی بوو، ئەبوایە هەر ڕۆژێک کەسێکمان نیوەڕۆ خواردنمان بۆ ببردایە، چونکە هەر ئەفسەرێک مراسلی هەبوو، ئێمەش هیچمان قبوڵمان نەئەکرد نانی بۆ بەرین، کردبوومان بە نۆرە، هەفتەی ڕۆژێک ئەگەر نیوەڕۆیەک بۆمان ببردایە ئەو ڕۆژە نۆرەی من بوو، چووم ئەبینم ئەفسەرێکی دوو ئەستێرە بەشانی لێیە بانگی کردم (شلونک ازاد) وتی نام ناسیت؟ وتم نەوەڵا، وتی من (ازبار)م ئەها پێکەوە لە کۆلێج پێکەوە بووین، بیرم کەوتەوە چونکە ئەو بەعسی بوو کرابووە ئەفسەر، دوایی بیرم کردەوە بەڵی وایە، ناوی (ازبار نایف الحمدانی) بوو، خەڵکی رومادی بوو، ئیتر هاوڕێیەتیمان نوێ بووەوە، بە ڕێکەوت سەربەستی برام لە سریەکەی ئەو سەرباز بوو زۆر هاوکاری کرد تەنانەت ساڵی (١٩٨٤) لە ناو بازاڕی هەڵەبجە سەربەستی برام هەڵاتبوو لە سەربازی گواسترابووەوە بۆ عەمارە لە بەرەی جەنگ، دەمەو عەسرێکیان گیرا، بە مأمور برا بۆ یەکەکەی خۆی، پاش چەند ڕۆژێک پێش ئەوەی ئەو بگاتە ئەوێ، من لەگەڵ کاک جەمیلی زاوامان ڕۆشتم بۆ وەحدەکەی و تێمگەیاند و هەردوای ئەوە دەبوو زیندانی بکرێت، بەڵام من وتم هەر هاتەوە لات مۆڵەتی بدەرێ، ئەو ڕۆژە ڕێبواری کاک حەمە ئەمین چل پینەی دراوسێمان سەرباز بوو لای، مۆڵەتیشم بۆ ئەو وەرگرت و سەربەست دوای دە ڕۆژ زیاتر گەشتەوە شوێنی خۆی مۆڵەتی وەرگرت و جارێکی تریش هەڵهاتەوە.

## بەدەم سەربازییەوە کاری هونەریم دەکرد

لە ناوەراستی مانگی (٧ ی ١٩٨٢) من ماوەی هەفتەیەک مۆڵەت درابووم چەند گۆرانییەکم بۆ کۆرس و گۆرانی بێژان ئامادە کردبوو، دوای ئەوە چوومەوە بۆ سەربازگەکەم، من هەر لە خەیاڵم نەبوو ئەندامەکان کەسێکیان دۆزیبووەوە بۆ ئەوەی مۆڵەتم بۆ وەرگرن، چونکە دوو فەرمانبەری بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری جەماوەری سلێمانی هاتبوون (جەلیل زەنگەنەو رەحیمی باڵەبان) چونکە بەڕێوەبەرێتی گشتی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردی لە بەغداد نیازیان بوو ڤیستیڤاڵێکی هونەری و ئەدەبی سەرتاسەری بکەن لە ناوچەی ئۆتونۆمی کە ئەو کاتە وایان پێ دەگووت، چونکە لە سلێمانیش تیپێکیان هەبوو سەر بە ڕۆشنبیری جەماوەر بوو کە بێستوون گورجی سەرپەرشتی ئەکردن، بیرم دێت دوو گۆرانی بێژیان لەگەڵ بوو، (عەتای حاجی عەلی برای حەمە جەزا و بورهان محەمەد) گروپی هەڵەبجە پێویستیان بە من بوو بۆ ئەوەی سەرپەرشتیان بکەم، هێندەم نەزانی سەربازێک هات و بانگی کردم بو لای ئامر فەوجەکە، منیش ترسام وتم هیچم نەکردبێت، بینیم ئەو کەسە لەوێ بوو مامۆستا بورهانی حەمەی باول بوو، داوای مۆڵەتی بۆ کردم، هەموو ئەندامەکان لە پاسێکی کۆستەردا لە بەردەم دەرگای سەربازگەکە وەستابوون، منیش جلی سەربازیم لەبەربوو بردمیانەماڵەوە و خۆم گۆڕی یەکسەر ڕووە وهەولێر کەوتینەڕێ،

هەر لەناو پاسەکەدا دەستمان کردەوە بە پرۆڤە کردن، لەوێ چووینە ئوتێلێک بە ناوی ئوتێل فەرید و چەند شەوێک ماینەوە، لە ڕۆژی دووهەم واتە لە ڕێکەوتی ١٩٨٢/٧/١٨ نۆرەی ئێمە بوو کە کاتی ئێوارە بوو، چەندین گروپ بەشدارییان کرد لەوانەی هەولێر تیپی نەتەوەیی بەشداریان کرد، وەک وریا ئەحمەد، لە دهۆکیش دڵشاد محەمەد سەعید، تیپی دهۆکی هێنابوو، کە کچە گۆرانی بێژ نەجات عبدالمسیح گۆرانی نێرگز نێرگزی تێدا گووت لە تەلەفزیون پەخش کرا، ئەو شەوە نۆرەی ئێمە بوو لەگەڵ دهۆک، ئەندامێکمان ڕای لەسەر ئەوە نەبوو ئێمە بەشداری بکەین بەو هۆیەی کە ئەمە یادی حەڤدەی تەمووزە، منیش وتم خۆ تازە ناگەڕێینەوە و خۆ ئێمە سروود لێنادەین، گۆرانی عاتیفی لێدەدەین، بە هەرحاڵ من بریارم دا بەشداری بکەین ئەویشم قەناعەت پێکرد، لەو گۆرانی بێژانەی هاتن لە گەڵمان: محەمەد ئیبراهیم عەبدول، حەمە لامەرکەزی، شێخ جەمالی موزیع،

سیروان عەلی ڕەزا ، هەروەها من، نیان و پەیمان وسەرکەوتی برامم بردبوو لە گەڵ نەرمینی حەمەی لاسلکی، نازەی حەمەی سابیر و چەندین کچی تر کە ناوەکانیانم لە بیرم نەماوە، وە کۆرس تەهای حاجی بەکر، نوری محەمەد ناسراو بە(نوری خەیاڵ) ئەو کاتە هۆشیار پێشمەرگە بوو نەهات، لە هۆتێلەکە چەندین رۆژنامە و گۆڤار هاتن وەک هاوکاری، چاوپێکەوتنیان کرد لە گەڵمان و ڕادیۆی کوردی بەغدا چەند گۆرانییەکی بۆ تۆمارکردین لە هۆتێلەکە و پێشکەش کارێکی ڕادیۆ(سەگڤان عبدالحکیم) بۆی سازداین، کامێرای تەلەفزیۆنی ودەرهێنەر (ناسر حەسەن)یان لەگەڵ بوو، ئەوە یەکەمین جار بوو کە بەتەلەفزیۆنی ڕەنگاو ڕەنگ کارەکانمان وێنە بگیرێت و چەند جارێک لە تەلەفزیۆن کارەکانمان لێدران .

ئەو مۆزیک ژەنانەی لەگەڵمان بوون بریتی بوون لە :

| ژ | ناوی ژەنیار | جۆری ئامێر |
|---|---|---|
| ١ | ئازاد صالح | کەمان |
| ٢ | ئەحمەد عەلی | کەمان |
| ٣ | عومەرحەمە ڕەحیم (دانا هە ڵەبجەیی) | کەمان |
| ٤ | شوان عەلی مەجیلان | کەمان |
| ٥ | عەزیزحەمە کەریم | بانجۆ |
| ٦ | ڕزگار صدیق | ئۆکۆردیۆن |
| ٧ | بەهمەن ئەحمەد | کلارنێت |
| ٨ | مەحمود ئەحمەد عبدالرحمن | ئیقاع |
| ٩ | ئاراس شێخ جەمال | جاز + سەنتور |

ئێمە بە دوو شێواز نمایشمان کرد تیپی ڕۆژهەڵاتی و میللی، محەمەد ئیبراهیم و حەمە لامەرکەزی لەگەڵ گروپی میللیدا بوون، کۆرسێکی زۆریشمان لەگەڵ بوو.

گۆرانییەکان بەم شێوەیە بوو، زۆربەی ئاوازەکان من ئامادەم کردبوو

١. گۆرانی: کەنیلە و گوڵەکەم نەخشانم، وتنی: شیخ جەمال و کۆرس
٢. هەی یار، وتنی: سیروان عەلی ڕەزا، ئاوازی: بەختیار عبدالله
٣. جوانان ئەگرن کۆمەڵە، وتنی: حەمە لامەرکەزی
٤. کوڵەنجە، وتنی: کۆرس
٥. نارنجە – هەی بەلار، وتنی: محەمەد ئیبراهیم عەبدول

ئـەو نیوەڕۆیەی پێش نمـایش کـردن، کـاک سـیروان گەدەی تێکچـوو، پێکەوە لەگەڵ مەحمود بردمان بۆ نەخۆشخانە باش بوو دکتور هیوا عومەرئەحمەد لەوێ بوو زۆر هاوکاری کردین، چونکە هاوڕێمان بوو، شتێک بۆ خۆشی دەگێڕمەوە: لە هـۆتێلەکە کـاک حـەمەی لامەرکەزی دەسـتنوێژی گرتبـوو مـن لە خـوارەوە بـووم تەقەیەک هات، کابرای هۆتێلەکە بـانگی کـردم وتـی ئـەوە یەکێکتـان مەغسـەلەکەی شکاند تومەز دەست نوێژی گرتبوو قاچی لە ناویدا شتبوو ....

پـاش ئەوە بەڕێـوەبەرانی ڤیسـتیڤاڵ بانگیـان کـردم بـۆ ژووری خۆیـان لە هۆتێلێکی تر بوون ئـەوان هـەزار دینـاری ئـەو کاتەیـان دامـێ بیرم دێت مـەحمـود زامدار بوو، سەلاح شوان بوو، عبدالله عەباس بوو، منیش یەکسەر دابەشم کرد بە سەریاندا و کەمترین کەس کۆرسەکان بوون یەکی پەنجا دینارم دانێ، سەرکەوتی برام مناڵ بوو بەو پارەیە پاسکیلێکی لێکڕێ بۆ خۆی ...

لە مانگی ئۆکتۆبەری هەمـان سـاڵ چـەند گۆرانییەکمـان بـۆ محـەمـەد ئیبراهیم عەبدول تۆمار کرد هەموویان من ئامادەم کردبوون، بەڵام هەمیشە حەزم ئـەکرد ئەو گەنجانە هانبدەم کە خۆیان ماندوو بکەن و بتـوانن ئـاواز دانـێن یـان ئامـادەی بـکەن زۆر بەرهـەمـم بە نـاوی خـۆمەوە نـەئـەکرد ئـەوە سروشـتی مـن بـووە بە ئێستاشەوە.



**لەڕاستەوە: مەحمود ئەحمەد. شوان عەلی. عومەرحەمە ڕەحیم. بەهمەن ئەحمەد. ئاراس شێخ جەمال. عەزیز حەمە کەریم. گۆرانیبێژەکە، حەمە لامەرکەزی. کۆرسەکان: ئاراس مەقسود. تەها بەکر. شێخ جەمال. ئەمیر پاشا. نوری محەمەد: (نوری خەیاڵ).**




مەحمود ئەحمەد. بەهمەن ئەحمەد. ڕزگار سدیق. عزیز حەمە کەریم. ئەحمەد عەلی. عومەر حەمەڕەحیم



گۆرانیبێژ: محەمەد ئیبراهیم عەبدول

## لەسەربازی هەڵاتم و خەریکی کاری هونەری بووم

لە کۆتایی مانگی هەشت بوو هەموو ئەندامانم کۆکردەوە لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی خۆمان چووین لە چالاکییەکەی پشتی گوڵان ئەو گۆرانییەم بە کامێرای سینەمایی بۆ وێنەگرت بە ناوی (ئای لە خاڵانی)

مانگی ١٠ ی هەمان ساڵ وەک سەربازێک گوازرابوومەوە بۆ عەربەت چونکە دەبووایە خولی نوێمان بکردایە ومنیش بێزار ببووم و خەڵکێش بە سەدان هەڵئەهاتن لە سەربازی، کەسیش دەستی بۆ نەبردن، چونکە گەر بوروژایە زۆربەی دەچوونە دەرەوە، منیش تاقەتم نەمابوو ڕۆژی ١٩٨٢/٥/١٠ لە سەربازگە هاتمە دەرەوە بە بەرچاوی نائب زابتەکەوە هەر چەند بانگی ئەکردم (تعال ازاد تره تدخل الهروب) گوێم نەدایە و سواری پاس بووم بیرم دێت خولەی ئەمنە لۆری شۆفێرەکە بوو، سواری کردم و چوومە ماڵەوە بۆ جارێکی تر، ئەمە ژیانی گەنجی ئێمە بوو.

دوای ئەوە دەستم کردەوە بە چالاکی هونەری یەک دوو هەفتەی نەبرد بە شێوازی میللی کاسێتێکمان بۆ محەمەد ئیبراهیم پڕ کردەوە بریتی بوو لە حەوت گۆرانی، بە نووسراوی ژمارە ٧٩ کە لام ماوە وبڵاوی ئەکەمەوە وە دابەشمان کرد بە سەر تۆمارگەکاندا، بەڵام بە داخەوە من هیچم لانەماوە و گۆرانیەکانیشم لە بیر نەماوە .

هەر لەوساتەدا نوسراوێکم نووسی بۆ ڕۆشنبیری، ئەویش بەرزی کردەوە بۆ سلێمانی لەوێشەوە بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوک بۆ ئەوەی تۆماری بکات بۆمان بەڵام وەڵامی نەبوو ...

تا ساڵی (١٩٨٣) دوو گۆرانی بۆ عوسمان کەیمنەیی و دووان بۆ محەمەد ئیبراهیم تۆمارکران.

لە چالاکی بەردەوام بووین بەڵام لەو کاتانەدا ئێمە سێتێک تەسجیلی چاکمان لابوو بۆ تۆمارکردن بە کارمان دەهێنا، شەوێکیان پیشمەرگەی لایەنێک هاتبوونە سەر فەرمانگەکە و دەستی بەڕێوەبەرەکەیان بەستبوو، چونکە خەڵکی سلێمانی بوو لەوێ دەخەوت(ئەنور محەمەد ڕەشید)و تەسجیلەکەو چەند ئامێری مۆزیکیان

دزی بوو، بە حسابی خۆیان چالاکییان ئەنجامداوە، ئیتر ئێمە بێ تەسجیل ماینەوە.

مانگی یانزە بوو، من نووسینێکم نووسی بوو دەربارەی گۆرانی فولکلۆری ویستم بیکەم بە کۆڕێک لە هۆڵی شاهۆی کچان، واش بوو، یەک ڕیکلاممان بۆ کرد لە ناو بازاڕ کارتۆنێکمان نووسی و هەڵمان واسی کە دوو گۆرانی بێژ عوسمان کەیمنەیی و محەمەد ئیبراهیم وەک نمونە دەهێنمەوە و گۆرانی تێدا بڵێن و عبداللەی حەمە لاو بەگ کۆڕەکەی دەبرد بەڕێوە، لە هۆڵەکە شانۆیەکمان دروستکرد بۆدوای نیوەڕۆ، چووین بۆ گرتنی کۆڕ و وامان زانی خەڵک سوودی لێ دەبینێت، من سەربازی هەڵاتووش بووم .... هولەکە پڕ بوو، هێندە خەڵک هاتبوون، چووبوونە سەر رەحلەی مەکتەبەکە، چەندین قاتیان درووست کردبوو، سەریان ئەگەشتە سەقفی هۆڵەکە، بەچاوی خۆم نابینایەکم دی لە پەنجەرەی سەرەوە بازی ئەدا تەسجیلێکی بچووکی بە دەستەوە بوو، بە حسابی خۆی گۆرانی پێ تۆمار بکات، عبداللە پێشەکییەکی گووت و منیش دەستم کرد بە خوێندنەوەی بابەتە کە هێندە قەرەباڵغ بوو کەس ئاگای لە هیچ نەبوو، هەر تەقەی ڕەحلە ئەهات و ئەشکا وئەکەوتن بە سەریەکدا، هەرچی شوشەی پەنجەرە هەیە شکا .

خەڵک جاران وا تامەزرۆ بوون بۆ هونەر، نەمانتوانی کۆڕەکە تەواوی بکەین و ئاشبەتاڵمان لێکرد بۆ سبەی بەڕێوەبەری قوتابخانە کە کچی (خوخو) بوو خوشکی موعتەسەم ناوەکەیم لە بیر نەماوە، وتی ئەبێ هەمووی چاک بکەنەوە، واشمان کرد، بیرم دێت من بووم، فەرهەنگی حەمەی سمایل بوو، عبداللەی حەمە لاو بەگ بوو، پارەمان کۆکردەوە، هێندەی پێمان کرا چاکمان کردن وشوشەکانمان تێگرتەوە، بۆ ڕیش چووین، بەڵام سمێڵمان نایە بانی ...

## كۆنسێرتێک لە سینەمای هەڵەبجە

لە ساڵی (١٩٨٣) هەر ئەو کاتەش لە سەربازی هەڵاتبووم و ئەو ساڵەش سەروەری حاجی حەمە کەریم کوردسانی ببوو بە بەڕێوەبەری مەڵبەندی لاوان وداوای لێ کردین کە کۆنسێرتێک ئەنجام بدەین بۆ هەندێ گۆرانی بێژی ناوچەکە، ئێمە هەر لە ئامادەیی کچان ئاهەنگمان دەگێڕا.

ئەمجارە بیرم لەوە کردەوە کە ئەو کۆنسێرتە لە سینەمای هەڵەبجە ئەنجام بدەین لە بەرچەند هۆیەک یەکەم لە بەر ئەوەی من چەند گۆرانییەک و دیمەنی ناوشاری هەڵەبجەو هەندێ پیشەی دەستی و خانووەکەی ماڵی وەسمان پاشام وێنەگرتبوو، دەمویست بۆ خەڵکی نمایش بکەم و بیبینن کە ماوەکەی نیو کاتژمێر ئەبوو، چونکە سینەماکە لە بار بوو چ بۆ دانیشتن کە پلە پلە بوو بۆ بینین و تاریکیش دەبوو بۆ کاتی فلیم لێدان و هەروەها سینەماکەش خاوەنەکەی کاک محەمەدی لاسلکی بوو کە برای سەروەر بوو، بۆ ئەویش سوودی هەبوو، چونکە پارەی بلیتی چوونە ژوورەوەی لێ وەردەگرتن، کە ئێمە هیچ سوودمەند نەبووین لەو داهاتە، بەڵام بۆ ئێمە کارێکی نوێ بوو، چونکە یەکەمجار بوو خەڵک بەرهەمی خۆماڵی ببینێت لە گۆرانی و دیمەنی دەوروبەر، هەروەهاش من ئامێری سازوجۆزەشم دەستبەرکردبوو، سازەکە لە هەولێر یونس خەتاتێک هەبوو چووم بۆی دروستی کردم بە ٢٠ دینار و هەروەها جۆزەیەکی عەرەبیشم لە بەغدا کڕیبوو بە ١٨ دینار کە خۆم ڕاهێنابوو لە سەری، عەزیزیش لە سەر سازەکە بوو، هەروەها تیپی شانۆی هەڵەبجەش شانۆیەکیان ئامادە کردبوو بە ناوی (کێشە) لە دەرهێنانی کامەران ئەحمەد و نوسینی سەلاح حاجی عەلی، بەڵام وا بزانم لە ڕاستیدا لەنووسینی حەکیم مەلا ساڵح بوو کە چووبووە دەرەوە ببووە پێشمەرگە بۆ ئەوەی ناوی نەبرێت.

ئێمە بەو تیپە میللییە دابەزین کە ساڵی (١٩٨٢) مامۆستا حەمە فەرەج ئەحمەد بە شێوازێکی جوان لۆگۆی تیپە میللیەکەی بۆ دروست کردین و بۆی هەڵکۆڵین و لە پێش ئامێری سەنتوورەکە دامان ئەنا و چەند بەرهەمێکمان پێشکەش کرد، پێشکەش کاری بەرنامەکەش ئومێدی نوری حەمەی نانەوا بوو، چونکە توانای نواندن و پیشکەش کردنیشی هەبوو، پاشانیش دەچوومە خوارەوە سینەما تاریک

دەبوو لە ناو خەڵکەکەوە فلیمەکەم دەگرتە سەر شاشەی سینەماکە لای خەڵک شتێکی سەیر بوو بۆ ئەو کاتانە.

ئەم ئەندامانە بەشدار بوون وەک مۆزیک ژەن:

١.ئازاد ساڵح: جۆزە، کەمان

٢.عەزیز حەمە کەریم: ساز

٣.ئاراس شێخ جەمال: سەنتوور

٤.بەهمەن ئەحمەد دەلاک: باڵەبان

٥. ئیسماعیل سەید حەسەن: زەڕب

٦.مەحمود ئەحمەد عبدالرحمن: دەف

بۆ ماوەی ٦ ڕۆژ بەردەوام بوو کە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر قەرەباڵغ دەبوو کە ژنان و پیاوان پێکەوە دەهاتن بۆ سەیری.

ئەم بەرهەمانە پێشکەش کران بۆ ئەم هونەرمەندانە:

١. پارچە مۆسیقای مەستم، ئامادەکردنی ئەنوەر قەرەداغی

٢. محەمەد لامەکەزی، گۆرانی (جوانان دەگرن کۆمەڵە)و(ئای لە خڕێ گیان)

٣. عوسمان کەیمنەیی (گەچێنەیی) کاڵە بەی کاڵێ، کە دوایی بۆ تەلەفزێۆن تۆمار کرا و گۆرانی (خاس بیژەنە)و (بەرزی کاڵە بەرزی) کە پاشان ناسری ڕەزازی وتییەوە .

٤. کامەران ئەحمەد کە دەرهێنەری شانۆکەش بوو گۆرانی (ئای لە هاڕەی گۆبەرۆکی عوسمان عەلی و گۆرانییەکی تری وت ناوەکەیم لە یاد نەماوە

٥. محەمەد ئیبراهیم عەبدول (بەچەندی گوڵ بە چەندی) و(گوڵەکەم)، (قاسم خان) و(نەرمە نەرمە) و (سەوزەی کاڵە بەی و هۆ مەچۆ دامەچۆ).

زۆربەی ئامادە کردنی مۆزیکەکان خۆم بووم، بۆیە لە بەر دووبارە نەبوونەوەی ناوم و هاندانی ئەندامانی تر دابووم بەوان، دەلیلی کارەکان بەڵگەن، کە هەمیشە کەسانی ترم هان داوە بۆئەوەی بتوانن ئاواز دانێن یان ئامادەی بکەن.

لەپاڵ ئەم کارە موزیکییەدا تیپی نواندنیش بە شانۆیی (کێشە) بەشدارییان کرد. لەو ئەکتەرانەی کە بەشداریی نمایشەکەیان کرد ئەمانەم لە بیرە: عبدالله حەمە لاو، سەلاح حاجی عەلی، ڕێبوار نوری، بەهادین حاجی بەکر، شێرکۆ محەمەد سەعید و چەندانی تر.



**عوسمان کەیمنەیی ١٩٨٣**



**محمد ئیبراهیم عەبدول ١٩٨٣**



**کامەران ئەحمەد ١٩٨٣**

**لەسەربازی رزگارم بوو**

لە مانگی (٤) ی ئەو ساڵە لە سەربازی ڕزگارم بوو، کاتی خۆی من لە فەرمانگەی کارەبا بووم، بەڵام بڕیارێک دەرچوو کە ئەتوانیت ڕاژەت بگوازیتەوە بۆ فەرمانگەیەکی تر، من خۆم گواستەوە بۆڕۆشنبیری هەڵەبجە کە ئەو کات محەمەد ئەمین پێنجوێنی بەڕێوەبەری ڕۆشنبیری سلێمانی بوو، کار ئاسانی بۆ کردم و لە لقی ڕۆشنبیری لە بینایەی کازیوەی ئێستا بووم بە ژمێریارو لێپرسراوی چالاکی هونەری، خوالێخۆشبوو کاک عوسمان سەید ئەحمەدیش بوو بە بەڕێوەبەری و هەروەها کاک سەروەت حاجی کەریم کوردسانیش بەڕێوەبەری مەڵبەندی لاوان بوو لەگەڵ خوالێخۆشبوو نەریمان ئەنوەر کە ساڵی (١٩٨٤) لە شەڕی ئێران ـ عێراق گیانی لە دەستدا .

**یەکەمین بەرهەمی تەلەفزیۆنیمان چۆن تۆمارکرد؟**

لە بەهاری ساڵی (١٩٨٣) لە ستۆدیۆکانی تیپی مۆسیقای مەولەوی مامۆستا عەلی ڕەزا، (پێنج) بەرهەمی تەلەفزیۆنی بۆ تۆمار کردین کە ئەمانەن:

١.محەمەد ئیبراهیم عەبدول (گوڵەکەم، قاسم خان)

٢.عوسمان کەیمنەیی (کاڵەبەی ، کەتانە، ئای بە لەنجە گیان)

وە هەموو ئاوازەکان فۆلکلۆر بوون و هەمووی خۆم مۆزیکم بۆ ئامادە کردبوون، بەڵام هەندێکیانم دا بە ئە ندامانی تر لەبەر هەمان هۆ کە پێشتر باسم کردووە.

مۆزیک ژەنەکان بریتی بوون لە :

١.ئازاد ساڵح : کەمان

٢.عەزیز حەمە کریم: جەمبوش

٣.ئاراس شێخ جەمال: سەنتور

٤.بەهمەن ئەحمەد و ڕەحیم باڵە بان کە هاوکارمان بوو لە تەلەفزیۆنیش لەگەڵمان بوو.

٥.عومەر حەمە ڕەحیم: ئیقاع

٤.مەحمود ئەحمەد: ئیقاع

٦.ئاراس مەقصود: ئیقاع

٧ـ شوان عەلی مەجیلان: ئیقاع

وا بڕیار بوو لەگەڵ تیپی چۆپی کە سەر بە بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری سلێمانی بوو، پێکەوە تۆماری بکەین، بەڵام دەرهێنەرەکە عادل ناوێک بوو، تورکمان بوو، وتی نۆرەی ئێوە نییە، بەڵام من و عومەر و شوان لەگەڵیان بەشداربووین لە وێنە گرتن:

کە ئەم گۆرانییانەیان بۆ تۆمارکردن:

عەبدوڵای زارا ـ هەی کاکی بەزاز

محەمەد جەزا زەنگەنە ـ بە تۆی سرکەیی

محەمەد ئیبراهیم ـ ئەی سەوزە سەوزە

کاتێک ڕێگایان بە تیپی ئێمە نەدا، ئیمە زۆر بیتاقەت بووین، کاک عوسمان توڕە

بوو، وتی من ئیتر تۆماری ناکەم، مەحمود ئەحمەد کەسێکی کۆمەڵایەتی بوو، هەرچۆنێک بوو دڵی نەرم کرد، دوای مانگێکی تر واتە مانگی ٧ چووینەوە بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوک، من پێش ئەندامان لەگەڵ کاک عوسمان و محەمەد ئیبراهیم شەو لە سلێمانی ماینەوە لە ماڵی پوورە فەخریم و عومەری وەستا مەردان لە گەڕەکی مامۆستایان خۆیان ئاسا زۆر ڕێزیان لێ گرتین و بۆ سبەی چووین(٤)گۆرانیمان تۆمار کرد، بەڵام گۆرانی (ئای بە لەنجە گیان)یان تۆمار نەکرد و تا دوای ڕاپەرینیش شریتی بەکرەکەم لامابوو، نازانم ئەویش دوایی فەوتا .

ئەم بەرهەمانە دەنگی باشی دایەوە و یەکەمین جار بوو کە کاک عوسمان کەیمنەیی لەتەلەفزیۆن گۆرانی وێنە بگرێت، تا ئیستاش ئەیڵێتەوە و ئەڵێت کاک ئازاد من چەند شریتم هەبوو هێندەی ئەو دوو گۆرانییە منی بە خەڵک نەناساند بە تایبەتی لە ئێران دا، ئە م چالاکییانە تا نیوەی یەکەمی ساڵی ١٩٨٣ بوو.

### کۆنسێرتێک بۆ هونەرمەند عوسمان کێمنەیی

لە مانگی (٦ی ١٩٨٣)دەقی شانۆگەرییەکی منالانم لە گۆڤاری(ڕۆژی کوردستان) بەرچاو کەوت، لە ماڵی پورە فەخریم لە کتێبخانەی سەرچڵی پوورم، بەناوی (سەوزە)وە دی، وتم ئەو ژمارەم بدەرێ، وتی باشە، دوای ئەوە کەوتمە ئاواز دانان بۆی، بە ئامێری بانجۆ، پاش ئەوە دام بە مامۆستا کامەران ئەحمەد ئەویش لەگەڵ کاک عوسمانی نەجیبە چەند خوشکێک و خزمان و دراوسێکانی کۆکردەوە و چەندین منالی تریش، ئەو کاتە منیش سەرکەوتی برامم هێنا، ڕێبوار نوریش کامەرانی برای، زیاتر لە ٤٠ منالْ ئەبوون، هەموو ڕۆژێک پاسە پۆلۆنیەکەی کاک فریادی غەفوری حەبێ ئەیهێنان وئەیبردن، زیاتر لە مانگێک ڕاهێنانیان کرد و هونەرمەندی ڕەوان شاد ئەسغەر ڕەشیدیش دارێکی دروستکرد کە زۆر لە منالان پێی سەرسام بوون، بە کورتی هەموو ئە ندامانی تیپی شانۆ و مۆزیک پێوەی خەریک بووین، من و عبداللەی حەمە لاو بەگ، عوسمانی نەجیبە، ڕێبوار نوری، نزار نوری برای، شاعیرەکانیش: ئیبراهیم هەورامانی، سەلاحە

ڕەش، هەندێ لە منالآنم هێنا کردمانن بە کۆرس و ئاوازەکانیان دەوتەوە، من زۆر سوودم لە ئاوازی فولکلۆری منالآن وەرگرت، ئاراسی شێخ جەمال و ڕزگار سدیقیش بەشدار بوون، یە ک دوو ئاوازیان دانا، عەزیز حەمە کەریمیش مالّیان چوو بۆ سلێمانی بەلاّم جار جار دەهاتەوە و بەشدار ئەبوو لەگەلّمان.

دوای ئەوە جولّەمان بۆ دانا و مامۆستا کامەران زۆر ماندوو بوو لەگەلّیان، لە مانگی ٦ دا لە شانۆی مەلّبەندی لاوان، شوێنی بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری ئێستا و هۆلّی چالاکی تێدا بوو، بەلاّم لە کاتی گەڕانەوەی داگیرکاری ئێران پاش کیمیابارانکردنی هەلّەبجە، چەندین بینا ڕووخان لەوانە کتێبخانەی گشتی و کارگەی پوختە کردنی توتن، کە ئێستا بووە بە بارەگای مەلّبەندی یەکێتی، بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک نمایشمان کرد و پارەیەکی باشمان تێدا خەرج کرد وپاشان لەو کارە جوانە زیانمان تێدا کرد، دوایی بیرم دێت من و عبداللەی حەمە لاو بەگ و کامەران بۆ قەرەبوو کردنەوەی زیانەکەمان وتمان با لە سەیدسادق کۆنسێرتێک بکەین بۆ عوسمان کەیمنەیی و چەند گۆرانی بێژێکی تر و چەند گۆرانییەکمان بۆ عوسمان کەیمنەیی ئامادە کرد لەگەلّ حەمەی حاجی واحید کە مێردمنالّێکی دەنگ خۆش بوو بۆ گۆرانییەکانی مەزهەری خالقی، هەروەها مام ئایاری حسین عزیزیشمان بانگ کرد و لەگەلّ چەند گۆرانی بێژێک، دوای ئەوە چووین بۆ قائیمقامیەت و ئەوانیش نووسراوێکیان کرد بۆ ناحیەی سەید سادق و چووین بۆ لای بەڕێوەبەری ناحیەی سەید سادق و هاوڕێیەکم لەوێ ئەندازیار بوو ڕەوان شاد کەریم سەید قادر زۆر هاوکارمان بوو...

قوتابخانەیەکمان دەست نیشان کردو یەک دوو کارتۆنمان هەلّواسی لە بازاڕی سەید سادق مانگی ١٠ بوو، ڕەزامەندیمان وەرگرت نوسراوەکەم لاماوە، چەندین بلیتمان چاپ کرد مۆرمان لێدان، عبداللەی حەمەلاو بەگ بوو بە پێشکەشکار، لە ڕۆژی نمایش هۆلّ پڕبوو .... جمەی ئەهات هێندە بلیتمان فرۆشت، دوای ئەوە ناچاربووین، لە سەر پەڕە کاغەزێک ئیبراهیم هەورامانی شاعیر خەلّکی ئەکردە ژوورەوە پارەکەی لێ وەرئەگرتن و ئیمزای ئەکرد و ئەهاتنە ژوورەوە، بە هەموومانەوە کۆنترۆلّی ئەو دەرگایەمان نە ئەکرد، بەڕاستی خەلّکی سەید سادق تینوو بوون هەمووی ناوبانگی کاک عوسمانیان بیستبوو، ئێمەش ئەو سالّە گۆرانیمان بۆ تۆمار کردبوو، لە تەلەفزیۆن، هێندە بلیتمان فرۆشت مایەی زیانە مادییەکەی هەلّەبجەی بۆ پڕکردینەوە بە زیادیشەوە .

## ئۆپەرێتی (سەوزە)مان برد بۆ دهۆک

پێشـتر هـەر لە مـانگی ٩ ی هـەمـان سـاڵ (١٩٨٣) ڤیسـتیڤاڵی لاوانـی نـاوچەی ئۆتۆنۆمی سازکرا لە دهۆک، زۆر لە ئەندامانی شانۆمان لەگەڵ بوو، ئێمە ئەوسا و ئێستاش خۆشەویستی هەیە لە نێوانمان، منالێکی زۆرمـان لەگەڵ بـوو هێنـدە زۆر بوون دابەشمان کردبوو بـە چەنـدین گـروپەوە، پێـنج یـان شـەش کەس، کەسێکی گەورە سەرپەرشتی ئەکردن، لەوانە عوسمانی نەجیبە، مەلا یاسین کە زۆر خۆش و دڵسۆز بوو لە ناو بازاڕ هەموو شوێنێکی ئەگەڕاندن، با ڕاست بڵـێم هـەندێکمان شەوان ئە چووین بۆ یانەی فـەرمـانبەران بـۆ گفتوگـۆی رۆشـنبیری و هونـەری و هەڵسەنگاندنی کارەکانمان و بەدەمیشیەوە کەمێک سەرمان گەرم ئەکرد.

ئۆپەرێتەکەمـان بـرد بـۆ دهـۆک واتە ئـۆپەرێتی سـەوزە، هەر لە ئـوتێلەکەش چەند گۆرانییەکمان ئامادەکرد بـۆ ئـەوەی دوای ئۆپەرێتەکە نمایشـی بکەیـن، ئـەو گۆرانی بێژانەش بریتی بـوون لـە مامۆسـتا کـامەرانی ئەحمـەد کارەبـا و ئـەڵـوەنی کوێخـا عـەلـی کە بەشـداربوو لەو ئۆپەرێـتە، گۆرانییەکیشـم بـۆ ئـەو ئامـادە کـرد، شـــەوی نمایشــەکە هونەرمەنـدی بە توانـا دڵشــاد محـەمــەد سـەعیـد لیـژنەی هەڵسەنگاندن بـوو، هـەر هـاتە ژوورەوە هـەمووئامـادە بـووانی هۆڵەکـە هـەسـتانە سەر پێ و دەستیان کرد بە چەپڵە ڕێزان تا دانیشت.

نزیکەی پێنج خولەک زیاتر چەپڵە ئەو ناوەی پڕکرد، پارێزگاری دهـۆک لەوێ بوو، یەک دوو کەس پێشوازییان کرد، بەڵام بۆ دڵشاد ئەو کارەیان کرد، کەسانێک هەن کە ڕێزی هونەرمەند لە سیاسییەک زیاتر ئـەگرن، لەو کـاتەدا دڵـم لە خۆمـان دائەما بۆ ئێمە چیمان کەمە؟

مۆزیک لای مـن کـارێکی خۆڕسکە، نەک دروسـتکراو، بەڵام ئیتـر ژیـان خـۆی وایە، ئێمە دەستمان کرد بە نمایش و لە سەرەتای کارەکەمان لەسەر شانۆ کارەبا کوژایەوە تا کۆتایی ئۆپەرێتەکە، ئیتر نەدەنگی منالەکان لە کاتی نمایش، نە دەنگی مۆزیک نەما، هێندە هۆڵەکە پڕ بوو بە ئاستەم گوێم لە کەمـان ژەنەکەی پـاڵـم بـوو، بـاش بـوو دڵشـاد لە پێشـەوە دانیشـتوو، وتـی بەردەوام بـن، ئاگـام لە کارەکەتـانە، کاتێک نمایش تەواو بوو کاتی گۆرانییەکان کارەبا هاتەوە .

هـەمـوو تیپەکـانی لاوانـی کوردسـتان بە شـداربوون، دوایـی ئەنجـامەکە بەم شێوەیە بوو:

**١. سلێمانی، یەکەم بوو**
**٢. تیپی شنروێ و ئۆپەرێتی سەوزە دووەم بووین (واتە هەڵەبجە)**
**٣. تیپی پاشای گەورەی ڕەواندوز سێهەم بوون**
**٤. تیپی باواجی کۆیە، چوارەم بوون**
**ئەوەی لە بیرمە ئەم گۆرانیانەشمان دوای ئۆپەرێتەکە نمایش کرد.**
**١. کامەران ئەحمەد ـ گۆرانی: کراسەکەت مۆرە +ڕە نگی زەردم بۆ تۆ مردم کراسەکەی خامەکە – دەستم بۆ مەمکۆڵەی برد – وتی هە تیوو وا مەکە**
**٢. ئەی هاوار لەیلی باوانم، لەوتنی: ئەڵوەن کۆێخا عەلی**
**٣. شیلان حامید و حەمید واحید گۆرانییەکیان وت، وێنەکەی ماوە**
**تا ئێستاش دەقی ئۆپەرێتەکەم لاماوە، فەوتا بوو،ساڵێکیان مامۆستا هیدایەت عوسمان بۆی پەیدا کردمەوە، هەروەها تۆماری دەنگی ئاوازەکانی ئۆپەرێتی سەوزەشم لاماوە کە ساڵی (١٩٨٥) تۆمارمان کرد بۆ تەلەفزیۆن وپاشتر باسی دەکەم .**

## ئاهەنگی ساڵی ١٩٨٤

**من پێشتر لە ساڵی (١٩٨٣) ڕاژەکەمم لە فەرمانگەی کارەباوە گواستبووەوە بۆبەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری کە تازە کرابووەوە، پاشان کاک عوسمان محەمەد سەید ئەحمەد باوکی بەڕێزموقەدەم بەرزان کە ئەویش دەرچووی کۆلێجی بەڕێوەبردن بوو، هاوڕێی منالێم بوو، لە سەرەتاییەوە پێکەوە بووین، ئەویش لە کۆلیج لە بەغدا پێکەوە بووین، دوای ساڵێک لە من، بەڵام بۆ ساڵی دووهەم خۆی گواستەوە بۆ زانکۆی سلێمانی بووە بەڕێوەبەری لقی ڕۆشنبیری ئەو کاتە.**
**بەڕێوەبەری ڕۆشنبیری سلێمانی محەمەد ئەمین پینجوێنی بوو، هەروەها لەگەڵ بینای بەڕێوەبەرێتی لاوانیش پێکەوە بووین، کە هە ردووکمان لە بینای بەرێوەبەرێتی گشتی ڕۆشنبیری ئیستا بووین، بەڵام بیناکە ئێران ڕوخاندی، چونکە هۆڵێکی چاکی تیا بوو، ئێمە ژووری تایبەتی خۆمان هەبوو کردبوومانە**

ستۆدیۆ، لەو کارەدا تەهای حاجی بەکر کە دارتاشی لە باوکییەوە بۆ مابووەوە و خۆشم دارتاشیم ئەزانی، ستۆدیۆیەکمان دروست کرد، هەروەها بەڕێوەبەری لاوانی هەڵەبجەش کاک سەروەتی حاجی حەمە کەریم کوردستانی بوو، وە ڕەوان شاد (نەریمان ئەنوەر) کە لە شەڕی ئێران ـ عیراق ساڵی (١٩٨٥) گیانی بەختکرد، سەرباز بوو، فەرمانبەران ئەوەی لە بیرم بێت فریشتە، مەحبوبە (تارا)ی خێزانی کاک فەرهەنگ محەمەد ئیسماعیل بوو، وە کارمەندەکان: کاک حیدەر، قادر، کاک صالح، سەید کەریم کە کارەباییش بوو، بە هەرحاڵ هێندەی لە یادم بێت نووسیومە. وەک چالاکی لە مانگی چواری (١٩٨٤) ئاهەنگێکی گۆرانی و مۆزیکمان ئە نجامدا، خەڵکانی موجەمەعی عەنەب هێندە تامەزرۆ بوون هۆڵەکە پڕببوو وە سەری هۆڵەکە جەمەلۆن بوو، بەردیان تێ دەگرتین، ناچار پۆلیسمان بانگ کرد بۆیان، لەو ئاهەنگەدا چەند گۆرانی بێژێک بە شدارییان کرد لەوانە: عوسمان کەیمنەیی، حەمەی حاجی واحید کە زیاتر گۆرانی مەزهەری خالقی دەوتەوە، هەر لەو ئێوارانەش لە سلێمانی تیپی چۆپی کە کاک بێستون گورجی سەرپەرشتی ئەکردن هاتن و نمایشی گۆرانی و مۆسیقایان لەگەڵ ئێمە ئە نجامدا.

لە ڕێکەوتی (٩/٩/ ١٩٨٤) مامۆستایەک هەبوو بەناوی (حەمە رەحیم رەمەزان)لە تەلەفزیۆنی کەرکوک بەرنامەیەکی هەبوو بە ناوی (پەلکە زیرینە) کە بەرنامەی منالان بوو ئەو ڕۆژە هەموو ئەندامانی تیپمان کۆکردەوە و بەرنامەیەکی تایبەت و سەرکەوتوومان بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوک ئەنجامدا، کە زیاتر لە پەنجا منالّ بەشداربوون، ئەو بەرنامەیە دەرهێنەرەکەی مەسیحی بوو پیاوێکی سوعبەت چی بوو، لەگەڵ مەحمود ئەحمەد بووە هاوڕێ ناوی (لبرۆن سیمۆن) بوو، کامێرامانەکە ناوی ئەحمەد ڕەمەزان بوو، چووینە گولان و ئەو بەرنامەمان تۆمارکرد، کاتێک پەخشکرا زۆر سەرکەوتوو بوو، لە هەولێر رۆژنامەنوس شێرزاد عبدالرحمن لە ڕۆژنامەی العراق لە سەری نووسی.

لە پایزی (١٩٨٤) لە گۆڤاری کاروان م. شەفیق محەمەد ئۆپەرێتێکی نووسی بوو بە ناوی (ڕێویەو لە پێستی شێردایە) نزیکە ی ١٢ ئاوازم بۆ دانا، هەروەها ڕزگار سدیق یەک دوو ئاوازی بۆ دانا و ئاراسی شێخ جەمالیش ئاوازێکی بۆ دانا، هەر لەو ساڵەدا لە لاوانی سلێمانی دوو ئامێری ترم هێنا بیرم دێت ڕەوان شاد (عبداللەی حەمە خانە ڕۆڵە) کرۆنایەکی ٨٢ ی سپی پێبوو، ئامێری قانونم هێنا بۆ ئاراسی شێخ جەمال کە بە ماوەیەکی کەم فێربوو، ئامێری چەلۆشم بۆ نظام شێخ

حسین کە هەردووکیان بەو ئامێرانە بەشدار بوون، کە یەکەمجار بوو بخرێنە ناو گروپەکەوە، هەروەها بۆ بەهمەن ئەحمەد فلوتم بۆ هێنا، دەرهێنانی ئەم ئۆپەرێتە (مەحمود مەلا عەلی) بوو، کە دەرچووی پە یمانگا بوو بەشی شانۆ، دروستکردنی جل و بەرگ و دەمامکی ئاژەڵەکان: م.رجا محەمەد بوو، لەگەڵ دیکۆرەکان کاک ئەسغەر ڕەشیدیش بەشدار بوو، ماوەی ئەم ئۆپەرێتە: کات ژمێرو نیوێک ئەبوو، لە هۆڵی ڕۆشنبیری نمایشمان کرد.



لە کاتی تۆمار کردنی گۆرانییەکان کە ڕەوان شاد غەریبی تەنەکەچی لە سلێمانیەوە هات و بۆی تۆمارکردین بە دەنگی منداڵەکان تۆمارمان کرد لەوانە ئەڵوەن عەلی، فاتمە عەلی، شیلان حامد ، هەڵاڵە و زۆری تر، ئەم بەرهەمەمان ساڵی (١٩٨٥) لە تەلەفزیۆنی کەرکوک تۆمار کرد کە بە دوو زنجیرە تۆمارمان کرد، زۆر سەیرە جاران بە یەک شەو دوانزە گۆرانیمان تۆمار ئەکرد، ئێستا بە مانگێک یەک گۆرانی تۆمار ناکرێت، بیرم دێت لە شەوی تۆمارکردن، عبداللەی حەمە لاو و هۆشیاری حەمە فەرج و مەلا یاسین و عوسمانی نەجیبەمان لەگەڵ بوو، مۆزیک ژەنەکان: من ، شوان عەلی مەجیلان، ئاراس محەمەد سابیر، ڕزگار سدیق، ئاراس شێخ جەمال، عەزیز حەمە کەریم، مەحمود ئەحمەد. دەرهێنەری تەلەفزیۆنی کەسێکی تورکمان بوو بە ناوی (سەباح ڕەشاد).



منالآن،کاتی تۆمار کردنی بەرنامەی ( پەلکە زێڕینە )١٩٨٤



گروپی مۆزیک،کاتی تۆمار کردنی بەرنامەی ( پەلکە زێڕینە )١٩٨٤

## تۆمارکردنی ئۆپەرێتی سەوزە لە ساڵی ١٩٨٥دا بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوک

خـەیـاڵ ئـەفرێـت و لـەگەڵ بەسـەر چـوونی ڕۆژو مانـگ و سـاڵ تـەنهـا یادەوەرییەکان ئەمێننەوە، هەر چەندە من هەستم بەو ساتانە ئەکرد کە هـەمووی ئەبێتە ئەرشیف، لەوانەیە کەم کەس هـەبێت بە وردی ڕۆژو مانـگ و ساڵەکانی لە بیـر بێت، مـرۆڤ بـەسـەرهاتـەکـانی لە بیـر ئـەچێتەوە، گیـانێکم بەوەیە زۆربەی یادەوەری هونەریم لە کاتی خۆی نوسیوەتەوە و زۆربەشیان فەوتاون بە داخەوە. بەڵام با ئەوەم لەبیر نەچێت ئۆپەرێتی سەوزە لەنوسینی فازیل قەصاب بوو.

ساڵی ١٩٨٣ لەگەڵ ئەندامانی تیپی شانۆی هـەڵـەبجە ڕێکەوتین کە بیکەینە کارێکی هونەری و بە شێوازی ئۆپەرێت، دەرهێنانی ئەو بەرهەمە کەوتە ئەستۆی مامۆستا کامەران ئەحمەد. کاک عوسمانی نەجیبە، چەند خوشکێکی مناڵی هەبوو لەوانە فاتمە، ئەڵوەن و چەند خوشکە زایەکی شیلان و هـەروەهـا ئـەوەی لە بیرم بێت هەڵاڵەعومەر، ڕەئوفیش مناڵێکی جوانکیلە بوو برای مامۆستا جەلال عوسمان و چۆمانی برای سەلاحـەڕەش، مـن سـەرکەوتی بـرای خۆشـم بەشداری پێکرد و کوڕانی عەلی مەجیلان و مناڵێکی هاواری بەناوی ڕزگار شەوکەت و چەندینی تر. ئەم ئۆپەرێتە مـایەوە تـا سـاڵی (١٩٨٥) مـانگی (١)واتە کـانوونی دووهەم، وتـم بە ئەندامان بۆ نـەیبـەین بۆ تـەلـەفزیۆنی کـەرکوک؟ وتیـان باشـە، کە لە تەلەفزیۆن دەقەکەیان دی یەکسەر ڕەزامەندییان لەسەردا، ئەسغەر ڕەشید دیکۆرێکی جوانی بۆ کردبوو، درەختێکی دروست کردبوو دەجوڵایەوە، مناڵان زۆر سەرسام ببوون پێی، پاش ئەوە شەوێک کاک غەریبی تەنەکەچیمان بانگ کرد بە شەوێک زیاتر لە دە دوانزە ئاوازمان تۆمارکرد، ئەکتەرەکان کۆرسیش بوون، مۆزیک ژەنەکان: من بووم، شوان عەلی مەجیلان، ئاراس محەمەد سابیر، ئاراس شێخ جـەمـال، ڕزگـار صدیق، عەزیز حەمە کەریم، مەحمود ئەحمەد، زۆربەی ئەندامانی تیپی مۆزیک و شـانۆ ئـەو شـەوە جێگـەونوێنمان بردبـوو لـەوێ خـەوتـین، دوایـش بـۆ خۆشـی گۆرانییەکمان بو هۆشیار حەمە فەرەج و عبدالله حەمە لاو بەگ تۆمـارکرد: قـازان قەتاران.

دواتـر نزیکـەی ١٠ ی مـانگی یـەک بـوو مـن و ئـەسـغەر خـاوەن دێکۆرەکـە، بە ئۆتومبیلی محەمەد ئیبراهیم عەبدول چووین بۆ کەرکوک شەو تـا درەنـگ پێکـەوە

دیکۆرەکەمان دائەنا و لەگەڵ دەرهێنەرەکە کە ناوی سەباح ڕەشاد بوو گفتوگۆمان لەسەر ئەکرد، بۆ سبەی هەموو ئەندامانی مۆزیک و منداڵەکان هاتن بە کۆستەرێک بۆ ستۆدیۆی کەرکوک، تەنانەت هەندێکیان لەئەندامانی موزیک سەربازی هەڵاتووبوون، وەک عوسمانی نەجیبە و مەحمود، خۆیان کرد بە ستۆدیۆدا، من لەگەڵ دەرهێنەر چوومە ژووری کۆنترۆڵ لە قاتی سەرەوەی ستۆدیۆکە، لەگەڵ دەرهێنەرەکە تێبینیم ئەدایە لە کاتی گۆرانی یان نواندن یان هەڵپەرکێ، تا عەسر کارەکەمان تەواو کردو پاشان لە ژووری ژمێریاری بانگیان کردم و ٥٠٠ دیناری ئەو کاتەیان دامێ، سەیرم لێهات، ئەمە یەکەم جارە شتی وا ببینم، وتیان کارەکە جوان ئەبێت، دوای ئەوە هەموو گەڕاینەوە و پاش ماوەیەک تەلەفزیۆن دەستی کرد بە پەخشکردنی، ئەگەر ستایش نەبێت، بووە کارێک ناوبانگی لە هەموو کوردستان دەرکرد، بۆ ماوەیەکی زۆر هەر منداڵێک لە دەرەوە بووایە یان کۆڵان، یان کاتی نان خواردنی ئێواران وازی لە هەموو شتێک ئەهێناو سەیری ئەو بەرهەمەی ئەکرد.

ژمارەی تایبەتی
ڕۆژی کوردستان

سەوزە

دیمەن : باخچەیەکی نزیك شارێکە .

( چەند منالێك خەریکـــی یاری‌کردنن ، هەریەکەیان سەرگەرمی جۆرە یاری‌یەکە . لەسەرەتای ئەم دیمەنەدا یاری‌و خـــۆش رابواردنی ئەو منالانە جێ سەرنجـــی دەرهێنەرە . درەختێکی گەورە لەباخچەکەدایە منالیك پیایدا هەڵئەگەڕێ ، درەختەکـــە نووزەو هاوارێکی کەمی لێ بەرز ئەبێتەوە .
چەند جارێك ئەم شتە دووبارە ئەبێتـــەوەو سەرنجی منالەکان رائەکێشێ ) .

فاضل قصاب

**ئاراس** : دەی منالینە ! نزیك‌ببنەوە ، کۆببنەوە .
وەوزـ با هەموو یاری شەڕە شمیر بکەین .
با هەریەکەتان شتێك پەیدا بکاو بیکاتـــە شمشێر . هەر یەکەشتان هاوڕێیەك بـــۆ خۆی دەست نیشان بکا تا بەرامبـــەری بووەستێ .. دەی .
( دوای هەندێ جوڵانەوەو ڕاو ئەگیبر )
**نەوزاد** : هاوڕێیان ! هەمووتان لە چۆنیەتـــی یاری‌یەکە تێ‌گەیشتن‌و زانیتان . ئینجـــا باهەریەکەتان شتی خۆی ئامادە بکـــاتـــا دەست پێ بکەین .
( **دیسان بلاوئەبنـــەوەو ئەگەڕێنـــەوە )** .
لەو کاتەدا منالیك ئەیەوێ لقێکی درەختـــە گەورەکە بپچڕێنێ . هەول ئەداو هـــەول ئەدا ، بێ سوودە ، دیسان هەول ئەداتەوە .
درەختەکە دەنگی لێ بەرزئەبێتەوەو سەرنجی هەندێکیان رائەکێشێ . ئەم هەولدانـــە چەند بارە ئەبێتەوە . منالەکان روو بـــۆ درەختەکە وەرئەگێڕن . منالی لای‌درەختەکە کەمێك ئەسلەمێتەوەو دوور ئەکەوێتـــەوە . درەختەکە بەردەوام هاوارو نووزەی دێت ) .
**کامەران** : چیە ئەم هەرایە ؟ (خەریکە بگـــری)
دەستم لەت لەت بوو ئەولقە دارەم بـــۆ نەکرایەوە ( ئەدرەختەکە نزیك ئەبێتـــەوەو بیایدا ئەکێشێ ئەم نەفرەت لێ‌کراوە قینی لێمەو خۆشی ناوێم ( دەنگی درەختـــــە کەدێت ) .
ئاراس : لەسەرخۆ بە کامەران ، ئارامت هەبێ ( نزیك ئەبێتەوەو ئەیەوێ لقەکە بپچڕێنێ )
هەر ئێستا ئەولقە دارەت بۆ ریشەکێـــش ئەکەم .
**درەختەکە** : ئانا ... تا ( ئەگرووزێتەوە ) بۆچی ئازارم ئەدەن ؟ بۆ ؟! ئای :. وەختە بمرم.. هەموو گیانم ئەزریکێنێ .
**کامەران** : ها ؟ ( بەزلێو فشەوە ) بۆ ؟ چیمان لێ کردووی ؟
**درەختەکە** : ئێوە دەستـو قاچم ئەبڕنو ئەمکوژن .
**کامەران** : جاتۆ چیت تا بتکوژین !!
**درەختەکە** : منیش وەك ئێوە حەز لە ژیان ئەکەم . ئەخۆمو ئەخۆمەوەو پێویستیشم بەحەوانەوە هەیە .
**خەندە** : وازی لێ بێنن .. بەزەییتان بەوگـــەڵا جوانانەیدا بێتەوە .
**کامەران** : باشە هیچمان لێت ناوێ‌و وازمان لێ

٥٧

٤

## دانانی ئاوازی سەربەستی لەساڵی ١٩٨٦دا

لە ڕۆژی ١٥ ی مانگی چواری (١٩٨٥) ئەو کاتە لە محاویل نزیک (حلە) لە یەکەی تۆپ (وحدة المدفعیة) لە سەربازی هەڵاتم، پاش ماوەیەکی کەم هەڵەبجە هەموو ڕۆژێک ئەدرایە بەر تۆپ و ڕاجیمە، هەراسان ببووین، ڕۆژانە خۆمان دەشاردەوە لەناو چەم و دۆڵەکان، تاوای لێهات شەویکیان من ، ئاراسی شێخ جەمال، عوسمانی نەجیبە، ئەسغەر لە ماڵی دولبەرخانی خوشکی ئاراس بووین، دەیان ڕاجیمە لە نزیکمان تەقیەوە و ورەمان نەما، ئەو شەوە هاوین بوو، هەمووومان چووینە چاوگ تا سبەی لە ناو جێبێک و لە مزگەوتەکەی باوەکۆچەک خەوتین، بۆ سبەی هاتم بۆ سلێمانی بە هەڵهاتوویی، لەگەڕەکی مامۆستایان ژوورێکم گرت بە کرێ، مانگی بەپانزە دینار، لای ڕەوانشاد عومەری وەستا مەردان لە مامۆستایان بووم بە شاگرد دارتاش، مانگی بە چل یان پەنجا دینارێک، ئەو کاتانەش مامە عەزە لە تیپی نەورۆز بوو لەگەڵ زانای مەحمود هەژار و بەختیار سەرسپی لە گەڕەکی ئاشتی لە قوتابخانەی ئەردەڵان تەمرینیان ئەکرد ئەوانیش زۆربەیان سەربازی هەڵاتوو بوون، یەک دوو جار عەزیز بردمی بۆ لایان، تا پایزی ئەو ساڵە لەوێ بووین، پاشان گەڕامەوە و لە هەڵەبجە دوکانی دارتاشیم دانا، ژیانێکی سەختبوو، ئاراسی شێخ جەمالیش بوو بە شاگرد لام، لە مۆزیک دوور کەوتمەوە، هەموو دەست و پە نجەم ڕەق بوون، جار جار هاوڕێیانم ئەهاتن بۆ لام تا هاوینی (١٩٨٦) عەبدوڵای حەمە لاو بەگ هات بۆلام لە دوکانەکە، وتی شانۆگەرییەکمان هەیە ئاوازی بۆ دابنێ، شیعری (بۆل ئیلوار)ە، من تاقەتم نەما بوو، خۆیان تەسجیلیان هێنا، ئاوازێکم دانا بە ناوی (سەربەستی) لەو تۆمارەدا، ئاراسی شێخ جەمالم لەگەڵ بوو، فرودی برای و مەحمود ئەحمەد. کۆرسەکان عەبدوڵای حەمەلاو، عوسمانی نەجیبە، ڕێبوار نوری و ئەڵوەن عەلی ئەوە تاکە بەرهەمی ساڵی ١٩٨٦ بوو تۆمارەکەی فەوتا ..

## دانانی چەند ئاوازێک لە ساڵی ١٩٨٧ دا

هـەر لـەو سـاڵەدا ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ ژیـان قورسـتر دەبـوو کـاری دارتاشـی نەمابوو دوکانی دارتاشیم داخست ئۆتۆمبیلێکی(نەسر)ی سپیم کڕی بۆ ئـەوەی ئیشی تاکسی بکەم، هەر پێش من فەرهەنگی حەمەی سمایل ڕینۆیەکی کڕیبوو، هەموو سەربازی هەڵاتووبووین، ژیانێکی سەخت بەهۆی شـەڕی کوردو شـەڕی ئێران ـ عێراق.

هاوینی ساڵی (١٩٨٧) بوو کاک (نزار نوری)دەقێکی شانۆیی، یوسف العانی کردبووە کوردی، هێنای بۆ من بە حوکمی ئەوەی عەرەبییەکەم باش بوو، بەناوی (کلیل) لام جوان بوو، نزیکەی دە تا دوانزە ئاوازم بۆ دانان کارێکی جوان بوو، بەڵام بەداخەوە، هەرچی ئەو ئاوازانە هەیە هەمووی لە یادەوەریم فڕین، هیچیانم بە بیر نایەتەوە ...

**ئاوازی گۆرانی یەکان و مۆسیقا**

ئازاد صالح ـ رزگار صدیق ـ ئاراس جمال

وەرگێڕانی هۆنراوەکان بە دەستکاری یەوە :ـ

دڵشاد عمر کاکی — ابراهیم هەورامانی

**بەشداڕانی مۆسیقا**

| | |
|---|---|
| ئازاد صالح | کەمانچە |
| شوان علی | = |
| | = |
| | = |
| عزیز حمە کریم | چەلو |
| ئاراس جمال | سەنتور ـ جاز |
| ڕزگار صدیق | ئۆکۆردیۆن |
| عەدنان قادر | ایقاع |
| فلاح احمد | = |

گۆرانی / هوشیار حمە فرج ـ ئەڵوەن علی

کۆرس / فاطمە علی ـ گوڵزار مجید

زانا محمد ـ فریق عبدالله

**تیپی نواندنی هەڵەبجە**

سەر بە مەڵبەندی لاوان

بە هاوبەشی

تیپی مۆسیقای شنروێ

شانۆیی

**کلیل**

پێشکەش ئەکات

نوسینی / **یوسف العانی**

وەرگێڕانی / **نزار نوری**

دەرهێنانی / **ڕێبوار نوری**

لەسەرشانۆی مەڵبەندی لاوان

لە ڕۆژی [illegible] / ٧ / ٩٨٧ و ڕۆژانی دوایی

کات ژمێر ( ٥ )

چاپخانەی کامەرانی

## دانانی (١٠) ئاواز بۆ تیپی هونەری پێشڕەو لە هەڵەبجە، ساڵی ١٩٨٨

لە سەرەتای ئەم ساڵەدا تیپی هونەری پێشڕەوی شانۆی کوردی(هەڵەبجە) کە کاک فەرهەنگ محەمەد ئیسماعیل سەرپەرشتی دەکرد کە بەخۆیی و سەرهەنگی برایی و دیاری و خوشکەکانی: سەمیعە، بەهار، هەموویان بەشدار بوون لەگەڵ چەندین ئەندامی تر پەیوەندییان پێوە کردین، کە بەنیازن شانۆگەرییەک بکەن بە ئۆپەریتێک بۆ منالان بە ناوی (ماسیە ڕەشە بچکۆلەکە) لە نووسینی نووسەری فارس(سەمەدی بە هرەنگی)بوو، بۆ ئەوەی ئامادەی بکەین.

ئێمە لەگەڵ هەموو گروپە شانۆییەکان بەشداریمان دەکرد، بێ گوێدانە هیچ بەربەستێک لەو کاتەدا چەند تیپێکی هونەری شانۆ هەبوون وەک : تیپی شانۆی هەڵەبجە، پێشڕەو، گۆران ، مەشخەڵ. تەنانەت لە ساڵەکانی هەشتاو شەش چەند ئەندامێک لە ئێمە جیا بوونەوە تیپێکیان دانابوو بە ناوی (تیپی مۆسیقای شەم)کە کاک عومەری حەمە ڕەحیم (دانا هەڵەبجەیی) سەرپەرشتی دەکردن، شیعری ئەم شانۆنامە کاک ئازاد تۆفیق شیعرەکانی دانا بوو، ئێمەش ئەندامانی تیپەکە بریتی بووین لە من و فرود شێخ جەمال، ئاراس شێخ جەمال، ڕزگار سدیق، مەحمود ئەحمەد، ئەحمەد خالیدی ئامۆزام، فەرهاد محەمەد، فەلاح محەمەد ڕەشیدیش جار جار بانگۆزی لێ دەدا، من نزیکەی ١٠ ئاوازم بۆ دانا و هەندێ ئەندامانی تریش لەوانە ڕزگار سدیق، هیچ کام لەو ئاوازانەم لە یاد نەماوە تەنها دەلیلی ئەو شانۆیە نەبێت، کاک فەرهەنگ دەرهێنانی بۆ کرد و شێرکۆ محەمەد سەعید ئامادەیی کردبوو، لە ڕێکەوتی ١٠ ی ٢ تا ١٤ ی مانگی ٢ ی ١٩٨٨ ئەم کارەمان لە شانۆی مەڵبەندی لاوان، بەڕێوەبەریتی گشتی ڕۆشنبیری ئێستا ئەنجام داو سەرکەوتنی بە دەست هێنا، واتە مانگێک پێش کیمابارانی هەڵەبجە ئێمە بەردەوام کاری هونەریمان ئەنجام دەدا، ئیتر دوای ئەم ڕۆژە هەڵەبجە بوو بە شارێکی دی، بووە ململانیی جێگای شەڕی حزبەکان و هەرچی جوانییە تێیدا ونبوو، کە تا ئێستاش پێوەی دیارە کە خەڵکی شارەکە هەموو دەربەدەربوو یان بۆ ئێران یان هەندەران و یان شارەکانی تری کوردستان، کە تا ئێستاش و ئەوساش پێوەی دیارە ..

بە هاوبەشی تیپی مۆسیقای شنرۆی

شانۆیی

( ماسی بە رەشە بچووکەکە )

نووسینی / صمد بهرنگی

وەرگێرانی / عبدالکریم محمود شێخانی

ئامادەکردنی / شێرکۆ محمد

دەرهێنانی / فەرهەنگ محمد

پێشکەش دەکا

---

بەرێز

تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردی [illegible] بە بەڕێوەبەرایەتی

رۆشنبیری جەماوەر لە هەڵەبجە

شادمانین بە هاتنتان بۆ شانۆیی [ ماسی بە رەشە بچووکەکە ]

رۆژی / ٢ / ١٩٨٨ کات ( ) ی ئێوارە

لە سەر هۆڵی مەڵبەندی لاوان

بەڕێوەبەری هۆڵ : [illegible]

چاودێران : عەلی جمیل ، امیر توفیق ، معتصم عثمان

مهدی ابوبکر ، محمود حمەلەمین ، بەکر فرج

## سوپاس

سوپاسی تایبەتیمان بۆ ئەو شوێن و بەرێزانەی

یارمەتیان داوین .

بەرهەمە پێشکەش کراوەکان

1 — هاوارێکی ئاسان 1983

2 — پێکەنین وەپێی پاسا 1984

3 — فایلی ٦٧ 1986

4 — چارەنووسی ئادەمیزاد 1987

5 — پەروانە 1987

## کاراکتەرەکان

وێژەر : فاتح عزیز

ماسییە رەشەکە : شارا محمد عبدالله

دایکی ماسییە رەشەکە : بەهار محمد

ماسییە گەورەکە : حسن جمیل

پیرە ماسی ١ : محمود حسن

پیرە ماسی ٢ : کاوە محمد

ماسییە پیرەکە : حسن جمیل

مارمێلکە : پەرۆ نامق

قرژاڵ : کاظم محمد جبار

سەرە مێکوتە ١ : سالار حمە فرج

سەرە مێکوتە ٢ : پەرز نامق

دایکی بۆق : کچەر عمر

بۆق ١ : وەرزێر احمد

بۆق ٢ : دیاری محمد

ئاسک : ئالا محمد ـ شنە محمد

ڕاوچی : فەرهەنگ محمد

ماسی ١ : سالار حمە فرج

ماسی ٢ : دیاری محمد

ماسی ٣ : وەرزێر احمد

ماسی ٤ : جوێرە فرج

ماسی ٥ : ئالا محمد

ماسی ٦ : ئیان عبدالقادر

جوتیار : دیاری محمد

لادێی : کچەر عمر

چەند ماسییەک : [illegible] جلال ، پەرز ، ئیان [illegible]

ماسییە سوورەکە : جوێرە فرج [illegible]

بێچوی ماسی [illegible] : ئالا محمد و شەیدا عەلی

دەنگ : کچەر انور ، فەرهەنگ محمد

## هونەرییەکان

بەڕێوەبەری بەرهەم : احمد حسن [illegible]

= شانۆ : کچەر انور [illegible]

دیکۆر : نزار رشید

جێبەجێ کردنی : فاتح عزیز ، شێرکۆ خالد

صمد حمە رشید ، ئومید جلال

جلوبەرگ : نزار رشید ، کچەر انور

فریشتە محمد ، چیمەن دلی

اکسسوار : ئومید جلال ، امیر توفیق

مهدی ابوبکر

ئارایشت : فرهنگ محمد ، نزار رشید

پۆستەر : نزار رەشید

خۆشنووس : ناسیق ابراهیم

رووناکی : عمر عەلی ، عطا عزیز

جێبەجێ کردنی : محمود حمە امین ، عەلی جمیل

امیر توفیق ، حمە عبدالله

## چالاکی هونەری لە ئێران لەساڵی ١٩٨٨

دوای ئـەو کـارەسـاتە گەورەیە، مـن وەک خـۆم کـۆڵم نـەداوە لـە ئێـران کـە لـە ئۆردوگـای سـەروچـاوە گیرسـامەوە، لێپرسـراوانی ئۆردوگـاکە کردمیـان بە لێپرسراوی بەشی ڕاگەیاندن، لە سەرووی ئۆردوگاکە چادرێکم وەرگرت لـەوێ پرۆڤەم بە منالانی ئۆردوگاکە دەکرد، ئامێری مۆزیکیـان دامێ و لەو منـالانە کـاک سیروان لهۆنی شاهیدە کە ئەو کاتە منالْ بوو وە کاک غەریب، وە کوڕێکی ئێرانـی منالێک بوو کوڕی ڕەسولی میرزا پوور کە عود ژەن بوو هاوکاری کردم، لـەگـەڵ ڕەوان شاد محەمەد کەریم زادە، ئەمانە هەموو لە سەقز بوون، ئێمە لە ئۆردوگای سەروچـاوە بـووین، هـەندێکی تریـان وەک ڕزگـاری شـێخ صـدیق، ئاراسـی شـێخ جەمال، وشیاری حەمە فەرەج لە ئۆردوگای سونغور بوون، دوور بـووین لەیەک، تا لە مانگی پێنجی ئەو ساڵە بەمنیان گوت لەگەڵ چەند کـەسـێکی تـر، کە ڤیسـتڤالی شیعر خوێندنەوە هەیە لە شاری مەهاباد مـن شـیعرێکم نووسـی لـەوێدا بـووم بە شاعیر، منیش لەگەڵ چەند هاوڕێیەک لەوێ کۆبووینەوە، لەوانە مامۆستا جەمالی پوررزام و ڕزگـاری ئـامۆزام، کـاک شـیروان ، م. سـەریـاس ، م. سـالم ، چـووین بـۆ سـەقز لە فـەرمانـداری بـووین، کـەچـی لەوێ دوو هونـەرمەنـدمان دی سـەنتـور ژەنبوون: عەزیزی سـەیفی و هونـەرمەند ڕەشـیدی فـەیزی نەژاد، کە پرۆڤـەیـان دەکرد، هەموو سواربووین بە پاسێکی مارسـیدس، ئێوارە گـەشـتینە مەهابـاد، بـۆ شەو چووینە ئوتێل کوێستان، بۆ شەو کاک محەمەد ئەحمەدی کارەبـا ناسـراو بە حەمە قیادە لە ئۆردوگای سـونغور چەنـد منـالێکی هێنـا بـوو وە یـەک دوو ئـاوازی دانابوو، وە فلوت ژەنێکی لەگەڵ خۆی هێنابوو بە ناوی ئاغای ئێران پوور، وە ئیتر پێکەوە لەگەڵ یەک هاوکاریمان کردو کاک فـەیزی نەژاد کـەمـانێکی فـەرەنسـی بـۆ پەیـدا کـردم، دەسـتمان کـرد بەتـەمـرین کـردن، بـۆ ڕۆژی دوایـی یەکەمـین جـەژنەوارەی هـونەری کـوردی لـە شـەڕدا لـە مەهابـاد ئـەنجـام درا، وە ئێمـە بەشداریمان کرد، بیرم دێت پێشکەشکارەکە ناوی محـەمـەدی کریم زادە بـوو، دە ستێ جلی شـالی ڕەشـی کوردی لـەبەربوو، وە زۆر بە حـەماسـەوە گروپـەکەی ئێمەی پێشکەش کرد، وە دوای ئێمە گروپی کاک فەیزی نەژاد چالاکییان ئەنجام دا ، کە خۆی گۆرانییەکی شادی وت و لە ناو شانۆکەوە لێپرسراوێکی ئێرانی وەلامی

بۆ نارد کە گۆرانی شاد (ممنوع است) دوای ئێمە زۆر لە هونەرمەندانی شاری مەهاباد لەوانە کاک حسین ڕەهبەر هاتنە سەر شانۆکە، هەموومانیان ماچ کرد لەگەڵ کۆرسەکەدا کە هێشتا جلی ئۆردوگایان لەبەر بوو، وە خەڵاتی ڕێز لێنانیان پێشکەش کردین، یەکی چەند مەترێک قوماشیان پێشکەش کردین کە هاتینەوە بۆ ئۆردوگا کاک ئیدریس ناوێک هەبوو خەیات بوو بۆی دروویین، من مابووم تا ئەوڕۆژەی کە هاتینەوە عێراق لەسەر سنوور خەڵاتەکەم لە چوارچێوە گیرا بوو، لەوێ شکاندم، بۆ ڕۆژی دوایی کاک فەیزی نەژاد بردینی بۆ ماڵی هونەرمەندی گەورە محەمەدی ماملێ، زۆر ڕێزی لێگرتین، تۆزیک نەخۆش بوو، لە جێگا کەوتبوو، قاچی تووشی ڕۆماتیزم ببوو، من وتم گەر ئاوازێکت بۆ دانێم بۆ هەڵەبجە؟ وتی بەسەر چاو، وتی کورد زۆر نەهامەتی دیوە، هیچیان هێندەی هەڵەبجە کاریگەر و گورچکبڕتر نەبووە، ماڵی حەمەی مامڵی دوو قات بوو، خۆی لە ژووری سەرەوە بوو، لەو ڕۆژەدا هونەرمەند ئیبراهیمی قادری لەوێ بوو، هەروەها وریای کوڕی لەوێ بوو لەگەڵ چەند کە سێکی تر وە وێنەمان لەگەڵدا گرت کە هاتینە خوارەوە لە بەردەرگاش وێنەمان لەگەڵ وریای کوڕی گرت، وەتەلەفزیۆنی ئێران لەوێ بوو بەرهەمەکانیان تۆمار کردین، دوای چەند ڕۆژێک نمایشی کرد و لە ئەرشیفی تەلەفزیۆنی ئێران ماوە.



لە ڕاستەوە: محمد ئەحمەد کارەبا. ئازاد سالح . کەسێکی ئیرانی .محمدی مامڵێ . ئیبراهیمی قادری .ڕزگار خالد
ماڵی محەمەدی مامڵێ ١٩٨٨ مەهاباد



بەردەمماڵی محەمەدی ماملێ لەراستەوە وریا محەمەد ماملێ .ئازاد ساڵح .هونەرمەند فەیزی نەژادی. مامۆستا جەمال حەسەن



مەیدانی چوار چرای مەهاباد

لەراستەوە .م.سالم .ئازاد ساڵح .م.سەریاس . م . جەمال حەسەن .شیروان ڕزگار خالد



مەیدانی چوار چرای مەهاباد . ئازاد سالح ١٩٨٨

## ساڵی ١٩٨٩ و ١٩٩٠ چالاکی هونەریم وەستا

پاش ئەوەی کە شەڕی ئێران -عێراق تەواو بوو لەڕۆژی ١٩٨٨/٨/٨کە خومەینی وتی جامێک ژەهرم خوارد بە ناچاری شەڕ وەستا، زۆربەی خەڵک لە ئۆردوگاکان گەڕانەوە بۆ عێراق، ئێمە لە کۆتایی مانگی ١٠ گەڕاینەوە لە سلێمانی نیشتەجێ بووین، بارێکی ناهەموار ڕووی تێکردین لە هەموو ڕوویەکەوە، من سەربازێکی هەڵاتووبووم، چەندین جار گیرام بە سەربازی و هیچ بوارێک نەبوو بۆ کاری هونەری ئیتر چالاکی هونەریم وەستا تا پاش ڕاپەڕین ..

## یەکەمین چالاکی دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١ لەهەڵەبجە

لە هاوینی ساڵی (١٩٩١) بەڕێکەوت ڕێم کەوتە بینای یەکێتی ئافرەتانی عێراق لە گەڕەکی بەختیاری لە سلێمانی، نزیک هۆڵی ڕۆشنبیری کە کرابووە بارەگای یەکێتی لاوانی سەر بە پارتی و محەمەدی ئەحمەدی کارەبا، چەند کەسێکی کۆکردبووەوە، ئەوەی بە بیرم بێت ڕزگارە سوور بوو وە منیش چەند ئەندامێکی ترم کۆکردەوە و لە باخی گشتی بە بۆنەی یادی دامەزراندنییەوە لە باخی گشتی هەڵەبجە ئاهەنگێکمان ساز کرد کەتێیدا کامەرانی کەمال خەفاف پێشکەشکار بوو، ئەو کاتە سەرەتای ڕاپەرین بوو، بەرەی کوردستانی باڵا دەستبوو، من هیچ گوێم نەئەدایە ئەو بۆنە چییە بەڵکو ئەوەی گرنگ بوو لام چالاکی هونەری هەبێت، ئەوە یەکەمین چالاکیمان بوو. ئەم چالاکییە کە لە (١٦)ی ئابدا کرا لە باخی گشتی، محەمەد ئەحمەد کارەبا ناسراو بە حەمە قیادە سەرپەرشتی ئەکرد

## پێشکەشکردنی کۆڕاڵی هەڵەبجە لەساڵی ١٩٩٢

لە ساڵی (١٩٩٢) جارێکی تر دەستمان کردەوە بە چالاکی هونەری لە مانگی سێی ساڵی (١٩٩٢) لە گەڕەکی سەرا کاک سیروان عەلی ڕەزا خانوویەکی چۆڵی بۆ گرتین بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژێک هەموو ئەندامان لەو خانووە ئەخەوتین، لە بیرم دێت ئاراس شێخ جەمال، عەزیز حەمە کەریم، هۆشیار حەمە فەرەج، نەجم محەمەد، ئیبراهیم نەجم الدین، فرود شێخ جەمال، شوان عەلی مەجیلان، مەحمود ئەحمەد عەبدوالڕەحمان، سەرحەد شەریف بۆ یەکەمین جار کاک ئازادە ڕەش، کاک مەلا بەختیار بەهۆی سەڵاحی شێخ سدیق ناردبووی بۆ لامان، وتی دەنگی خۆشە بەڵکو لاتان ببێت بە گۆرانی بێژ، دوو مۆزیک ژەنی سلێمانی لەگەڵمان بوون کاک نەوزادی حاجی، کەمان ژەن و کاک ئاسۆ عەلی بۆ ئامێری ساز،

هەروەها دوو ئەندامی دێرینی تیپەکەش هاتن لەوانە مستەفا کەمال خەفاف و ماموستا هەڵکەوت شێخ محەمەد، دوای چەندین ساڵ هاتنەوە لامان، ئەو ساڵە زۆر گرنگی ئەدرا بەو یادە و من لە لیژنەی باڵای ئەو یادە بووم، لەگەڵ ماموستا ئەنوەر قەرەداغی، خالید سە رکار، عەبدولی حەمە جوان، فەرەیدون دارتاش، عەلی جۆلا، حیکمەت هیندی، دارا حەمە عەلی، ماموستا حەمە فەرەج ئەحمەد، ماموستا تەها خەلیل، ماموستا ناسر تۆفیق کە ئەو لۆگۆی فیستیڤاڵەکەی دروست کرد لەگەڵ چەندین هونەرمەندی تر، ئەو ساڵە من بۆ یەکەمین جار (کۆڕاڵ)ێکم دانا بە ناوی (شۆڕشی هەڵەبجە) کە یەکەمین بەرهەمی کۆراڵی من بوو.

لە باخی گشتی نمایشمان کرد، ئێمە یەکەم تیپ بووین دابەزین تەنانەت ناسری ڕەزازی لە هەندەرانەوە گەڕابووەوە سروودی (دنیا خەمە ژیان ژانەی) گووت و ئەژدەر وەهبی ئەو کاتە مێرد منداڵێک بوو، ماموستا سەلاح ڕەئوف ئاوازی (دایە گیان)ی بۆ دانا بوو، تارا ڕەسوڵ سروودی (بە تەنیا جێم مەهێڵن)ی وتەوە لەگەڵ تیپی مۆسیقای سلێمانی .. هەروەها سەرکردە کوردەکان : مام جەلال و مەسعود بەرزانی ئامادە بوون، ئیتر ئەو کاتە وابوو!

ئێمە یەکەم بەرهەم دابەزین، دوای ئێمەش تیپی مۆسیقای سلێمانی و تیپی مەولەوی لە دوای ئەوان بوون و ماموستا ئەنوەر قەرەداغی ئەو ساڵە وەک کامێرامان وێنەی ئەو فیستیڤاڵەی گرت کە لە تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان کاری دەکرد ..

بەرهەمەکانی تیپی مۆسیقای شنروێ لە ڕۆژی ١٩٩٢/٣/١٦بەم شێوەیە بوو:

١. کۆڕاڵی (شۆڕشی هەڵەبجە) هۆنراوەی سەردارمەردان، ئاوازی ئازاد سالح، وتنی: سەرحەد شەریف

٢. دێوانە، ئاوازی هۆشیار حەمە فەرەج و ئازاد سالح، هۆنراوەی ڕەفیق سابیر، وتنی: هۆشیار حەمە فەرەج

٣. (ناتوێینەوە) ئاوازی عەزیز حەمە کەریم ، وتنی : ئازادە ڕەش

٤. (جێ ژوانم هەڵەبجە بوو) ئاوازی: ئاراس شێخ جەمال، وتنی : نامق سەعید عەزیز

ئەمە پوختەی چالاکی مانگی سێی ١٩٩٢ بوو دوای ئەوە بۆ ساڵانی تر من ئەم کۆڕاڵە دا بە دەنگی زاهیر جەلال لە ساڵی ١٩٩٦،١٩٩٤ وتیەوە

## به دوو ڕۆژ شەش گۆرانیمان وێنەگرت

هەر لە پایزی (١٩٩٢) ویستمان چەند گۆرانییەک و سروودێک بۆ تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان تۆمار بکەین و هیچ شوێنێکمان نەبوو بۆ پرۆڤەکردن، ئەندامانی تیپەکەش کەم ببوینەوە، ناچار سوودمان لە کاک نەوزادی حاجی بۆ کەمان و کاک هێرش عبدالرحمن هەروەها کاک لوقمان سابیر بۆ ئامێری فلووت لە کاتی تۆمار کردنی دەنگ هاوکارمان بوون، ناچار زۆر شەو لە ماڵی خۆم، یان کاک ئایاری حسین عەزیز یان کاک نامق سەعید پرۆڤەمان ئەکرد، شەوێکیان پێشەکییەکی مۆزیکم بۆگۆرانی (شەماڵ بیشەنێ) دائەنا، بۆ خۆم خەریک بووم، ئاراسی شێخ جەمال لەلام بوو، وتی کاک ئازاد ئەو پێشەکییە زۆر جوانە دەست خۆش، پاش ئامادەکردنی گۆرانییەکان، ئەو کاتە کاک سەباحی سەنتور لە شەقامی ئۆرزدی سلێمانی لە بازاڕی (دەوەن)ستۆدیۆیەکی دانابوو، بە تەسجیلی بەکرە، م.ئەنوەر قەرەداغی گۆرانییەکانی بۆ تۆمارکردین.

بیرم دێت لە مانگی (٩)بوو، کە لەعەسرەوە تا کاتژمێر هەشتی شەو شەش گۆرانیمان تۆمارکرد، دوای چەند ڕۆژێک بە وێنەگرێکم وت کاک (پۆڵا سدیق) لە تەلەفزیۆنی حزبی شیوعی کاری دەکرد ڕۆژی ١٩٩٢/١٠/١٧ کە یەکەم بارانی پایز باری، بە یەک ئێوارە چوار گۆرانییمان وێنەگرت، بۆ ڕۆژی دووهەم دوانەکەی تر، ئەتوانم بڵێم یەکەم کلیپ بوو کە توانیمان لە دەرەوە و لە سروشت ئەنجامی بدەین وە دیمەنەکان خۆڕسکانە درووست بوون.

بۆ نمونە :

لە گۆرانی (هۆ هۆ کابانێ) بە ڕێکەوت شوانێک لەوێدا بوو تێکەڵ بە گۆرانییەکە کرا، یان هەندێ دیمەنی تر وە زۆربەی گرتەکان من بە وێنەگرەکەم ئەوت بەو کادرە بیگرە و شوێنەکانمان ئاڵوگۆڕ ئەکردەوە توانیمان بە دوو ڕۆژ شەش گۆرانی وێنە بگرین و بیدەین بە تەلەفزیۆنەکان و سەدایەکی باشی هەبوو لەو کاتەدا و تا ئێستاش تام وچێژی خۆی هەیە، وێنەی ئە م گۆرانییانە لە چاوگ و بیاوێڵەو عەنەب لەهەڵەبجە گیران، بەرهەمەکان بەم شێوەیە بوون:

١. (بۆ شەهید)هۆنراوەی : حەمە عەزیز، ئاواز: هۆشیار حەمە فەرج، وتنی: ئایار حسین عزیز

٢. (دیۆانە) ئاوازی هۆشیار وئازاد، هۆنراوەی : ڕەفیق سابیر، وتنی: هۆشیار حەمە فەرج

٣. (هاواری هەڵەبجە)هۆنراوەی: ڕەفیق محەمەد، ئامادەکردن : ئازاد ساڵح، وتنی: نەجم محەمەد

٤. (شەماڵ بیشەنێ)هۆنراوەی: فۆلکلۆر، ئاواز : ئازاد ساڵح، وتنی ئازادە ڕەش

٥. (نەوبەهار) هۆنراوەی: فۆلکلۆر ، ئاواز : ئازاد ساڵح، وتنی: سەرحەد شەریف

٦. (شیرین و کابانێ) ئاوازی یەکەم : فۆلکلۆر، دووهەم واتە کابانێ هۆشیار حەمە فەرەج، ئامادە کردنی مۆزیک : ئازاد ساڵح، وتنی هۆشیار حەمە فەرەج.

لەم چالاکی و بەرهەمەمانە تەنها من بەشدار نەبووم، بەڵکو ئەوهونەرمەندانەی تریش ڕۆڵی بەرچاوی خۆیان دیوە لە دڵسۆزی لەخۆبردوویی، ڕاستە من کارەکتەری سەرەکی کارە هونەریەکان بووم چ لە ڕووی بەڕێوەبردن یان هونەری، بەڵام هەوڵ و ماندووبوونی ئەوانیش کە بێ جیاوازی بە هەند وەرئەگرم و ئەگەر ئەوان نەبوونایە ئەو کارانە ئەنجام نەئەدرا سوپاسیان ئەکەم، کە ناوی زۆربەیانم بردووە .

## چالاکی هونەری ساڵی (١٩٩٣)

لەم ساڵەدا هێندەی نوسیبێتمەوە یەک چالاکیمان ئەنجام داوە، ئەویش بەشداری کردن بووە لە یادی شانزەی مانگی سێی ١٩٩٣ ئەویش بەم بەرهەمانە :

١. (شەهید) ئاوازی هۆشیار حەمە فەرەج، ئامادە کردنی: ئازاد ساڵح.

٢. (ئەم مەڵبەندە) ئاوازی هۆشیار، ئامادەکردن: ئازاد ساڵح، شیعری: محەمەد کەساس

٣.کۆراڵی (شۆڕشی هەڵەبجە) ئاوازی: ئازاد ساڵح ، هۆنراوەی : سەردار مەردان، وتنی : زاهیر جەلال

وە ئەم بەرهەمانە لە گۆڕەپانی شەهیدان ئەنجام درا، کە هۆشیار چووە هەندەران، (ئەم مەڵبەندەی) لە تەلەفزیۆنی کەناڵی (مید) بە هەمان ئامادە کردنی مۆسیقای من کە کەمان ژەنی تورکی ـ ئێرانی (عارفی ئیبراهیم پوور) و پێشکەش کردنی: کاک حسەین ڕەهبەر بوو.

## ساڵی ١٩٩٤ و هاتنی کاک عادل حەسەن بۆ تیپەکەمان

هەر وەک ساڵانی پێشوو بەشداریمان کرد لە یادی شانزەی سێ، لەبەر ئەوەی شوێنی پرۆڤەمان نەبوو ماڵی حەمەی حاجی ناجی چۆڵ بوو بۆ پرۆڤە کردن چووینە ئەوێ، چەند شەوێک لەوێ ماینەوە من بۆ جارێکی تر (کۆڕاڵ)ێکی نوێیم دانا کە ماوەی بیست خولەک دەبوو بە ناوی (هــۆ خەڵـکینـە) لە هۆنراوەی کاک ئــازاد تۆفیـق و دڵشــادی عـومەری کـاکی، کـە چەنـدین مۆزیـک ژەن و گـۆرانی بێژبەشداربوون تێیدا لەوانە هۆشیار حەمە فەرج، ئازادە ڕەش، نەجم مـحەمەد، هەر لەو ساڵەدابوو بەڕێکەوت کاک (عادل)م دی، کە لە تیپی مەشخەڵ کاری دەکرد، ئێوارەیەکیان لە نزیک سەرای سلێمانی دیم، وتم کاک عادل بۆ نایەیت بەشدار بیت لەگەڵمان؟ وتی من لە تیپی تردام، هاوڕێی خۆشەویستمی لێیە ناتوانم وازیان لێ بێنم، لەوانە کاک عومەری چەلۆ، وتم کێشە نابێت لەگەڵ هەردوو تیپەکە کاربکە، وتی با بزانم، ئیتر ئەوە بوو هات و بەشداریکرد لەگەڵمان و بووە ئەندامێکی چالاک، هەروەها هونەرمەند خەلیل عبداللە وەک کۆرس لەگەڵمان بەشدار بوو، وە ئێستا یەکێکە لە هونەرمەندە بە تواناکان لە زۆربەی ئامێرەکان: نای.تار. سەتار وساز، بە توانایە، بیرم دێت سازێکی بە دەستەوە بوو، هاتبوو بۆفێربوون، شتێکی خۆش: هەر من ئەو ساڵە لیژنەی هەڵسەنگاندنی کارە هونەرییەکان بووم، ئەبوایە بچوومایە بۆ بینینی کارە هونەرییەکان، شەوێک بوو تیپێک ئاوا سێ چوار کەس ئەبوون، لە مزگەوتێکدا تەمرینیان ئەکرد، چووم بۆ سەیری کارەکانیان زیاتر مۆرکی سوونەتی بوون.

دوایش یەکێکیان هات کارەکەی ئێمەی بینی وتی ئاوازێکی زۆر(مەحزونە)

کەواتە بەهۆی چالاکی بەردەوامی ئێمەوە چەندین کەسی دڵسۆز ئەهاتن و بەشدار ئەبوون لەگەڵمان، بەرهەمەکان بەم شێوەیە بوون:

١. کۆڕاڵی (هۆ خەڵکینە) هۆنراوەی ئازاد تۆفیق و دڵشاد عومەرکاکی، ئاوازی: ئازاد ساڵح، وتنی کۆرس و هۆشیار حەمە فەرەج و ئازادە ڕەش

٢. (شەوەن خەڵوەتەن) هۆنراوەی مەولەوی و فۆلکلۆر، ئاوازی ئازاد ساڵح، وتنی ئازادە ڕەش.





هەر هەمان ساڵ (١٩٩٤) واتە نزیکەی مانگی پێنج بوو، ئەندامانی تیپ بەتایبەت هۆشیار و ئاراس و عەزیز و مەحمود، وتیان کاک ئازاد با چەند گۆرانییەکی تر تۆماربکەین، ئەو کاتانە هۆشیار یەک دوو ئاوازی دانا بوو لەوانە یەکێکیان گۆرانی (کاڵێ بار مەکە) بوو لە بازاڕ بۆی وتم، منیش وتم ئاوازێکی چاکە، لێم وەرگرت و لە دائیرە بە پیاسە کردن و بە دەم خەیاڵ، کەمانەکەم پێ بوو، وردە وردە ئاوازەکەم چاک کردوو پێشەکیم بۆ دانا، پاشان ئاوازێکی تری هەبوو (لێم گەڕێن) ئەمەش لە ماڵەوە شەوێکیان ئاراس هات بە خۆی و سەنتورەکەیەوە ...

دوای ئەوە کاتی خۆی لە ڕادیۆی کوردی بەغدا گۆرانی بە لەنجەم گوێ لێبوو، زۆرم بە دڵ بوو ئەمویست دەستکاری بکەم و لەگەڵ خۆم ئەمگووتەوە لە بازاڕی سلێمانی بیرم دێت لە شەقامی مەولەوی ئەپەڕیمەوە بەشێکم بۆ زیاد کرد (ئەرێ

شاگوڵی گوڵشەن ئازیز لیمۆ دیارە/ ئەرێ دەستم نایگاتی، ئازیز دڵم غەمبارە) دوای ئەوەش ئاوازێک و هۆنراوەیەکی مامۆستای ڕەوان شاد بەختیار عەبدوڵام لە یاد بوو کە ساڵانی حەفتاکان بۆی وتبووم و هەندێ مۆزیک و بەرزبوونەوەم بۆ دانا و دام بە نەجم محەمەد بەناوی (گۆرانی ئەم گوێ چەمە ..هۆ جەمەیە هۆ جەمە)، نزیکەی مانگی شەش بوو کە لە ستۆدیۆکەی سەفین خەراجیانی بە هاوکاری کاک زانای مەحمود هە ژار و هێرش عبدالرحمن تۆمارمان کرد، لە پێشدا لە دەربەندیخان وێنەمان گرت، بەڵام نازانم بۆ بلاو نەکرایەوە؟ دوایی کاک بەکر فەرج لە هۆڵی ڕوشنبیری سلێمانی وێنەی بۆ گرتین بەڵام گۆرانی(لێم گەڕێن)مان وێنە نەگرت، هەر بە دەنگ بڵاوبووەوە، دوایی لە بەرنامەکانی ساڵانی دواتر وێنەمان گرتەوە و ناوبانگی باشی هەبوو، گۆرانی کاڵێ بارمەکە و لێم گەڕێن لە چەندین بۆنەدا دووبارەمان کردۆتەوەو تا ئێستاش تام و بۆی خۆی هەیە و چەندین هونەرمەندی تر لە ئێران و عێراق وتویانەتەوە.

بەرهەمەکان بەم شێوەیە بوون :

١.گۆرانی (لێم گەڕێن) هۆنراوەی فۆلکلۆر، ئامادەکردنی مۆزیک: ئازاد ساڵح

٢.(گۆرانی (بەلەنجەگیان)هۆنراوەی فۆلکلۆر: ئاوازی فۆلکلۆر+ئازاد ساڵح، وتنی: ئازادە ڕەش

٣.گۆرانی (کاڵی بارمەکە) هۆنراوەی فۆلکلۆر، ئامادە کردنی مۆزیک ئازاد ساڵح + زانا مەحمود هەژار، وتنی : هۆشیار حەمە فەرەج

٤.گۆرانی (گوێ چەم)هۆنراوەو ئاوازی :بەختیار عبداللە +ئازاد ساڵح، وتنی: نەجم محەمەد.



## چۆن لە بینای دەبۆکەی سلێمانی لە شەقامی مەولەوی نیشتەجێ بووین؟

جاری وا هەیە بە پێی تێپەڕبوونی کات شتەکان لە بیر دەچنەوە و یادەکان پاش وپێشدەکەون، هێندەی لە بیرم بێت بینای دەبۆکە لـە سـاڵانی هـەشـتاکان دروسـت کراوەو چەند دوکان و بازاڕی تێدا دروست کرا، کە سـاڵانی چلـەکـان و پەنجاکـان ناوچـەرگـەی شـاری سـلێمانی بـووە و هـەرچـی کـڕین و فرۆشـتن و هـاتووچۆی خەڵکانی گوندنشین لەوێ بووە و دارچنارو بارەداری تێدا فرۆشراوە و بۆ خانوو و دووکـانی ئـەوکـاتە بـەکارهـاتووەو وێنـەکـانی بـەر دەرکـی سـەرا شـاهیدن، بـە هـەرحـاڵ ، لـەپـاڵ ئـەو دوکـان و بـازاڕە و چـەنـد قـاتی ئەوبینـایە گـەلـەرییـەک بـۆ پێشـانگای وێنە بەکـار هـاتووە، مـن یـەکـەم جـار سـاڵی (١٩٨٥) بـوو سـەربـازی هـەڵاتـوو بـووم، مـاڵم لە سلێمانی بـوو، پێشـانگایەک کرایـەوە بـۆ هونـەرمـەندانی شێوەکار لەوانە: ئیسماعیل خەیات، عەلی جۆڵا و مامۆستا حەمە فەرەج کە هەندێ هەڵکۆڵینی لە دار دروست کردبوو، پاش ڕاپەڕین ئـەم شـوێنە، قـاتی سـەرەوەی پشتگوێ خرابوو بەشێکی کرابوو بە بـارەگـای تـەلـەفزیۆنی پـارتی لە سـلێمانی و کەمال ڕەئوف هەنجیرە، کە دەرچووی بەشی شانۆ بوو بـەڕێوەبەری بـوو، پێش ئێمە عەبدوڵای حەمە لاو بەگ ژورێکی وەرگرتبوو، جار جار دەچووم بۆ سەیری پرۆڤەکانیان، ڕۆژێکیان چووم ڕێبوار نوری شانۆگەرییـەکی دەرئـەهێنـا، زسـتان بـوو، بیـرم دێـت چیرۆکنـووس حەمە فەریـق حەسـەن لـەوێ بـوو، دواتـر مـانگی چواری (١٩٩٤) بوو، عەبدوڵا وتی بۆ ژورێک ناگرن بۆ خۆتان، چووم سەیرم کرد دوور لە ڕووتان هەمووی پیسایی بوو بێ ئاو، بێ کارەبـا ، وتـم هـەرچۆنێک بێت باشە، مادام ناوچەرگەی بازاڕە، لەگەڵ عەبدوڵا دووقۆڵی چووین بۆ لای م. کەمال لە قاتی سەرەوە بوو، بۆم باسم کرد، بێ گفتوگۆ یەکسەر ڕەزامەندی دەربڕی، تـا ئەو کاتە کەس ئاگای لێ نەبوو، دوای دە ڕۆژێک لە ڕێکەوتی ١٩٩٤/٤/١٤ هـەمـان ساڵ بە ئەندامەکانم وت ئەو کات: ئاراس، مەحمود، ئـازادە ڕەش، فرود ، هـەمـوو پێیان بـاش بـوو، ئیتـر چـەنـد خشـتێکمان کـڕی و مـن بـووم بە وەسـتا و ئـەوانـیش کرێکار، ئاو نەبوو بە ئاوی باراناو گـەچمـان ئـەگرتەوە، دیوارێکی خـوارو خێچم دروست کرد، دوایش هۆشیار موبەڕیدەیـەکی لای خێر خوازێک پەیدا کـرد.. بـۆ مێژوو ئەڵێم من زۆر دڵخۆش بووم بەو دەسکەوتە.

ڕۆژێک لەسەر کورسییەکی ڕەش بووم، خەریکی چاک کردنی کارەباکە بووم، لای ژوورەکە، دوایی بوو بە ژووری مەلا یاسین، ئەندامێک هات و وتی ئەوە خەریکی چیت ؟ وتم کارەبا چاک ئەکەم ، وتی ئاخر بینای شارەوانییە و ناهێڵن دوای چەند هەفتەیەک دەرمان ئەکەن، منیش یەکسەر وتم گەر یارمەتیمان نادەیت ساردم مەکەرەوە، کە ڕۆشت، هاتمە خوارەوە لەسەر کورسییەکە و تێڕامام وتم کەسێکی دووربینە، کێ ئەڵێت ڕاست ناکات، دوایی بیرم کردەوە و لە ڕاو و ڕوت و تالآن کردنی دام و دەزگاکان، بیرم کردەوە لە کاتی ڕاپەڕین، وتم ئەمە وڵاتی قە زاو قەدەرە، گوێم نەدایە ودوایی ئەوە، بیرم کردەوە دیکۆرێکی بۆ بکەین، ساڵی حەفتاکان م. حەمە فەرەج لە شانۆگەری (بە زۆر کراوە بە دکتۆر) بە تەبەقی هێلکە هەندێ دیکۆری جوانی ڕەنگاو ڕەنگی درووست کردبوو، هەرزانیش بوو، بەڵام عەمەلی نەبوو چونکە کە مرۆڤ پاڵی بدایە بەدیوارەکانەوە پان دەبۆوە، ئیتر مەحمودو ئاراس هەموویانم ناردە ژێر پردەکە و تەبەقە هێلکەیان بە خاسە ڕەنگ لە تەشتێکدا بە ئاوی باراناو ڕەنگ ئەکرد ....دواییش وەک بلۆک دەمان خستە بەرخۆرو منیش بە بزماری کەوش، ئیتر من وەستاو ئەوان شاگرد، سەقف و دیوارو دەرگام بە تەبەقە هێلکەی ڕەنگاو ڕەنگ داپۆشی، بیرم نەچێت لەو کاتەدا شێوەکارێک کاک خەسرەو ئەیویست شوێنێک دابین بکات بۆ خۆی، هاتە لای من وتی ئەوە چی ئەکەیت؟ ئەم ژوورەم بۆ تیپی مۆسیقا ئەوێت، هەندێ بۆڵە بۆڵی کرد وایی قەناعەتی کرد و من گوێم نەدایە، ئاوا ئەو بینایەی دەبۆیەم بەدەست هێنا، دوایی ئەوە چەندین گۆڕانکاریمان تێدا کرد بە هاوکاری هاوڕێیان، چیرۆکی دەبۆکە درێژەی هەیە بۆ ئەوەی ڕاستییەکان وەک هەبووە باس بکەم کە ئێستا ساڵی (٢٠٢٢)ە هەر هەمان شوێن بۆتە جێگا وشوێنی خەو و وانە وتنەوەو کاری هونەری کە زۆر کەس سوودمەندە لێی کە ڕەنجی فەرهادم تێدا داوەو لە ژوورێکی بچوکدا خزاوم کە هیچ مەرجی تەندروستی تێدا نییە .

## هەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆ و لەدەستدانی فیزەی ئەڵمانیا

لە هەمان ساڵ بە هۆی ڕەوانشاد کاک عوسمان عەبدوڵا کە لە شاری (بریمن) لە ئە ڵمانیا ئەژیا، ڕێکخراوی کوردانی هانۆڤەر داوەت نامەیەکیان بۆ کردین بۆ ئەوەی بڕۆین بۆ شاری هانۆڤەر لە مانگی نۆی ساڵی (١٩٩٤) بەڵام ئەو ساڵە شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسا و وڵاتی ئەڵمانیا ڤیزەی نەداینێ، بۆ ئەوەی ئەو سەفەرە بکەین هەر چەندە چەندین نوێنەرمان دی، لەوانە کاک بەرزان ناوێک، کاک فەرەیدوون قازی، لە سلێمانی لای بازاڕی عەسری بەرامبەر چایخانەی شەعب یەکترمان دی، وتی من پانتۆڵێکی ڕەش و تیشێرتێکی سەوزم لەبەرە، منیش وتم پانتۆڵێکی قاوەیی و کراسێکی بێجیم لەبەرە، ئەوکاتە مۆبایل نەبوو بە ناونیشانی جلەکانمان یەکترمان ناسییەوە .

کۆمیتەی کوردەکان هانۆڤەر

Kurden Komitee Hannover e.V.

ژمارە : تایبەتی
بەروار : ١٩٩٤/٧/٢٠

بۆ ئەنجومەنی وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیری
لایەنە پەیوەندیدارەکان

بابەت: یارمەتیدان و پشتگیری

سلاوێکی برایانەی کوردانە

[illegible]

لەگەڵ ڕێزو سڵاوی ... 

ناوی ئەو ئەندامانەی کە بانگ کراون بۆ هانۆڤەر

١- ئازاد حمە صالح ... ١٩٥٥
٢- ... شیخ جمال ١٩٦٤
٣- هوشیار حمە فرج علی ١٩٦٠
٤- فرود جمال محی‌الدین ١٩٦٨
٥- محمود احمد عبدالرحمن ١٩٦٢
٦- حمەعزیز حمەکریم ١٩٦٣
٧- زانا محمود محمد ١٩٦٦
٨- شوان محمد علی ١٩٦٦
٩- ابراهیم نجم‌الدین میرزا ١٩٦٨
١٠- نجیم محمد عبدالله ١٩٧٠
١١- ئازاد کریم علی ١٩٦٧
١٢- ئادان محمد ابراهیم ١٩٦٢
١٣- جیا محمود محمد ١٩٦٦
١٤- زیان محمد شکر... ١٩٦٧

Kurden Komitee Hannover e.V.

فەرەیدون قازی
ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەر
٩٤/٧/٢٠

Postfach 210504
30405 Hannover
Germany

## ساڵی ١٩٩٥ و چوونی ئەندامانمان بۆ هەندەران

ئـەتـوانم بڵـێم ئەمسـاڵە سـاڵی نەهـامەتی بـوو، شـەڕی نـاوخۆو کـۆچکردنی زۆربـەی لاوانـی کوردسـتان بۆ هـەندەران و ئـەم نـەهامـەتییە ئێمـەشـی گرتـەوە زۆربەی کەسە چالاکەکان بەرەو هەندەران کۆچیان کرد، لە تیپی ئێمە هۆشیار حـەمـە فەرەج، شـوان عـەلـی مەجیلان ، ئاراس شـێخ جەمـال ، مـەحمـود ئـەحمـەد عەبدوالڕەحمان، لە تیپی نواندنیش عەبدوڵای حەمە لاو بەگ، ڕێبوار نوری خەیات چوونە هەندەران، کە هەموو لە ساڵانی ١٩٩٤ و١٩٩٥ بوو، من زۆر نائومێد بـووم ئـەنـدامانی تـریش وەک فـرود شـێخ جـەمـال دوورکـەوتـەوە و لە ڕێکخراوێکـی فەرەنسی دامەزرا لە سلێمانی، ئیتر یەک دوو کەس ماینەوە پێش ئـەوەی هۆشـیار بڕوات، وتی ئەمەوێت پێش ئەوەی سەفەر بکەم گۆرانییەک تۆمار بکەم، شیعرێکی لە نەجم هۆگر وەرگرتبوو بە ناوی کۆچ، دوو بە دوو لە چایخانـەکـەی شـێخ جـافر بەرامبەر بەر دەرکی سەرا دانیشتبووین چامان ئەخواردەوە، وتی ئەم ئاوازەم بۆ ئەم شیعرە داناوە، بۆی وتم ، وتی ڕات چۆنە ؟ وتم چاکە.

لەبەر قەرەباڵغی بە سووکی بۆی وتم ..وتی چی لێبکەین؟ وتم هەڵسە با بڕۆین بۆ تیپ، دوایی کەمێک دووبارەی کردەوە بۆم، لە تیپ و منیش کەمانەکەم هێنـا لە هۆڵێکی زۆر گەرم دانیشتبووین، منیش بە پێنج شەش خولەکێک پێشەکییـەکـم بـۆ داناو ئاوازو شیعرەکەمان گونجاند، بۆ سبەی کاک کەمالی حاجی سەعیدمان بانگ کـردو کـاک زانـای مـەحمـود هـەژاریـش لـەگـەڵ سـەبـاحی سـەنتـوور و هـەروەهـا گـەنجێکـی تـازە هاتـە لامـان کـاک فوئـاد کەریـم بـرای ئـازادە ڕەش و ئـەویـش بەشداربوو لەگەڵمـان و ئـەو گۆرانییەمـان بۆ تۆمـارکرد، پێش ئـەوەی بـڕوات بـۆ هەندەران، بەڵام هەر بەدەنگ تۆمارمان کردو فریای وێنەگرتن نەکەوت، دوایی لە ئەوروپا لە کەناڵی (مـــید تیڤی) وتیەوە .

ئیتر دوایی هەوڵمدا ئەو بۆشاییانە پڕ بکەمەوە لە تیپ و چەند ئەندامێکی تازەی تر هاتن وەک کاک سەلام ڕەشید کە ئەویش چەنـد ئـاوازێکی دانـا، هـەروەهـا توانـا جەمالیش هات و دوایش دیاری مەردۆخی، بە ڕاستی ئەوسـاڵە ناهـەمـوار بـوو لـە گرانی و قات و قڕی و شەڕی ناوخۆ.

## ژنێک باران لێیدەدا، سەرنجی راکێشام

هەر ئەوساڵە یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان وەڵامیان بۆ ناردم کە لە مانگی (٩) ڤیستڤاڵێک هەیە ئەبێت بەشداری بکەن لەگەڵ تیپەکانی کوردستان لە هەموو شارێکەوە هاتبوون، منیش بەو هاوینە بەو گەرمایە بەو بێدەرامەتیە و گیرفان خاڵی و بەو نیوەڕۆ گەرمانە، مەگەر هەر خۆم بزانم چۆن خەریکی ئاواز دانان و ئامادەکردنی مۆزیک بووم، ژێرم تانییەکی ڕەق بوو، بەو گەرمایە خەریکی گۆرانی ئامادە کردن بووم.

ساڵی نەوەدەکان لە کاتی باران بارین شۆخە ژنێکم دی، باران بوو چەتری دابووە سەری، باران ئەباری، لە دوورەوە شیعریکم بۆ هات (وەی وەی لەو بارانە یار بە بێ تۆ ماڵم وێرانە)دوایی سەلاحە ڕەشی شاعیرم دی وتم ئەم شیعرەم بۆ تەواوبکە و دوایی تەواوی کرد، کردمە ئاوازێک و دام بە ئازادە ڕەش، نەجم محەمەدیش میلۆدییەکی هەورامی بۆ هێنام ئەویشم ئامادەکرد، باش بوو چەندین ئەندامی تر پەیوەندییان پێوە کردین، لەوانە کاک سەلام ڕەشید کە بۆ چەند ساڵێک ئەندامێکی چالاکبوو، دوای ئەوە کاکە ئاراسی حەمەی سابیر هاتەوە کە ئە ندامێکی دێرین بوو، ئاراس و مەحمود تا ئەو کاتەی لێرە بوون زۆر کارا بوون، بە هەر حاڵ توانیمان لە ڕێکەوتی ١ تا ٥ی /١٩٩٥بە دوو بەرهەم بە شداری بکەین و لە مانگی (١٠) هەمان ساڵ بە دەنگ، مامۆستا ئەنوەرقەرەداغی لە ستۆدیوی تیپی مۆسیقای سلێمانی بۆی تۆمارکردین و دواییش ڕەزامەندیمان وەرگرت بۆ وێنەگرتنی لە تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان خودی ماموستا ئەنوەر وێنەی بۆ گرتین لە سەرچنار و لە سەرەتای ساڵی (١٩٩٦) ئەو ئاوازانە لێدران، کارەکە هێندە جوان بوو بەس بۆ یەک شەو لێدرا، ئیتر نازانم لە تەلەفزیۆن هەمووی ون بوو نازانم سوتاندیان یان چی لێهات؟ تا لە ساڵی (٢٠٢٠) لە ستۆدیۆکەی کاک عومەری چەلۆ جارێکی تر گۆرانی (بارانە)مان تۆمار کردەوە و کاک وریا حەمە کەریم بۆی کلیپ کردین لە نزیک خورماڵ، لەو کارەدا کاک مەلا بەختیار ڕێزلێنانی بۆ کردم لە ڕێکەوتی ٥ی ٩ی ١٩٩٥.

هەر لەو ساڵەدا بوو کاکە نیازی سەنتوور لە تیپی مەولەوییەوە هات بۆ لامان، من بە هەموو شێوەیەک هانمدا کە تواناکانی سەربخەم و هەر واش بوو، هەر بە هەوڵ و زیرەکی و تێکۆشانی خۆی، بووە ئەو هونەرمەندە بە توانایە کە مێژوو شاهیدە چۆن بووم لەگەڵیان.





## ساڵی ١٩٩٦ و یادی هەڵەبجە و پێڵاوەکانی سابیر کوردستانی

وەک ساڵانی پێشوو بەشداریمان کرد لە یادی هەڵەبجە بۆ ١٦/ ٣/١٩٩٦ لە باخی گشتی هەڵەبجە، ئەو ساڵە شەڕی ناوخۆ گەرمبوو، هەڵەبجە لە ژێر کۆنترۆڵی پارتی دا بوو. ڕەوانشاد کاک سابیر کوردستانی بەشدار بوو لەگەڵمان و هەروەها چەند مۆزیک زانێکی ترلەوانە مامۆستا سەرکار عیزەت و کاک فەرهاد حەمە ساڵح و لاوک سەلاح ڕەئوف.

بۆ شەوەکەی لە شوێنێک ماینەوە وەک بەشی ناوخۆیی بوو، بیرم دێت کاک سابیر شەو مەقاماتی جوانی بۆ وتین و بووە هاوڕێی نزیکمان و شتێکی خۆش ڕوویدا، شەو کاک سابیر ئەیویست بچێتە دەرەوە پێڵاوی زۆری لێبوو، مەحمود ئەحمەد چەندین پیلاوی بۆ دەبرد، مەحمود ئەیویت ئەمەیە؟ کە دەستی بۆ دەبرد ئەیوت نا ئەمە نییە، تا لە کۆتاییدا کە دەستی بۆ تاکێکی تر برد وتی ئا ئا ئەمەیە نازانم بە چیدا دیاری کردبوو.....

## بەرهەمەکانی ساڵی ١٩٩٦ لەیادی هەڵەبجە و قەڵادزێ

ئەم بەرهەمانە پێشکەشکران:

١.شۆڕشی هەڵەبجە: هۆنراوەی سەردار مەردان، ئاواز: ئازاد ساڵح، وتنی: زاهیر جلال

٢.ئەم مەڵبەندە کە ئاوازێکی هۆشیار حەمە فەرەج بوو، خۆی لە هەندەران بوو، نەجم محەمەد وتیەوە.

٣.فوئاد محەمەد ساڵح کە بە مامە پیرە ناسرابوو بەشداری کرد بە چەند تابلۆیەکی منالان

لە مانگی چواری هەمان ساڵ چەند برادەرێکی خەڵکی قەڵادزێ داوایان لێ کردین کە بەشدار بین لە یادی ٢٤ /١٩٩٦/٤ کە قەڵادزێ بۆردومان کرا لە ساڵی ١٩٧٤ بە ماوەیەکی کەم چەند ئاوازێکمان دانا و لە ڕێکەوتی ٢٤ ی ٤ لە گۆڕەپانێک پێشکەشمانکرد .

**لە دوای نیوەڕۆ:**

**ئەم بەرهەمانە پێشکەش کران:**

**١.(سێ فرمێسک)هۆنراوەی حەمید عەبدوڵا ، ئاوازی ئازاد ساڵح، وتنی زاهیر جەلال، شیعرەکەی کورت و مانادار بوو بەم شێوەیە بوو:**

**(قەڵادزی و هەڵەبجە وهێرۆشیما سێ ئەستێرەی یەک ئاسمانی ڕاپەڕینن، سێ فرمێسک سێ هەناسە، سێ لێوی بێ پێکەنین، لە شەستە بارانی پەڵە زەوی وشکن، لەسەنگەری خۆڕاگری و ڕەش پۆشیدا دەستە خوشکن.**

**بەکورتی ئەمە بوو (قەڵادزێ و هەڵەبجە و هێرۆشیما سێ ئەستێرەی یەک ئاسمانی ڕاپەڕینن)**

**٢.(بۆ قەڵادزێ)هۆنراوە، ئیبراهیم هەورامانی، ئاوازی سەلام ڕەشید، وتنی: لوقمان سەلیم**

**٣.(دایە گیان)هۆنراوەی: سوارە قە ڵادزێی، ئاوازی سەڵاح ڕەئوف، وتنی: ئەژدەر وەهبی**

**٤.(نەوەی قەندیل) هۆنراوەی :بێزار عومەر، ئاوازی سەلام ڕەشید، وتنی: توانا جەمال**

**٥.(خەزان) هۆنراوەی: ئازاد تۆفیق، ئاوازی عەزیز حەمە کەریم، وتنی: نەجم محەمەد**

**٦.(شاری شەهید)هۆنراوەی: مەحمود ئەحمەد، ئاوازی: ئازاد ساڵح، وتنی ئازادە ڕەش**

**٧.(شەهید) ئاوازی هۆشیار حەمە فەرەج ، وتنی توانا جەمال**

**بە داخەوە من هیچ وێنەیەکیم لا نییە تەنها وێنەی دەلیلەکە نەبێت.**



(سێ فرمێسک)
هۆنراوەی (حمید عبدالله)
ئاوازی ئازاد صالح
وتنی زاهیر جلال
(بۆ قەلادزێ)
هۆنراوەی ابراهیم هەورامانی
ئاوازی سلام رشید
وتنی لوقمان سلیم
(شەهید)
هۆنراوە و ئاواز هوشیار حمە فرج
وتنی توانا جمال
(نەوەی قەندیل)
هۆنراوەی (بێزار عمر)
ئاوازی (سلام رشید
وتنی (تواد محمد)

**یادی هەڵەبجە لەسلێمانی ئەنجامدرا لە ساڵی ١٩٩٧دا**

لەم ساڵەدا یادی هەڵەبجە لە سلێمانی کرایەوە، ئێمە و تیپی مۆسیقای سلێمانی و تیپی مۆسیقای مەولەوی بەشداریمان کرد لە ڕۆژی شانزەی سێ، من ویستم ئەم یادە بە شێوازی کۆراڵ و هەروەها نواندن و سەماو جوڵەشی تێدا بێت.

بۆ بەدیهێنانی ئەم بیرۆکەیە، شەوێکیان چووم بۆ ماڵی مامۆستا ئەمین سەپان و ماوەیەکی زۆر گفتوگۆمان کرد، شیعرێکی نووسیبوو، بیرۆکەکەم لاجوان بوو، ئیتر من خۆشم بە پێی هەست و خەیاڵی خۆم دەستکاری شیعرەکەم کرد، ئەوەی بۆ ئاواز دانان ئەگونجا گونجاندم و ڕۆژانە و شەوانە بیرۆکەی جوانترم بۆ دەهات، بۆ ئەم مەبەستەش من و کاک عادل پێکەوە چووین بۆ ئامادەیی پیشەسازی کوڕان و کچان زیاتر لە ٣٠ کوڕو کچمان هێنا.

هەرچەندە دەنگیان زۆر باش نەبوو، بەڵام هەر ئەوە هەبوو، ناچار ڕۆژانە من و عادل پرۆڤەمان پێئەکردن، زۆر لە ئەندامی مۆزیک ژەنمان کۆکردەوە لە ناوەوە و دەرەوەی تیپی شنروێ، چەند ئەکتەرێکمان هێنا، لەوانە مامۆستا جەلال عوسمان، کردمانە دەرهێنەر و حیکایەت خوان، بیرۆکەی من ئەوەبوو هەرچی شاعیر و هونەرمەندی ناوچەی هەڵەبجە هەیە، کەسایەتی خۆی بدەینێ، هەر شاعێرێک چەند کۆپلەیەکم لە شیعرەکانی دەکردە ئاواز و لەگەڵ جل و بەرگی ئەو سەردەمە بەڕەوتێکی مێژوویی هێنامن و لە کۆنەوە: وەلی دێوانە، کە دلێر ئەحمەد و کچێک کە جلی سپی بالیەی لەبەربوو، بە ڕەزمی ڤالس، سەمایان ئەکرد لەگەڵ پارچە مۆزیکەکە.

بۆیە ئەمەوێت بە وردی باسی بکەم، چونکە ئەو ڤیدیۆیە نەماوە، تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان ئەم وێنانەی گرت، یەکێک بوو لەشاکاری ئاواز و کارە هونەریەکانم کە زیاتر لە یەک کاتژمێر پتر دەبوو ..

وە هۆنراوەی سەرەتا ئاوا دەستی پێدەکرد:

(هەستنە سەرپێ ساڵی جارێ پێنج هەزار ڕۆح دێنە خوارێ

هەستنە سەر پێ ساڵی جارێ پێنج هەزار ئەستێرە ئەکشێ و دا ئەبارێ

ساڵی جارێ دار عەساکەی موسای گەورە دەست بەکارە

هەزاران ڕۆح دێنێتەوە بەر ئەم شارە
پێنج هەزار گوڵاڵە سوورەی دەشتی شارەزوور ئەژێتەوە.
وە ئەم دوو دێڕە خۆم نووسیم:
(پێنج هەزار گوڵە نێرگزی گوێ چەمی زەڵم ئەڕوێتەوە)
شاعیر ئەمین سەبان بەردەوام دەبێت و دەڵێ:

ساڵی جارێ دەهەزار پێڕەوگەی شارم چاوەڕێی هەستانەسەر پێن، تاڵێ پەتن، چاوەڕوانی کافرمانی ئەحمەد بەگن، هاوار بکات، هەستنە سەرپێ بۆ کارێزی حاجی ناجی بکەونەڕێ.

*عادل و (نیگار عەلی خەیات) کە فلوت ژەن بوو کچەزای فازیلی خەیاتی هەڵەبجەیی بوو، ئەم بەیتەیان بە سۆلۆ وت:

مەبەست لەم بەیتە ئەوەیە کاتی خۆی کە هەر منالێک درەنگ پێی بگرتایە ئەحمەدبەگ مەبەستی ئەحمەد بەگی سۆسەنە، باوکی دکتۆر فوئاد بابان، هەردوو قاچی منالەکەی بەستۆتەوە، نازانم دوعای خوێندووە بۆی، دوایی بەکافرمان واتە چەقۆ ئەوانەی کەبەدەست هەورامییەکان دروستی ئەکەن پەتەکەی پچڕاندووە و منالەکە هەستاوە و ڕایکردوە، چووە بۆ کارێزی حاجی ناجی کە جاران لە سەرووی هەڵەبجە بوو لای شە هیدان*

لە کەسایەتی وەلی دێوانەدا کاک ئازادە ڕەش هۆرەی جافی ئەکرد.

پاشان کەسایەتی نالی شاعیر کە فوئاد حەمە صالح ڕۆڵی دەبینی، من پێش عەدنان کەریم ئاوازم بۆ ئەم بەیتەی نالی دانا، بەڵام بە شێوازێکی تر و بە هەستی خۆم کە هۆنراوەکە دەڵێت:

قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مروور
ئەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری شارەزوو

لوقمان سەلیم دوای ڕۆڵی نالی شیعرێکی شێرکۆ بێکەسی کە بۆ نالی نووسیوە بە مەقام گوتیەوە و هەموو هولەکەی هەژاند.

پاشان کەسایەتی مەولەوی کە شێرکۆ حەمە سەعید ڕولی دەبینی.

کە ئاوازێکی سۆفی ئامێزم بۆ دانا، (مەروان حەمە خورشید) ئەیگوت و دوایی چوو لە ڕادیۆی یەکگرتووی ئیسلامی، بەبێ پرسی من تۆماری کرد.

ڕۆڵی شەم کچێک بوو بە ناوی سەمیرە.

ڕۆڵی ئەحمەد موختار جاف کاک تاهیر عەبدوڵا دەیبینی، کە هەر لە خۆی دەچوو بەو کڵاو و مشکیەوە، ئەم شیعرەی ئەحمەد موختار جافم هەڵبژاردبوو:

لە خەو هەڵسن درەنگە میللەتی کورد خەو زەرەرتانە

هەموو تاریخی عالەم شاهیدی فەزڵ و هونەرتانە

تەنانەت کاک توانا جەمال ئەم ئاوازەی ئەوتەوە کە باس لە کوشتنەکەی ئەحمەد موختار ئەکات:

لە کەناری سیروانەوە

پاشان مامۆستا ئازاد حەمە خوشید ڕۆڵی (گۆران)ی ئەبینی.

ئەرجومەند هەورامی لەگەڵ کچێک بە شیعرەکەی گۆران کە بریتی بوو لە گەشتی هەورامان، دەڵێ:

سەرچاوەی ئاوێک کەڵەکێک لەسەر

ژنێ تێی ئەچێ ژنێ دێتە دەر

ئەمەش لە دێدا کانی ژنانە

قیبلەی دڵداری هەرزەکارانە

لەگەڵیدا سیاچەمانەی ئەوت ودڵداری لەگەڵ یەکێک لەکچەکانی سەرکانی دەکرد، کە بە گۆزەوە هاتبوونە سەرکانی، ئەرجومەند وا چاوی تێ بڕیبوو وات ئەزانی ڕاستییە، ئەو هۆڵە هەمووی دایانە قاقای پێکەنین ..

پاشان ڕۆڵی مینەی لولک ژەن، مەریوان عەلی بوو کە بەعارەبانەیەکەوە هاتە سەر شانۆ و ئەم شیعرەی ع.ع. شە ونمم بۆ کردبووە ئاواز کە کاتی خۆی بۆی نووسیوە و مامۆستا ئەمین سەپان بۆ منی وت:

ئادەی مینەی لولک ژەن

شمشاڵێکی زۆر پەسەن

هەستی پەستی تەماوی

ئاوازێک بێ نەوایی

ڕووناکی کارەکە کاک ئیبراهیم ئەحمەد وئارایشت م.شیرکۆ محەمەد سەعید بوو.

ئەوە جێگای وتنە ئەم کارە نزیکەی شەست کەس بەشدار بوون تیایدا .

برگەکانی فیستڤال ڕۆژی ٢/١٦ / ١٩٩٧
کردنەوەی پیشانگای پۆستەری سیاسی لە هۆڵی ڕۆشنبیری

**تیپی مۆسیقای شنروێ**

**گۆرانیک و چەند تابلۆیەک**

**( هەڵەبجەی عەشق - هەڵەبجەی زام )**

**هەڵەبجەی خەم**

بیرۆکەو سیناریۆ / ئازاد صالح

هۆنراوەی / مامۆستا امین سەبان

ئاوازی / ئازاد صالح

دەرهێنانی / جلال عوسمان علی

**گۆرانی بێژەکان**

١- لقمان سلیم / مەقام
٢- شازاد کریم / هۆرە
٣- عادل - نیگار / صولو
٤- سیروان حمە خورشید / مناجات
٥- ئەرجومەند / سیاچەمان
٦- ترانا جمال / صول

**ئەکتەرەکان**

١- جلال عوسمان / حیکایەت خوان
٢- فراد حمە صالح / نالی
٣- دلێر احمد / وەلی دێوانە
٤- سەمیرە / شەم
٥- شێرکۆ محمد سعید
٦- طاهر عبدالله امین / احمد مختار جاف
٧- ئازاد حمە خورشید / تینەی لرلەکە ژەن
٨- کامران احمد / گۆران
چەند فریشتەیەک

دیکۆرو اکسوار / شێرکۆ رووف

ڕووناکی ........ ابراهیم احمد

**لیژنەی ڕاگەیاندن**

١- علی احمد حۆلا
٢- جبار قسری
٣- عوسمان محمد قادر
٤- زاهیر صدیق
٥- ئاکۆ غریب
٦- نیاز نوری
٧- سەردار خلیل

لەگەڵ بەڕێزان نوێنەرانی کۆمەڵ ونیە بەشداربووەکان

**لیژنەی دارایی**

١- عەبدولی حمە جزان
٢- تەنویر فەرەداغی
٣- صلاح فەرەج
٤- هوشیار احمد
٥- لیلان کمال



## تۆمارکردنی چەند بەرهەمێک لەژێرزەمینەکەی ماڵی ئەنوەر قەرەداخی

لە یادەوەریمدا هەندێ شتم لە بیر چوبوو کە لام گرنگن بۆیە لێرەدا ئەینووسمەوە:

ئەوەی شایانی باسە لە ساڵی (١٩٩٦) هەندێ ئەندامی تر پەیوەندیان کرد بە تیپی شنرویۆە بە هۆی نیاز محەمەد کە سەنتور ژەنی تیپەکە بوو، لەوانە دانا ئەبوبەکر و توانای برای ، دانا سازژەن بوو تواناش نای ئێرانی، کە پورزای نیاز بوون، هەروەها کاک ئەکرەم حەمە ڕەشید وەک گۆرانی بێژ و کاک مارف کە زەڕبی دەژەنی، هەروەها کاک ڕەحیم بۆ ئامێری کەمان، م.گۆران ئامێری فلووت.

لە زستانی (١٩٩٦) هەردوو بەڕێزان هۆشیار حەمە فەرەج و عبداللەی حەمە لاو بەگ لە هەندەران گەڕابوونەوە، هاوکارمان بوون بۆ تۆمارکردنی چەند گۆرانییەک لە ژێر زەمینەکەی ماڵی مامۆستا ئەنوەر قەرەداغی، بە شەو چەند گۆرانییەکمان تۆمارکرد و زستانێکی سارد بوو، بەفریش ئەباری، کارەباش نەبوو، جاری وا هەبوو سێ چوار سەعات چاوەڕێمان دەکرد تا کارەبا ئەهاتەوە، عەبدوڵای حەمە لاو بەگیش کە هونەرمەندی نواندن بوو، دەستکاری ئاوازێکی فۆلکلۆری کردبوو بە ناوی(نایە)من بۆم ئامادە کرد، هۆشیار کە لە تورکیا بوو لەگەڵ شاعیر ئیسماعیل خورماڵی ئاوازێکی دانابوو بە ناوی (سەفەر) من بۆم ئامادەکرد و زۆر لەگەڵی ماندووبووم، شەوی وا هەبوو تا کاتژمێر سێی نیوە شەو لەبەر چرا دادەنیشتم تا خەیاڵم بۆ پێشەکی مۆسیقاکەی ئەچوو، کاک سەلام ڕەشیدیش ئاوازێکی بۆ لوقمان سەلیم دانا بوو بە ناوی (ئەمشەو زەمەن) چەند جارێک هەوڵیان دا بە جوانی بۆیان تۆمارنەکرا، شەوێکیان سەلامم بردەوە ماڵی خۆمان و پێکەوە نۆتەکەمان نووسییەوە، من دابەش کردنێکم بۆ کرد و ئەوە بوو بووە هۆی بەناوبانگ بوونی لوقمان سەلیم و بەو ئاوازە ناوی دەرکرد. هەروەها من یەک دوو گۆرانی فۆلکلۆریم بۆ کاک ئازادە ڕەش ئامادە کرد و بۆ یەکەم جار ئاوازێکم بۆ تارا رەسووڵ دانا و گۆرانییەکیشم بۆ نەجم محەمەد ئامادە کرد و هەموویمان لای مامۆستا ئەنوەر تۆمارکرد و هەروەها بۆ یەکەمجار هونەرمەند خەلیل عبدالله بەشدار بوو لەگەڵمان بە ئامێری شمشاڵ و کارزان مەحمود ئەو کاتە مناڵ بوو دەف و زەڕبێکی باشی دەژەند و دەستی دایە ئامێری سەتار و سەلام ڕەشید سۆلۆیەکی دایە و دوایی توانای کارزان دەرکەوت و بووە

هونەرمەندێکی بە توانا، دوو گۆرانیمان بۆ تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان تۆمار کرد لەوانە گۆرانی (سەفەر) بۆ هۆشیار و گۆرانی(نایە) بۆ عبداللە حەمەلاو. ئەوانی تر لە ساڵی (١٩٩٧) لە کۆشکی میر مامۆستا ئەنوەر بەرنامەیەکی بۆ تۆمارکردین.

بە بۆنەی جەژنی ڕەمەزانەوە لە کۆشکی میر، نزیک چێشتخانەی شکار لەسلێمانی و ئەو بەرنامەیە دەنگی دایەوە و بیرم دێت بینەران داوایان کردەوە، دوو شەوی جەژن پەخشکرا لە تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان و وێنەکان کاتی پرۆڤەیە لە تیپ و ماڵی مامۆستا ئەنوەر.

هەر لەو ساڵەدا لە هاوینەکەی دوو گۆرانیمان بۆ ئەکرەم حەمە رەشید و کاک ئازادە ڕەش تۆمار کرد بەم شیوەیە :

١. گۆرانی (ماڵی چۆڵم)لە ئاوازی کۆن، ئامادەکردنی ئازاد ساڵح، وتنی ئەکرەم حەمە ڕەشید

٢.گۆرانی (گوڵزاری ژیان) ئاوازو ئامادەکردن: سەلام ڕەشید، وتنی ئازادە ڕەش

لە ماڵی مامۆستا ئەنوەر تۆمارمان کردن بەڵام بۆ تەلەفزیۆن وێنە نەگیران.

بەرهەمی نوێی

تیپی مۆسیقای شنروێ

ی هەڵەبجەی شەهید

١٩٩٧

تیپی مۆسیقای شنرویی هەڵەبجەی شەهید/١٩٩٧

| گۆرانی | هۆنراوەی | ئامادەکردنی | ئاوازی | وتنی |
|---|---|---|---|---|
| سەفەر | ئیسماعیل خورماڵی | ئازاد صالح | هۆشیار حەمەفرج | هۆشیار حەمەفرج |
| نایە | ئازاد توفیق | ئازاد صالح | عبداللە حەمەلاو | عبداللە حەمەلاو |
| ئامان ئازیز | نجم محمد | ئازاد صالح | فۆلکلۆر و نجم محمد | نجم محمد |
| شەوانی بێ تۆ | صالح بیجار | سەلام رشید | سەلام رشید | لوقمان سلیم |
| دێتەوە | توانا جمال | سەلام رشید | توانا جمال | توانا جمال |
| ئەی ناز | فۆلکلۆر | ئازاد صالح | ئازاد صالح | ئازاد رسول |
| وەنەوشە | فۆلکلۆر - سحار | ئازاد صالح | فۆلکلۆر | ئازاد کریم |




ئازاد ساڵح . هۆشیار حەمە فەرەج . سەلام ڕەشید. لەکاتی پرۆڤە

## ساڵی ١٩٩٨ ـ وایزانی سەید عەلی ئەسغەر زیندووبۆتەوە

ڕەمەزانی ساڵی (١٩٩٨) بوو، مامۆستا ئەنوەر قەرەداغی پێی ڕاگەیاندم و گوتی ئەمانەوێت بەرنامەیەک تۆماربکەن بە بۆنەی جەژنی ڕەمەزانەوە، وتی بەوگۆرانیبێژ و کەسایەتییە هونەرییانەی ناوچەی هەڵەبجە و هەورامان بڵێ و کۆیان بکەرەوە، منیش هەروام کرد و چووم بۆ لای کاک عومەری خەزان لە دوکانی دارتاشییەکەی لە گەڕەکی مامۆستایان لە سلێمانی، خەریکی درووست کردنی ژووری نان خواردن بوو بە داری گوێز، کاک عومەر وەستایەکی دەستڕەنگین بوو تابڵێی بە سەلیقە بوو، جگە لە دەنگ خۆشیەکەی، بۆ ڕۆژی دوایی دوای نیوەڕۆ هات بۆ تیپ و چەند ئەندامێکی لێبوو شارەزاییەکی تەواوی

هەبوو لە مەقامی هەمایۆن دەستی خستە بن گوێ و مەقامی هەمایۆنی چڕی بە هەموو پەردەکانیەوە، بەڕاستی هەموومان گیانمان مووچڕکەی پێدا ئەهات و ئەو هۆڵە گەورە دەنگی ئەدایەوە خەلیل عەبدوڵا شمشاڵەکەی داناو هاواری کرد وتی ئای باوکە ڕۆ لەو دەنگە وا ئەزانم سەید عەلی ئەسغەرە و زیندوو بۆتەوە، دوایی دەستی کرد بە گۆرانی کەتان کەتانە، بەڵام لە کاتی بەستەکاندا لە ئیقاع دەرئەچوو و ئاوتی ئەکرد، دوای ئەوەی لە تەمرین لێ بووینەوە هەندێ گلەیی کرد لە یەکێتی هونەرمەندان و وتی چەند ساڵە من گۆرانی ئەڵیم تا ئێستا مووچەیەکیان نەداومەتێ، چونکە ئەو کاتە هەندێ هونەرمەند مانگی دوو سەد دینار مووچەی هەبوو، هەندێکی تریش زیاتر لابەلا وەریان ئەگرت.

کاک عوسمان کێمنەیی دەنگی تێکچووبوو، کاک دڵسۆزی کوڕیمان بانگکرد لەباتی باوکی، دواییش پەیوەندیم بە کاک عوسمان کەیمنەیی و کوڕەکانیەوە کرد، کاک عوسمان بە داخەوە لە نەوەدەکانەوە دەنگی تێکچوو بوو زۆر خەفەتی ئەخوارد، بە کاک موختاری کوڕیم وت تۆ گۆرانی بڵێ، وتی تاقەتم نییە گۆرانی بڵێم، ئیتر بۆ یەکەمین جار بە (دڵسۆز)ی کوڕیمان وت، ئەویش ڕەزامەند بوو، چونکە سەرەتای بوو، عارەقی شین و مۆری دەرئەدا، پاشان بە ئەرجومەند هەورامی و هەورامان عزەت و ئیبراهیمی دەفی لای خۆشمان و چەند کەسایەتیەکیشمان بانگ کرد لەوانە مامۆستا ئەمین سەبان و چەند کەسێکی تر، کە چەند بەرهەمێکمان ئامادە کردو هەروەها کاک عومەر زۆر حەزی لە گۆرانی شۆڕی باڵا بەرز ئەکرد لەگەڵ ئەرجومەند هەورامی پێکەوە وتیان.

لە شەوی ۱۹۹۸/۱/۳۱ لە هۆڵی کەلەپوور لە سەهۆڵەکە تۆمارمان کرد، کە پێشکەش کارەکان بریتی بوون لە بەهات حەسیب قەرەداغی و بەناز عومەر، وێنەگرەکە یەک دوو کەس بوون لەوانە هەردی عومەر و ئاکۆعومەر، بۆ شەوی دووهەمی جەژن بۆ ڕەمەزانی ئەو ساڵە پەخشکران.

شەوی یەکەم تیپی مۆسیقای سلێمانی بوو، کە بەرنامەیان بۆ کەریم کابان کە یارجوانەی تێدا گوت و عوسمان عەلی و عبدالقادر حەسەن... هتد.

ئەم ڤیدیۆیانەش یەک جار لێدران لە تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان، دوای چەندین ساڵ مامۆستا ئەنوەر کاری ڕاست بێت لە ئەرشیفی خۆی پاراستبووی و بڵاوی کردەوە لە فەیس بووک.

مۆزیک ژەنەکان لە ڕاستەوە :

سەلام رەشید، عادل حەسەن، ئازاد سالّح، نیاز محەمەد، عەزیز حەمە کریم، کارزان مەحمود، خەلیل عبداللە، مارف، بەداخەوە ناوی باوکی کاک مارفم لەبیر نەماوە.



**ساڵی ١٩٩٨ و یادی هەڵەبجە لە هۆڵی رۆشنبیری سلێمانی**

بۆ یادی هەڵەبجەی ئەوساڵە نیاز بوو لە سلێمانی بکرێت لە هۆڵی ڕۆشنبیری، بیرمان لەوە کردەوە کە گروپێک کۆرس بهێنین بۆ ئەنجامدانی ئەم کۆراڵە، ڕۆژێکیان من و م.عادل حەسەن چووین بۆ ئامادەیی سۆلاڤی کچان لە ڕزگاری چەند کچێکمان هەڵبژارد بۆ کۆرس، پاشان لە قوتابخانەی ڕووخۆش کە مامۆستا هەڵکەوت لەوێ مامۆستای هونەر بوو وە تیپێکی مۆزیک و کۆرسی درووست کردبوو وەک سرووشتی جوانی خۆی زۆر هاوکاری کردین، بیرۆکەی شیعرەکەشم دانا بوو، شەوێکیان لەگەڵ عادل چووینەوە بۆ ماڵی خۆمان و زۆربەی کارەکانمان ڕێکخست و ئامادەمان کرد و من شەوانە لە کاتی پرۆڤە کردن ئاوازو شیعری نوێم بۆ دائەنا، ئیتر وردە وردە کارەکەمان ئەنجام دا و

کۆراڵەکە نزیکی بیست خولەک ئەبوو، لە یادی هەڵەبجەی ئەو ساڵە نمایشمان کرد، کۆراڵیکی جوان بوو.

ئەو گۆرانی بێژانەی بە شداربوون تێدا لەوانە: لوقمان سەلیم، ئەکرەم حەمە رەشید و سیروان لهۆنی، کارێکی کاک سەلام رەشیدیشمان نمایش کرد بە ناوی (بەرێکەون) . وە بۆ ساڵی (٢٠٠٠) لە ستۆدیۆی حەمکولّ لە سەهۆڵەکە تۆمارمان کرد کە کاک عادل حەسەن سەرپەرشتی تۆمار کردنی دەکرد، چونکە من ئامادە نەبووم لەوێ، چونکە سەرقاڵی دەوام بووم بە یەک شەو و ڕۆژ کاک عادل سەرپەرشتی دەکرد و کیبۆردەکە کاک سامان تەها بوو، کە ڕێکی خستوو تۆماری کرد و چەند گۆرانیبێژیک لەوانە سوارە محەمەد، لوقمان سەلیم، ئازادە ڕەش و مەروان حەمە خورشید، دەریا خالد وچەند کۆرسێکی لە خێزانی هاوڕێمان کاک عومەری چەلۆ، مۆزیک ژەنەکان عادل حەسەن، خەلیل عبداللە، نیاز محەمەد، ئیبراهیم نجم الدین، ئەم بەرهەمانەمان لە ساڵی (٢٠٠٠) تۆمارکرد دوای هەندێ دەستکاری کردن .

م .عادل ڕای وابوو کە گۆرانییەکی فولکلۆری بە ناوی (کوێستانان خاڵ خاڵ) لە سەرەتادا تێهەڵکێش بکەین بە شمشاڵ، کاک خەلیل عەبدوڵا بە هەستێکی جوان شمشاڵەکەی ژەند، لە ناوەڕاستی ئاوازەکەش عادل ئاوازێکی بۆ شیعرێکی شێرکۆ بێکەس دانابوو کە دەڵێت:

چواردەی مانگ بوو لە سەر گۆیژە با قەڵەمەکەی فڕاندم
کە دۆزیمەوە و پێم نووسی پۆل پۆل فڕین وشەکانم
پانزەی مانگ بوو سیروان قەڵەمەکەی بردم
کاتێ گرتمەوە پێم نووسی، بوون بە ماسی شیعرەکانم
پانزەی مانگ بوو کە شارەزوور قەڵەمەکەی لێ وەرگرتم
کاتێ دایمەوە و بنوسم وەک هەڵەبجە وشک ببون پەنجاکانم.

پاش ئەوەی تۆمارمان کرد ساڵی (٢٠٠٠) دابەشمان کرد بەسەر تەلەفزیونەکان و ڕادیۆکان، بەڵام کەس وێنەی بۆ نەگرتین، پاشان کاک عەزیز حەمە کریم بە سەلیقەی خۆی و تێگەیشتن لە ئاواز و هۆنراوەکان و ماندوبوونێکی زۆر، چەند وێنەیەکی خستۆتە سەر کە بە جوانی لە ماناکەی دەگەیت بەڵام ناوی کۆڕاڵەکە ناوی (سووتماکی هەڵەبجە)یە وەک لە دەلیلەکەدا هاتووە .

ئەمانەش چەند وێنەیەک و دەلیلی ئەو کۆڕاڵەن کە ساڵی (١٩٩٨) لە هۆڵی ڕۆشنبیری سلێمانی نمایش کرا.







١. کۆرالی ( سوتماکی هەڵەبجە )

هۆنراوەی / ئازاد صالح  ئاوازو ئامادەکردنی / ئازاد صالح ، عادل حسن

٢. سروودی / بەرێکەوەن

هۆنراوەی / رێبوار میران.  ئاوازی / سلام رشید

ووتنی / لقمان سلیم

**مۆسیقیەکان**

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئازاد صالح | کەمان | نیاز محمد | سەنتور |
| عادل حسن | = | نجم الدین خالد | ساز |
| رحیم عبداللە | = | خلیل عبداللە | عود |
| سلام رشید | = | شیرزاد عبدالرحمن | فلوت |
| هاوژین أحمد | = | توانا آبوبکر | نای |
| ئازاد محمدصابر | = | کارزان محمود | ایقاع |
| إسماعیل محمد | = | معروف علی | = |
| شادمان عبدالرحمن | چەلو | إبراهیم نجم الدین | = |
| عزیز حمە کریم | = | | |

سۆلۆکان / أکرم محمد رشید - لقمان سلیم - سیروان لهۆنی

کیژان فاتح - ئاڤکە تفە نکچی

کۆرس / بەهاوکاری خوێندکارانی دواناوەندی سۆلاڤی کچـــــــان .

ئامادەیی پیشەسازی زانستی . قوتابخانەی سەرەتایی رووخۆش .

## ساڵی ١٩٩٨ و تۆمارکردنی چەند بەرهەمێک

لە هـاوینی هــەمــان ســاڵ واتە (١٩٩٨) بڕیارمانـدا کـە کاسـێتێک بـۆ چەنـد هونەرمەندێک تۆماربکەین، من ئـاوازێکی نـوێم دانـا بـۆ کـاک لوقمـان سـەلیم لـە هۆنراوەی کاک ساڵح بێچار، کاک عـادلیش ئامـادە کردنێکی جوانی بـۆ ئـاوازێکی مەروان حەمــە خورشـید کـرد وئـەکـرەم حــەمــە ڕەشـید گۆرانیـەکی وت، کـاک سەلامیش ئاوازێکی دانا بۆ ئازادە ڕەش ومامۆستا چالاک سدیق ئاوازێکی حسێن عەلی بە ناوی(تەنکە)بۆ حەمە ڕەئوف کەرکوکی ئامادە کرد و چەندین کاری تر لە هۆڵی سلێمانی پالاس شەوێکیان لەبەرنامـەی(ڕازەکانی دڵ) لـە پێشکەش کردنی

بەهات حەسیب قەرەداغی بۆ تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان تۆمارکرد

بەڵام هەرچەند گەرام هیچ ڤیدیۆیەک نەبوو، تەنها کاک حەمە رەئوف گۆرانییەکەی خۆی دۆزیبووەوە و ئەکرەم حەمە رەشیدیش ئەوانی تر، تەنها یەک جار بوو دوایش بە هۆی کاک سەلاح حەمە عەزیزەوە تەلەفزیۆنی ئازادی حزبی شیوعی وێنەی گرت.

| | بەرهەم | هۆنراوە | ئاواز | ئامادەکردن | وتنی |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | تەنکە | فۆلکلۆر | حسین عەلی | چالاک سدیق | حەمە ڕەئوف کەرکوکی |
| ٢ | ون بوون | مەروان ئەحمەد | مەروان ئەحمەد | عادل حسن | ئەکرەم حەمە رەشید |
| ٣ | لەیل لەیل | فۆلکلۆر | فۆلکلۆر | عادل حسن | سیروان لهۆنی |
| ٤ | جودایی | ئەحمەد محەمەد | | عومەر عبدالله | ئاشتی عارف |
| ٥ | گولزاری ژین | سەنار | | سەلام ڕەشید | ئازادە ڕەش |
| ٦ | کەڵی مل بەرز | فۆلکلۆر | | ئازاد ساڵح | هەورامان عزەت |
| ٧ | بووک | فۆلکلۆر | وشیار حەمە فەرەج | نیاز محمد | ئیبراهیم نجم الدین |
| ٨ | زامی دووری | تالیب رەسوڵ | تالیب رەسوڵ | عادل حسن | تالیب رەسوڵ |





ئەکرەم حەمە ڕەشید

## ساڵی ١٩٩٩ و تۆمارکردنی دوو بەرهەم بۆ نیان عەبدوڵا

لەم ساڵانەدا واتە لە کۆتایی ساڵی (١٩٩٧) سەرقاڵی دەوام کردن بووم لە کۆمپانیایەکی ئەهلی وەک ژمێریار، بەهۆی ناهەمواری باری ژیانەوە، لە فەرمانگەکەم کە بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری سلێمانی بوو مۆڵەتی بێ مووچەم وەرگرتبوو، بۆیە هێندە کاری هونەریم بۆ نەئەکرا، بوارم کەم بوو، ئیتر من ئاگام لە کارو چالاکی ئەندامانی تر نەبوو چییان دەکرد.

ئەوەی لەم ساڵەدا کردمان لە سەنتەری گەنجانی سلێمانی دوو بەرهەمی هونەریمان بۆ هونەرمەند نیان عەبدوڵا تۆمار کرد، کە دەهات بۆ تیپ، زۆرجار نەجم هۆگر لەگەڵی دەهات، ئەو کاتە هونەرمەند دیاری قەرەداغی لێپرسراوی ستۆدیۆکە بوو، هونەرمەند ئارا ئەحمەد تۆماری کرد بۆمان و وێنەی تیپەکەمان زیاتر لە باخی گشتی سلێمانی گرت .

بەرهەمەکانی نیان عەبدوڵا بەم جۆرە بوو:

١. گۆرانی (فەرهەنگی ئەوین)هۆنراوەی نەجم هۆگر، ئاوازی: بەختیار عەبدوڵا، من خۆم هەندێ گۆڕانکاریم لە ئاوازەکە کردو مۆسیقاکەم بۆ ئامادە کرد، وتنی: نیان عەبدوڵا بوو لە تەلەفزیۆنی کوردسات وێنەیان بۆ گرتین.

٢.(هەناسەکەم) هۆنراوەی : ئەحمەد محەمەد، ئاوازی نیاز سەنتور و ئامادەکردنی: عادل حەسەن بوو، وتنی نیان عەبدوڵا، ئەم بەرهەمە وێنە نەگیرا و هەر بە دەنگ مایەوە، من سەرپەرشتی تیپەکەم کردووە، هەمیشە هەوڵم داوە بە شێوەیەکی شارستانی دەرکەوێت و زۆر جار بۆتە بۆڵە بۆڵ کردن لەگەڵ هەندێ ئەندامدا کە پابەند نەبوون بە جل و بەرگەوە و تەنانەت هەڵبژاردنی دیمەنی جوان بۆ وێنە گرتن و لەگەڵ کامێرامانەکە شوێنمان هەڵبژاردووە، چونکە زانیومە دەبێتە مێژوو، لەم وێنەیەدا جل و بەرگی تیپەکە ڕاستی بۆچوونەکانم ئەسەلمێنیت، چونکە بۆتە ئەرشیفێکی جوان، ئیتر بەهۆی سەختی ژیان و کارکردن لەبواری تردا، هیچ چالاکیم نەبوو ئەو ساڵە.

ئەم مۆزیک ژەنانە بەشدار بوون لە تۆمارکردن :

ئازاد ساڵح، عادل حەسەن، چالاک سدیق، نیاز سەنتور، توانا ئەبوبەکر، دانا ئەبوبەکر، عەزیز حەمە کەریم، ئاری ، نزار عوسمان .





**نیان عەبدوڵا . باخی گشتی سلێمانی**

## کەی مۆڵەتی فەرمی تیپی شنرۆیمان وەرگرت

هەر لە سەرەتای دامەزراندنی تیپی مۆسیقای هەڵەبجەوە لە ٩٧٣/٤/٢٦ ئێمە خۆڕسکانە تیپەکەمان دامەزراند لەبەر ئەوە تا ماوەیەک شوێنمان نەبوو، یەکەمین شوێن بارەگای یەکێتی قوتابیانی کوردستان بوو کە ئەو کاتە محەمەدی غەفور شەریف لێپرسراوی بوو. ئێمە ئەمانویست تیپەکە بە ناوی (تیپی مۆسیقای هەڵەبجە) بێت، یەکێتی قوتابیانیش ئەیانوت ئەبێ ناوی بنێن تیپی یەکێتی قوتابیان، لەسەر ئەوە بوو بە ناکۆکی و ماوەیەک پێداگریمان لەوە کرد. پاش ماوەیەک هەردوو لا ڕازی بووین لە سەر ئەوەی کە لەسەر تابلۆی تیپەکە بە گەورەیی بنوسرێت (تیپی مۆسیقای هەڵەبجە) لە سەرەوەش بە بچوکی بنوسریت (یەکێتی

قوتابیانی کوردستان) هەر وامان کرد. لە ساڵی (١٩٧٤) لەوێ نەماین چووینە بارەگای (یەکێتی لاوانی کوردستان) کە ئەو کاتە چەند کەسێک لەوێ بەرپرسیار بوون لەوانە فەرەج محەمەد ساڵح و قادری سۆفی سەعید. جار جاریش سەید تەهای شێخ حەمە ئەمین ئەهات و گۆرانی بۆ ئەوتین یەکێک لەو گۆرانییانەی ئەیووت کە لە بیرم بێت (هەی بێنن بێنن، گالیسکە بێنن، ئەو کچە مندالە، دڵی مەشکێنن. یان گۆرانی: کوزەڵەو بەنۆڵە ترشۆکەی شاخی/ یارم مندالە لێم مەکەن یاخی. لەبەر بەلۆعە حاجەت ئەشۆرێ/ دایکی لێی داوە و لە من ئەتۆرێ)

پاش ئەوەی لە مانگی ٢ی (١٩٧٤) ئاهەنگێمان کرد بە سەرپەرشتی لاوان، دوای ئەوە لە مانگی ٣/ی ئەو ساڵە نێوان پارتی و بەعس تێکچوو ئەوە بوو لە ١٩٧٤/٤/٢٦ هەڵەبجە بۆردومان کرا، ئیمە ماڵمان چووە سلێمانی و لە پایزی (١٩٧٤) لە کۆلێجی بەڕێوەبردن و ئابووری وەرگیرام لە بەغدا و ئومێدو مستەفاش چوون بۆ ئێران. دوای شکستی شۆڕش لە ساڵی (١٩٧٥) ماڵمان هاتەوە هەڵەبجەو هیچ شوێنمان نەبوو، تەنها من و مستەفای کەمال خەفاف کە ئەویش هاتبووەوە و ئومێدیش کارەکەی لە پینجوێن بوو، بووبوو بە فەرمانبەری (مالیة). ئیتر مستەفا بە فەیرۆزە ئەفەندی وتبوو کە کلیلی قوتابخانەی ناوەندی شارەزووری بداتێ لە پیر محەمەد، ئیتر ئەو هاوینە تەنها من و مستەفا لەوێ پرۆڤەمان ئەکرد، هیچ چالاکی هونەریمان نەبوو.

لە ساڵی (١٩٧٦) ئومێد لە لاوان بوو دوای ئەوە بورهانی حەمەی باول شوێنیکی داینێ ئەویش ماڵی مەلا نوری خەزووری بوو لە پاڵ دەرگای خوارەوەی باخی گشتی و چالاکییەکانمان لەوێ ئەنجامدا. پاش ئەوە ئەکتەرو ئەدیب و شاعیر و مۆزیکژەن دەهاتن، بیرمان لەوە کردەوە کە لقێکی (کۆمەڵی هونەرو وێژەی کوردی) کە ئێستا کۆمەڵی هونەرە جوانەکانە بکەینەوە بۆ ئەو مەبەستە چەند کەسێک کۆبووینەوە ئەوەی لە بیرم بێت: ساڵح هەژار، جەمالی مەلا قادر، سەید تەها، حەکیمی مەلا ساڵح، مستەفای ئەحمەد شیرین و ئەوانی ترم لە یاد نەماوە، بە جێبێکی سەوزی لاندرۆڤەری ستەیشن کە شۆفێرەکەی عوسمانی حەمە کەریمی چایچی بوو چووین بۆ سلێمانی و ئەو کاتە بارەگاکەیان لە گەڕەکی مەڵکەندی بوو نزیک شەخسەکەی پیرمەسوور، کە چووین مامۆستا (تەها خەلیل) لەوێ بوو، عەلی توانا، عەلی جۆلا و چەند کەسێکی تر، ئەوان هەموو

حەزیان ئەکرد ئەو لقە بکرێتەوە و وتیان (عەریزەیەک) بدەن ئەینێرین بۆ بەغدا بۆ وەزارەتی ڕاگەیاندن، دوای چەند ڕۆژێک من و حەکیمی مەلا ساڵح چووینەوە بۆ سلێمانی و پێکەوە چووینە لای عەریزە نوسێک کە لە پاڵ بانکی ڕەشیدی ئێستابوو بە (طابعة) و بەزمانی عەرەبی و لەسەر کاغەزێکی تەنک بۆی نووسین ئێمەش بردمان بۆ کۆمەڵ، پاش ماوەیەک وەڵامیان داینەوە کە لە پەیڕەوی ناوخۆیی کۆمەڵدا ڕێگا نادرێت لە قەزاو ناحیەکان لقیان هەبێت، ئیتر ئێمەش ئومێدمان نەما، پاش ئەوە لە ساڵی (١٩٧٧) بەدواوە شوێنمان نەما، من ئەو کاتە تەنها بووم کە هاوین هاتمەوە کلیلی قوتابخانەی شاهۆی کچانم لە پیر محەمەد وەرگرتوو لەوێدا خولی فێر بوونی مۆزیکم کردەوە و هاوینی ساڵی (١٩٧٨) مامۆستا هەڵکەوتی شێخ محەمەد مامی واتە شێخ ئەنوەر بەڕێوەبەری ئامادەیی هەڵەبجەی کوڕان (ئێستا ئامادەیی ئەحمەد موختارجاف)ە، بۆ هاوینەکەی لەوێ پرۆڤەمان ئەکرد و سێ چوار کەس بووین تا لە ساڵی (١٩٧٩) مەڵبەندی لاوان کرایەوە لە گەڕەکی سەرا لە ڕێگای بامۆک، ئیتر ئەوێ فەرمانگەی حکومی بوو سەر بە ئەمینداریەتی گشتی وەرزش و لاوان بوو، بە ناوی ئەو مەڵبەندەوە کارو چالاکیمان ئەنجام ئەدا تەنانەت ئێمە چەند ئەندامێک (من بووم، حەمیدی حاجی ڕەشید بوو، هەڵکەوت بوو، مستەفای غیاث بوو، چووین بۆ کانی شێخ لەوێ لە عەسرێکی خۆرهەتاو بوو بەڕێکەوت ١٩٧٩/٣/١٦ بوو، چووین بە مێشکی خۆمان پەیڕەوێکی ناوخۆییمان دانا بە سەرپێی، من دەفتەری یاداشتەکانم پێبوو لەو دەفتەرەدا حەمید دەستوخەتی خۆش بوو، خۆش نووس بوو، چەند خاڵێکی نووسییەو من تا ئێستاش ئەو نوسراوەم لاماوەو بڵاوی ئەکەمەوە ..تا ساڵی (١٩٨٠) شەڕی ئێران - عێراق دەستی پێ کرد و ئیتر منیش بوومە سەرباز ولە ساڵی (١٩٨٢) لقی بەڕێوەبەرێتی جەماوەر کرایەوە لە پاڵ فەرمانگەی کارەبا بەرامبەر گازینۆ شنروێ کە پێش ئەوە حەدیقەی عەلە بەڕانی بوو، چووینە ئەوێ و ماوەیەک لەوێ ماینەوە، پاشان شوێنەکەی گواسترایەوە بۆ گەڕەکی کانی قوڵکە، لەوێ من بە هاوکاری تەهای حاجی بەکرو ئەندامەکان ستۆدیۆیەکمان درووستکرد بە(تەبەدۆر) لەوێدا چەندین چالاکیمان کرد تا ساڵی (١٩٨٣) ئەو کاتە سەروەتی حاجی کەریم کوردستانی بەڕێوەبەری مەڵبەندی لاوان بوو، بانگی کردم و وتی با پێکەو چالاکییەک بکەین، ئیتر ئەوە بوو بە ناوی مەڵبەندی لاوانەوە

جـارێکی تـر چالاکیمـان ئەنجـام دا لە سـینەمای هەڵەبـجە کە خـاوەنەکەی کـاک محەمەدی لاسلکی بـرای کـاک سـەروەت بـوو، تـا سـاڵی (١٩٨٣) بینـای مەڵبەنـدی لاوان کرایەوە و منیش لە سەربازی تەسریح بـووم و ڕاژەی خـۆم لە فەرمـانگەی کارەباوە گواستەوە بۆ ڕۆشنبیری جەماوەر، ئەو کاتە محـەمـەد ئەمـین پێنجـوێنی بەڕێـوەبەری ڕۆشـنبیری جەمـاوەر بـوو لە سـلێمانی و بە ئاسـانی کـارەکەی بـۆ ئەنجـام دام. ئیتـر لەو بینـایە دوو فەرمـانگەی تێـدا بـوو مەڵبەنـدی لاوان کە بەڕێـوەبەرەکەی سـەروەتی حـاجی حەمە کوردسـتانی بـوو و لقـی ڕۆشـنبیری جەمـاوەر کە بەڕێوەبەرەکەی عوسمانی محـەمـەدی سـەید ئەحـمەد بـوو، منیش ژمێریـارو لێپرسـراوی بەشـی هـونەری بـووم. ئیتـر لەو بینـایە سـتۆدیۆیەکمان درووست کـرد هەر بە تەبەدۆر، هەر تەهـای حـاجی بەکر هاوکارمـان بـوو، بەڵام ئەمجـارە گەورەتـر و تەنـانەت چەنـدین ئـامێری مـۆزیکم بـۆ یەکەمینجـار هێنـایە هەڵەبجە وەک ئـامێری قـانون و چەلۆ، قـانونەکە ئاراسـی شـێخ جەمـال بە زوویـی فێری بوو چونکە لەوەو پێش سـەنتووری ئەزانـی، چەلـۆکەش (نظـام) فێـری بـوو، هەر لەو شوێنە چەندین چالاکیمان کرد وەک ئۆپەریتی سەوزەو  ئۆپەریتی ڕێویە لە پێستی شێردایە و تیپە نواندنەکانیش لەوێ شـانۆگەریەکانیان ئەنجـام ئەدا، لەو شوێنە بەردەوام بووین تا ١٩٨٨/٢/١٤ کە دوا چالاکی تێدا کرا ئەویش ئۆپەرێتی (ماسیە ڕەشە بچکۆلەکە) کە تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردی ئەنجامی دا و منـیش زۆربەی ئاوازەکـانیم بـۆ دانـان کە لە دەرهێنـانی فەرهەنگی حەمەی سـمایل بـوو، شیعری ئاوازەکانیش هی ئازاد تۆفیق بوو، ئیتر ئەوە دوا چالاکی بوو پاش ئەوە لە ١٩٨٨/٣/١٦ هەڵەبجە کیمیاباران کراو و پاش کۆتایی هاتنی شەڕی ئێران ـ عێراق، ئێران زۆربەی فەرمانگەو قوتابخانەو کتێبخانی گشتی و فەرمانگەی پوختە کردنی توتن و بینای قائیمقامیەت و یانەی فەرمانبەرانی بە (TNT) تەقاندەوەو بۆ هەتـایە شارستانیەتی لە هەڵەبجەدا خاپوورکرد، پاش ئەو لە ئێران مـن لە (چادر)ێکدا  لە ئۆردوگای سەروچاوە نزیک شاری سەقز وانەی مۆزیکم دەوتەوە تـا هـاتینەوە و تا ساڵی (١٩٩١) هیچ چالاکیمان نەبوو .

پاش سەرەتای ڕاپەڕین بینای بەشی ناوخۆیی زانکۆی سلێمانی هەبوو، چۆڵ بـوو لە سـەرکارێز چەنـد جارێـک کۆبـووینەوە بەڵام نەمـانتوانی کـاری هـونەری بکەین، ئەوەی کرا هۆشـیار حەمە فەرەج ئـاوازێکی دانـابوو بە نـاوی (هەڵەبشـیما)

عەزیزیش ئاوازێکی دانابوو بە ناوی (فریشتە گوڵ ڕەنگەکان) ئەوەی هۆشیار، زانا مەحمود هەژار بۆی ئامادە کردبوو چوون لە ماڵی مامۆستا سەلاح رەئوف تۆماریان کرد، بۆ ساڵی ١٩٩٢ ویستمان چەند بەرهەمێک تۆمار بکەین، زۆربەی شەو لە ماڵی من پرۆڤەمان ئەکرد، شەوێکیش چووینە ماڵی ئایاری حسین عەزیز و شەوێکیش لە ماڵی نامق سەعید پرۆڤەمان کرد و لە مانگی ١٠ ی ١٩٩٢ وێنەمان بۆ گرتن تا ساڵی ساڵی ١٩٩٤ هیچ شوێنمان نەبوو، پێش ئێمە لە بینای دەبۆکە عەبدولای حەمە لاو بەگ لە بینای دەبۆکە لە شەقامی مەولەوی ژوورێکی لە سەرەوە گرتبوو بۆ خۆیان ئەو کاتانە کەس بە کەس نەبوو، ئەو شوێنە بینای شارەوانی بوو، ئەو کاتە کەمال رەئوف هەنجیرە لێپرسراوی تەلەفزیۆنی کوردستان بوو لە سلێمانی و من و عەبدوڵا چووین بۆلای و یەکسەر ڕەزامەندی دەربڕی کلیلەکەی دامێ ئیتر لەو کاتەو تا ئێستاش لەو بینایەداین وەک تیپی شنروێ، پاشان زۆر تیپی هونەری مۆڵەتی وەرگرت و منیش فەرمانبەر بووم لە بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری ئەو کاتانە مامۆستا عەبدولی حەمە جوان بەڕێوەبەر بوو، زۆر جار پێی ئەوتم کاک ئازاد ئیجازە دەربێنن و چونکە تا ئێستاش ئێوە فەرمی نین بەو هەموو چالاکییەوە. ئێمەش پێداویستی و بەڵگەنامەمان ئامادە کرد، بەڵام زۆربەی ئەندامان ئەبوایە ماوەیەکی زۆر خەریکی هونەر بوونایە کە لە پێنج ساڵ کەمتر نەبێت لە دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەکان بێت، زۆریان ئەو ئەزمونەیان نەبوو، بۆیە ناچار سوودمان لە بڕوانامەی چەند مامۆستایەکی دەرەوەی تیپەکە وەرگرت کە دەرچووی پەیمانگا بوون کە وەک دەستەی دامەزرێنەربن. بۆیە بڕوانامەکەمان وەرگرتن و هاوپێچمان کرد بە مامەڵەکانەوە و عەزیز حەمە کەریممان ڕاسپارد بۆ ئەو کارە و بە ماوەیەکی کورت و بێ کێشە مۆڵەتەکەمان وەرگرت لە ڕۆژی ١٩٩٩/٢/٩ کە ئەوکاتە مامۆستا جەمال عەبدول وەزیری ڕۆشنبیری بوو.

**حكومەتی هەرێمی كوردستان**

**وەزارەتی رۆشنبیری**

بەڕێوەبەرێتی گشتی رۆشنبیری و هونەر

ژمارە/ ٥٠٩

رۆژ/ ٩/ ٦/ ١٩٩٧

بۆ/ فەرمانی وەزاری

+++++++++++++++++

بەپێی ئەو دەسەلاتەی پێمان دراوە و پشت بەستن بە یاسای ژمارە (١٦٦)ی سالی ١٩٦٤ ی مولەت دانی تیپە هونەرییەكان بریارماندا بە مولەت دانی تیپی موسیقای شەروی وئەم زاتانەی لای ئەبنە دەستەی دامەزرینەر بەمەرجی لە ماوەی ٦٠ روز هەلبژاردن دەستەی بەریوەبەر ساز بدریت و بەپێی ی پەیرەو پروگرامی تیپ و رینكنمایەكانی وەزارەت كارەكانیان ئەنجام بدەن . ئەم فەرمانە لە روزی دەرچوونیەوە كاری پی ئەكریت .

دەستەی دامەزرینەر

++++++++++++++++++++++++++++++

١- ئازاد حمە صالح صابر
٢- جالاك صدیق
٣- حمە عزیز حمە كریم
٤- هاوژین احمد صالح
٥- نیگار علی ابراهیم
٦- ئاراز محمدصابر
٧- سلام رشید

جمال عبدول محمد
وەزیری روشنبیری

وینەیەك بو/-

+++++++++

- وەزارەتی ناوخو /كومەلەكان
- بەریزگای سلیمانی / =
- ئاسایشی گشتی
- = سلیمانی
- قائمقامیەتی هەلەبجە
- بەریوەبەریتی گشتی دیوان
- = روشنبیری سلیمانی/. ........ .. ..........

جوبی /٢/٧

تیپی مۆسیقای
هەڵەبجە

بەندی یەکەم
ئامانجی گشتی تیپەکەمان .
خزمەت کردنی گۆرانی و مۆسیقا و هونەری رەسەنی کوردی .
دەبێتە پاڵنەری ساوایانی هونەر بەرەو پێشڕەوەکەماندا .

بەندی دووەم -
تیپەکەمان ئامادەیە بۆ وەرگرتنی ئەندام ـ ح مۆسیقاژەن یاخود گۆرانی بێژ یا کۆرس بە پێی ئەم مەرجانەی خوارەوە .
مەرجەکان .
١- خولیای هونەری تیا رەچاو بکرێت .
٢- خوورەوشت - هەروەها مەرجی پێویستە بەلای تیپەکەمانەوە .
٣- مل کەچ بێت بۆ هەموو مەرجەکانی پەیرەوی ناوخۆی تیپەکەمان .
٤- وەرگرتنی ئەندام بە پێی داوانامە بۆ تیپەکەمان لە لایەن داواکەرەوە بۆ وەرگرتنی .
٥- بە پێی توانا یارمەتی تیپەکە ئەدرێت لەلایەن ئەندامانەوە .
٦- پەیرەوی ئامۆژگاریەکانی هونەری بکرێت بەتایبەتی لە کاتی پرۆڤە و ئاهەنگەکاندا .
٧- ئاگادار کردنەوەی ئەندامێک بۆ یەکەم جار بەزاری بە هەموو سەرپێچیەک لەلایەن تیپەکەمان .
٨- تکای کردنی بەرامبەر بەو ئەندامەی کە بۆ دووەم جار سەرپێچی دووبارە ئەکاتەوە .
٩- سەرپێچی بەرامبەر بە تیپەکەمان بۆ سێیەم جار - بریتی ئەبێت لە دەرکردنی ئەو ئەندامە بە نووسراوێک لەلایەن تیپەکەمان بۆ ئەو ئەندامە .
١٠- ئامادەنەبوونی هەر ئەندامێک یا لە دانی یارمەتی بەبێ هۆیەکی بەجێ دەرئەکرێت لە تیپ - ئەگەر ئەم کردەوەیە تا (٣) مانگی بخایەنێ .
١١- بە هیچ جۆرێک ماوەنیە بۆ هیچ ئەندامێک لە لیستی تر یاخود لە تیپی تر بەشداری بکات وە هیچ جولانەوەیەکی هونەری نیە بۆ هیچ ئەندامێک بەبێ رەزامەندی دەستەی بەڕێوەبەری تیپ .
١٢- ئەو کەسانەی ئەیانەوێت ببنە تیپەوە ئاگاداری ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەن .
١- ناوی خۆی و ناوی باوکی .
٢- تەمەن و ناونیشان .
٣- پەیرەوی مەرجەکانی پێویستی تیپەکەمان بێت .
٤- ئەو کەسەی ئەیەوێت پەیوەندی بە تیپەکەمانەوە بکات و ببێتە ئەندام ئامانجێک لە ژێر چاودێری پێویستی تیپدا بێت .

یادگاری رۆژی هەینی ریکۆردە
١٩٧٩/١٢/١٦
کات - عەسر - رۆژی هەینی
سەعات (٢,٤٥) دەقیقە
شوێن - کافتریای بازاڕ .
١٩٧٩/١٢/١٦

## ساڵی ٢٠٠٠ و تۆمارکردنی چەند بەرهەمێک

لە سەرەتای ساڵی (٢٠٠٠) هونەرمەندی گۆرانیبێژ کاک (هۆشیار حەمە فەرەج) هەوڵێکـی زۆری دا بـۆ ئەوەی بتوانێـت کـۆمەک و هاوکاریمـان لە هاوڕێیـانی هەندەران بۆ کۆبکاتەوە بۆ ئەوەی بتوانین شوێنی بارەگاکەمان چاک بکەین و هەندێ ئامێری مۆزیک و ئامێری (ڕیکۆردەرو میکسـەر بکڕین). لەسـەر گیرفانی خۆی پەیوەندی کردبوو بە چەندین کەسانی دڵسۆزی هەڵەبجەیی و کوردەوە. هەریەکەی بە پێی توانای خۆی هاوکاریان کردین، وەک ئاشکرایە کە لەو ساڵانەدا گەمارۆی ئابووری بەسەر عێراق و کوردستاندا سەپێنرابوو، بۆیە باری ئابووری ئەندامان باش نەبوو . کە هاوکاریەکە گەشتە دەستمان، بڕێکمـان دابەش کـرد بەسەر ئەندامانـدا و بەوەی کە مـابووەوە بە کومبارێکی شین ستۆدیۆکەمان پێ ڕووپـۆش کـرد کە تـا ئەوکـاتەش سـتۆدیۆکەمان بە بەتـانی ڕوپـۆش کردبـوو. (ڕیکـۆردەرێکی چـوار تـراک و میکسـەڕێک)مـان کـڕی لە گەڵ ئـامێرێکی سـایزەر. ستۆدیۆکەمان فراوانتر کرد. ئیتر ئامادەبوو بۆ تۆمار کردنی گۆرانی و سوپاسـی هەڵوێستیانمان کرد بۆ ئەو هاوکاری و کۆمەکە.

هەر لە زسـتانی سـاڵی ٢٠٠٠ هونەرمەنـدی گـۆرانی بێـژ بورهـان خۆشـناو بەرنامەیەکی هونەری هەبوو بە ناوی (ساباتی هونەر ) لە کەناڵی (کوردسات) کە لە ئامادە کردن و پێشکەشکردنی خۆی بوو ، پەیوەندی پێوە کردین بۆ ئەوەی (٣) بەرنـامەی هـونەری بـۆ تۆمـار بکەیـن کە تـایبەت بێـت بە گۆرانییەکـانی نـاوچەی هەڵەبـجە و شـارەزوور و هەورامـان وە بە (٣) زنجیـرە هەریەکەی نیـو کـاتژمێر بێت، بە بەشداری کەسایەتی هونەری و ئەدەبی و کۆمەڵایەتی هەڵەبجەی تێدا بێت کە بتـوانن لە بەرنـامەکە باسـی هـونەری مۆزیـک و شـانۆو و شـێوەکاری و بـاری کۆمەڵایەتی ئەو دەڤەرە بکەن، بۆ ئەم مەبەسـتەش ووردە ووردە دەسـتمان کـرد بە ئاواز دانا ن و ئامادە کردنی مۆزیک و پـەیدا کردنـی گـۆرانیبێژ بـۆ ئەنجامـدانی بەرنامەکە . پەیوەندیمان کرد بە چەند هونەرمەند و گۆرانیبێژێکەوە. لە وانە خاتوو (کۆچەر عومەر)، من ئاوازی ( هەوای باخی میر)م بۆ دانا، خاتوو ( تاڤگە تفەنگچی) کچێکی هاواری بوو دەنگی باش بوو گۆرانی (هەی گوڵ) کە لـە یـادو بۆنەکانـدا لە هەڵەبجە (باجەخانی ڕەشید عەزیز) ئەیگوتەوە لـە یـادەوەریم مـابوو کە ئـاوازێکی

دەروێش عەبدوڵایە. هەروەها گۆرانیبێژان کاک ( ئازادە ڕەش، هەورامان عیزەت، نەجم محەمەد. ئەکرەم حەمە ڕەشید).

من ئەو کاتە لە کۆمپانیایەکی ئەهلی ژمێریار بووم بە ڕۆژ نەم ئەتوانی ئامادە بم بۆ تۆمار کردنی گۆرانییەکان ، بۆیە بە شەوانە پرۆڤەمان ئەکرد. بۆچەند شەوێک دەستمان کرد بە ئاواز دانان وتۆمارکردنی چەند گۆرانییەک بۆ ئەو هونەرمەندانە . کە زۆربەی ئاوازەکان لە ئاواز یان ئامادەکردنی بەندە و کاک عادل حەسەن بوو . پاش ئەوە پەیوەندیم کرد بە چەند کەسایەتی هونەری و ئەدەبی و کۆمەڵایەتی هەڵبجەوە کە ناسراو بوون، لەوانە ڕەوان شاد کاک جەمالی مەلا قادر. مامۆستا حەمە فەرج ئەحمەد ، ڕەوان شاد مامۆستا ئازاد حەمدی و کاک مستەفا بەختیار . کاک عومەری حاجی عەنایەت. خاڵی بەڕێزم مامۆستا خالید حسەین بانەیی. پاش خۆئامادەکردن بۆ بەرنامەکە، مابوەوە سەر دیکۆری بەرنامەکە کە دەبوو لە ستۆدیۆی کەناڵی (خاک تیڤی) تۆماری بکەین هەرچەندە بەرنامەکە بۆ کەناڵی کوردسات بوو. عەسری ئەو ڕۆژەی کە تیایدا بەرنامەکە تۆمار بکەین مامۆستا حەمە فەرەج و ڕەوان شاد ئەسغەر ڕەشید ئەرکی دیکۆرەکەیان خستە ئەستۆی خۆیان، کە بریتیبوو لە دروستکردنی وێنەی ماڵی (وەسمان پاشا ). بە ماوەیەکی کەم دروستیان کرد و کاک عادل حەسەنیش هەندێ تێبینی دا، چونکە شارەزایی لە شێوەکاریدا هەبوو. بۆ شەوەکەی هەموو ئەندمانی تیپ لە مۆزیکژەن و گۆرانیبێژو میوانەکان ئامادە بوون و لە ماوەی چەند کاتژمێرێک هەر (٣) زنجیرەکەمان تۆمار کرد. ئەوەی مایەی داخ بوو کە لە کاتی لێدوانی کاک جەمالی مەلا قادر (شەکرەی) بەرز بووەوەو نەیتوانی لێدوان بدات.

بەرهەمەکان بەم شێوەیە بوون

| وتنی | ئامادە کردن | ئاواز | هۆنراوە | ناوی بەرهەم |
|---|---|---|---|---|
| تاڤگە تفەنگچی | عادل حەسەن | کۆن | کۆن | هەی گوڵ |
| کۆچەر عومەر | عادل حەسەن | ئازاد سالح | فۆلکلۆر+ئازاد | هەوای باخی میر |
| ئازادە ڕەش | ئازاد ساڵح | فۆلکلۆر+ئازاد | فۆلکلۆر | بەلەنجە |
| نەجم محمد | عادل | فۆلکلۆر | فۆلکلۆر | یارە دوورەکەم |
| هەورامان عزەت | ئازاد | فۆلکلۆر | فۆلکلۆر | کچی هەورامان |
| ئەکرەم حەمە ڕەشید | سەلام ڕەشید | ئەکرەم حەمە ڕەشید | ساڵح بێچار | دووری |

له هه‌مان ساڵدا واته ساڵی (٢٠٠٠) ئاوازێکم به شێوازی کۆراڵ دانا به ناوی (سوتماکی هه‌ڵه‌بجه ) بۆ یادی کیمیابارانی هه‌ڵه‌بجه. له ستۆدیۆی (حه‌مکوڵ) لای سه‌هۆڵه‌که به‌سه‌رپه‌رشتی کاک عادل تۆمار کرا، چونکه من له‌به‌ر ده‌وامکردن بۆم نه‌ئه‌کرا ئاماده بم . مۆزیکژه‌ن و گۆرانیبێژ تێیدا به‌شدار بوون، له‌وانه: لوقمان سه‌لیم . ئازاده ڕه‌ش. ده‌ریا . سواره محمد و کاک عادلیش بڕگه‌یه‌ک له شیعری شێرکۆ بێکه‌سی تێهه‌ڵکێش کرد، که ده‌قی کۆراڵه‌که زۆربه‌ی هۆنراوه‌کانی خۆم دامنابوو باسی له مێژووی هه‌ڵه‌بجه ده‌کرد.

هه‌ر له هه‌مان ساڵدا له هاوینه‌که‌ی جارێکی تریش ده‌ستمان کرد به هه‌ڵبژاردنی ده‌سته‌ی به‌ڕێوه‌بردنی تیپ و به زۆرینه‌ی ده‌نگ جارێکی تریش بۆ سه‌رۆک تیپ هه‌ڵبژێردرامه‌وه.



کۆبونه‌وه‌ی ئه‌ندامانی تیپی مۆزیکی شنروێ بۆ هه‌ڵبژاردنی ده‌سته‌ی به‌ڕیوه‌بردنی تیپ ساڵی ٢٠٠٠

## ساڵی ٢٠٠١ و ئامادەکردنی بەرنامەیەک بۆ جەژنی رەمەزان

بە بۆنەی جەژنی ڕەمەزانی ئەو ساڵەوە، مامۆستا ئەنوەر قەرەداغی ڕایسپاردین کە بەرنامەیەک ساز بکەین بۆ تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان، چەند بەرهەمێکمان بە شەوان تۆمارکرد و چە ند کەسایەتییەکمان بانگ کرد بۆ قسە کردن لەسەر جەژنانی کۆنی هەڵەبجە، لەوانە:

کاکە حەمەی فەرەج ، دکتۆر فوئاد بابان، محەمەد غەفور شەریف، غازی مەلا عەلی، حەمەی حاجی حەمە شەریف ودایکی خێزانی حاجی حەمە شەریف وفەرەجی حەمە ساڵح وچەند کەسێکی تر لە هۆڵی ڕۆشنبیری سلێمانی بە شەو وێنەمان گرت، ئەم بەرهەمانەمان بە دۆبلاج تۆمار کرد لە وانە :

| ناوی بەرهەم | هۆنراوە | ئاواز | ئامادە کردن | ووتنی |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| جەژنەن شادیەن | فۆلکلۆر | فۆلکلۆر | ئازاد ساڵح | ئازادە ڕەش |
| کەژاڵ | حەسیب قەرەداغی | هوشیار حەمە فەرەج | عادل حەسەن | لوقمان سەلیم |
| دڵەی پرخەم | حەسیب قەرەداغی | هوشیار حەمە فەرەج | عادل حەسەن | ئازادە ڕەش + کۆچەر عمر |
| هەنار هەنارە | فۆلکلۆر | فۆلکلۆر | عادل حەسەن | تاڤگە تفەنگچی |

## کارکردن لە گۆرانییەکی سابیر کوردستانیدا

لە کۆتایی ساڵی (٢٠٠١) هونەرمەند کاک سابیر کوردستانی ئاوازێکی هێنا بە ناوی (ئەوین) کە ئاوازی خۆی بوو، کاک عادل حەسەن بۆی ئامادەکرد و شەوێکیان لە تەلەفزیونی خاک وێنەیان بۆ گرتین.

لە ساڵی ٢٠٠٠ چەند ئەندامێکی تر هاتنە تیپی مۆزیکی شنروێ، لەوانە کاک توانا خورشید و هەروەها هونەرمەند کاک ئەرکان ڕۆستەم، کە لە پێشدا بە ئامێری زەڕب بەشدار ئەبوو لەگەڵمان، هەر لەو ساڵانەدا لە منداڵانی تیپی مۆزیکی شنروێ تیپیکی سوونەتی درووستبوو، وە زۆربەی ئەندامەکانی ئەندامانی تیپی مۆزیکی شنروی بوون بە سەرپەرشتی مامۆستا دلێر حسین بە

ناوی تیپی (گەڕیان)لەوانە: نیاز سەنتور، کارزان مەحمود، خەلیل عبداللە، توانا ئەبوبەکر، ئیتر زۆربەی چالاکی و کارەکانیان بە ناوی ئەوتیپە ئەکرد کە بە شێوازی سونەتی کاریان دەکرد و زۆر کاریگەری نەگەتیڤی لەسەر تیپی ئێمە دانا، چالاکیمان سستبوو، دوای ئەنجامدانی کۆنسێرتێک، م. دلێر چووە تورکیا، کارزان سەرپەرشتی دەکردن، پاشان کارزانیش چووە هەندەران و توانا خورشید سەرپەرشتی ئەکردن و چەندین چالاکیان ئەنجام ئەدا لە دەرەوەی تیپی ئێمە، چونکە سەر بە دەزگای خاک بوون، هەموو مووچەیان هەبوو تا ساڵانیکی زۆر بەردەوام بوون، بەڵام دوایی هەموو پەرتەوازە بوون و تیپەکە بوونی نەما .

## چەند بەرهەمێک لەیادی کیمیابارانکردنی هەڵەبجە لە ساڵی ٢٠٠٢

لەم ساڵەدا لە ڕۆژی ٢٠٠٢/٣/١٦ لە گۆڕەپانی فیستیڤاڵ لەهەڵەبجە کە بە یاریگای شاهۆ حەمە فەرەج ناسراوە، ئەم بەرهەمانەمان پێشکەش کرد بە ئامادەبوونی ئەم هونەرمەندانەی ناویان لە خوارەوە هاتووە

| گۆرانی | هۆنراوە | ئاواز | ئامادەکردن | وتن |
|---|---|---|---|---|
| ئەی شەهیدان | محەمەد تۆفیق وردی | ناسری ڕەزازی | توانا خورشید | کۆرس |
| قەڵادزێ و هەڵەبجە | سوارە قەڵادزێی | ئازاد ساڵح | عادل حەسەن | زاهیر جەلال |
| پەیمانێک بۆ هەڵەبجە | ئەژی گۆران | ئازاد ساڵح | عادل حەسەن | لوقمان سەلیم |
| ناڵەی بولبول | ڕازی | سابیر کوردستانی | چالاک سدیق | سابیر کوردستانی |
| کوردستانم | سەلاحە ڕەش | هۆشیار حەمە فەرەج | عادل حەسەن | شیلان عوسمان |
| پە پولەی بەهار | حەکیم مەلا ساڵح | ئازاد ساڵح | عادل حەسەن | شیلان عوسمان |
| ئازیز مەکەرۆ | عوسمان هەورامی | دڵسۆز | زۆزک ئەحمەد | دڵسۆز عوسمان |
| سیاچەمانە | فۆلکلۆر | فۆلکلۆر | عادل حەسەن | سیروان لهۆنی |

## له ساڵی ٢٠٠٣ دامەزراندنی ناوەندی روناکبیری هەڵەبجە

پێش ئەوەی ئەمریکا هێرش بکاتە سەر عێراق و بیخات، ڕۆژێکیان کاک ئازاد تۆفیق (پارێزگاری هەڵەبجە)تەلەفۆنی بۆ کردم وتی بە نیازی دامەزراندنی ناوەندی ڕوناکبیری هەڵەبجەین منیش هەر بوارێک خزمەتی کردبێت نکوڵیم نەکردوە پاشان بە چەند هونەرمەند وشاعیر و ئەدیب و نووسەری تری وتبوو کە دەستەی دامەزرێنەری بووین.

ڕۆژێکیان پێکەوە دوو بە دوو ڕۆشتین بۆ وەزارەتی ڕۆشنبیری ئەو کاتە، کاک فەتاح زاخۆیی وەزیری ڕۆشنبیری بوو، لە بینای مۆزەخانەی سلێمانی، دەستمان کرد بە وەرگرتنی مۆڵەتی فەرمی بۆ ئەو ڕێکخراوە و من هەر ئەو رۆژە لەگەڵی بووم، پاشان خۆی و یەک دوو کەس چوونە لای ڕەوانشاد بایز تاڵەبانی، وەزیری دارایی ئەو کاتەو بڕێک پارەیان وەرگرتبوو بۆ کڕینی شت و مەک بۆ ئەو ناوەندە و خانووی حاجی عەبدول کەریمیان بەکرێ گرت، لە گەڕەکی سەرا و پڕیان کرد لە شت و مەک و کۆمپیوتەر. ساڵی (٢٠٠٥) کە من بووم بە بەڕێوەبەری ڕۆشنبیری هەڵەبجە کە شەوان دەمامەوە لەوێ ئەخەوتم و کاک هێمن لەتیفیش لەوێ بوو، پێش منیش کاک مەریوان هەڵەبجەیی هەر لەوێ دەمایەوە کاتێ بەڕێوەری ڕۆشنبیری بوو.

دەستەی دامەزرێنەر

...ەرمەندو نووسەرو رووناکبیرە، لە ٢٠٠٣/٣/٣دا شەرەفی یەکەم پێکهێنانی دەستەی دامەزرێنەری (ناوەندی رووناکبیری هەڵەبجە)یان پێبڕا.

جەلال عوسمان عەلی
١٩٦٩لە هەڵە بجە لەدایك بووە
دەرچووی پەیمانگای هونەرەجوانەکان
شانۆکار

سەلاح عەلی محەمەد
١٩٦٢لە هەڵە بجە لەدایك بووە
دەرچووی پەیمانگای هونەرەجوانەکان
شانۆکار

حەمە عەزیز حەمە کەریم (مامە عەزە)
١٩٦٣لەهەڵە بجە لەدایك بووە
دەرچووی ئامادەیی پیشەسازی
مۆزیکی

عیزەت عەزیز موراد
١٩٦١لە هەڵە بجە لەدایك بووە
دەرچووی ئامادەیی
شێوەکار

رۆژ محەمەد لایەق حەسەن (رۆژ هەڵە بجەیی)
١٩٦٧لە هەڵە بجە لەدایك بووە
دەرچووی پەیمانگا
شاعیر

مەریوان ئەبوبەکر (مەریوان هەڵە بجەیی)
١٩٦٢لە هەڵە بجە لەدایك بووە
دەرچووی ئامادەیی
نووسەرو رووناکبیر

سەمیعە محەمەد ئیسماعیل
١٩٧١لە هەڵە بجە لەدایك بووە
دەرچووی پەیمانگای هونەرەجوانەکان
شانۆکار

هیدایەت عوسمان سەحمەد
١٩٧٢لە هەڵە بجە لەدایك بووە
دەرچووی پەیمانگای هونەرەجوانەکان
شێوەکار

سەلاح ئەحمەد رەشید (سەلاحە رەش)
١٩٦٣لە هەڵە بجە لەدایك بووە
دەرچووی زانکۆ
شاعیرو رۆژنامەنووس

یاسین حەسەن حەمە ئەمین
١٩٦٢لە هەڵە بجە لەدایك بووە
دەرچووی پەیمانگای هونەرەجوانەکان
شێوەکار

پاشان چەندین چالاکی ئەدەبی و هونەرییان سازداو لە سەرەتادا زوو زوو دەهاتین، بەڵام پاشان بەهۆی قەیرانەوە و تەکینەوەی زۆربەی ئەندامان لە کارکەوت، ئەم چالاکییانەمان ئەنجامدا:

ڕۆژی ٢٠٠٣/٧/٢٤ بەشداریمان کرد لە چالاکییەکی هونەری لە هۆڵی ئەحمەد موختار جاف، بەڵام هیچ وێنەیەکم لانییە و ناوی بەشدارانم لە بیر نەماوە کە چ مۆسیقییەک یان گۆرانی بێژێکم لەگەڵ بووە.

بەشداری کردنمان لە فێستیڤاڵی هونەری شارەزور ڕێکەوتی ٢٠٠٣/١٢/١٦ لە هۆڵی ئەحمەد موختارجاف.



## یەکەم رۆژی فیستیڤاڵ

کات : (١٠)ی سەرلە بەیانی .. کردنەوەی پێشانگا
(١١) وتاری لیژنەی فیستڤاڵ
وتاری حکومەتی هەرێمی کوردستان
وتاری ڕێکخراوە دیموکراتیەکان
(١١: ٣٠) ئاهەنگی تیپی مۆسیقای شنروێ
ئاهەنگی تیپی مۆسیقای هەورامان

### پاش نیوەڕۆ

کات: (٢ : ٣٠) لە هۆڵی احمد موختار جاف لیژنەی شارەزوور
تیپی شانۆیی ئاڵ : نمایشی شانۆیی ( کۆتایی بونی ئەزاکان )
ئامادەکردن و دەرهێنانی : جەمال ئەحمەد جەمیل

## رۆژی دووەم

هۆڵی ئەحمەد موختار جاف
کات : (١١)ی سەرلەبەیانی تیپی شانۆیی هەڵەبجە شانۆیی(نمایشێك لە تەنیایی)
(٢) ی پاش نیوەڕۆ تیپی مۆسیقای شارەزوور ئاهەنگی کۆتایی .

پشوویەك

بەسەرپەرشتی بەرێز نوێنەری حکومەتی هەرێمی کوردستان
یەکێتیی هونەرمەندانی کوردستان
دووەمین
فێستیڤاڵی هونەریی شارەزوور
بە دروشمی :
ئازادی ڕەها ..
هزری ئازادی ئاڵە و
داهێنانی نوێ
دەستەبەر ئەکات
بەبەشداری لیژنەکانی
"هەڵەبجەی شەهید -شارەزوور - هەورامان - پێنجوێن"
لە رۆژانی : ١٦-١٧/١٢/٢٠٠٣ دا لەهەڵەبجەی شەهید

## چالاکیەکانی (ناوەندی ڕووناکبیریی هەڵەبجە)

### شیعر

ڕۆژی سێشەممە ٢٠٠٣/٧/٢٢کاتژمێر ١٠ی سەرلەبەیانی کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە بۆ نۆ شاعیر سازکرا:
١- مامۆستا ئەمین - هەڵەبجە ٢- گۆریان - هەڵەبجە ٣- حەمە عەلی غەریب - هەڵەبجە ٤- ڕۆژ هەڵەبجەیی - هەڵەبجە ٥- عومەر عەبدول - هەڵەبجە ٦- وەرزێر حەمە سەلیم - هەڵەبجە ٧- ئەمیر هەڵەبجەیی - هەڵەبجە ٨- ڕەمەزان کۆساری - هەڵەبجە ٩- ئیدریس عەلی - هەڵەبجە.
ڕۆژی چوارشەممە ٢٠٠٣/٧/٢٣کاتژمێر ١٠ی سەرلەبەیانی کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە شاعیرانی میوان سازکرا:
١- هیدایەت عەبدوڵا حەیران - سلێمانی ٢- کۆسار کەمال - سلێمانی ٣- سۆزان مامە - سلێمانی ٤- عیرفان ئەحمەد - سلێمانی ٥- چنار نامیق - هەولێر ٦- هێمن حەمە جەزا - سلێمانی ٧- عومەر عەبدولکەریم - سلێمانی ٨- حەمە عەلی خان - سلێمانی.
ڕۆژی پێنجشەممە ٢٠٠٣/٩/٤کاتژمێر ٥ی ئێوارە کۆڕێك بۆ شاعیر (دڵشاد عەبدوڵا ) سازکرا.

### لێکۆڵینەوە

ڕۆژی سێشەممە ٢٠٠٣/٧/٢٢کاتژمێر ٦ی ئێوارە:
لێکۆڵینەوەیەك بەناوی( ئەمریکا .. خۆرهەڵاتی ناوەڕاست .. زەرورەتی کۆنترۆڵکردن ) بۆ نووسەر ( ئازاد تۆفیق ).
ڕۆژی سێشەممە ٢٠٠٣/٧/٢٢کاتژمێر ٦ی ئێوارە:
لێکۆڵینەوەی ( جینۆساید لەعێراقدا .. هەڵەبجەو کیمیاباران ) بۆ نووسەر ( محەمەد حەمەساڵح تۆفیق ).
ڕۆژی چوارشەممە ٢٠٠٣/٧/٢٤کاتژمێر ١١ی سەرلەبەیانی:
لێکۆڵینەوەیەك بەناوی ( عیشق و ئازادی ) بۆ نووسەر ( ئەکرەمی میهرداد ).
ڕۆژی چوارشەممە ٢٠٠٣/٩/٣کاتژمێر ٦ی ئێوارە:
لێکۆڵینەوەیەك بەناوی ( پەرەسەندنی ئەدەب و زمان و زاراوە لەبزافی ڕۆژنامەگەری کوردیدا ) بۆ نووسەرو ڕۆژنامەنووس ( مەحمود زامدار ).
ڕۆژی پێنجشەممە ٢٠٠٣/٩/٤کاتژمێر ١٠ی سەرلەبەیانی:
لێکۆڵینەوەیەك بەناوی ( خوێندنەوەیەك بۆ ئەفسانە بەگشتی و مێژووی ئەفسانەی کوردی بەتایبەتی ) بۆ نووسەر ( مەولود ئیبراهیم حەسەن ).
ڕۆژی پێنجشەممە ٢٠٠٣/٩/٤کاتژمێر ١٢ی نیوەڕۆ:
لێکۆڵینەوەیەك بەناوی ( کورتە باسێك دەربارەی ئەدەب و ڕۆشنبیری منداڵان ) بۆ نووسەر ( حەمە ساڵح فەرهادی )

### مۆزیك

ڕۆژی پێنجشەممە ٢٠٠٣/٧/٢٤کاتژمێر ٦ئێوارە:
ئاهەنگێکی گۆرانی و مۆسیقا بۆ تیپی مۆسیقای شنروێ بەسەرپەرشتی هونەرمەندان ( ئازاد ساڵح )و ( عەزیز حەمە کەریم ).

## چالاکیەکانی (ناوەندی ڕووناکبیریی هەڵەبجە)

### شێوەکاریی

ڕۆژی سێشەممە ٢٠٠٣/٧/٢٢کاتژمێر ١٠ی سەر لەبەیانی:
کردنەوەی پێشانگەیەکی هاوبەش بۆ نۆزدە هونەرمەندی شارە جیاجیاکانی کوردستان.
١- یاسین حەسەن - هەڵەبجە ٢- ئیسماعیل حەسەن - هەڵەبجە ٣- ئارام عەلی - سلێمانی ٤- ... صدیق - سلێمانی ٥- ئەسفەر ڕەشید - هەڵەبجە ٦- شێروان فاتیح - کەرکوك ٧- سەعید ئیس... کەرکوك ٨- بەرزان سابیر - سلێمانی ٩- ڕەجا عەلی -هەڵەبجە ١٠- ئامیق حەمە - هەڵەبجە ١١- عەزیز - هەڵەبجە ١٢- موحسین کاکە حەمە - هەڵەبجە ١٣- فەرهاد عەبدولڕەحمان - هەڵە...
١٤- عەبدوڵا میرزا - هەڵەبجە ١٥- عەبدولڕەحمان میرزا - هەڵەبجە ١٦- ئاودێر عوسمان - ...
١٧- سروشت عومەر - هەڵەبجە ١٨- سەعید ئیسماعیل - کەرکوك ١٩- ئەریوان سەلاح - هەڵەبجە
ڕۆژی سێشەممە ٢٠٠٣/٨/٥کاتژمێر ١٠ی سەرلەبەیانی :
کردنەوەی پێشانگەیەکی شێوەکاری بۆ گروپی کوردستان بۆ پێشکەش کردنی بەرهەمی دوانزە هونە...
١- عەلی جۆڵا ٢- ڕێبوار خالید ٣- ئاکۆ غەریب ٤- نوری مەحمود ٥- محەمەد فەتاح ٦- ڕۆستەم ...
٧- ئەرسەلان ئەحمەد ٨- ئەعیمە محەمەد ٩- خەسرەو محەمەد ١٠- سازان عەلی ١١- ڕێبوار ...
١٢- ڕەوف حەسەن.
ڕۆژی چوارشەممە ٢٠٠٣/٩/٣کاتژمێر ١٠ی سەرلەبەیانی:
میوانداری پێشانگای ( پانۆرامایەك لەتراژیدیای وڵاتەکەم ) بۆ هونەرمەندی هەولێر ( دارا محەمەد ...
ڕۆژی چوارشەممە ٢٠٠٣/٧/٢٣کاتژمێر ١٠ی سەرلەبەیانی:
کردنەوەی پێشانگایەکی دیکۆمێنتی کە تایبەت بوو بە ( ١٣٥ ) وێنەی ئەرشیفی دەڤەری هەڵەبجە.

### فیلم

ڕۆژی پێنجشەممە ٢٠٠٣/٧/٢٤کاتژمێر ١٠سەرلەبەیانی:
پێشکەش کردنی دوو فیلم بەم شێوەیەی خوارە:
١- فیلمی ( نوقڵەکانی شنە ) سیناریۆو دەرهێنانی ( هیدایەت عوسمان ) نواندنی ( شاکار ئازاد ).
٢- فیلمی ئەرشیفی ( سەردانی خاتو دانیال میتران بۆ شاری هەڵەبجە ) لەئەرشیفی ( مامۆستا عەبدو...

### کۆنگرە

ڕۆژی دووشەممە ٢٠٠٤/١/٥کاتژمێر ٩ی سەرلەبەیانی بەئامادەبوونی پەنجاوسێ کەس لەن... ڕووناکبیران ( ناوەندی ڕووناکبیریی هەڵەبجە ) یەکەم کۆنگرەی خۆی بەدروشمی ( ئازادی .. دا... مەدەنیەت ) لەهۆڵی یادگاری هەڵەبجە سازکرد.

### بڵاوکراوە

ناوەندی ڕووناکبیریی هەڵەبجە لەدرێژەی چالاکیەکانیدا دوو ئامیلکەی بەم شێوەیە بەچاپ گەیاندو...
١- ئەمریکا .. خۆرهەڵاتی ناوەڕاست .. زەرورەتی کۆنترۆڵکردن. نووسینی ( ئازاد تۆفیق ) زستانی ٢٠٠٣...
٢- ئیشکێ لەکلاوڕۆژنەی مەعریفەوە بۆ ماڵە تاریکەکەی فاروق ڕەفیق. نووسینی ( ئازاد تۆفیق ) پایز...

هــەر لەو ســاڵەدا کتێبـێکم دەربـارەی فۆلکلـۆری گـۆرانی منـاڵان نووســی و (جوان)ی خوشکم وێنەکانی بۆ کێشـام و دام بە خانـەی سـمۆرە ویسـتیان چـاپی بکەن و دیزاینیشیان بۆ کرد و ئامادەش کرا، بەڵام قەیرانی دارایی هات بە سەریدا و نەک کتێبەکە چاپ نەکرا بەڵکو خانەی سمۆرەش داخرا.



## چالاکییەک لە ساڵی ٢٠٠٤

ئازاد تۆفیق و حەکیمی مەلا ساڵح وەک یەک دەنگیان هێنا

ئەو ساڵە وازم لە دەوامی کۆمپانیا هێنـا، بـە هـەمـوو هـەوڵ و هیمـەتـی خـۆم و هاوکـاریی دانـای سـازو تـانگۆی کـورم، ژوورێکـی دیکـەم لە بینـای دەبـۆکە لـە سەرەوە درووست کرد بۆ ئەوەی چالاکی تیپی شنروێ زیندوو بکەمەوە، چونکە خوارەوە ببووە شوێنی تیپی گەڕیان ئیمەش بۆ ڕێز گرتن لێیان هیچمان نەئەوت.

ئەوچالاکییەی کردمـان لـەو سـاڵەدا ناوەنـدی ڕونـاکبیری هـەڵـەبـجە لـە ڕۆژی ٢٠٠٤/١/٦ کۆنگرەیەکیـان بـەسـت و ئێمە بـەشـداریمان کـرد لەگەڵیـان، بـەهـەنـدێ گۆرانی فولکلۆری، ئامادەبووان بەرنامەیان خوێندەوە و کۆنگرەیان بەست، ئازاد تۆفیق و کەمـال هەورامـی و مەریـوان هەڵەبجەیـی و حەکیمـی مەلا سـاڵح و چەنـد کەسـێکی تـر، دوو کەس خۆیـان هەڵبـژارد بۆسـەرۆکی ئەو ڕێکخـراوە، عەزیـزی

حاجی حەمەکەریم ئەیویست خۆم هەڵبژێرم و پاڵی پێوە نام بۆ ئەوەی بچمە سەر ستەیجەکە، من لای خۆمە باوەڕم بە ڕێکخراو نەمابوو، چونکە هەر کەس بۆ بەرژەوەندی لایەنێک کاری دەکرد، بۆیە دوورکەوتمەوە.

ئازاد تۆفیق و حەکیمی مەلا ساڵح خۆیان هەڵبژارد و هەردووکیان وەک یەک دەنگیان هێنا، دوای ئەوە حەکیم ڕێکخراوێکی بۆ خۆی درووست کردو ئەوەی تریش ئازاد سەرپەرشتی ئەکرد مایەوە و وردە وردە لە چالاکی کەوت، لەو ساڵەدا تەنها ئەم چالاکییەمان هەبوو.



## خۆئامادەکردن بۆ ڤیستیڤاڵی یەکێتی هونەرمەندان لە ساڵی ٢٠٠٥دا

لە سەرەتای ئەم ساڵەدا یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان ڤیستڤاڵێکی سەرتاسەری بۆ تیپەکانی کوردستان سازکرد، من بوارم زیاتر بوو بۆ کاری هونەری، چونکە گەڕابوومەوە فەرمانگەی ڕۆشنبیری و لەوێ بەڕێوەبەری ژمێریاری فەرمانگەکە بووم، کاتێ مامۆستا عەبدولی حەمە جوان بەڕێوەبەر بوو، هەفتەی سێ ڕۆژ دەوامم ئەکرد، بیرم دێت زۆر جار لەسەر مێزەکەی خۆم

نۆتەکانم ئەنووسییەوە، دەستمان کرد بە پرۆڤەکردن و ئەو ساڵەش لە ئامادەیی بازرگانی کچان کۆرسمان هێنا و بۆ کوڕانیش ئەندامانی تیپی هەڵپەڕکیی نەتەوەییمان هێنا.

ئەندامانی مۆزیکمان کەم بوو، چونکە تیپی گەڕیان دەچوون بۆ هەندەران، ناچاربووین چەند میوانێک بانگ بکەین لەوانە مامۆستا هێمن، م.ئەحمەد، ئاری. وە دڵسۆزی عوسمان کەیمنەیی بۆ سەنتور و لە جێگای خەلیل، دانای ساز بۆ عود، هەروەها ئەندامی کۆنی تیپ ڕزگار فەرەج و ئەم بەرهەمانە لە ڕۆژی ٢٠٠٥/٢/٢٤ لە هۆڵی سەنتەری گەنجان لە گەڕەکی بەختیاری پێشکەش کرد بەم شێوەی خوارەوە:

١.(سێ چریکە و سۆزێکی شارەزوور) ئاوازی : فۆلکلۆر، ئامادەکردن ئازاد ساڵح

٢.(وێستگەی ژیان)هۆنراوەی : ئەحمەد محەمەد، ئامادەکردن: عادل حەسەن و ئاوازو وتنی ئەکرەم حەمە رەشید

٣.(باخی میر) ئاوازو هۆنراوەی: فۆلکلۆر، ئامادە کردن : توانا خورشید، وتنی: ئازاد کریم

٤.(کزەی شەماڵ)هۆنراوەو ئاواز: فۆلکۆر، ئامادەکردن : عادل حەسەن، وتنی بەهرۆز بەڵخەیی



## کۆرسی کوڕان:

١. زانا مەحمود عوسمان
٢. ستران جیهاد دڵپاك
٣. زانیار حەمە کەریم
٤. هۆگر نوری عەباس
٥. محەمەد جەلال عەبدوڵا
٦. دارا عەلی سەعید
٧. میران ئەحمەد مەولود
٨. هیوا ئەحمەد عەلی
٩. ئاری ئەبوبەکر
١٠. بڕوا بوار نورەدین
١١. سەرکەوت عوسمان محەمەد
١٢. پێشڕەو نەجمەدین
١٣. بەرهەم لوقمان

## کۆرسی کچان:

١. ژیار صدیق
٢. ئاورنگ ئەحمەد
٣. شانۆ حەسەن
٤. شۆخان ئەبوبەکر
٥. تریفە ئەحمەد
٦. بەیان عەبدولڕەحمان
٧. دڵپاك كەریم
٨. لانك مەهدی
٩. دیلمان ئیسماعیل
١٠. نیاز عوسمان محەمەد
١١. چنار مەحمود
١٢. لینا جەلال
١٣. شیلان غەریب
١٤. دەروون عومەر
١٥. روناك كەریم

## سوپاس و خۆشەویستیمان بۆ:

- ئامادەیی بازرگانی سلێمانی کچان.
- هەموو ئەو خوێندنگایانەی لەم فیستیڤاڵەدا یارمەتیان داین.
- هەموو ئەو میوانانەی لە بەرهەمەدا بەشداریان کرد.
- مامۆستا گەزاڵ مەعروف/ ب. ئامادەیی بازرگانی سلێمانی کچان.
- مامۆستا هەتاو حەمە سەعید/ ی. بەڕێوەبەری گشتی پەروەردە.

## بەرهەمەکان

١. سێ چریکەو سۆزێکی شارەزووری:
هۆنراوەو ئاواز: فۆلکلۆر — ئازاد صالح
داڕشتنەوەی: ئازاد صالح
وتنی: کۆرس
تاك گۆ: ئازاد کریم — دڵسۆز عوسمان — یاسین محەمەد ئەمین

٢. ویستگەی ژیان
هۆنراوەی: ئەحمەد محەمەد
ئامادەکردنی: عادل حەسەن
ئاوازو وتنی: ئەکرەم حمە ڕەشید

٣. باخی ژین:
ئاوازو هۆنراوەی: فۆلکلۆر — ئازاد کەریم
وتنی: ئازاد کەریم
ئامادەکردنی: توانا حمە خورشید

٤. کزەی شەماڵ:
ئاوازو هۆنراوەی: فۆلکلۆر
ئامادەکردنی: عادل حەسەن
وتنی: بەهرۆز بەنخەیی

## ژەنیارەکان:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١. ئازاد صالح | کەمان | ٩. دانا ئەبوبەکر | عود |
| ٢. عادل حەسەن | کەمان | ١٠. ئانگۆ ئازاد | جۆزە - دەف |
| ٣. هێمن عوسمان | کەمان | ١١. بەختیار عەبدوڵا | باڵەبان - دەف |
| ٤. ئەحمەد کەریم | کەمان | ١٢. عزیز حمە کەریم | چەلۆ |
| ٥. ڕزگار فەرەج | کەمان | ١٣. یاسین احمد ئەمین | شمشاڵ |
| ٦. ئاری عەبدوڵا | کەمان | ١٤. توانا ئەبوبەکر | [illegible] |
| ٧. دڵسۆز عوسمان | [illegible] | ١٥. [illegible] ڕۆستەم | زەربە |
| ٨. [illegible] کەریم | ساز | ١٦. [illegible] عەبدوڵا | سایزەر |











## یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان

لەژێر دروشمی

**ڕەوو هونەرێکی ڕەسەنو هاوچەرخ**

دووەمین فێستڤاڵی مۆسیقای کوردی

### تیپی مۆسیقای شنروێ



بەرواری ٢٤/٢/٢٠٠٥ – سلێمانی - هۆڵی سلێمانی

**پەیڤێک:**

هونەر خۆی بۆ خۆی مەودایەکە بۆ سەوداکانی داهێنان، چرکەیەکە لە ساتە وەختەکانی هزرو، سازدانی ڕۆحە بۆ عەشقە سەرمەدییەکانی ژیان. ئەدی خۆ هەر هونەرە بۆتە خولیای هەزاران بیرمەندو فەیلەسوفو هونەرمەندی ئەم سەرزەمینە، بەهەموو قۆناغە جیاجیاکانی مێژوووەوە، جما مۆسیقا .... کەموەک هونەرێکی سەربەخۆ بۆ خۆی هەموو بوارەکانی ژیانی داگیر کردووە خۆی سەپاندووە بەسەر هەموو سۆزەکانماندا...... !!

گیانمان بۆتە گۆیلەی ... ژیانمان بۆتە ئالودەی .

ئای.. ئەوە چ سیحرێکە ئەو کاتینە نادیارو دیارە ... نادیار بە سیحرەکەی دیار بە نەغمەکانی هەموومانی کردۆتە عەشقی خۆی.

وا ئێمەش دەچینەوە لای کلتوورو بە شێوازێکی نوێو بە بۆچوونێکی نوێو یەکەم بە هەڵوەشاندنی .. دووەم بە پێداچوونەوەی .. سێهەم بە بوونیات نانەوەی.. لە شێوازێکی جیاواز ... جیاواز لەو مانایەی کە هەیبووە، جیاواز لەو دارشتنەی کە هەیبووە....

بۆ ئەوەی بتوانین لە کۆن نوێ دروست بکەین.. کۆنیش لە فەوتان ڕزگار بکەین .. بۆ ئەوەی ئەو نەغمانەی کە هەیبووە ... ڕستەی نوێ داڕێژینەوە . لەو شیعرانەش کە هەیبووە مانای نوێ دابهێنینەوە. ئەدی ناکرێت ؟ ... بۆ !!!

« تیپی مۆسیقای شنروێ »

## بەشداری کردن لە یادی کیمیابارنکردنی هەڵەبجە لە ساڵی ٢٠٠٥ دا

هەر لەو ساڵەدا واتە (٢٠٠٥) و لە یادی هەڵەبجە لە ١٦ ی ٣ بەشداربووین لە هۆڵی ئەحمەد موختار جاف و ئەمجارە هۆشیار حەمە فەرەج هاتبووەوە و ویستم هەندێ گۆرانی بێژی ناسراو بەشدار بێت، ئەو کاتە هونەرمەند کاک ناسری ڕەزازی ماڵی لە دوکان بوو، تەلەفۆنەکەیم لە کاک سابیر کوردستانی وەرگرت و تەلەفۆنم بۆ کرد کە بەشدار بێت و وتی بە ئەرکی خۆمی ئەزانم و بەشدار ئەبم و تەنها ڕۆژێک هات بۆ پرۆڤە کردن و هەندێ کارمان بۆ ئامادە کرد و دوای ئەویش تەلەفۆنم بۆ هونەرمەندی کۆچ کردو حەمە جەزا کرد، بیرم دێت وتی بە خوا سیحەتم تەواو نییە و سەردانی نەخۆشخانە ئەکەم، بۆی نەکرا بەشداربێت.

بەرهەمەکان بەم شێوەیە بوون:

١.(پرسەی گەلا) ئاوازو ئامادەکردنی عادل حەسەن ، هۆنراوەی: ئەحمەد محەمەد و حەسەن هەڵەبجەیی، وتنی :سارا محەمەد عەلی و لوقمان سەلیم

٢.(میوان)هۆنراوەی: سیروان محەمەد ڕەشید ، ئامادە کردن: عادل حەسەن، ئاوازو وتنی هۆشیار حەمە فەرەج

٣.(ناڵەی بولبول) هۆنراوەی: ڕازی ، ئاوازو وتنی : سابیر کوردستانی

٤.(پە پوولەی نازەنین)هۆنراوەی : حەکیم مە لا ساڵح، ئاوازی: ئازاد ساڵح، وتنی: شیلان عوسمان

٥.هونەرمەند ناسری رەزازی، ئەم بەرهەمانەی خوێند (دنیا خەمە، تاسەبار، بارگەی خەم)

هەر لە هاوینی ئەو ساڵەدا کاک هۆشیار حەمە فەرەج هاتبوەوە و وتی سەرەتای ئاوازیکێم داناوە با بۆت بڵێم، پێکەوە چووینە یانەیەک و پێکەوە دوو بەدوو دانیشتین و وتی هۆنراوەکەی (هێمن لەتیف)ە بە ناوی (تا نەڕۆشتی نەم ئەزانی) ئیتر بۆی وتم و منیش هەندێ تێبینم دایە و دوای چەند ڕۆژێک دای بە خەلیل عەبدولا و بۆی ئامادەکرد و ئێمەش من بووم، عادل بوو، خەلیل خۆی عودو جۆزەشی دەژەند و لە تیپی خۆمان کاک عومەر عەبدولا بۆی تۆمار کردین و ئاوازێکی تری دانا بوو بە ناوی(میوان) ئەویش عادل بۆی ئامادە کردو تەلەفزیونی پەروەردە بۆی وێنە گرت و دوایی هۆشیار خۆی لە بەرنامەیەک

گۆرانییەکەی لە تەلەفزیۆنی کوردسات وێنە گرت و دەنگێکی باشی دایەوە و تا ئێستاش دەوترێتەوە.




بەرهەمەکان:-

١-( پرسەی گەلا ) ئاوازو ئامادەکردنی: عادل حسن
هۆنراوەی : احمد محمد
وتنی : سارە محمد علی
لوقمان سلیم

٢-( میوان ) ئاوازو ووتنی هوشیار حمە فرج
هۆنراوەی سیروان حمە رشید
ئامادەکردنی عادل حسن

٣-( نالەی بولبول ) ئاوازو ووتنی : سابیر کوردستانی
هۆنراوەی : رازی
ئامادەکردنی : مستەفا رەنجەرۆ

٤-( گۆرانی پەپولە ) ئاوازو ئامادەکردنی : ئازاد صالح
هۆنراوەی : حکیم مەلا صالح
ووتنی : شیلان عوسمان

٥-( سۆزێك بۆ هەڵەبجە ) لەلایەن میوانی خۆشەویستی شارەکەمان هونەرمەند
( ناصری رەزازی )
آ-دنیا خەمە
ب-تاسەبار
ج-بارگەی غەم

ژەنیارەکان :-

| ناو | ئامێر | ناو | ئامێر |
|---|---|---|---|
| ١-ئازاد صالح | کەمان | ٢-عادل حسن | کەمان |
| ٣-رزگار فرج | کەمان | ٤-ئاری عبداللە | کەمان |
| ٥-دڵسۆز عوسمان | سەنتور | ٦-فوئاد کریم | ساز |
| ٧-دانا ئەبوبەکر | عود | ٨-توانا ئەبوبەکر | فلوت ـ نای |
| ٩-مارف علی | کلارنێت | ١٠-عزیز حمە کریم | چەلۆ |
| ١١-عمر عبداللە | چەلۆ | ١٢-تانگۆ ئازاد | جۆزە |
| ١٣-نەوزاد عبداللە | دەف | ١٤-ئەرکان رۆستەم | زەرب |

کۆرسی کچان
١-تریفە احمد
٢-دەرون عمر
٣-شیلان غریب
٤-سارە محمد علی
٥-دیلمان اسماعیل

کۆرسی کوران :
١-زانا محمود
٢-بـروا بوار
٣-زانیار حمە کریم
٤-پێشرەو نجم الدین
٥-دارا علی
٦-راستگۆ ئـازاد

- سوپاس بۆ ئامادەیی بازرگانی کچـــان.
- هەموو ئەو لایەنانەی هاوکاریان کردین.

## هەوڵێکی سەرنەکەوتوو بۆ بەشداری کردن لە ڤیستیڤاڵی کلتوری لە ئەڵمانیا

هەر هەمان ساڵ واتە (٢٠٠٥) هاوڕێیەکمان لە شاری کۆلن لە ئەڵمانیا وەڵامی بۆ ناردین کە سەفەرێک هەیە بۆ شاری (کۆڵن)کە بەشداری بکەین لە ڤیستیڤالی کلتووری ئێرانی ـ ئەڵمانی لە ١٨ی مانگی نۆڤەمبەری ئەو ساڵەدا، ئەویش کاک دڵشاد عومەر کاکی بوو و هەوڵێکی زۆری لەگەڵداین و ماندووبوو، ڕۆژانە تەلەفۆنی بۆ ئەکردین و ڕێنیشاندەرمان بوو، ئەو کاتە سەفارەتی ئەڵمانیا لە عێراق نەبوو، ئەبوایە بچووینایەتە تورکیا بۆ ڤیزە وەرگرتن.

ئەوەی شایانی باسە ئەندامەکانمان زۆر بوو بریتی بوون لە ١٩ کەس، پارەی زۆری دەویست زۆر هەوڵماندا بە هۆی زۆر لە ئەندامان لەوانە کاک ئازاد کەریم هەوڵی زۆری دا، بەڵام بێ سوود بوو، من لە هاوینی ئەو ساڵەدا ببووم بە بەڕێوەبەری ڕۆشنبیری هەڵەبجە و سەردانی وەزیرو بەڕێوەبەری گشتی ڕۆشنبیری کە ئەو کاتە حاکم فە رهاد بوو، بە هۆی ئەوەی ماوەیەک لە ئیدارەی گشتی ژمێریار بووم و ڕەوان شاد بایز تاڵە بانی و کاک عوسمان شوانیم لە نزیکەوە ئەناسی و منیان خۆش ئەویست لەگەڵ کاک سەلاحە ڕەش، کە ئەویش بە هۆی هاوڕێیەتی لەگەڵ دڵشاد لە سەفەرەکە بەشداربوو، چووین بۆ لای کاک فەتاح زاخۆیی و ئەویش وتی بودجەی وەزارەتی ڕۆشنبیری بەش ناکات، دوای ئەوە ڕۆژێکیان فوئادی سازم لەگەڵ بوو پێکەوە چووین بۆ لای وەزیری دارایی کاک بایز تاڵەبانی و من چوومە ژوورەوەو بە ڕێکەوت کاک عوسمان شوانیش لەوێ بوو، ئیتر بۆم باس کردن و وتیان دڵت ناشکێنین و ڕەزامەندییان نیشان دا لەسەر خەرجکردنی بڕیکی زۆر لە پارە و من ئەو کاتە دەوامم هەبوو لە هەڵەبجە وچەند کەسێک چوون بۆ گەنجینە، لەوانە شیلان عوسمان و فوئاد، پارەیان وەرگرت و ئامادە بووین بۆ سەفەر، منیش بۆ ئەوەی تووشی قسە و قسەڵۆک نەبم و پارەکەم دابەش کرد بە سەر سێ کەسدا، لەوانە توانا خورشید و ئەرکان و فوئاد، یانی من تەنانەت ڕوژانە وەک ئەوان پارەم وەرنەگرت، من ئاوا بووم بۆ خۆم، هەوڵی من بۆ ئەوەی هەموو کەس وەک یەک هەستی پێبکات، تەنانەت زۆربەی ئەندامان بە خۆشمەوە پەساپۆرتمان نەبوو، چوومە لای کاک حەمەی فەرەج کە زۆر ڕێزی ئەگرتم و نامەیەکی دامێ بۆ فەرمانگەی پەساپۆرت بەو قەرەباڵغییە بە ڕۆژێک ئەوەی پەساپۆرتی نەبوو، دەرمان کرد کە لە دە کەس

زیاتر بوون، ئیتر شەوێکیان پاسمان گرت و بلیتی فڕۆکەمان کڕی کە ئەو کاتە نرخی بلیت زۆر گران بوو نزیکەی (پانزە هەزارو دووسەد دۆلار، واتە دەفتەرێک و پەنجاو دوو وەرەقە)دۆلارمان دا بە بلیت، پاشان لە هەولێر سواری فڕۆکە بووین من یەکە م جارم بوو سواری فڕۆکە ببم، چووینە بەغدادو لەوێش بە فرۆکەیەکی تر چووینە ئەستەنبوڵ و ئەبوایە بگەشتینایەتە ئەنقەرە و کاک دڵشاد دەلیلی بۆ پەیدا کردبووین وهات بۆ لامان بۆ فرۆکەخانە و دوایش هەر ئەو شەوە چووین بۆ ئەنقەرە و بۆ هەمان شەو دڵشاد پارێزەرێکی ئەڵمانی لە ئەڵمانیاوە گەیاندە ئوتێلەکەمان بۆ ئەوەی کاری سەفەرەکەمان بۆ ئاسان بکات و بۆ سبەی بەیانی زوو من و توانا خورشیدو ئەو پارێزەرە ئەڵمانییە چووین بۆ سەفارەتی ئەڵمانیا لە ئەنقەرە و خەڵکێکی زۆری لێبوو یەکسەر ئەو چووەژوورە و پاش نیو سەعاتیک هاتە دەرەوە و وتی ناوەکانم داوە بە سەفارەت و بەڵکو ڤیزەتان بدەنێ و بۆ ڕۆژی دوایی چەند کەسێکی تر چووینە لای (بە هرۆز گەلالی) کە من بووم، عەزیز بوو و توانا خورشید و سکرتێرەیەکی ئافرەتی تورکی لێبوو دوای ئەوە خۆشی هات، وتمان بەڵکو کار ئاسانیمان بۆ بکات بەلام پاش یەک دوو ڕۆژێک پارێزەرەکە  کە لە هوتێل شەو لەگەڵ من بوو لە ژوورێکدا وچووەوە بۆ سەفارەت و کە هاتەوە  وتی بە داخەوە ڤیزەتان پێ نەدرا، لەو کاتانەدا پارتی کرێکارانی کوردستان، چالاکی خۆپیشاندانی کردبوو، بۆیە ئەو سەفەرە سەری نەگرت بۆمان، ئیتر لە ئەنقەرەماینەوە بۆ ماوەی زیاتر لە دوو هەفتە وبەلام هوتێلەکەمان گران بوو، ناخۆشیش بوو، بۆیە بەیانیەکەی من و دانای ساز چووین بۆدەرەوە بە ڕێکەوت هۆتێلێکمان دۆزییەوە بە ناوی هۆتیل(مەدحەت)و من بە ئینگلیزی قسەم لەگەڵ پرسگەکە کردو و توانیمان بە نرخێکی گونجاو لەوێ بمێنینەوە و هۆتێلیکی چاکیش بوو و ئەو ماوەیە بۆ خۆمان ئەگەڕاین و بۆ ئێمە شتێکی نوێ بوو، ئەندامان دوو دوو سێ سێ پێکەوە ئەگەڕان و یادەوەری خۆشی تێدا بوو و شەوانە پێکەوە لە هۆتێلەکە قسەی خۆش و سوعبەت و بە سەرهاتی خۆش و پاشان بۆ ڕۆژانی دوایی چووینەوە ئەستەنبوڵ و پاش یەک دوو شەو گەڕاینەوە بۆ سلێمانی، ئەم سەفەرەمان لە ڕێکەوتی ١١تا ١١/٢٤ /٢٠٠٥ بوو و چەندین وێنەمان گرت ئەویش لەگەڵ پارێزەرەکە و ئەندامانداندا .

**Shnrwe musical team**

NO :

date:

**تیپی مۆزیکی شنروێ**

ژمارە : ت

بەروار : ٢٠٠٥/١٠/٢٥

### بۆ / لایەنە پەیوەندی دارەکان

سڵاوێکی هونەری

تیپی مۆسیقای شنروێ بانگهێشت کراوە بۆ بەشداریکردن لە فێستیڤاڵی تانتری ئێرانی-ئەڵمانی کە لەشاری کۆڵن ی ئەڵمانیا لە( ١٨ ) ی نۆڤەمبەری ئەمساڵدا ساز دەکرێت ژمارەی ئەندامانی بەشداربوو ( ١٩ ) ئەندامە بۆ ئاگاداری بەرێزتان.

| ژ | نــاوەکــان | ژەنیــاری | پـلە | ژمارەی پاسپۆرت |
|---|---|---|---|---|
| -١ | آزاد حمە صالح صابر | کەمانچە | سەرۆک تیپ | 1822196 |
| -٢ | عادل حسن حمە امین | کەمانچە | ئەندام | 0913010 |
| -٣ | توانا خورشید محمد | کەمانچە | ئەندام | 0151863 |
| -٤ | حمە عزیز حمە کریم | عود | ژمێریار | 1822222 |
| -٥ | توانا ابوبکر قادر | فلوت-شمشاڵ | ئەندام | 1822218 |
| -٦ | دانا ابو بکر قادر | سەنتور | ئەندام | 1822207 |
| -٧ | فواد کریم علی | ساز | ئەندام | 0912989 |
| -٨ | ارکان روستم توفیق | زەرب | ئەندام | 1822962 |
| -٩ | تانگۆ آزاد حمە صالح | دەهۆڵ | ئەندام | 1822190 |
| -١٠ | عمر عبدالله محمد | چەلۆ | ئەندام | 0913013 |
| -١١ | جنگین جمال علی | دایرە-دەف | ئەندام | 0913005 |
| -١٢ | اکرم حمە رشید احمد | گۆرانی بێژ | ئەندام | 1822189 |
| -١٣ | ئازاد کریم علی | گۆرانی بێژ | ئەندام | 1822223 |
| -١٤ | لقمان سلیم فتاح | گۆرانی بێژ | ئەندام | 0912987 |
| -١٥ | بهروز علی حمە رحیم | گۆرانی بێژ | ئەندام | 1822188 |
| -١٦ | شیلان عثمان عزیز | گۆرانی بێژ | ئەندام | 0913007 |
| -١٧ | کوچەر عمر عبدالله | گۆرانی بێژ | ئەندام | 0299068 |
| -١٨ | صلاح احمد رشید | شانۆکار | - | 1518362 |
| -١٩ | بی‌گەرد احمد رشید | شانۆکار | - | 1520389 |

دەستەی بەڕێوەبەری

تیپی مۆسیقای شنروێ



هۆتێل مدحت ئەنقەرە لەگەڵ پارێزەرە ئەڵمانیەکە




ئەنقەرە . چێشتخانەیەک .ئەکرەم . دانای ساز . ئازاد

## چالاکی هونەری ساڵی ۲۰۰٦

ئامادەکردنی بەرنامەیەکی هونەری بۆ کەناڵی کوردسات

لەو ساڵەدا توانیمان یەک چالاکی هونەری بکەین ئەویش بە هەوڵێکی زۆر و پەیوەندی بەردەوامم هەبوو لەگەڵ کاک ئیبراهیم ئەحمەد ئامادە کاری بەرنامەی (ئاوێنە)لە کەناڵی کوردسات، تا توانیمان بەرنامەیەک ساز بکەین بە پەخشی ڕاستەوخۆ لە شەوی ۲۰۰٦/۸/۳۱ و چەند گۆرانی و گۆرانیبێژمان ئامادەکرد و بۆ هەر یەک لە :

بەهرۆز بەڵخەیی

ئازاد کەریم

ئیسماعیل سابووری

ئەکرەم حەمە ڕەشید

دڵسۆز عوسمان کەیمنەیی

لەکاتی تەلەفۆن کردندا ئاراس شێخ جەمال و مەحمود ئەحمەد عبدالرحمن لە سویدەوە و کاک دڵشاد عومەر کاکی لە ئەڵمانیاوە قسەیان کرد دەربارەی ئەو بەرنامەو چالاکییە.



## ساڵی ٢٠٠٧ کاک عادل حەسەن بەرهەمێکی بۆ بەهرۆز بەڵخەیی ئامادەکرد

لەوانەیە بۆ هەموو کەس ئاشکرا بێت کە من ببومە هۆی درووست بوونی زۆربەی زۆری ئەو چالاکییانە و من لەو ساڵەدا کێشەی تایبەتی ژیانی خۆم هەبوو، هێندە نە ئەپەرژامە سەر هونەر و کەم کەم سەردانی تیپەکەم ئەکرد و هەندێ ئەندامیش باکیان نەبوو بە بوونی چالاکی تیپەکە، چونکە کاری تریان لە دەرەوەی تیپەکە ئەکرد و خەم سارد بوون، بیرم دێت کاک عادل وتی کاک بەهرۆز بەڵخەیی ئاوازێکی هەورامی هێناوە و حەز ئەکەم بە ناوی تیپەکەوە بێت، وتم بۆ نا چاکە ئیتر هەر خۆی و یەک دوو ئەندامی تیپەکە لە ستۆدیۆکەی کاک عومەری چەلۆ تۆماریان کرد و عادل بەشی بەرز بوونەوەکەی بۆ زیاد کرد و مۆزیکەکەشی ئامادەکرد، مانگی یانزەی ساڵی (٢٠٠٧)بوو کۆتایی پایز بوو پاسمان گرت و چووینە گوندی بەڵخە، چونکە یادەوەری کاک بەهرۆز بەڵخەیی تێدا بوو، بە ناو باخەکاندا چووینە خوارەوە لای تاڤگەی ئاوێک وێنەمان گرت وتا ئێوارە لەوێ ماینەوە و بۆ نیوەڕۆکەی عەزیز چوو بۆ تەوێڵەو یەکی لەفەیەک کەبابی بۆ هێناین و نانمان خوارد وجارجارەش شوێنەکەمان بۆ ئەگۆڕێ و زوو زوو دەچووین هەناری وردمان لێ دەکردەوە و کامێرامانەکە: کاک بڕیار فەتاح بوو، لەکۆتایی کە هاتینە سەرەوە وێنەیەکمان گرت، بە کامێرامانەکەم وت لە دوورەوەش وێنەی دێی بەڵخە بگرەو دوایش خستیە ناوگۆرانییەکە و پاش نیشاندانی لەهەموو تەلەفزیۆنەکان سەرکەوتنیکی باش و ناو بانگێکی باشی دەرکرد.



بەهرۆز بەڵخەیی

حسین نعمە وەک میوان لەوێ ئامادە بوو، بەڵام گۆرانی نەگوت

لەم ساڵەدا چالاکی هونەریمان زۆر کەم بووەوە، وردە وردە بەرەو پووکانەوە ئەچوو هۆکارەکان زۆرن چ لە رووی مادی و مەعنەوی بە تەنگەوە نەهاتنی زۆربەی ئەندامان، بۆیە من ئەو ساڵە بە شداریم نەکرد لە یادی شانزەی سێی ئەو ساڵە، بەڵام ئەندامانی تر بەبێ من بە شدارییان کرد، بۆیە هیچ یادەوەریەکم لە گەڵیدا نییە ئەوەی هەیە من لە یادەوەریمدا نووسیومەتەوە و بەم شێوەیە بووە کە من بەشدار نەبووم تێیدا، بەشداری کردن لە فێستیڤاڵی هەڵەبجەی شەهید ڕێکەوتی ٢٠٠٨/٣/١٦ بە هاوبەشی هونەرمەندان زاهیر جەلال و کاروان مەحمود و مەهابات عوسمان لە هۆڵی ئەحمەد موختار جاف لە هەڵەبجەی شەهید

١.(پرسەی گەڵا) هۆنراوەی: ئەحمەد محەمەد، ئاواز و ئامادەکردنی: عادل حەسەن. وتنی: کاروان مەحمود و مەهاباد عوسمان

٢.(لەم شارەدا) هۆنراوەی: جەوهەر کرمانج ، ئاوازی : عەزیز حەمە کەریم، وتنی: کاروان مەحمود و مەهاباد عوسمان

٣.(سێ فرمێسک) هۆنراوەی: سوارە قەڵادزێی، ئاوازی : ئازاد صالح، وتنی: زاهیر جەلال.

پاشان لە هاوینی هەمان ساڵ لە کەناڵی (الفیحاء) بۆ یادی دامەزراندنی کەناڵەکە لە هۆتێل (پالاس) چەند گۆرانییەکمان پێشکەش کردن و تیپێک لە (بەسرە)شەوە هاتبوون، ئەو شەوە هونەرمەندی ناسراو(حسین نعمە) وەک میوان لەوێ ئامادە بوو، بەڵام گۆرانی نەگوت.

هەر هەمان هاوین گۆرانی بێژ شاخەوان کەیخەسرەو لە هەندەران هاتبووەوە و ڕۆژیک لەبەردەم چاپخانەی الشعب دیم، زۆر لە زووە ئاوازێک لە ناخم هەبوو، چیرۆکی ئەم ئاوازە ئەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٧٠) کە ئەو کاتە نەچووبوومە دنیای مۆزیکەوە، هاوینەکەی باوکم: (ساڵحی مەلا سابیر) لە مەزادخانەی خوارەوەی سلێمانی تەسجیلیکی گۆرەندیکی گەورەی کڕیبوو، هێنایە ماڵەوە، زۆر دڵم پێی خۆشبوو، هەندێ شریتی بەکرەی لەگەڵ بوو کە دوو کەسی شارەزووری گۆرانی

به لەنجەیان ئەوت زۆر سەرسام بووم پێی، شیعرەکانی ئەوەی کە لە یادم بێت بەم شیوەیە بوو :

(ئای بە لەنجە بە لەنجە بە لەنجەکەی ئەو بەرۆ ...هۆ کچێ بە جێم مەهێڵە دوو ماچت هاوەسەرۆ/ ئای بە لەنجە بە لەنجە بەلەنجەم پێ نەماوە .....دوێکە لە ماڵی ناهی دەسرەکەم لێ جێماوە

ئای بە لە نجە بە لەنجە .........................

بە قوربانی تۆی ئە کەم گرێزەو کانی پانکە

بەکرەیەکی تر ئەم گۆرانییەی تیدا بوو، گۆرانییە کە باو بوو ئەو کاتە:

(ئەرێ یەزن کاکە یەزن شێخەکان بیپاریزن، فەتە ڕۆ برا ڕۆ)

دوای ئەوە هەندێ شریتی تری کڕی لەوانە دوو ئاوانەکەی ڕەفیق چالاک و ئای بۆ هەلامەی عوسمان کەیمنەیی و چەندینی تر، جار جاریش لە ماڵەوە باوکم گۆرانی سەید عەلی ئەسغەری بۆ ئەوتم و تۆماری ئەکرد.

ئەو کاتانە سەردانی خزم و کەسوکار زۆر بوو، هەفتەی جارێک یان ئێمە ئەچووین بۆ ماڵی حاجی عیزەت خاڵی باوکم یان ئەوان ئەهاتن. ئەو کاتە کاک شەوکەتی کوڕی لە کۆلێجی ئەندازە بوو شەوێکی هاوین بوو گۆرانی (نخل السماوة)ی حسین نعمەی وت و تۆماری کرد زۆر خۆش بوو لەلام، بەڵام وتی بۆ کەسی لێمەدەن، بەڵام من هەر جار جار بۆ خۆم گوێم لی ئەگرت.

بە هەر حاڵ شاخەوان ڕۆژێک هات بۆ تیپ و من دەستکاری ئەو گۆرانییەم کردو کۆپلەم بۆ زیاد کرد و دوایش ساڵانی هەشتاکان گۆرانییەکی ترم لە حەمە لامەرکەزی بیستبوو (هەلام هەلامە .... عەمرەکەمی کەنی) ئەو ڕۆژە عادلم بانگ کرد بۆ تیپ و وتم ئەم دوو گۆرانییەی بۆ ئامادە بکە، من بوارم نییە ئەویش تۆنی گۆرانیەکەی وەرگرت و وە شاخەوان ئامێریکی زەربی بە دیاری بۆ هینابووین.

لەماوەیەکی کەمدا عادل تۆماری کردو لەگەڵ سولۆی جۆزەکە، توانا خورشید خستیە سەری لای کاک عومەری چەلۆ و (ئاشتی) خێزانیشی بە سوپاسەوە بووە کۆرس وهۆنراوەکەشی کاک(دیار هەڵەبجەیی) هەندێ لەهۆنراوەکەی گۆڕی و سەردەمیانەی کرد، ئامادەبوو بۆ وێنەگرتن، شاخەوان کامێرامانێکی کەناڵی زاگرۆسی هێنا و وتی: تیپی هەڵپەڕکێ ئەهێنم بەڵام کەسی دەست نەکەوتبوو، ناچار خوشک و برای خۆی هێنا.

ڕۆژی ١٤/ ١١ /٢٠٠٨ بە پاس چووین بۆ باخەکانی گولان و کامێرامانەکە کە هەر ڕای ئەکرد کاتی وێنەی ئەگرت وئەیگوت ئەمە شێوازی تازەیە من گاڵتەم لێئەهات و بڕێکی زۆر پارەمان دایە و کاتێ مۆنتاجی کرد هیچ تەلەفزیۆنێک لێی وەرنەگرتین، تەنها کەناڵی جەماوەرنەبێت، زۆر لێی ئەدا و چووە ناو خەڵکەوە شاخەوان چەند تراکێکی تری تۆمار کردبوو، ئاکۆ عزیز بۆی کردبوو زۆر ئەکادیمی بوو، بەڵام بیرم دێت هەموو تۆمارگەکانی سلێمانی ئەوەی ئێمەیان زیاتر لێدەدا تا وایلێهات کاک فەرهەنگ غەفور لە هەولێر و ئاڤان عوسمان گەشتێکیان کردبوو بە ناو گۆرانییەکانی ناوچە جیاوازەکاندا، کۆتا گۆرانی، بەگۆرانی بەلەنجەی شاخەوان تەواوی دەکات.



شاخەوان کەیخەسرەو، کاتی وێنەگرتنی گۆرانی (ئای بەلەنجە ) لای باخەکانی گولان



کۆرسەکان

**چالاکی ساڵی ٢٠١٠**

**ئامادەکردنی بەرنامەیەک بۆ هونەرمەند سابیر کوردستانی**

زۆر دەمێ بوو ئەمانویست بەرنامەیەکی تایبەت بۆ هونەرمەند(سابیر کوردستانی) لە کەناڵی (کوردسات)سازبکەین، بۆ ئەم مەبەستەش پەیوەندیم کرد بە برای بەڕێز کاک (ئیبراهیم ئەحمەد)ەوە تا بەرنامەیەکی تایبەتمان بۆ بکات لە بەرنامەی (میلۆدی) بە ڕاستەوخۆ، ئەویش بە سوپاسەوە لە شەوی ٢٠١٠/١/٢٩ ئەو بەرنامەی بۆ سازکردین و تێدا چەند گۆرانییەکی وت کە زۆربەی ئاوازەکانی هی خۆی بوو، بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک پرۆڤەمان کردو توانیمان بەرنامەیەکی سەرکەوتووی بۆ بکەین و ئەوەی لە بیرم مابێت ئەم گۆرانیانەی تێدا وت :

١.گۆرانی (ئەمیرەگیان) لە ئاوازو هۆنراوەی سابیر کوردستانی و ئامادە کردنی مۆزیک (مستەفا ڕەنجەڕۆ) بوو.

٢.گۆرانی (بەڵێن بێ) لە ئاوازو هۆنراوەی سابیر کوردوستانی و ئامادە کردنی مۆزیک (سەباحی سەنتوور)بوو.

٣.گۆرانی (خۆم غەریبم)ئاوازو هۆنراوەی سابیر کوردستانی و ئامادە کردنی (سەباحی سەنتوور)بوو.
وە دوو گۆرانی تری وت لەبیرم نەماوە چی بوون .

**تۆمارکردنی چەند بەرهەمێک بۆ منالان**

هەرهەمان سال کە لە کۆتایی سالی (٢٠٠٩) ببومە لێپرسراوی (خانەی مۆزیکی منالان) چەندین فەرمانبەرم لەگەل بوون، لەوانە هونەرمەند بێستون گورجی، شوان سەعید، دێرین دلێر، فەرمانبەران: ئامانج ، سەرکەوت، توانا عەلی، نزار ژاژلەیی و عوسمان ڕەشید، لە ژنان: نازەنین ،ڤیان، میدیا ، فەرمانبەرێک بە ناوی روناک کە کچیکی دەنگ خۆشی هەبوو بە ناوی (ڤانیا) زۆربەی گۆرانیەکان بە دەنگی ئەو تۆمار کران. هەروەها چەند فەرمانبەرێکی تر کە ژمارەیان لە (٢٠)فەرمانبەر زیاتر ئەبوون، ئەو کاتە کاک (تاهیر عەبدولا) بەڕێوەبەری ڕۆشنبیری منالان بوو، یەکەمین چالاکیمان بوو، کاک بێستون تیپێکی منالانی درووست کردبوو سەر بە خانەی مۆزیکی منالان بوون، بۆ ئەم مەبەستەش چەند گۆرانییەکمان تۆمارکرد، لەڕۆژی ٢٠١٠/٣/٢٤ بەبۆنەی جەژنی نەورۆزەوە لە هۆلی ڕۆشنبیری نمایشمان کرد لەگەل بەرهەمی چەند هونەرمەندێکی تر کە فەرمانبەر بوون لام، لەوانە بێستون گۆرجی، شوان سەعید، دێرین دلێر، زانا ژاژلەیی، ئەم بەرهەمانە لە ستۆدیۆی (لاوە) کە هونەرمەند مامۆستا عومەری چەلۆ بۆی تۆمارکردین و (میکس و ئەڕەنج)ی بۆ هەموو ئەو بەرهەمانە کرد و بەرهەمەکانی بریتی بوون لەم گۆرانیانە :

| | ناوی گۆرانی | ئاوازو هۆنراوە | وتنی |
|---|---|---|---|
| ١ | ئێمە منالێن جوانین | ئازاد سالح | ڤانیا عەبدولا + کۆرس |
| ٢ | شنەی بای شەمال | ئازاد سالح | داستان لەتیف + کۆرس |
| ٣ | جەژنی منال | ئازاد سالح | ڤانیا عەبدولا + کۆرس |

١. هۆنراوەی گۆرانی : (ئێمە منالێن جوانین)
هۆنراوەو ئاوازی ئازاد سالح، تۆمارکردن و ئەرێنج کردنی (عومەر عەبدوڵا) (ستۆدیۆ لاوە)

ئێمە منالێن جوانین گوڵی باخچەی ژیانین
پرشنگی خۆری بەیانین ها ها ها
شنەو نەشئەی بای شەماڵین ها ها ها
خونچەی کراوەی گوڵین نەغمەی دەنگی بولبولین
ئێمە گوڵی نەوبەهاری ئەم دەشت و هەردەین
بۆنی گوڵاڵەو نێرگزی ئەم چیاو دۆڵەین
ئێمە نمەی بارانین خەندەین بزەین گۆرانین
ئێمە نەوەی پاشەڕۆژی ئەم کوردستانەین
چراومەشخەڵی ڕووناکی و بیری تازەین
با هەمووومان پێکەوە دەست بگرین بۆ پێشەوە
ئێمە منالێن جوانین گوڵی باخچەی ژیانین
پرشنگی خۆری بەیانین ها ها ها
شنەو نەشئەی بای شەماڵین ها ها ها
خونچەی کراوەی گوڵین نەغمەی دەنگی بولبولین

٢. هۆنراوەی گۆرانی (شنەی بای شەماڵ)، ئاوازو هۆنراوەی ئازاد سالح تۆمارکردن و ئەرێنج کردنی (عومەر عەبدوڵا) (ستۆدیۆ لاوە) وتنی: داستان لەتیف + کۆرس

کۆرس
شنەی بای شەماڵ شنە شنیەتی ئەمان لەنجێنێ
ئاوی کانیاویش پاراومان ئەکات ئەمان لاوێنێ
گۆرانی بێژ
ئێمەی منالێش چەشنی پەپولە باڵ ئەشەکێنین
بۆنی گوڵاڵە وهەڵاڵەی ڕەنگین ئەمان تاسێنی

کۆرس
شنەی بای شەماڵ شنە شنیەتی ئەمان لەنجێنێ
ئاوی کانیاویش پاراومان ئەکات ئەمان لاوێنێ
هاوڕێی گشتانین ئێمەی مناڵ
دەم بەپێکەنین وەک گوڵی ئاڵ
زیاتر لەجاران نازمان بکێشن
خەم و پەژارە لە دڵ لابەرن
تیشکی خۆری دەم بەیانین
نەوەی دواڕۆژی کوردستانین

کۆرس
شنەی بای شەماڵ شنە شنیەتی ئەمان لەنجێنێ
ئاوی کانیاویش پاراومان ئەکات ئەمان لاوێنێ

٣. هۆنراوەی گۆرانی (جەژنی مناڵ)

هۆنراوە و ئاوازی: ئازاد ساڵح، تۆمار کردنی دەنگ و ئەرێنج کردنی (عومەر عەبدوڵا) ستۆدیۆ (لاوە لە سلێمانی) وتنی: ڤانیا عەبدوڵا + کۆرس

ئەی مناڵانی ئەم جیهانە جەژنتان پیرۆز
شادی و ئازادی هیوامانە خۆشەویستی و سۆز
هەموو بە یەک دەنگ هاوار ئەکەین مژدەی ئازادیتان پێ ئەدەین
ئەی مناڵانی ئەم جیهانە ئەی مناڵانی ئەم جیهانە
ئەی مناڵانی ئەم جیهانە نەوەی دوا ڕۆژی مرۆڤانە
ئەی مناڵانی ئەم جیهانە نەوەی دوا ڕۆژی مرۆڤانە
هەڵئەپەڕین سەما ئەکەین خەمی کۆنمان بە با ئەدەین
دنیای شادی ئەهێنین بزەو خەندە ئەچێنین
ئەی مناڵانی ئەم جیهانە ئەی مناڵانی ئەم جیهانە

له ڕۆژی٤/١٠/٢٠١٠ له هۆڵی کۆمەڵەی هونەرەجوانەکانی کورد لە سلێمانی بەبۆنەی ڕۆژی جیهانی مۆزیکەوە بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری منداڵانی سلێمانی (کۆنسیرتی مۆزیک و گۆرانی منداڵان)ی ساز کرد بۆ خانەی خەبات و خانەی مۆزیک کە من لێپرسراوی بووم، تێدا چەند بەرهەمێک پیشکەش کران، ئەوەی پەیوەستە بە خانەی مۆزیکەوە کە چەند بەرهەمێک تێدا پێشکەش کران لەوانە :

| ژ | گۆرانی | ئاوازو هۆنراوە | وتنی |
|---|---|---|---|
| ١ | پارچە مۆزیکی کەتان | ئاوازی بێستون گورجی | ناوەکەیم بیرچۆتەوە |
| ٢ | گۆرانی پەڵە | هۆنراوەی کەمال میراوەلی. ئاوازی بێستون گورجی | کۆرس |
| ٣ | کـــەو | ئازاد ساڵح | ڕەنگین و دیبە |
| ٤ | ئێمە منداڵین جوانین | ئازاد ساڵح | کانی شوان |
| ٥ | پشیلە | هۆنراوە:سالار محەمەد | ناوەکەیم بیرچۆتەوە |
| ٦ | ناوی گۆرانییەکەم بیرچۆتەوە | ئاواز:عادل حەمە سەعید | سابات ئامانج |

ئەمەش هۆنراوەی گۆرانی (کـــەوە) کە لەو کۆنسێرتە پێشکەشکرا:

لە ستۆدیۆ (لاوە) تۆمار کراوە لای مامۆستا عومەری چەلۆ

کچ :

دایکە دایکە وا کەوەکەم پشیلە سوورەی ڕاونا

کەس نەیزانی بۆ کوێ چوو     هەتا توانی بۆی دەرچوو

پشیلە سوورە بە کوێیا چوو     ئەرزی دڕی بۆی دەرچوو

نەکەی نەکەی پشە سوورە ئازاری کەوم بدەی

کەوی من زۆر ئازایە   زیرەک و بە توانایە

کۆرس :

کەوی تۆ زۆر ئازایە زیرەک و بە توانایە

پشیلە سوورە بەکوێیا چوو     ئەرزی دڕی بۆی دەرچوو

دایک :

ڕۆڵە کچم ئەو کەوە جوانە بەردە لە کۆت دیلی قەفەس ڕزگاری کە

لێی گەڕی با ئازاد بێ     بۆ خۆی دەروونی شاد بێ

کەوی کچم بۆ کوێ چوو   بۆ ئاسمانی بەرین چوو

چالاکییەکانی خانەی خەبات

بەرهەمەکان

پارچەیەك مۆزیك بۆ پیانۆ — ئامادەکردنی : کاربین هیوا
پارچەیەك مۆزیکی تورکی — ئامادەو دابەشکردنی: احمد فائق
پارچە مۆزیکی (لە هێلانەی دڵی من) — ئامادەکردنی: احمد فائق
دابەشکردنی محمد طه
پارچە مۆزیکی (قەد نەدەی ئازاری گیانم) — ئامادەو دابەشکردنی: احمد فائق
پارچە مۆزیکی (دواین پیاوەکانی مۆهیکەنز) — ئامادەو دابەشکردنی: احمد فائق
پارچە مۆزیکی دەهۆڵی — ئامادەکردنی کارین هیوا
دابەشکردنی محمد طه

م ـ احمد فائق — ڕاهێنەری مۆزیك
م ـ ایبراهیم نجم الدین — ڕاهێنەری مۆزیك
محمد طه عبدالله — یاریدەدەری ڕاهێنەری مۆزیك

ژەنیارەکان

کارین هیوا عوسمان: پیانۆ — بژوێن طاهر : ایقاع
چێـــــوار کەریم : ایقاع — تابلۆ بێستون صابر: گیتار
عمــر عیماد حمید: گیتار — محمد کامیل محمد: گیتار
زریوە مصطفی عبداللە: کەمان+خشخاش — هەساو امیر عبداللە: کەمان+دف سنجار

چالاکییەکانی خانەی میوزیك

بەرهەمەکان

پارچەیەك مۆزیکی کەتان — ئاوازو دابەشکردن: بێستون گورجی

گۆرانی پەڵە — ئاوازو دابەشکردنی: بێستون گورجی
هۆنراوەی: کەمال میراودەلی — وتنی: کۆرس

گۆرانی کەو — ئاوازو دابەشکردن: ئازاد حەمە صالح
هۆنراوەی: ئازاد حەمە صالح — وتنی: ڕەنگین شەماڵ، دیبە عومەر

گۆرانی ئێمە منالی جوانین — ئاوازو دابەشکردن: ئازاد حەمە صالح
هۆنراوەی: ئازاد حەمە صالح — وتنی: کانی شوان

گۆرانی پشیلە — ئاوازو دابەشکردن: عادل حەمە سعید
هۆنراوەی : سالار محمد ابلاخی — وتنی: سابات ئامانج

## بەڕێوەبەرێتی رۆشنبیری هەڵەبجە ڕێزیان لێنام

ساڵی (٢٠١٠) برای بەڕێزم (ئیبراهیم هەورامانی)بەڕێوەبەری ڕۆشنبیری هەڵەبجە بوو، بڕیاری دا کە ڕێزلێنانێکی شایستەم بۆ ساز بکات لە ڕۆژی ٢٠١٠/١٢/٥ لە پای ماندوو بوون و خزمەتی مۆزیکی ناوچەی هەڵەبجەو شارەزوورو هەورامان، بۆ ئەم مەبەستەش ئەندامانی تیپی مۆزیکی شنرویَ چ وەک مۆزیکژەن چ وەک گۆرانی بێژ، ئامادەیی خۆیان نیشان دا کە لەگەڵ ڕێزلێنانەکە چەند بەرهەمێکی بەندە پێشکەش بکەن و گۆرانی بێژان کاک بەهرۆز بەڵخەیی و کاک ئازادە ڕەش یەکی چەند گۆرانییەکیان وت وخەڵکانێکی زۆر ئامادە بوون چ وەک کەس و کار لە دایکم و خۆشک و براکانم و کوڕەکانم و چەندین کەسایەتی هەڵەبجەو سلێمانی ئامادەبوون و چەند بەڕێزێک وتاریان خوێندەوە و ئەو کاتە کاک عەباس عەبدولڕەزاق بەڕێوەبەری گشتی ڕۆشنبیری سلێمانی بوو، مامۆستا گەزیزە عومەری نارد لە جیاتی خۆی وهەروەها کاک نیاز

نـوری نەقیبـی سـەندیکای هونەرمەنـدانی کوردسـتان و کـاک تـاهیر عەبـدوڵا بەڕێوەبەری ڕۆشنبیری منداڵان و کاک ئازاد تۆفیق وتارێکی خوێندەوە و چەندین کەسایەتی چەپکە گوڵیان پێشکەش کردم و کاک ئاسۆ بامۆکی، کاک ئاسۆ عەبدول لەتیفـی وەک نـوێنەری خـۆی نـاردبوو بـڕی (٥٠٠) دۆلاری پێشـکەش کـردم، بەڕێوەبەری ڕۆشـنبیریش مەدالیـایەکی زێڕینیـان پێشـکەش کـردم کە نـرخەکەی بـایی یەک ملیـۆن دینـار بـوو، کە وێـنەی خـۆمی تێـدا دروسـتکرابوو، هەروەهـا پاداشتی هەموو ئەندامانی تیپی مۆزیکیان کرد لەگەڵ نان خواردنی ئەندامان، ئەم مەراسیمەش لە هۆڵی ئەحمەد موختار جاف ئەنجام درا.

ئەوەی شایانی باسە من ئەو کاتە خەریکی نۆژەن کردنەوە خانوەکەم بووم لە سلێمانی و قەرزار بووم دوای ماوەیەکی کەم ئەو مەدالیا زێڕینەم فرۆشتەوە بە نرخێکی کەمتر بە هۆی قەرزەوە ئەو یادگارییەم لە دەستدا .




- ووتاری بەخێرهاتن
- کردنەوەی مەراسیم لەگەڵ سروودی ئەی رەقیب
- ووتاری بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیری هەڵەبجە
- ووتاری بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری و هونەر لە سلێمانی
- خوێندنەوەی ژیاننامەی هونەرمەند ( ئازاد حمە صالح )
- مەراسیمی رێزلێنان لە هونەرمەند ( ئازاد حمە صالح )
- ئاهەنگی گۆرانی و موزیك لە لایەن تیپی موزیکی شنرویٚ وە

## ئازاد حمە صالح ملا صابر

- لە سالی 1955 لەگەرەکی جولەکانی شاری هەڵەبجە لە دایك بووە.
- لەسالی 1961 خراوەتە بەر خوێندن و هەرسیٚ قۆناغی خوێندنی سەرەتایی ناوەندی . ئامادەیی لەشاری هەڵەبجە تەواو کردووە.
- لەسالی 1978 بڕوانامەی باکالۆریۆسی لە کۆلێژی کارگێری و ئابوری زانکۆی بەغدا بەدەست هێناوە.
- لەسالی 1973 ئاشنایەتی لەگەڵ هونەری موزیك پەیدا کردووە.
- لە 1973/4/26 ئەندامی دامەزرێنەری تیپی مۆسیقایی هەڵەبجە بووە.
- لە سالی 1980 تا ئێستە دامەزرێنەر و سەرۆکی تیپی موزیکی شنرویٚ یە.
- ئاوازی بۆ چەندین گۆرانی هونەرمەندان داناوە.
- ئێستاش فەرمانبەرە لە وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان.

## چالاکی ساڵی ٢٠١١

جەژنی نەورۆز و چەند چالاکییەک بۆ منداڵان

وەک ئەوەی لیپرسـراوی خـانەی مـۆزیکی منـاڵان بـووم هەسـتم بە بەرپرسیاریێتی ئەکرد بۆ ئەوەی کاروچالاکی هونەری گۆرانی و مۆزیکی مناڵان گەشە بکات و هەمیشە فەرمانبەرەکان وەک شانەیەکی هەنگ هاوکارم بوون، لەو فەرمانبەرانە کە توانایەکی هونەری گەر کەمیش بوایە هەمیشە هانم ئەدان بۆ ئەوەی ئاواز دانێن و برەو بە توانای هونەریان بدەن، وە لە مانگی ٤ی ئەم ساڵەدا وەک خانەی مۆزیک بە بۆنەی جەژنی نەورۆزەوە چالاکییەکی ترمان ئەنجام دا وەک خانەی مۆزیک کە سوودم لە قوتابیانی قوتابخانەی سەرچنار وەرگرت بۆ تۆمار کردن و ئەنجام دانی ئەو کۆنسێرتەومامۆستا عومەر عەبدوڵا چەلۆ خاوەنی ستۆدیۆ (لاوە) دەنگەکانی بۆ تۆمار کردین، کە من (٢) ئاوازی نوێم دانا تێدا بەم شێوەی خوارەوە:

| ژ | ناوی گۆرانی | ئاوازو هۆنراوە | ووتنی |
|---|---|---|---|
| ١ | سەیران | ئازاد ساڵح | سیڤان + کۆرس |
| ٢ | ساڵێکی نوێی خۆش | ئازاد ساڵح | ئاشتی عارف + کۆرس |

١.هۆنراوەی گۆرانی (سەیران)

کۆرس:

دەی وا وەرن ئەی مناڵان بچین بۆ گەشت و سەیران

با هەڵپەڕین و سەما کەین خەمی ڕابردوو بە با دەین

گۆرانی بێژ:

ئێمە کۆتری ئاشتی ژینین قاسپەی کەوی چیای بەفرینین

ئێمە بزەین ئێمە خەندەین بەستەو هەڵبەستی جوانین

کۆرس:

دەی وا وەرن ئەی مناڵان بچین بۆ گەشت و سەیران

با هەڵپەڕین و سەما کەین خەمی ڕابردوو بە با دەین

گۆرانی بێژ:

ئێمە گوڵی باخی ژینین پروشەی بەفری زیوینین

ئێمە نێرگزو وەنەوشەی     وەرزی بەهاری ساڵین

کۆرس:

دەی وا وەرن ئەی منالان     بچین بۆ گەشت و سەیران

با هەڵپەڕین و سەما کەین     خەمی ڕابردوو بە با دەین

کۆرس:

سەیرانمان خۆش بوو     گەشتی بەهەشت بوو

ڕۆژ تا ئێوارە     دەم بە پێکەنین

بەخۆشی و شادی     گەردن ئازادی

٢. هۆنراوەی گۆرانی (ساڵێکی نوێی خۆش)

کۆرس:

ساڵیکی نوێی خۆش     ساڵێکی نوێی خۆش

ساڵێکی نوێ ساڵێکی نوێ     ساڵێکی نوێی خۆش

باوک:

ڕۆڵەی شیرینم جگەر گۆشەکەم     تۆی ئاسودەیی بیرو هۆشەکەم

کاتێ کەدەنگی گڕوگاڵت دێ     ژێی هەست و نەستم هەمووی ئەبزوێ

کۆرس:

ساڵێکی نوێی خۆش     ساڵێکی نوێی خۆش

ساڵێکی نوێ، ساڵێکی نوێ     ساڵێکی نوێی خۆش

دایک :

وەرە باوەشم کۆرپەلەی دایە     بەدەنگی نەرم بۆت کەم لای لایە

تۆ تابلۆیەکی پڕسیحرو خەیاڵ     جیلوە و ئاوازی گڕوگاڵی ماڵ

کۆرس:

هەموو با پێکەوە گۆرانی بڵێێن     مۆمی ساڵێکی نوێ باداگیرسێنین

دنیای خۆشی خەیاڵ     پڕبێ لە گوڵی ئاڵ

ساڵێکی نوێی خۆش     ساڵێکی نوێی خۆش

happy berth day to you
happy berth day
Happy berth day to you

Happy berth day to you
Happy berth day

کۆرس :

سالّێکی نوێی خۆش
سالّێکی نوێ سالّێکی نوێ

سالّێکی نوێی خۆش
سالّێکی نوێی خۆش





## ڕێزلێنان بۆ هونەرمەند عوسمان کەیمنەیی

مانگی ٨ی هاوینی ساڵی (٢٠١١) بوو ئەو کاتە تەلەفزیۆنی (کە ی ئێن ئێن) چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ کاک عوسمان کەیمنەیی ئەکرد و بۆ ئەو مەبەستەش بەڕێزی منی دەست نیشان کردبوو کە قسە لە سەر کارە هونەرییەکانی بکەم، وێنەکانی ئەو لە باخی گشتی سلێمانی گیرابوو، منیش ئەو کاتە لێپرسراوی خانەی مۆزیک بووم لە گەڕەکی مامۆستایان نزیک مزگەوتی قازی محەمەد، کات نزیکەی ١٠ ی سەر لە بەیانی بوو، تەلەفۆنێکم بۆ هات لە پێشکەش کاری بەرنامەکەوە کە بتوانم دەربارەی کەسایەتی هونەری بدوێم وپاش کات ژمێرێک کامێرامانێک و پێشکەش کارەکە هاتن بۆ فەرمانگەکە منیش ماوەی چارەکە کاتژمێرێک لەسەر کارەکانی و توانای هونەری دوام، دوای نزیکەی ١٠ رۆژێک بەرنامەکە پێشکەشکراو پەخشکرا، لەو بەرنامەدا بەڕێکەوت کاک مەلا بەختیار بەرنامەکەی دیبوو کە تێدا باسی ژیان و گوزەرانی خۆی کردبوو، کاک عوسمان کە لە هەڵەبجە بوو لە فەرمانگەی ئاو کارمەند بوو من جار جار ئەمدی ئەچوو بۆ لای بیرە ئیرتیوازیەکەی شەهیدان دەوامی ئەکرد و بە بڕێک پارەی خانەنشینی کەم گوزەرانی ئەکرد، لە ساڵانی نەوەدەکاندا یەکێتی هونەرمەندان مانگی بڕێک پارەی وەک ڕێزلێنان بۆ هەندێ هونەرمەند تەرخان کردبوو کە مێژوویەکی هونەریان هەبوو منیش یەکێک بووم لەوانە، ئیتر کاک عوسمان لەو بەرنامەیە باسی ئەوەی کردبوو کە ڕێزلێنانێکی هەبووە ئەوەشیان بڕیوە، بۆ بەیانی ئەو شەوەی دوای پەخش کردنی بەرنامەکە سکرتێری کاک بەختیار تەلەفۆنی بۆکردم کە ئێوارە کات ژمێر ٤ بچین بۆ لای، منیش بە دوو ئەندامی (تیپی مۆسیقای شنرویێ)م وت کە لەگەڵم ئامادە بن، ئەوانیش (کاک عادل حەسەن و توانا ئەبوبەکر) بوون وهەروەها تەلەفۆنیش بۆ کوڕی کاک عوسمان کرابوو، عەسرەکەی چووین بۆ نوسینگەکەی و کاک عوسمان هەموو کوڕەکانی لەگەڵ خۆی هێنابوو وەک موختارو دڵسۆزو ئەوانی تر، کاک نیاز نوریش وەک نەقیبی سەندیکای هونەرمەندان ئامادە بوو، کاک عوسمان و کوڕەکانی گلەیی زۆریان کرد و ئەویش بە سنگ فراوانیەوە ڕەخنەکانی وەرگرت و کە چووینە لای و تەوقەم لەگەڵ مەلا بەختیار کرد وتی

کاک ئازاد (تۆ جارێ بەبەرتەوە ماوە ڕێزلێنانت بۆ بکەین)، دوای گفتۆگۆیەک بۆ ماوەی کاتژمێرێک، من بە مەلا بەختیارم وت بەڵکو پەیکەرێکیشی بۆ درووست بکەن، وتی باشە، لەوێدا دیارییەکی گرانبەهای پێشکەش بە کاک عوسمان کردو و مانگانە بڕێک مووچەی بۆ بڕییەوە ئیتر نازانم تاکەی بەردەوام بوو، بۆ تیپی ئێمەش وتی هەمووتان جل و بەرگی یەکپۆش دروستبکەن، بڕێک پارەی بۆ تەرخان کردین بۆ کڕینی جل و بەرگ .. ئەرکی ئەنجام دانی ئەو ڕێزلێنان و کۆنسێرتەی خستە ئەستۆی (بنکەی ڕوناکبیری گەلاوێژ)و (سەندیکای هونەرمەندان) ئەم ڕێزلێنانە ڕەوانشاد (ئاسۆ سوارە) سەرپەرشتی کرد، کاک ئەیوب ڕۆستەمیش وەک ڕۆشنبیرێکی هەورامان هاوکاری کرد، عەسرێکیان من و کاک ئاسۆ و کاک ئەیوب و دڵسۆزی کوڕی کاک عوسمان بە پیکابێکی دەبڵی کاک ئەیوب کە کوڕەکەی شۆفێری ئەکرد چووین بۆ تەوێڵە بۆ ئەوەی لەوێ ئەنجامی بدەین و شوێنمان دیاری کرد، بەڵام پاش ماوەیەک شوێنەکەیان گۆڕی بۆ ناحیەی بیارە و پەیکەرەکەش درا بەدرووست کردن ولە گۆڕەپانی بیارە لە ڕۆژی ٢٠١١/١٠/١٠ کۆنسێرتێکی شایستە ئەنجام درا و مەدالیای ڕێز لێنانی پێشکەش کرا، جەماوەرێکی زۆر هاتبوون چ لە هونەرمەندان چ لەکەسایەتییەکان و کاک بەختیارو خێزانەکەشی ئامادە بوون، هەروەها لە هەورامانی ئەودیویشەوە هەوادارانی هاتبوون و هاوڕێی کاک عوسمان، هونەرمەند کاک جەمیلیش هاتبوو کە پێکەوە لەساڵانی پێشتردا لەگەڵ کاک عوسمان چەندین شریتی گۆرانیان پڕکردۆتەوە، پەردەش لەسەر پەیکەرەکەی لادرا و کە دەکەویتە سەر پردەکەی بیارە، بەداخەوە دوای ماوەیەک کەسانی نەفس نزم پەیکەرەکەیان شێواندبوو، بەڵام خۆشبەختانە نۆژەن کرایەوە، وە ئێمەش وەک تیپی مۆسیقای شنروێ چەند گۆرانی بێژێکمان بردبوو لە تەک خۆماندا، لەوانە کاک بەهرۆز بەڵخەیی، قاسم هەورامی، دڵسۆزی کوڕی کاک عوسمان، شیلان عوسمان، نەجمەدین هەورامی و هەر یەکەی یەک دوو گۆرانییان وت، پێشکەش کاری مەراسیمەکە کاک ئەیوب ڕۆستەم بوو.

بنکەی روناکبیری
گەلاوێژ
بەهاوکاری
سەندیکای هونەرمەندانی کوردستان

عوسمان هۆرامی

دیزاین و کاری هونەری
سۆران نەقشبەندی

## ژیاننامەی هونەرمەند عوسمان هۆرامی

هونەرمەند عوسمان موئمین عەزیز
ناسراوە بەعوسمانی هۆرامی

هونەرمەند عوسمان هۆرامی ساڵی (1936) لەگوندی کێمنە کە دەکەوێتە هۆرامانی ئەودیو لەبنەماڵەیەکی هونەرپەروەر لەدایکبوە، ساڵی (1958) خێزانی پێکەوەناوە، لەبەر خراپیی بژێویی ژیانی نەخراوەتە بەر خوێندن، هونەرمەند دایک و مام و براو خاڵەکانی گۆرانیبێژبون، ئەویش لەسەرەتای تەمەنیەوە چوەتە ناو دونیای هونەری گۆرانییەوە. هەر لەتەمەنی منداڵیدا دەستیکردوە بەگۆرانی وتن ناوبانگێکی باشی بەدەستهێناوە، خزمەتێکی زۆری بەهونەری کوردی بەتایبەت هونەری ناوچەی هۆرامان کردوە، لەگەڵ زۆربەی گۆرانیبێژەکانی ئەو سەردەمە گۆرانیی وتوە چەندین کاسێتی تۆمارکراوی هەیە، ساڵی (1964) بۆ یەکەم جار لەئێزگەی کوردی کرماشان لەگەڵ چەند هونەرمەندێکی ناوچەی هۆرامان گۆرانیی تۆمارکردوە، ساڵی (1982) لەگەڵ تیپی مۆسیقای شنروێ چەند گۆرانییەکی تۆمار کردوە بۆ تەلەفیزیۆنی کەرکوک، ساڵی (1990) بەهاوکاریی تیپی مۆسیقای شاری سەقز کاسێتێکی تۆمارکردوە، چەندین خەڵاتی رێزلێنانی پێبەخشراوە.

بنکەی روناکبیری
گەلاوێژ
بەهاوکاری
سەندیکای هونەرمەندانی کوردستان

ئاهەنگی رێزلێنان
بۆ هونەرمەندی میللیی
ناوداری ناوچەی هەورامان

# عوسمان هۆرامی

بەرێوەدەبات
بیارە
10-10-2011
کات: 2:30 ی پاش نیوەرۆ

## پرۆگرامی رێورەسمی رێزلێنان

- پەردەلادان لەسەر پەیکەری هونەرمەند
- وتەی بەخێرهاتن
- وتاری بنکەی روناکبیریی گەلاوێژ
- بەخشینی خەڵاتی زێرین بەهونەرمەند
- وتەی بەرێز مەلا بەختیار
- وتاری میوانەکانی هەورامان - خۆرهەڵاتی کوردستان
- چەند گۆرانییەکی تایبەت بەرێورەسمەکە لەئامادەکردنی تیپی موزیکی شنروێ

## تیپی موزیکی شنروێ

| | |
|---|---|
| ئازاد حەمە ساڵح | کەمانچە |
| توانا خورشید | کەمانچە |
| عادل حەسەن | کەمانچە |
| زۆزگ ئەحمەد | کەمانچە |
| عومەر عەبدوڵڵا | چەلۆ |
| عەزیز حەمەکەریم | جنبوش |
| نیاز محەمەد | سەنتور |
| فوئاد کەریم | ساز |
| توانا ئەبوبەکر | نای |
| ئەرسەلان رۆستەم | عود |
| ئیبراهیم نەجمەدین | زەرب |
| ئانکۆ ئازاد | دەف |
| دڵسۆز عوسمان | گۆرانیبێژ |
| بەهرۆز عەلی | گۆرانیبێژ |
| نەجمەدین هەورامی | گۆرانیبێژ |
| قاسم عارف | گۆرانیبێژ |

بنکەی روناکبیری
گەلاوێژ
بەهاوکاری
سەندیکای هونەرمەندانی کوردستان

## سوپاس و پێزانین بۆ:

مەڵبەندی (٩) ی شارەزور

مەڵبەندی رۆشنبیریی هەورامان

تیپی موزیکی شنروێ

بەرێوەبەرایەتیی ناحیەو فەرمانگەکانی ناحیەی بیارە

## دیداری شیعری وەلی دێوانە لە سەیدسادق

ئێمە هەرچیمان پێکرابێت درێغیمان نەکردوە لە چەندین دیداری هونەری و ئەدەبی و کردنەوەی ڤیستیڤاڵەکان بەشداریمان کردوە و ئەرکی خۆمان بەجێهێناوە وە لە ڕێکەوتی ٢٠١١/١٠/٢٥ بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری هەڵەبجە و فەرمانگەی ڕۆشنبیری لە سەید سادق دیدارێکیان ساز کرد بۆ شاعیر وەلی دێوانە و خەسرەو جاف تێدا ئامادەبوو کە چەندین تابلۆی جوانی عەشقی دێوانەو شەمی کێشابوو، ئێمەش بەشداریمان کرد لەو دیدارەدا و دوو هونەرمەند بەشدار بوون لەوانە (تابلۆ ئومێد و ئەنجام عبدالواحد) کە چەند گۆرانییەکیان وت لە شیعرە جوانەکانی وەلی دیوانە وەک (یاران وەسیەتم، هەی شەمی شەوان، یاران لە جەرگم و چەند گۆرانییەکی تر.






## کۆنسێرتێک بۆ چوار گۆرانی بێژی تازه

له ڕێکەوتی ٢٠١١/١٢/٢٢ لەشاری هەڵەبجه کۆنسێرتێکمان ساز کرد بۆ چوار گۆرانی بێژی تازه پێگەیشتوو ئەوانیش (شانۆ کەمال، قاسم هەورامی، ماریا هەورامی، ئەنجام عبدالواحد) به سەرپەرشتی بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری هەڵەبجه که ئەو کاته ڕەوانشاد (شاهۆ حەمه فەرەج) بەڕێوەبەری بوو، ئەم نمایشه له هۆڵی ئەحمەد موختارجاف ئەنجام درا وەبەرهەمەکان بریتی بوون لەم گۆرانییانه:

| ژ | گۆرانی | ئاوازو هۆنراوه | وتنی |
|---|---|---|---|
| ١ | وەره قوربان | فۆلکلۆری کۆن | شانۆ کەمال |
| ٢ | گوڵستانی ڕۆح | عەدنان کەریم | ئەنجام عبدالواحد |
| ٣ | کەسەکەم | فۆلکلۆر | ماریا هەورامی |
| ٤ | کاڵێ بارمەکه | هۆشیار حەمه فەرەج | قاسم عارف هەورامی |
| ٥ | ئاگرێ دەبارێ | فۆلکلۆر | شانۆ کەمال |
| ٦ | ئاگریش بم | بەهجەت یەحیا | ئەنجام عبدالواحد |
| ٧ | کەتانه | فۆلکلۆر | ماریا هەورامی |
| ٨ | ئامان شیرین خانم | فۆلکلۆر | ماریا+شانۆ |
| ٩ | فەسڵی بەهار | ئازاد ساڵح | قاسم عارف |

ئەوەی لەو دەلیلەی خوارەوەدا هەیه هەندێ هەڵەی تێدایه و وردەکاریەکانی تریشی تێدا نووسراوه له ئاماده کردنی مۆزیک وهونەری و سەرپەرشتیاران.



له ڕێکەوتی ٢٠١١/١٢/٢٧ هەمان کۆنسێرت له هۆڵی بۆنەکانی هەڵەبجەی تازه دووباره کرایەوه و خەڵکانێکی زۆر ئامادە بوون و سەرکەوتنی بەدەست هێنا ئەمەش چەند وێنەیەک لەو دیمەنانە :





## شێركۆ بێكەس چەند شیعرێكی لە ڤیستیڤاڵی گەلاوێژ خوێندەوە

لەسەرەتای ساڵی (٢٠١٢) (بنكەی ڕووناكبیری گەلاوێژ) بەنیازبوون ڤیستیڤاڵی ساڵانەی خۆی ئەنجام بدات، بۆ ئەم مەستەش ڕەوانشاد كاك (ئاسۆ سوارە) پەیوەندی پێوەكردم وئێمەش دەستمان كرد بە پرۆڤەكردن، لە هۆڵی (تەوار). سەرلە بەیانی ڤیستیڤاڵەكە دەستی پێكرد كە چەندین نووسەرو شاعیر وڕۆشنبیر بەشداریان تێدا كرد. بیرم دێت كاك مەلا بەختیار وتەیەكی دوورو درێژی پێشكەشكرد و باسی بەهاری عەرەبی تێداكرد ، شاعیری گەورەی كورد شێركۆ بێكەسیش چەند شیعرێكی خوێندەوە، پاشان ئێمە وەك تیپی مۆزیكی شنروێ چەند بەرهەمێكمان پێشكەش كرد، چەند گۆرانی بێژێكمان لەگەڵ بوو لەوانە خاتوو (شیلان عوسمان) و (قاسم هەورامی) و (شانۆكەمال) تێیدا بەشداربوون.



## ئاهەنگی ڕۆژی منداڵان لەساڵی ٢٠١٢

لە ڕێکەوتی ٢٠١٢/٦/٦ بەبۆنەی ڕۆژی جیهانی منداڵانەوە لە پارکی ئازادی سلێمانی خانەی مۆزیکی منداڵان کە من سەرپەرشتیاری بووم، سەر لە ئێوارەکەی ئاهەنگێکی گۆرانی و مۆزیکمان ئەنجام دا کە کەس وکاری منداڵانی بەشداربوو جەماوەرێکی زۆر تێدا ئامادەبوون.








## ڕۆڵی کچان و ژنان لە بواری هونەردا لە هەڵەبجە

ڕۆڵی کچان و ژنان لە پێشخستنی بواری مۆزیک و شانۆ لە هەڵەبجە، دەست ئەکەم بە نوسینەوەی یادەوەرییەکانم لەگەڵ ڕۆڵی کچان و ژنان لە بواری مۆزیک تا بشتوانم شانۆ، ئەگەرچی شانۆکاری من نییە، بەڵام هێندەی ئاگاداربم ئەینوسمەوە، ئێمە لە ساڵی ١٩٧٣ تیپی مۆزیکی هەڵەبجەمان دامەزراند و چالاکی هونەریمان دەست پێکرد، لەو ساڵەدا هیچ کچێک بەشداری کاری هونەری لەگەڵ نەکردین، چونکە تازە تیپەکەمان دامەزراندبوو، وە کەس نەی ئەناسین و هەموومان هەرزەکار بووین، بۆ ساڵی ١٩٧٤ لە مانگی شوباتی ئەو ساڵەدا واتە مانگی دوو ئاهەنگێک و شانۆگەریەکمان ساز کرد، ئەبوایە شەوێکیش بۆ ژنان بوایە، لەو کچانەی هاتبوونە ئاهەنگەکە دوو کچ هاتنە سەر شانۆ وتیان حەز ئەکەین گۆرانی بڵێین بۆ شەوی ژنان و هەردووکیان ماڵیان لە گەڕەکی سەرا بوو و ئەو کاتە گەڕەکی سەرا و خانووی فەرمانبەران وەک گەڕەکی عەقاری سلێمانی وابوو، ئەو دوو کچە ئەسمەرێکی جوان و خانەدان (ئاوازی جەمالی ئەمین عەلی)

بــوو ئەوی تریشــیان لە بنەمــاڵەیەکی ناســراوی گەڕەکــی جولەکــان بــوو بە خۆشحاڵیەوە تا ئێستاش فاتمە خان لە ژیاندا ماوە، ڤیانی کچی حەمە پایدەر بوو، پێکەوە گۆرانییەکیان  وت (ئەی گەرمێنی خۆشە کوێستان) هەموو ژنان چەپڵەیان بۆ لێدەدان، من ئێستا هەست بەو ئازایەتی دایک و باوکە ئەکەم کە چەند ئازا بوون کچەکانیان گۆرانیان ئەوت و بوونەتە یادەوەری لای من کە بیاننووسمەوە، ئەوە یەکەمین جار نییە کچان گۆرانی بڵێن بەڵکو لەساڵانی پەنجاکاندا پەخشانی حاجی ئەمین صالح و پەری جەمال خەفاف لە باخەکەی

عەلە بەڕانی گۆرانی و سروودیان وتوە و قادر دیلان کەمانچەی بۆ ژەندوون و مامۆســتا ع شــەونم سەرپەرشــتی کــردووە و تەنــانەت ئــاوازی بــۆ چەنــد گــۆرانییەک دانــاوە، لەوانە (هــاتم هــاتم بەسەربەســتی هــاتم / نەم زانــی وا گــرژو پەستی بێ دەربەستی هاتم)و وە چەندینی تر، ئەو کاتە عومەر ڕەزا باوکی پۆلیس ئەبێت لە هەڵەبجە وە دوایش لە ناوەڕاستی ساڵانی پەنجاکان بێ پرسی مامۆستا ع ع شەونم تۆماری کرد لە ئێزگەی بەغدا. بابێمەوە سەر یادەوەریم، لە ساڵی ١٩٧٥ بە بۆنەی ئاش بە تاڵەوە هەموو کورد مەعنەویاتی ڕووخابوو، هیچ چالاکییەکی هونەریمــان نەبوو، بەڵام لە ســاڵی ١٩٧٦ هــاتینەوە ســەر خۆمــان بە هــۆی یەکێتــی ئافرەتانی عێراقەوە چەندین کچ هاتن بە پیریمــانەوە بە هــۆی ڕەوان شــاد (لەیــلای خــاڵە تۆفیــق) چەنــدین کــچ هــاتن بــوون بە کــۆرس و گــۆرانی بێــژ لەوانە پەروینــی وەســتا هاشــم، بــژاری دارای ئیســعاف، ڕۆشــنای خوشــکی، نــزیکەی هەشــت کــچ ئەبوون ناوەکانم لە یاد نییە، تا ساڵی ١٩٧٧ چەندین کچی تر بەشدار بــوون لەوانە بەهار حەمە سەعید وەلەساڵی ١٩٧٨ چەنــد کچێکــی تــر ئامــادە بــوون وەک دڵشــاد حەسەن گەلاڵی. پەیمان حەسەن گەلاڵــی . ســاڵی ١٩٧٩ کچەکــانی حەمەی ســۆفی، کەژاڵ و دوای ئەوە کچەکانی مامۆستا ماجد عەبــابەیلێی و خوشــکەکانی خــۆم و نیان وجوان پەیمان و دوای ئەوانیش کچەکانی حەمەشــەل: گۆنا ودوای ئــەوانیش کچەکانی حەمە پارە پیس وەک جوان وهتد .

لە ساڵەکانی هەشتاکان هەموو دراوسێکانمان بوون بە کۆرس وەک نەرمینــی حەمەی لاســلکی و نــازەی حەمەی ســابیری موزەمیــد و لە ســاڵی ١٩٨٢ شــیرینی حاجی بەکر زۆر حەزی ئەکرد بەشدار بێت لەگەڵمان بەڵام باوکی نەیهێشت.



جەژنی نەورۆزی ساڵی (١٩٥٧) ، کە پێش شۆڕشی (١٤)ی تەمووز پێی ئەوترا (جەژنی دارو درەخت).

ئەوەی مایکرۆفۆنەکەی پێیە (بەهرۆزی ئەحمەد بەگ)ە، گەنجێکی رۆشنفکری ئەو سەردەمە، کەپاشان لە سەیرانێکا لە ناوی بەنداوەکەی سیروانا خنکاو هەموو هەڵەبجە ماتەمینی بۆ گێرا (تەنانەت چایخانەکان تاماوەیەک گۆرانییان لێ نەئەدا).

کۆرسەکان:

کچەکان: جەمیلە، پەری جەمال خەفاف، ئەختەری مەحمودی سەراج، پەخشانی حاجی ئەمین، نەناسراو.

کورەکان (هاوتەمەن و هاورێیانی خوێندنم) : بابا، ئەنوەری حاجی حەمە کەریم، هیوا سەید ئەحمەد، خالد، فایەق سەعید، عومەر علی، مەحمود عەبدول رەحمان (شێخ عەلی).

تێبینی: ئەو ناوانەی کە لە سەر وێنەکە نوسراوە، خاڵە خالیدم بۆی ناردوم و ئەو ناوەکانی دەستنیشان کردوە.

## ئەو پیاوانەی ڕۆڵی ئافرەتیان دەدی

ئینجا با بێمە سەر شانۆ چەندین کچ بەشدارییان کرد چونکە پێش ئەو پیاو ڕۆڵی ئافرەتی ئەدی وەک کەمالی عومەر مەغدوور، یان سەروەتی حاجی کەریم کوردستانی یان سەباحی ئەحمەد چاوەش، بەڵام لە بیرم دێت ساڵی (١٩٦٨) ڕووناکی حەمەی لاسلکی لە قوتابخانەی حەمدون لە سەر دەستی مامۆستا تەها خەلیل ڕۆڵی دایکێکی بینی، ئیتر دوای ئەوە لە ساڵی (١٩٧٤) چومە کۆلێج و وێنەم لەگەڵ سعدون جابر و یاس خضر گرت خوشکەکەم نیان ئەو وێنەی نیشانی هاوڕێیانی دابوو فەوتان، دوای ئەوە لە ساڵی (١٩٧٩) ئاوازم بۆ منداڵان دانا نەخشینی جەلالی وەستا مەردان و کچێکی مامۆستا ماجید عەبابەیلێی ئەو گۆرانییەی وت کە یەکەمین ئاوازی من بوو بۆ منداڵان.

تەمەن ئەڕواو کات ئەڕوات هەر لەو ساڵانەدا کچەکانی بەشدار بوون لەگەڵمان وە تا ساڵی ١٩٨٠ تا ١٩٨٥ چەندین کچ بەشدار ئەبوون و ئەمانبردن بۆ چەندین ڤیستیڤاڵی هونەری لە شارەکانی سلێمانی و هەولێر دهۆک و بەغدا، وە لە ساڵی ١٩٨٤ و ١٩٨٥ ئۆپەرێتی سەوزە و ڕێوی لەپێستی شێردایە و کەزۆربەی ئاوازەکان من دامنا بوون بە هاوکاری ڕزگار سدیق، ئاراس شێخ جەمال و چەندین منداڵمان کۆکردەوە لە کوڕ وکچ بردمانە تەلەفزیۆنی کەرکوک لەوانەی بەشدار بوون لە بیرم بێت هەلالە و شیلان حامد، ئەلوەن کوێخا عەلی ولەیلا نوری و چەندینی تر، ڕەئوف عوسمان، چۆمان ئەحمەد و ڕزگار شەوکەت، وێنەکان و دیکۆرەکان ئەسغەر ڕەشید و ڕەجا مەحمەد و پاشان لە بەشدار بووانی کچ وەک شانۆ ئەوەی لە بیرم بێت پەیمانی بەکر وە نیهایەتی عوسمانی مام کەریم.

لە دوای ڕاپەڕنیشەوە چەندین کچی تر بەشدار بوون چ وەک گۆرانی وتن، چ کۆرس یان هەڵپەڕکێ لەوانە کۆچەر عومەر، تاڤگە تفەنگچی ، نەرمین عەبدول. پاشان گۆرانی بێژانی سلێمانی لە کچەکان: تارا ڕەسوڵ . نیان عبدالله، ئاشتی عارف. شیلان عوسمان، ماریا هەورامی. شانۆ کەمال. تابلۆ ئومێد. شانۆ ئامانج. یاد بەختیار. چەندینی تر

## چالاکی ساڵی ٢٠١٣

### یادی هەڵەبجە لەشاخی عەنەبی هەڵەبجە

چەند ڕۆژێکی مابوو بۆ یادی ٢٠١٣/٣/١٦ تەلەفزیۆنی کوردسات تەلەفۆنیان بۆ کردم کە لە شەوی ( ٣/١٦) لە شاخی عەنەب نزیک هەڵەبجە، کە مۆنمۆمێنتێکی تێدایە و بەرنامەیەک ساز بکەین بۆ ئەو یادە، بەڕێکەوت هۆشیاری حەمەفەرەج لە هەندەران هاتبووەوە، پاشان گۆرانیبێژ (هێدی قادر) ئەوەی کە بۆ یەکەمین جار لاوانەوەی (بەتەنیا جێم مەهێڵن)ی گوتووە لە ساڵی (١٩٩٢) و مامۆستا ئەنوەر قەرەداغی مۆسیقاکەی ئامادە کردووە بۆی، هەروەها کچێکی ڕۆژهەڵاتیشمان لەگەڵ بەشدار بووبە ناوی (نێرگز) لەگەڵ چەند مۆزیک ژەنێک، وە ئەو بەرنامەیە ڕاستەوخۆ بوو، ئێمە لە دەرەوەی ستۆدیۆ واتە لە شاخی عەنەب، هەروەها لە ناو ستۆدیۆی کوردسات (تاراجاف) بە خۆی و ئامێری (چەنگ .القیثارة) چەند بەرهەمێکی پێشکەش کرد، ناو بەناویش هەندێ کەس گفتوگۆی لەگەڵ ئەکرا لەوانە (دانا هەڵەبجەیی و بەختیاری عومەری خەزان) ئێمە بۆ ئێوارەکەی کاتژمێر هەشتی شەو بەرنامەکەمان دەستی پێکرد، بەڵام لە سەر لە بەیانیەکەی (گروپی کامکاران) هەروەها (عەدنان کەریم)یش چەند بەرهەمێکیان پێشکەش کرد، ئەمەش چەند وێنەیەکی ئەو یادەیە:



## ڤیستیڤاڵێکی نێونەتەوەیی بۆ نەورۆز

لە نەورۆزی هەمـــان ســـاڵ لە ڕۆژی ٢٠١٣/٣/٢٠ بەڕێوەبـــەریتی گشـــتی ڕۆشنبیری و هونەری سلێمانی ڤیستیڤاڵێکی گەورەی نێو نەتەوەیی ساز کرد لە سلێمانی و چەندین گروپ بەشداریان کرد تێیدا، ئێمەش بەشدار بووین لەسەر ستێجێک لە شەقامی سالم لە سەهۆڵەکە و چەندین گۆرانی بێژمان لەگەڵ بوو لەوانە (بیـژەن جەزا . ئەنجام عبدالواحد . شەهرەیار) لە (دەلیل)ی چالاکیەکاندا نـاوی ئەو گـروپ و تیـپە هونەریـانەی تێدا نوسـراوە کە بەشداریان کـردوە لەو ڕۆژەدا و بەڕای مـن یـادی نەورۆزی ئەو ســاڵە یـادێکی زۆر شارســتانی و پێشکەوتووانە بوو، کە لە چەندین وڵاتەوە بە چەندین گروپ بەشداریان تێدا کرد.





چالاکیەکانی شەشەمین فیستیڤالی نەورۆز

سەعات چواری ئێوارە هەموو ستێجەکان بە سروودی نەورۆز دەستپێدەکەن

1 - ڕێوڕەوێک لە باخی گشتیەوە بۆ بەردەم ئاگری نەورۆز لە سەهۆڵەکە

2 - بەردەم باخی گشتی - بەڕێوەبەرێتی هونەری شێوەکاری :

- دروستکردنی پەیکەر بە ڕاستەوخۆ

3 - ستێجی بەڕێوەبەرێتی چالاکی قوتابخانەو خوێندنگاکان - بەردەم چالاکی قوتابخانەکان

سروودو گۆرانی و مۆزیک هەڵپەڕکێ شانۆ شێوەکاری نمایشی جۆراو جۆر

4 - ستێجی بەڕێوەبەرێتی کەلەپوور ( پارکی ئازادی ) :

- گروپی مۆزیکی بەڕێوەبەرێتی

- گروپی هەڵپەڕکێی ڕۆژئاوای کوردستان

- گروپی مۆزیکی میللی

- گروپی هەڵپەڕکێی سلێمانی

- گروپی مۆزیکی ڕۆناو ڕۆژهەلات

- گروپی کۆمەڵەی میللی

- ساڵنامەی نەورۆز

- نمایشی جل وبەرگ

- نمایشی فۆلکلۆری

5 - سەر ئەندەر باسی ڕەوف بەگ : ستێجی بەڕێوەبەرێتی سەنتەرەکان :

- گروپی مۆزیکی هونەرمەندانی میللی ( ئەفسانە )

- گروپی مۆسیقای سەنتەری گمۆ

6 - ستێجی لای ژووری بازرگانی : بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری گەرمیان ئاهەنگی کلتووری گەلان

- تیپەکانی فۆلک دانسی میوان - تیپی میللیە نەتەوەییەکانی کوردستان ( 19 ) گروپ

- پۆلۆنیا 3 گروپ - هەنگاریا - ئامەد - ئێران - ئوردون - تاجاکستان - چیک - سلۆڤاکیا - جورجیا - ئۆکرانیا - سوریا - بصرە - هندستان - مەکسیک - دهۆک - هەولێر - سلێمانی

7 - گەلەری مۆزەخانە : بەڕێوەبەرێتی هونەری شێوەکاری :

- پیشانگەی شێوەکارانی سلێمانی

- پیشانگای فۆتۆگرافی بەردەم مۆزەخانە

- پیشانگای فۆتۆگرافی شێر ئەندەر پاس

8 - ستێجی سەنتەر لە سەهۆڵەکە

- تیپی مۆسیقای شنروێ

- گروپی هیڤی بەڕێوەبەرێتی هونەرەکانی مۆزیک

- تیپی میللی بەڕێوەبەرێتی هونەرەکانی مۆزیک

- گروپی هەڵپەڕکێی تیپی میللی نەتەوەیی

- گروپی مۆزیکی سەنتەری ئابلو

- دوبارە بوونەوەی چەند گروپێکی کەلتووری گەلان و تیپەکانی ستێجەکانی تر

9 - چاپخانەی شەعب :

- بە ئامادەبی کەسایەتیە هونەری و ڕۆشنبیریەکانی شاری سلێمانی

- پیشانگەی شێوەکاری وفۆتۆگرافی سەنتەری ئابلو

10 - ستێجی بەردەم شەوانە ڕۆژی شۆرش

- چالاکیە مۆزیکیەکانی سەنتەری ئابلو

- چالاکیە مۆزیکیەکانی تیپی مۆسیقای فۆلکلۆری کورد

11 - ستێجی بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری منالان :

- هەڵپەڕکێ گۆرانی و مۆزیک شیعر پیشانگە ڕەنگکردنی دەموچاو نمایشی جلوبەرگ

- چالاکی تیپی شانۆی منالان

12 - فەرمانگەی بوکەڵە :

- دروستکردنی بوکەڵە بەشێوەی کاریکاتێری

13 - بەردەم مزگەوتی حاجی حسن / بەڕێوەبەرێتی خانەی سموره : بەڕێوەبەرێتی کارگەی ماقوور : کۆمەڵەی کەم ئەندامان :

- چالاکیەکانی کەمئەندامان

14 - ستێجی بەردەم شارەوانی : بەڕێوەبەرێتی لاوان + بەڕێوەبەرێتی هونەرەکانی مۆزیک

15 - سەر پردی خەسرەو خاڵ : بەڕێوەبەرێتی هونەری شێوەکاری :

16 - بەڕێوەبەرێتی چالاکی وێژەیی :

18 - بەڕێوەبەرایەتی وەرزشی سلێمانی

چالاکی یاری ئاگرینی

من خۆم وەک لێپرسراوی خانەی مۆزیک چەند ئاوازێکم دانابوو بۆ منالاّن هەر لەسەر ستەیجێکی تر نزیک سـەهۆڵەکە، کە نەمتـوانی خـۆم لەوێ ئامـادەبم، بەڵام ئەو فەرمانبەرانەی کە لام بوون ئەوان سەرپەرشتیان کرد و ئاوازەکانیان نمایش کرد ئەو ئـاوازە نـوێیەش هـۆنراوەیەکی شـاعیری گەورە (گـۆران) بـوو بە نـاوی (نەورۆز ئەکەم ..نەورۆز ئەکەم ..نەورۆزێـکی بەسـۆز ئەکەم)ئەمەش وێـنەی ئەو نمایشەیە لە سەهۆڵەکە:



## كۆنسێرتێک بۆ هونەرمەند هۆشیار حەمەفەرەج

لە ڕێکەوتی ٢٠١٣/٤/٧ لە هۆڵی ئەحمەد موختار جاف لە هەڵەبجە کۆنسێرتێکی تایبەتمان بۆ هونەرمەند هۆشیار حەمە فەرەج ئەنجام دا، بە چەند بەرهەمێک بەشداربوو تێیدا و پاش چەند ڕۆژی تر ئەو کۆنسێرتەمان برد بۆ هەڵەبجەی تازە و لەوێش نمایشمان کرد .





## یادی حەسەن زیرەک لەساڵی ٢٠١٣دا

لە شەوی ٢٠١٣/٦/٢٦ لە یادی کۆچی دوایی هونەرمەندی بەناوبانگ (حەسەن زیرەک) کە لەلایەن بەڕێوەبەریتی (هونەری مۆزیک) کە مۆزیکزان (نەجات عەبدوالقادر) بەڕێوەبەریەتی تا ئێستاش، چەند هونەرمەندێکمان بانگ کرد کە گۆرانییەکانی حەسەن زیرەک بڵێنەوە لەوانە (ئیحسان زیرەک . پەیمان عومەر. سیروان زیرەک . بێژەن جەزا)

کەسمان دەست نیشان نەکردبوو بۆ پێشکەش کاری ئەو نمایشە ئێوارەکەی تەلەفۆنم کرد بۆ کاک (سەردارخدر) ئەویش وتی کاک ئازاد جلی کوردیم لەبەر نییە پانتۆڵم لە پێدایە، لە بارەگای تیپ جلی ئەندامەکان لەوێ بوو، وتم وەرە بۆ تیپ دەستێ جل لەبەربکە، بەو شێوازە پێشکەش کاری کرد.



**بڵاوکردنەوەی چەند گۆرانییەک (بۆ منداڵان)**

یەکەم ئاوازم بۆ منداڵان ساڵی (١٩٧٧) بوو بەناوی کۆترێکی نەشمیلانە هەرلە منداڵییەوە ئالودەی گۆرانی منداڵان بووم، بەو یاریانەی کە لە گەڕەکەکان ئەمانکرد، زۆربەیان ئاوازی تێدا بوو لەگەڵ یارییەکان گۆرانی تایبەتمان بە هەر یارییەک ئەوتەوە، ئەمانە لەناو مێشکم گینگڵیان ئەخواردەوە، تەنانەت ئەو گۆرانییانەم ئەوەی لە یادم بوو نوسیمەوە و کردومەتە کتێبێک کە تا ئێستاش چاپ نەکراوە، کاتێکیش قوتابی بووم لە بەغداد چەندین کۆبوونەوە ئەچووم کە تایبەت بوو بەگۆرانی منداڵان، یەکەمین ئاوازی منداڵانم لە ساڵی (١٩٧٧) دانا، بە ناوی (کۆترێکی نەشمیلانە) هەروەها لە ساڵی (١٩٨٠) لەگەڵ مامۆستا هەڵکەوت تیپێکی مۆزیکی تایبەتمان بۆ منداڵان دروستکرد، تەنانەت ئۆپەرێتی (سەوزە)و (ڕێویێ یە لەپێستی شێردایە)لەساڵی ١٩٨٣و ١٩٨٤ دوو ئۆپەرێت بوون تایبەت بوون بە منداڵان کە بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوک تۆمارمان کردن، لە ساڵانی ١٩٩٤ و ١٩٩٥ کاتێک فەرمانبەر بووم لە بەڕێوەبەرێتی رۆشنبیری سلێمانی ئەو کاتەی کە مامۆستا عەبدولی حەمە جوان بەڕێوەبەری بوو، چەندین خولمان کردەوە بۆ منداڵان لە هاوینەکەی لە قوتابخانەی هەردی لە بەختیاری و چەندین مامۆستا بەشداربوون، ئەوانەی لە بیرم بێت: کاک زانای مەحمود هەژار. ئاکۆ عەزیز. فەرهاد حەمە صالح . هێرش عومەر ڕەزا ، نەوژین محەمەد ، وە ئەو ساڵە قوتابی بەتوانا نەبەز حەمە ڕەشید فێرخوازمان بوو، کە ئێستا دکتۆرای لە (مایسترۆ) هەیە، واتە سەرپەرشتیاری تیپی سەمفۆنیا لەکاتی ژەنینی هەر کارێکی مۆزیک، هەر لە ساڵی ١٩٩٤ نمایشێکمان بۆ ئەو فێرخوازانە کرد لە هۆڵی بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری، ئاوازێکم بۆ دانان بە ناوی (ئێمە منداڵین جوانین).

لە ساڵی ٢٠٠٦ بوومە فەرمانبەر لە بەشی ڕۆشنبیری منداڵان و لە ساڵی ٢٠٠٧ ئەم گۆرانییە لە تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان بۆیان کلیپ کردین لە پارکی ئازادی، ئیتر وردە وردە کەوتمە ئاواز دانان و کاتێک لە ساڵی ٢٠٠٩بوومە لێپرسراوی خانەی مۆزیکی منداڵان، ئیتر بە هاوینان لەگەڵ هەندێ فەرمانبەری مۆزیکژەن خولی مۆزیکمان بۆ منداڵان ئەکردەوە و بەکارم ئەهێنان بۆ کۆرس و چەندین ئاوازم بۆ دانان و لە ستۆدیۆ (لاوە)کاک عومەری چەلۆ بۆی تۆمار ئەکردین تا ژمارەیان گەیشتە (١٠) ئاوازی منداڵان کە (٩) لەوانە ئاوازو هۆنراوەی خۆم بوون،

تەنها یەکێکیان هۆنراوەی (ئەحمەد محەمەد) بوو، ئەوی شایانی باس کردنە ئەرکی تۆمارکردنی لە ئەستۆی بەڕێوەبەریتی ڕۆشنبیری منداڵان بوو کە ئەو کاتە بەڕێوەبەرەکەی کاک (تاهیر عەبدوڵا) بوو کە زۆر هاوکارم بوو، سەرپەرشتی کردنی بەرهەم هێنانی ئەو (CD)ە فەرمانبەری دڵسۆز کاک عوسمان ڕەشید بوو، لە ئاهەنگێکی منداڵان لە هۆڵی بەڕیوەبەریتی ڕۆشنبیری لە ڕۆژی ٢٠١٣/١٠/٧ بڵاوکرایەوە.






## سەفەری تیپی مۆسیقای شنرویّ بۆ وڵاتی دانیمارک و سوید

لە نەوەیەکم کە چەندین تاڵی و دەردی سەریمان دیوە بە هۆی جەنگەکانەوە، هەر لە شەڕی کورد و شەڕی ناوخۆ و شەڕی ئێران -عێراق و ڕاوەدوونانی کەسانی بیر ئازاد و لەلایەن هەموو ڕژێمە یەک لەدوای یەکەکانەوە، بۆیە چەندین هاوڕێی ئازیزم کە هاوتەمەنی خۆمن ڕوویان لە هەندەران کردووە، یەکێک لەو هاوڕێ ئازیزانەم کاک (لەتیف مەحمود)ە ناسراو بە (گۆران هەڵەبجەیی) کە کەسێکی پێشکەوتووخوازو نوسەرێکی قەڵەم بەدەستی جوانە دژی نادادی ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی، کەم تا زۆر پەیوەندیم لەگەڵ زۆربەی ئەو هاوڕێیانەم تا ئێستاش ماوە.

## گۆران هەڵەبجەیی هەوڵی سەفەرەکەی داین

ناوەڕاستی ساڵی (٢٠١٣) بوو کاک گۆران پەیوەندی پێوە کردم و وتی کاک ئازاد من ئەتوانم لەڕێگای ڕێکخراوێکی دانیمارکییەوە بانگهێشتان بکەم بۆ دانیمارک ئەگەر خۆتان بتوانن پارەی ئەو سەفەرە دابین بکەن، ڕێگاشی بۆ دانام کە کێ بتوانێت هاوکاریمان بکات و چەند کەسێکی بۆ دەستنیشان کردم، بەڕاستی منیش بیرم لێکردەوە لە ساڵی ٢٠٠٥ کە کاک دڵشادی عومەری کاکی هەوڵێکی زۆری بۆ داین، من هەوڵێکی زۆرمدا بۆ ئەوەی بتوانم پارەی ئەو سەفەرە کە بڕێکی زۆر بوو بە هۆی ڕەوان شاد بایز تاڵەبانیەوە وەزیری ئەو کاتەی ئیدارەی سلێمانی پەیدا بکەم، ئەمزانی کە کارێکی ئاسان نییە، ماوەیەک لای کەس باسم نەکرد، چونکە ئەمزانی زۆربەی ئەرکەکە ئەکەوێتە سەر من، ئیتر کاک گۆران ئەیگووت وەڵام بدەرەوە و منیش تێدا مابوومەوە، دوای ئەوە ڕۆژێکیان بڕیارم دا کە کۆبوونەوەیەک بە ئەندامانی تیپ بکەم بۆ ئەوەی مەسەلەکەیان لا باس بکەم و

کۆبووینەوە هەموو وردەکاریەکم پێ وتن، کە ئەو سەفەرە چۆنە، من وتم من ئامادەم ئەو ئەرکە بگرمە ئەستۆ بە مەرجێک من هەقم بەسەر پارە پەیدا کردنەوە نییە، دوای مشت و مڕێکی زۆر زۆربەی ئەندامان وتیان باشە ئێمە ئەو ئەرکە ئەگرینە ئەستۆ، منیش وتم باشە و چەندین لایەنمان دیاری کرد، خۆم نوسراوەکانم کرد بۆ زۆربەی لایەنەکان، دەبوایە پێش ئەوە بڕۆین بۆ سەفارەتی دانیمارک لە تاران، چونکە سەفارەتی دانیمارکی لە بەغدا نەبوو، بۆ ئەو مەبەستەش دەبوایە کۆنسێرتەکە بۆ سێ چوار گۆرانیبێژ بوایە ئەوانیش :

(هۆشیاری حەمە فەرج ومەریوان سەفادین) کە کێشەی ئەو دوانەمان نەبوو، چونکە هۆشیار لە ئەڵمانیاو مەریوانیش لە سوید بوون، ئەوانی تریش کاک (بەهرۆز بەڵخەیی و ئەکرەم حەمە ڕەشید) بوون، ئیتر دەبوایە ئەندامانی تیپمان هەڵبژاردایە لەگەڵ چەند میوانێکی تر لەمۆزیک زانان، وە ئەندامەکان بریتی بوون لە :

١.ئازاد ساڵح

٢. توانا خورشید

٣.عادل حەسەن

٤.زۆزک ئەحمەد قەرەداخی بۆ ئامێری کەمان

٥.عەزیز حەمە کەریم بۆ ئامێری عود

٦.فوئاد کەریم - ساز

٧.توانا ئەبوبەکر — نای

٨.عومەر عەبدوڵا - چەلۆ

٩.دانا شێرکۆ _کیبۆرد

١٠.کرمان جەلال .سەنتوور

١١.تانگۆ ئازاد بۆ ئیقاع

١٢.بەهرۆز بەڵخەیی —گۆرانی بێژ

١٣. ئەکرەم حەمە ڕەشید - گۆرانی بێژ

## بۆ چاوپێکەوتن چووین بۆ تاران

بـۆ ئەم مەبەسـتەش دەبـوایە بچووینـایە بـۆ تـاران، بـاش بـوو لەو کـاتەدا (نەسریەی) تیپمـان بـۆ مـاوەیەکی زۆر وەرنەگرتبوو، بەڵام لە ناکاو ئەو نەسریە کەڵەکە بووەمان وەرگرت کە مـانگی (١٥٠٠٠٠٠) یەک ملیۆن و پێنج سـەد هەزار دینار بوو کە بەسەر یەکەوە (٩٠٠٠٠٠٠) نـۆ ملیۆن دینارمـان وەرگرت، ئەو کاتە توانا ئەبوبەکر ژمێریـار بـوو، لەو کاتەدا نیازی سـەنتور و ئیبراهیم نجم الدین و ئەرکان ڕۆستەم لە سەفەری تیپی نەتەوەیی بوون لە یۆنـان، بۆیە لە جیـاتی نیـاز، من کەسێکی ترم هەڵبژارد بۆ سـەنتور ئەویش کرمـان جەلال بـوو کە لە هەڵەبـجە ئەژیا .. لەو کاتەدا هەستم بە دابڕانێک ئەکرد لە نـاو تیپەکەدا ..بە هەر حـاڵ چۆن بڕۆین بۆ تاران ؟ ڕۆژێکیان کاک (مەهدی مەلا عەلی)م دی لە شـەقامی مەولەوی، پێم وت کەسـێک ناناسـیت کە شـارەزا بێت بـۆ ئەوەی بچـین بـۆ تـاران و بتوانێت سەفەرەکەمان بۆ ڕێکخات وکار ئاسانیمان بۆ بکات؟وتی با، وتم کێیە وتی (نەوەی حیلمی)، وتم من دایک و باوکیشی ئەناسـم کە ئەویـش (نەوشـیروانی کـوڕی شـێخ مەحمودی سەعاتچی) برای شاعیری ناسـراو (حیلمـی هەڵەبجـەیی ١٩٠٩-١٩٨٥)، من هەر لە منداڵییەوە کە لە دوکانی باوکم بـووم، دایکشـیم ئەناسـی (فەیمەی کچـی نوری قەساب) ئەهات شتی لە دوکانی باوکم ئەکڕی لە پیرمحەمەد، پەیوەندیم پێوە کرد و هات بۆ تیپ و ڕێکەوتین کە بڕێک پارەی بدەینێ و ئەویش لە ئێران خـەریکی هـاتووچۆ و موعـامەلە بـوو وەک بردنـی نەخـۆش و سـەفەرکردن ئەو هەمـوو پێداویستیەکانی سەفەری بۆ ئامادە کردین و لە سـەرەتای مـانگی (٩) بە ١٣ کەس پاسـێکمان گـرت، سـەر لە بەیـانییەکی زوو بـوو لە سـلێمانی بـۆ پێنجـوێن هەمـوو ئامادەبووین و هەریەکەمان ئامێری مۆزیکمان پێبوو، بیرم دێت توانا (نای)یەکەی لە بیر چـوو بـوو، خەریک بـوو دەرئەچـووین لە سـلێمانی زۆر بـێ تـاقەت بـووم و گەڕاینەوە تـا جـارێکی تـر بەڕێکەوین، بە هەر حـاڵ سـەرکەوتین پـاش سـەعات و نیوێک زیاتر، سـەر لە بەیـانی گەشـتینە پێنجـوێن و لەوێ نـانی بەیانیمـان خـواردو هەوایەکی ساردی هەبوو من دوو کەبابم خوارد و دوایـی پشـوودان سـەرکەوتین بۆ سـنوور بـۆ باشـماخ، پاسـەکە تـا سـنوور بردینـی و گەڕایەوە بـۆ سـلێمانی، ئەو کاتەی بانگهێشت کرابووین بۆ دانیمارک مـن پەسـاپۆرتی یەکەمـم لە سـاڵی ٢٠٠٥

دەرهێنابوو وە دوای (١٠)ساڵ بەسەر ئەچێت لە مانگی هەشتی ئەو ساڵەدا، توانا ئەبوبەکریش پەساپۆرتەکەی بەسەر چووبوو ڕۆژێک هەردووکمان چووین بۆ پەساپۆرتی سلێمانی لە گەڕەکی بەختیاری پەساپۆرتی نوێمان دەرهێنا، لە بەیانی تا نیوەڕۆ پەساپۆرتمان بەدەست هێنا، بۆیە کە چووینە سنوور لە باشماخ کاک نەوشیروان حیلمی چەند ئۆتۆمبیلێکی بۆ گرتین و سوار بووین یەکسەر بۆ تاران، هەموو دابەش بووین بە سەر چەند قەمەرەیەکی پەیکان، بە چەند سەعاتێک گەشتینە تاران و نەوشیروان هۆتێلی بۆ گرتبووین، چوینە هۆتێلەکەو من وتم ئەمەوێت لە ژوورێکی تەنها بم بەڕاستی لەو کاتەوە هەستم بە نامۆیی خۆم کرد، لەژوورێک گیرسامەوە لەو هۆتێلە، شەوان پرسیارم لە خۆم ئەکرد ئایا بڕۆینە هەندەرانیش دوایی پیاو خراپیش نابم ؟ بۆ ڕۆژی دوایی سەر لە بەیانییەکەی چووینە سەفارەتی دانیمارک لە تاران و سەعات نۆ دەرگای سەفارەت کرایەوە و چەند فەرمانبەرێک هاتن و یەک یەک موقابەلەیان کردین و هەموو ئامێری مۆزیکمان پێبوو، بە یەک دوو ڕۆژ موقابەلە کردن کە کچێکی فارس بوو پرسیاری لێ ئەکردین، نزیکەی سێ چوار ڕۆژێک لە تاران بووین، هەندێ ئەندام خۆیان جیا کردبووەوە لە ئێمە بە فڕۆکە هاتن بۆ تاران و لە هۆتێلێکی تر نیشتەجێ بوون، بەڵام لەو سەرەوە کە لە تاران گەڕاینەوە سەفەرەکەیان بە فڕۆکە بۆ نەکرابوو لە شاری مەریوان هاتنەوە بۆ لای پاسەکەی ئێمە.

### تەنها شەش هونەرمەند ڤیزەی سەفەرکردنیان بۆ دەرچوو

دوای چاوەڕوانی بۆ ماوەی مانگێک زیاتر، لە تاران وەڵاممان بۆ هاتەوە کە شەش کەسمان ڤیزەمان بۆ دەرچووە بۆ سەفەرکردن بۆ دانیمارک. ئەوانیش : ئازاد ساڵح . عەزیز حەمە کەریم . توانا خورشید . فوئاد کەریم . دانا شێرکۆ . زۆزک قەرەداغی . دەمانتوانی تا ماوەی دوو مانگ لە ئەوروپا بین. من حەزم ئەکرد هەموو ئەندامان کە لەگەڵمان بوونایە و لە تاران ڤیزەیان وەربگرتایە لە بەر

دوو هۆ، یەکەمیان: زۆربەیان ئەوروپایان نەدیبوو حەزم ئەکرد تۆزیک دونیا ببینن. دووهەمیان : لەبەر ئەوەی هاتنی ئەوان بۆ ئەنجامدانی کۆنسێرتەکە باش بوو بۆ بە هێزکردنی تیپەکە، چونکە زۆر لە ئامێرەکانمان کەم و کورِی پێوە دیار بوو، بەڵام ناچار بووین برِۆین، من بۆ خۆم تامەزرۆی ئەو سەفەرە بووم چونکە تا ئەو کاتە ئەوروپام نەدیبوو، ئێمە ئەبوایە لە ٢٠١٣/١١/٢ یەکەم کۆنسێرتمان لە دانیمارک ئەنجام بدایە، دەبوایە ٢٠١٣/١١/١ لە دانیمارک بووینایە، هەندێ لە ئەندامان گلەییان لێ کردین کە ناوی ئەوان نەهاتۆتەوە بۆ سەفەرەکە، بەڵام کە سەفارەتی دانیمارک ڤیزەیان نەداتێ تاوانی ئێمە چی بێت ؟

### بۆ ئەم سەفەرە زۆر کەسایەتی و لایەن هاوکارییان کردین

بۆ خۆ ئامادە کردن بۆ ئەو سەفەرە پێویستمان بە پارەیەکی زۆر بوو، ئەو نامانەی کە نوسرابوو بۆئەو کەسانەی کە وتیان ئێمە ئەتوانین پارە پەیدا بکەین، نەیانتوانی ومنیش لە پێشەوە ئەمزانی کەهیچیان پێ ناکرێت، جگە لە یەک دوانێکیان نەبێت، لەو کاتەدا هۆشیاری حەمەفەرەج گەرِابووەوە بۆ کوردستان و هاورِێیەتی لەگەڵ کاک ئاسۆ بامۆکیدا هەبوو رِۆژێکیان بە هۆی هۆشیارەوە بەڵێنی دا بمان بینێت، سەر لە بەیانیەکی مانگی ١٠ ی ئەوساڵە بوو، من و هۆشیار لەگەڵ دوو ئەندامی ئەو کەسانەی کە ناویان هاتبووە، هاتن لەگەڵمان بۆ ئەوەی بزانین چەندمان ئەداتێ، چووینە لای کاک ئاسۆ و رِێزی منیش ئەگرێت، زۆر سوپاسی هەڵوێستیمان کرد بۆ هاوکاری کردنی، پاش ئەوە کاک دانا شێرکۆ کەوەک میوان لەگەڵمان بوو توانی برِێکی ترمان بۆ دابین کات هەروەها کاک مەلا بەختیاریش برِێکی بۆ دابین کردین توانیمان لە چەند کەسایەتی و رِێکخراوو هونەر دۆستێک ئەو برِە پارەیە پەیدا بکەین بۆ سەفەرەکە، چ وەک خەرجی، چ وەک کرێی بلیتی فرِۆکە .. عەزیز حەمە کەریم ناسیاوێکی لە کۆمپانیایەک بوو ئەو بلیتەکانی بۆ دابین کردین بە قەرز، دەبوو بۆ سەفەر کردن کەسێک حسابی بانکی

هەبێت، عەزیز ئەوەشی دابین کرد، ئا بەو شێوازە بوو، ئیتر خۆمان ئامادە کرد بۆ سەفەرکردن و بلیتمان بە قەرز کڕی و پێش ئەوەی بڕۆین بە دوو سێ ڕۆژ پێش سەفەرەکە هۆشیار پەیوەندی کردبوو بە بەڕێوەبەری ڕۆشنبیری کەلارەوە تا کۆنسێرتێکی بۆ ساز بکەین لەوێ، لە ڕۆژی ٢٠١٣/١٠/٢٧ لە کەلار کۆنسێرتیکمان بۆ ساز کرد، ئیتر کاتی سەفەرەکە نزیک بووەوە و بەردەوام پەیوەندیم لەگەڵ کاک گۆران هەڵەبجەیی هەبوو کە چی بکەین و چۆن سەفەر بکەین، ڕۆژێکیان من ئاگام لە هیچ نەبوو وە لە تیپیش نەبووم، ئەندامان وەک برا ئەو بڕە پارەیان دابەش کردبوو بەسەر حەوت کەسدا، واتە بۆ مانەوەی یەک مانگ بۆ خەرجی و خواردن و هۆتێل وهاتوو چۆ، بۆ ڕۆژی ٢٠١٣/١٠/٣١ بە پاسێک بەڕێکەوتین بۆ هەولێر و بۆشەوەکەی چووینە فڕۆکەخانەی هەولێر و بە فڕۆکەیەک چووینە فڕۆکەخانەی (ڤییەنا) و دوای کاتژمێرێک مانەوە لە ڤییەنا سواری فڕۆکە بووین بۆ کۆبنهاگن، ئەو فڕۆکەیەی سواری بووین زۆر پێشکەوتوو بوو، پاش کاتژمێرێک گەیشتینە فڕۆکەخانەی (کۆپنهاگن) لە دانیمارک.

ئەمەش دەقی ئەو بانگهێشت نامەیە کە (سەنتەری ڕۆشنبیری جیهانی)بۆی ئەنجام داین :

VALIDATION OF INVITATION

VERDENSKULTURCENTRET

Copenhagen 15 Auguste 2013

**Ministry of Culture and Youth of Kurdistan Rigion**
**Shnrwe Musical Group**

With this letter we invite the following musicians who their name attached to participate in a cultural event from (1th) of October to (17th) of November at The world Culture Center, where are celebrating the (20th) anniversary as civic cultural house.

The world Culture Center is a culture house under the municipality of Copenhagen, Denmark, with a special interest in and focuses on the ethnic minority groups living in Copenhagen City and suburbs

We often invite artist from abroad that represent the cultures of the minorities living in Copenhagen in order to give the public, minority groups as well as inherent Danes an experience, which transcends what, normally is offered in the local context.

Therefore, we hereby validate and confirm the request by the holder of this letter.

On behalf of
Sara Bech Jakobsen
Manager

Gustavo Lopez
Culture Coordinator

The World Culture Center
Norre Alle 7
220 Copenhagen. N.
Denmark
Phone : +45 8220 5140




### پێشوازیکردنمان له دانیمارک

هەر لە فڕۆکەخـانە کـاک گـۆران هەڵەبجەیـی بە هـاوڕێ هەڵەبجەییەکـانی دانیمـارکی ڕاگەیانـدبوو کە ئێمە دەگەیـنە دانیمـارک، ئەوانـیش بە سوپاسـەوە بە چەپکە گوڵ پێشـوازییەکی گەرمیـان لـێ کردین لەوانە :کـاک گۆران خـۆی، کـاک ئیبراهیمی حاجی حەمە شەریف وکاک هیدایەتی مەلا عەلی لەگەڵ چەنـد کەسـێکی تر کە ناوەکانیانم لە بیر نەماوە، پێشـوەخت کـاک گۆران هـۆتێلێکی بـۆ گرتبـووین هەروەها پاسێکیش بۆ هاتوچۆی ئەندامان، پاش نان خواردنی ئێوارە گەیاندینیانە هۆتێلەکەو بۆ شەو لەو هۆتێلە ماینەوە.

## یەکەم کۆنسێرتمان لە شاری ئۆدیسە لە دانیمارک

تا ئەو کاتەش کە چووین بۆ دانیمارک من مۆبایلێکی ئاساییم پێبوو، مۆبایلی زیرەکیش گران بوو، فەیس بوکم هەبوو، بەڵام کەم کەم پۆستم ئەکرد چونکە مۆبایلەکە وێنەی نەئەگرت و لاپتۆپێکی گەورەم هەبوو بۆ سەفەرهەڵگرتنی ئاسان نەبوو، کاری ڕاست بێت کاکە نیازی سەنتور وتی من لاپتۆپیکی بچوکم هەیە با لات بێت تائەگەڕێنەوە، ئەوجا بۆم بگێڕەوە، ئەو ماوەیە ئەو لاپتۆپەی ئەوم بەکارئەهێنا بەڵام کاک گۆران هەڵەبجەیی لەکاتی ئەنجامدانی ئەو کۆنسێرتە پۆستێکی کردبوو منیش دەقی نوسینەکەی بڵاو ئەکەمەوە کە باسی یەکەمین چالاکیمان ئەکات بەم شێوە لە سەری نوسیوە : "یەکەم ئاهەنگی تیپی شنرویٚ سەرکەوتووانە بەڕێوە چوو".

ئێوارەی ٢٠١٣/١١/٢ لە بازێڕی ئۆدنسە[دانمارک] لە گەلەری [گالشیۆت] یەکەم کۆنسێرتی گرووپی موزیکی شنرویٚ بەڕێوە چوو.

سەرەتا بەڕێز [یەنس] سەرۆک و خاوەنی گەلەری پاش بەخێرهاتنی میوانەکان بە کورتەیەک باسێکی جوانی دیرۆکی کوردو ئەو نەهامەتیانەی بەسەریاندا هاتووە پێشکەشکرد. پاشان باسی لە دڕندەیی ڕژێمی سەدام کرد بەرامبەر بە گەلی کورد تا گەشتن بە ئاستی پەیڕەوکردنی پرۆسەی ئەنفال و بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی، ئینجا وتی سەدام چەکی کیمیاوی بە خەستی لە شاری هەڵەبجەدا بەکارهێنا، ئەو شارەی کە ئەم گرووپەی بەرهەم هێناوە، لەدرێژەی قسەکانیدا وتی کورد زیندووە و بە کارەساتەکان چۆک دانادات و لەگەل تراژیدیاکاندا ڕاهاتووە و ئومێد لەدەستنادات، حەزی لە ژیانە، لە خۆشییە لە هونەر و گۆرانییە. پاشان کاک نیاز بەیاتی دیزاینەرو شێوەکار کە لە هەمان گەلەری کاردەکات، هەر خودی خۆی ئەم کۆنسێرتەی ڕێکخست، باسێکی جوانی خۆشەویستی میللەتی کورد بۆ موزیک کرد، ئەوجا هاتە سەر باسی گرووپی شنرویٚ لە کاتی درووستبوونیەوە تا ئەمرۆ).

دوای ئەم دوو پێشەکییە بە چەپڵە ڕێزان پێشوازی لە گروپەکە کرا.

سەرەتا هونەرمەند هۆشیار حەمەفەرج بە کۆمەڵێک گۆرانی ئاهەنگەکەی ڕازاندەوە، ئەوەی تێبینیم کرد زۆرێک لە میوانە دانیمارکییەکان بەسیمایاندا دیاربوو ئاوازو گۆرانییەکانیان لاپەسەندە، بەوەی لەگەڵ ئاوازەکاندا جەستەی خۆیان دەبزواند و چێژیان لێ وەردەگرت، پاش کۆتایی هەر گۆرانییەکیش بەگەرمی چەپڵەیان لێدەدا، دوای گۆرانییەکانی هۆشیار حەمەفەرج، پشووی نان خواردن دەستی پێکرد، کە (لەعلی خان) بەسەلیقەی جوانی، کۆمەڵێک خواردنی کوردەواری درووستکردبوو کە بریتیبوون لە شفتە، برنجی سورو سپی و شلەی باینجان، کە بەلای دانیمارکیەکانەوە زۆر خۆشبوو، زۆرێکیان سوپاسی تایبەتی لەعلی خانیان کرد.

بڕگەی دووەم وکۆتایی بریتی بوو لە گۆرانییەکانی هونەرمەند مەریوان سەفادین، ئەویش لەسەرەتادا چەند گۆرانییەکی ڕیتمی هێمنی چڕی، پاشان گۆڕییە سەر ڕیتمی خێرا و بووە هەڵپەڕکێ، وێرای بەشداری کوردەکان، دانیمارکیەکانیش بەشداری هەڵپەرکێیان کرد، هەندێکیان زوو فێربوون، بەڵام هەندێکی دیکەیان هەر جەستەیان دەبزواند. ئەوەی گرنگە تا کۆتایی ئاهەنگەکە دانیمارکییەکان دەستیان بەرنەدا. بەیان خان و هاوسەرەکەی کاک نیاز بەیاتی کە جلی کوردییان پۆشی بوو، هاوکات بەشداربوون لە هەڵپەڕکێدا، سەرنجی دانیمارکییەکانیان بۆ جل و بەرگە جوانەکانیان ڕاکێشا، لایان جلێکی جوان بوو.

شایانی ئاماژەیە دوای کۆتایی هاتنی شەوە ئاهەنگەکە، زۆربەیان هاتن و دەستخۆشیان لە ئەندامانی گرووپە موزیکیەکەکرد، ئەمەش نیشانەی ڕەزامەندییان بوو لە ئاهەنگەکە. جێی خۆشحاڵی بوو ئەو شەوە توانرا تا ڕادەیەک دانیمارکییەکان بە هونەری موزیکی کوردی ئاشنا بکرێن، ئەوەی جێی سەرسوڕمان بوو کەمی ڕێژەی میوانی کورد بوو کە تەنها ڕێژەیەکی کەم ئامادەبوون، بەمەرجێک ژمارەیەکی زۆر کورد لەو باژێرەدا دەژین.

پاش ئەوەی میوانەکان ڕۆشتن هەر لەوێ گرووپەکەو چەند کەسێکی دیکە دانیشتنێکی خۆشمان درووست کرد کە تا درەنگانێکی شەو کاتێکی خۆشمان بە قسەکردن و گوێگرتن لە ئاوازی خۆشی موزیکژەنان و لە دەنگی هونەرمەندان هۆشیارو مەریوان بەسەر برد. جگە لە هۆشیارو مەریوان چەند کەسێکی دیکە لە

موزیکژەنان گۆرانییان چڕی، کوڕێکی گەنجیش بە ناوی [ ڕەوەند هەڵەبجەیی ] کە خاوەنی دەنگێکی خۆشە و هاوکات گۆرانیزانێکی باشیشە، زۆرێک لە گۆرانییەکانی هۆشیارو مەریوان و چەند گۆرانیبێژێکی دیکەی چڕی)





# Invitaion til Koncert hos Galleri Galschiøt

Lørdag d .2 . november 2013 kl. 18.00-20.00

Shnrwe Music Group - Symbol of Halabja

Koncert med den kurdiske gruppe Shnrwe fra byen Halabja

Entre 100 kr.

Midt i koncerten vil være en lille pause,hvor der vil være mulighed for at købe kurdisk mad



## ئەركی پاككرنەوەی هۆڵەكە كەوتە سەر شانی من و كاك گۆران هەڵەبجەیی

ئەوەی من بەدیم كرد لەو گەلەریەدا كە لە شاری (ئۆدیسە) بوو خاوەنەكەی بەڕێز (یەنس) بوو زۆر سەرنج ڕاكێش بوو، ئەو پیاوە زۆر دۆستی كورد بوو ئەو هۆڵەش بە هۆی كاك نیاز بەیاتی دابین كرابوو خۆبەخشانە بوو واتە كرێی هۆڵەكەیان لێ نەسەندین، سەردانی كوردستانیشی كردبوو، كاك نیاز بەیاتی وتەكانی وەرئەگێڕا بۆ زمانی كوردی و كەسانێكی زۆر لەو دانیماركییانە كە زۆربەیان بەتەمەن بوون و هونەرمەندیشیان تێدا بوو، هەریەكەی بوتڵێك شەرابی لەبەردەم بوو، لەكاتی پشووەكە زۆربەیان لەو خواردنە كوردەواریەیان دەخوارد كە ئەو خانمە كوردانە دروستیان كردبوو تا درەنگانێكی شەو لەوێ ماینەوە بەدەم بابەت و گفتوگۆی رۆشنبیری و هونەرییەوە كەمێك سەرمان گەرم كردبوو.

هەر ئەو شەوە هەموو ئەندامەكان گەڕانەوە بۆ كۆپنهاگن، چونكە دووری نێوان شاری ئۆدیسەو پایتەختی دانیمارك تەنها یەك كاتژمێر بوو، جگە لە من و كاك گۆران كە بڕیار بوو هەموو لەوێ بمێننەوە، بۆ بەیانییەكەی ئەو هۆڵە هەمووی پاشەڕۆی خواردن و قاپ و قاچاخی چەورو دەوری و سینی پیس هەموو كۆببووەوە دەبوایە هەموویمان بشتایە و هۆڵەكەمان بە پاك و خاوێنی تەسلیم بكردایەتەوە، ئێمە خەریكی شتنی قاپ و دەوری و پاك كردنەوەو گسكدانی هۆڵەكە بووین، وابزانم سێ كەس بووین، من و كاك گۆران كە تەندروستی باشیش نەبوو بەدار ئەڕۆی بەڕێوە، لەكاتی ئیش كردندا بووین لەلایەن یەك دوو كەس لە هاوڕێیانمان تەلەفۆنیان بۆ ئەكردم بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ كۆپنهاگن، نەیاندەزانی من خەریكی پاككردنەوەی هۆڵەكەم هەر دەیانگوت دەی كاك ئازاد بگەڕێرەوە، منیش بەوە زۆر بێ تاقەت بووم، چونكە خەریكی گسك دان بووین، ئەوان هەر شەو بێ پرس گەڕابوونەوە هەموو ئەو ئەركەیان بۆ ئێمە جێهێشت وبارێكی دەروونی خراپی بۆ درووست كردم، نزیكەی (٣) سەعات ئێمە خەریكی پاك كردنەوەو شتنی قاپ بووین ئەوانیش وایان ئەزانی لە سەیرو سەفام، تا دوای نیوەڕۆ بە تەنیا لەگەڵ كاك گۆراندا گەڕاینەوە كۆبنهاگن، لەڕێگا هەرچیم ئەدی پرسیارم لێ ئەكرد بە درێژایی ئەو ڕێگایە

هەمووی سەوزایی بوو، جۆرە بەروبومێکی تێدا بوو وەک کاهوو وابوو گەڵاپان، هەمووی دەشتایی بوو هەموو دانیمارک تەختاییە و دەشتایی یەک مەتر نابینیت سەوز نەبێت، جار جارەش خانووی پێشکەوتووی جووتیارەکان بوون دوور لەیەک، یانی دێهاتم نەدی بەڵکو هەمووی دوور بوون لە یەک و هەموو جۆرە ئامێرو تەکنیکی کشتوکاڵیان هەبوو، بۆ وزەی کارەبایی بە سەدان پانکەی هەوایی (الطاحونة) هەبوون بۆ وەدەست هێنانی وزەی کارەبا، چونکە دانیمارک هەواو بای زۆرە، بەسەر پردێکدا تێپەڕین کە لەسەر زەریایەک بوو درێژیەکەی (١٤کم) بوو کاک گۆران وتی بە چوار ساڵ درووستیان کردوو، بۆ پشوودان چووینە چێشتخانەیەک و چایەکمان خواردوە، کاک گۆران پاسەکەی لێدەخوڕی بەو بارە تەندرووستیەوە کە قاچی بە تەواوی نەیدەتوانی بجولێنێت و بە (جی .پی .ئێس) ڕێگاکەی دەدۆزیەوە ومن ئەو کاتە سەرم سوڕما بوو لەو (ئەپلیکەیشنە) بۆ عەسر گەشتنیە کۆبنهاگن و چووینە هۆتێلەکە، کە چووین زۆربەی ئەندامان هۆتێلەکەیان چۆڵ کردبوو هەموویان چووبوون هەر کەسەو بۆ لای خزمێکی یان ناسیاوێکی، بە بیانوی ئەوەی کە هۆتێلەکە گرانە، بەوەش زۆر بێتاقەت بووم و بوو بە دەنگە دەنگ لەگەڵیان، وتم وابزانن ئێمە لە سەیرانین ؟ ئێوە هەر شەو هەموو گەڕاونەتەوە و هەموو ئەرکەکەتان بۆ ئێمە جێهیشتووە، هەر ئەو ڕۆژەش کاک گۆران ناچار بوو کە پاسەکەی بەکرێ گرتبوو، تەسلیم کردەوە بە کۆمپانیاکە، ئەو بۆ ئەوەی بەکرێ گرتبوو کە بەکۆمەڵ بمان گەڕێنێت بە سەر مۆزەخانەو شوێنی کلتووری وڵاتی دانیماک، نەیئەزانی هەموو دوای ڕۆژێک هەموو پەرتەوازە ئەبن. ئەوەش زۆر دڵگرانی کردم بەڕاستی نازانم ڕاستی لای کاممان بووە؟ دوای ئەوەش ئێمە لەو کۆنسێرتانە داهاتمان هەبوو ئەو داهاتە لای کاک نیاز بەیاتی بوو، بۆ بەیانییەکەی هەمووی تەسلیمی کاک گۆران کرد و لە عەلاگەیەکی شەفافدا بوو، ئەویش یەکسەر تەسلیمی منی کرد، بڕوابکەن نازانم چەندی تێدا بوو هەر گەیشتینە ئەوێ یەکێکیان داوای ئەو پارەیەی کرد، منیش هەموویم تەسلیم کردو دابەشی کرد، ئەمە لە هەموو ئاهەنگەکان دووبارە ئەبۆوە ..بۆ شەوی دووهەم بەتەنها لە هۆتێلەکە مامەوە و بۆ بەیانیەکەی نزیکەی کاتژمێر ١٠ بوو لە خەو هەڵسام چووم بۆ کافتریاکەی کە جۆرەها خواردنی تێدا بوو بەڕاستی ئەوە یەکەمجارم بوو بەو شێوازە خواردنانە هەر لە پەنیری دانیمارکی و

چا وقاوە، گۆشت، قیمە و چەرەسات و شیری فرێش، پاش ئەوە بڕیارمدا بچم بۆ سوید بۆ شاری (یۆتۆبۆری) بۆ نیوەڕۆکەی لە ماڵی کاک ئیبراهیمی حاجی حەمە شەریف میوان بووین خزمەتێکی زۆری کردین و خێزانەکەی خاتوو (شیلان حامید) بوو. کە کاتی خۆی لە ئۆپەڕێتەکانی سەوزەو ڕێوی بەشدار بوو لەگەڵمان لە سالآنی ١٩٨٣ بە دواوە، کاتژمێر دووی نیوەڕۆ کاک ئیبراهیم بردمی بۆ تەرمینالی کۆبنهاگن و بلیتی شەمەندەفەری بۆ کڕیم و بە تەنها سوار بووم، وە کەوتمەڕێ و یەکەمین جارم بوو سواری شەمەندەفەر ببم .



## بەتەنها چووم بۆ سوید

لەڕێگا بەرەو شاری یۆتۆبۆری سوید دوای ماوەیەکی کەم کە گەشتینە سەر سنوور نامەیەک هات بۆ مۆبایلەکەم کە لەو وڵاتە چوومەتە وڵاتێکی تر، ئەگینا خۆ هیچ بازگەیەکی تێدا نەبوو وەک لای خۆمان نێوان شارێک و شارێکی تر چەندین بازگە هەبێت، لەڕێگا شەمەندەفەرەکە بە تونێلی وادا دەڕۆشت کە لە ژێر ئاو دروستکرابوو، یەکەمین شار کە گەیشتین بۆ ماوەیەکی کەم شاری (مالمۆ) بوو لەسوید، ئیتر شارو گوندی دەبڕی، لە ناو شەمەندەفەرەکە کچێکی گەنج نزیکم بوو هەندێ قسەم لەگەڵ کرد بە ئینگلیزی و پاش کەمێک گەیشتینە شارێک شەمەندەفەرەکە وەستا، هەموو سەرنشینەکان دابەزین تەنانەت من جانتایەکی گەورەم پێبوو لەگەڵ ئامێری کەمانچەکەم ئەو کچە هاوکاری کردم، من بەوە زۆر تێکچووم، لەدڵی خۆمدا نەشارەزا ! چی بکەم لێرە؟ ئەو کچە بێ ئەوەی بیناسم وتی کەمێکی تر شەمەندەفەرێکی تر دێت و سواری بەو دەتگەیەنێتە یۆتۆبۆری و بردمیە لای ویستگەی بلیت بڕەکان وپێی ڕاگەیاندن کە من بلیتی یۆتۆبۆریم بڕیوە و نابێت پارەی تری لێ بسێنن و لەگەڵم چاوەڕوان بوو وتی بەجێت ناهێڵم تا شەمەندەفەرەکە نەیەت، لەوێدا بیرم لە پەروەردەو گیانی هاوکاری ئەو وڵاتانە ئەکردەوە کە چەند جوان پەروەردە کراون، پاشان ژنێک کە تەمەنی نزیکەی پەنجا ساڵ بوو کە زانی غەریبم وتی مەترسە ئێمە هاوکاریت ئەکەیت و لەپڕ شەمەندەفەرێکی ڕەنگ نیللی هات و لە وێستەگەکە وەستا وتیان سواری بەو ئاهێک هاتەوە بەگیانما و زۆر سوپاسم کردن، نزیک کاتژمێر حەوت و نیوی ئێوارە بوو دنیا تاریک ببوو، هاوڕێیەکم چاوەڕوانی ئەکردم و گەیشتمە ئەو شارە، بەڕاستی ئەو هاوڕێیانەم لە هەندەران هەموو تەلەفۆنیان بۆ ئەکردم کە میوانیان بم ماوەی ئەو چەند ڕۆژە هەر شەوەی لە ماڵی هاوڕێیەکم یان خزمێکم بووم، جار جارەش ئەچوومە هۆتێل کە شەوی بە (٩٠) دۆلار بوو بۆ ئەوەی ئەرک نەبم بەسەریانەوە، لە شاری یۆتۆبۆری شەوێک لەماڵی ئاراسی شێخ جەمال بووم خزمەتێکی باشیان کردم، شەو ئاراس کە کاتی خۆی سەنتووری ژەن بوو لەگەڵمان سەنتورێکی هێنا هەموو ژێکانی خاو ببونەوە وتم بۆ کۆکیناکەیت؟ وتی دراوسێکان تەلەفۆنیان بۆ پۆلیس کردووە کە بێزارم کردوون، شەوێکی تر لە

ماڵی کاک هێمن عەلی بووم کەخێزانەکەی دلۆڤان کچی سەرگوڵی پورمە وهێمن دەنگی خۆش بوو شەو گۆرانی جوانی وت، بۆ بەیانی دلۆڤان بلوسێکی جوانی بۆ کوڕە بچوکەکەم بە دیاری بۆ هێنابوو، شاری یۆتۆبۆری دووهەم شاری سویدە کە شارێکی زۆر جوان و دڵگیر بوو.



## کۆنسێرتێک لە سوید

هەفتەیەک لەوێ مامەوە تا کۆنسێرتەکە مان دەستی پێ کرد کە بۆ کوردەکان بوو کە کاک گۆران پەیوەندی هەبوو لەگەڵ ڕەوان شاد (دڵشاد ئەحمەد) کە سەرۆکی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان بوو لەو شارەو شوقەیەکیان هەبوو بۆ ئەنجام دانی چالاکی هونەری و ئەدەبی، لەوێش پێشوازییەکی گەرمیان لێکردین، لەوێ بەڕێکەوت نوسەرو دەرهێنەری شانۆیی کاک (جەلیل زەنگەنە)مان دی کە کاک دڵشاد بانگهێشتی کردبوو بۆ کاری هونەری و هەروەها کاک مەریوان هەڵەبجەییش لە نەرویجەوە هاتبوو هەردووکیان لەگەڵ میوانەکانی کوردی ئەو شارە ئامادەی ئەو کۆنسێرتە بوون کە لە شەوی ٢٠١٣/١١/٨ ئەنجام درا لە هۆڵیک نزیک ئەو شوقەیەی کۆمەڵی هونەرەجوانەکانی لێبوو، لەو کۆنسێرتەدا ئاراسی شێخ جەمال پێشکەش کاری بوو، کاک نەوزاد ناوێک فلمێکی دۆکۆمینتاری لەسەر مێژووی تیپەکە درووست کرد کە زۆر جوان درووستی کردبوو بە وێنەو گۆرانییەکانی تیپەکەوە، پاشان کوردانێکی زۆر ئامادە بوون و چەندین هاوڕێی دێرینمان هاتبوون بۆ بینینی ئەو نمایشەو تێیدا گۆرانی بێژان هۆشیار حەمە فەرەج و مەریوان سەفادین چەند گۆرانییەکیان پێشکەش کرد، بۆ شەوەکەی ئێوارە خوانێکیان بۆ ئەنجام داین و پاشان چەند کەسێکمان شەو لە ماڵی کاک فەلاح ئەحمەد ڕەشیدماینەوە، بۆ بەیانییەکەی یەک دوو کەسیان چوون بۆ ئەڵمانیا ومنیش شەوێکی تر لای فەلاح مامەوە و بۆ ڕۆژی دوایی فەلاح بە سوپاسەوە هات لەگەڵم بۆ تەرمینالی ئەو شارەو جارێکی تر گەڕامەوە شاری کۆپنهاگن و ئامادە بوون بۆ کۆنسێرتی سێهەم.

## کۆنسێرتی سێیەم لەدانیمارک

کۆنسێرتەکە بۆکوردانی ئەو شارە سازدرا لە شەوی ۲۰۱۳/۱۱/۱٦ لەو کۆنسێرتە کاک گۆران پێشکەش کاری کۆنسێرتەکە بوو، من دەستێ جلی شاڵم بەدیاری بۆ بردوو بەو جلانەوە پێشکەشکاری کرد، هەموو بەرکەوتنێک لەگەڵ کەسانی دی ڕووداوی خۆش و ناخۆشی تێدەکەوێت کە پێویست بە باس کردن ناکات لێرەدا، لەوێشدا چەندین بەرهەممان پێشکەش کرد و مەریوان چەندین گۆرانی شادی وت و میوانەکان دەستیان کرد بە هەڵپەڕکێ تا کۆتایی ئاهەنگەکە.




شەوێکیان پێش ئاهەنگەکە کاک گۆران من و مەریوانی داوەت کرد بۆ ماڵی خۆیان بۆ ڕۆژەکەی بردمی بۆ ئەو کەنیسەی کە خێزانی مەلیک هاوسەرگیری تێدا ئەکەن بەڵام رۆژی شەممە بوو داخرابوو، دوای ئەوە بردمی بۆ مۆزەخانەی پاپۆڕیک کە ۲۰۰ ساڵ لەمەوپێش لە ئاوێکی ئەو وڵاتە نوقم ببوو زۆر گەورە بوو زۆربەی پارچەکانیان بە یەکەوە نوساندبووەوە چەند پارچەیەکی کەم بوو پێش چەند ساڵێک دۆزیبوویانەوە، ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام لەو وڵاتە ناهێڵن کەسانی خانەنشین و بە تەمەن بێزار ببن، ئەبینم زیاتر لە ۱٥ ژن و پیاوی بەتەمەن بە جلی

ئـالْو والاو ژنەکـان ئارایشـتیان کردبـوو بە پاسـێک هێنابوویـانن بـۆ سـەیری ئەو مۆزەخـانەیە، لەویٰ بەو شـێوە ڕیـز لە خانەنشـین و بەتـەمەن ئەگـرن نەک لای خۆمان کە خانەنشینان لە ڕیزی وەرگرتنی مووچەدا دەمرن .

گەڕان بەناو شاری ستۆکهۆڵم و بەسەرکرنەوەی هاوڕێیان و دۆستان

ئـێمە پلانـی بەرنامەکانمـان تەواو ببـوو، بەڵام عەزیـزو هۆشـیار لەگەڵ کـاک بەختیاری سلێمان بەگ ڕێکەوتبوون کە ئەم ئاهەنگەش ببەینە پایتەختی سـوید لـە ستۆکهۆڵم، ئیتر پێش چەند ڕۆژێک پێش ئەوە کەوتینە ڕیٰ بۆ ستۆکهۆڵم، سواری شەمەندەفەر بـووین ئەمجارەیـان بە شـەمەندەفەرێکی دووقـات بەڕیٰ کەوتـین کە وەک پاسەکانی بەغدادی سالانی حەفتاکان وابوو، بەڵام زۆر درێژتر، ئێمە ئێـوارە کەوتینەڕیٰ، شەومان بەسەردا هات ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام پیاو و ژنێکی نابینا هەبوون هەردووکیان هەتا دابەزین لە شارێک پێش ئێمە دەسـتیان خسـتبووە نـاو دەسـتی یەکتـر و ئەیـان چپـان بە گـوێی یەکتـردا، لەوێـدا بیـرم لەوە ئەکـردەوە کە خۆشەویستی مانای هەست و بینیش نازانێت کە چەند بەیەکەوە ئاسـوودە بـوون، بۆ شەوەکەی درەنگ گەشتینە شاری (ڤیستریس) کە مـاڵی هـاوڕێیەکی ئازیزمـان لەویٰ بـوو لەگەڵ مـاڵی حەمەی مـامە خالـدم، هەر گەیشـتینە ئەویٰ کـاک مەحمـود ئەحمەد عبدالرحمن کە ئەنـدامی دێرینـی تیپەکەمـان بـوو هەر لەگەیشـتنمانەوە بـۆ هەندەران هەمیشە وبەردەوام پەیوەندی پێوە ئەکردم بە تەلەفۆن، ئەو شـەوە چوار کەسـمان لە مـاڵی مـەحمـود مـاینەوە مـن و عەزیـز و هۆشـیارو توانـا خورشـید، خێزانەکەی (فەوزیە خان) خزمەتێکی زۆری کردین، چـونکە مـن هەر لە منـاڵییەوە ناسیاویمان لەگەڵیدا هەبووە کە کچی حاجی مەولودە ، شەوی دواتـر مـەحمـود بە درەنگانیکی شەو ئەوانی بردە ستۆکهۆڵم و هاتەوە، من دوو شەو لەماڵی مەحمود بووم کە دەست بڵاوانە خزمەتی ئەکردم لەو کاتەدا تەکسییەکی پیٰ بـوو ئەو دوو ڕۆژە زۆر شـوێنی شـارەکەی گەڕانـدم، هەروەهـا پاشـان حـەمەی مـامە خالـدم شەوێک لە ماڵیان مامەوە و زۆر خزمەتی کردم، هەر لە شارەکەی مەحمود بـووم کـاک گـۆران هەڵەبجەیـی تەلەفـۆنی بـۆ کـردم وتـی لەگەڵ پێشکەشـکار خـاتوو (نەجیـبە) لە تەلەفزیـۆنی (سـتێرک) چاوپێکەتنتـان لەگەڵ ئەکـات، دوای ئەوە بـۆ ڕۆژی دوایـی دەبـوایە بچومـایە بـۆ سـتۆکهولم لەگەڵ کـاک ئیسـماعیلی حـاجی مەولود هات لەگەڵم بۆ ئەوەی بەڕیٰ بکەوم کە برای خێزانەکەی مەحمـودەو هەر

لە مناڵیەوە ئەیناسم و هات لەگەڵم بۆ تەرمیناڵەکە و بلیتی بۆ بڕیم وبەو تەمەنەوە بەڕێـزەوە جانتـاکەمی پـێ بێـت لەو هەنـدەرانە هەمـوو شـت بە کـاتە بـۆ نمـونە شەمەندەفەرێک ٤ خولەک ئەوەستێت بۆ ئەوەی سەرنشین سوار بێت، مـن شـتم زۆر پـێ بـوو وا ڕێـکەت کـاک ئیسـماعیل جانتـاکەی منـی پـێ بـوو هـاتە نـاو شەمەندەفەرەکەو ڕۆشت ئەویش تووش بوو سوار بوو لەگەڵم من زۆر شـەرمم لەوە کرد بەڵام وتی ئێرە وایە و نزیکەی نیوکاتژمێر لەناو شەمەندەفەرەکە بوو تـا گەیشتە وێستگەیەکی تر ئینجا دابەزی و گەڕایەوە، پاش ئەوە گەیشتمە ستۆکهۆڵم وزۆر هاوڕێ چاوەڕێیان ئەکردم، ئەندامێکی دێرینی تیپەکە کاکە ڕزگاری شێخ سدیق هات بە شوێنما و بردمیەوە لای خۆی کە هۆشیار و عەزیزیش لەوێ بوون، دوو سێ شەو لای ڕزگار بـووم کەبەڕاسـتی خزمەتێکی جوانی کـردین، خـۆی بە تەنها دەژیا.

شـاری ستۆکهۆڵم تـا بڵێیت جوان بـوو خـەریکی خـۆ ئامـادە کـردن بـوون بـۆ جەژنی سەری ساڵ، هەموو شەقام و ماڵ و مۆڵەکان بە گڵۆپی سپی بە زنجیرەیی ڕازابوونەوە و شەوێک لە ماڵی رزگار بووم بەرامبەر شوقەکەی هۆڵێک هەبوو دەنگی مۆسیقا ئەهات کەسەیرم کرد چەندین ژن و پیاوی بەتەمەن خەریکی پرۆڤە کردن بوون و سەمایان دەکرد، سەیرم لێهات وتم ئەوە چییە؟ وتـی ئەوە خۆیـان ئامـادە ئەکەن بـۆ ئەنجـام دانـی چـالاکی سـەماو گـۆرانی بـۆ سـەری سـاڵ، کە لە بەلـەکـۆنەی شـوقەکەیەوە سـەیری شـوقەکانی تـرم ئەکـرد هەمـوو ماڵێـک پەنجەرەکەی ڕازاندبووەوە بە گڵۆپ و مۆم، یەک شتی تریشـم بەدی کرد هەمـوو ئەو شـوێنانەی دیـم لە مـاڵی هـاوڕێ وئوتێـل و شـوقە هەمـوو گڵـۆپی زەردیـان دائەگیرسـان، نەک نیـۆن، ئەوەش بـۆ ئەوە ئەگەڕێـتەوە کە هێنـدە خـۆر نـابینن، دەچوومە هەرماڵێک هەموو مێزەکانیان بە هەموو جۆرە میوەیەک ڕازاندبووەوە، هەموویان جۆرەها خواردنەوەیان لە سەلاجەکانیاندا هەبوو.

لەو ماوەیەی کە لەو شارە بووین چەندین هاوڕێ و دۆستانمان بینی شـەوێک سێ کەسمان لە مـاڵی کـاک عەبدوڵای حەمەلاوبەگ میوان بووین مـن و عەزیـزو هۆشیار، بەڕاستی خزمەتێکی زۆریان کردین و دوای نانن خواردن ئەوان ڕۆشتن بۆ ماڵێکی تر مـن مـامەوە لای عەبدوڵا پێکەوە تـا درەنگـان پێکەوە دانیشـتین، بـۆ سبەی زۆر شـوێنی شـاری سـتۆکهۆڵمی گەڕانـدم لەوانە سـەنتەری شـارەکە کە

هەمووی بینای کۆن بوون، بەڵام بە جوانی مابوونەوە، نەدەبوو ئۆتۆمبێلی پێدا بڕوات و کۆڵانەکانی تەسکبوون، بۆ کەنیسەیەکی مێژوویی بردم، بورجێکی گەورە کە بەرزیەکەی (٥٠٠)مەتر بوو بە (مەسعەد) خێرا سەرکەوتین کە هەر وەک ئەوە وابوو لە باڵەخانەیەکی پێنج قات سەربکەوێت چونکە ئەو بەرزییە زۆرەی بە خێرایی ئەبڕی کە لە سەرەوە کافتریای تێدا بوو، دووربینێک کە هەموو شارەکەی نزیک ئەکردەوە، کە چەندین پاپۆڕ لەو دورگانە وەستا بوون، ئەو شارە بە دەیان دوورگەی بچوکی تێدا بوو، بەڕاستی من لە هەر ماڵێک لەشەوێک زیاتر نە ئەمامەوە، مەگەر دەگمەن، چونکە هەموو ئیش و کاریان هەبوو، بۆ شەوێکیش کاک (تەهای حاجی بەکری دارتاش) هات بە شوێنمدا و لەماڵی ئەوان مامەوە، تەها کە لە هەڵەبجە بوو زۆر سەردانی ئەکرین و وەک ئەندام وابوو لەگەڵمان، تەنانەت ساڵی (١٩٨٢) بەشدار بوو لە گەڵمان لە کۆنسێرتێکی هەولێر وەک کۆرس، دارتاشیش بوو زساڵی (١٩٨٢) کە ستۆدیۆیەکمان درووست کرد زۆر یارمەتی ئەدام و هەردووکمان پێکەوە درووستمان کرد، ساڵی ١٩٨٥ یش پێکەوە لە مەڵبەندی لاوان بە تەبەدۆر ستۆدیۆکەمان ڕوو پۆش کردو سەقفمان بۆ کرد، دەنگیشی خۆش بوو شەیدای حەمەی ماملێ بوو، شەو پێکەوە دانیشتین و چەندین گۆرانی وت ومنیش کەمانەکەم پێبوو .

## کۆنسێرتێک لە ستۆکهۆڵم

لە ڕۆژی ٢٠١٣/١١/٢٤ لە چێشتخانەیەکی گەورە لەو شارە کۆنسێرتەکەمان ئەنجام دا بەڵام دوو ئەنداممان گەڕابوونەوە لەوانە دانا شێرکۆ کە بە کیبۆرد لەگەڵمان بوو وە زۆزک ئەحمەد کە ژەنیاری کەمان بوو، زۆر لە هاوڕێیانمان ئامادەبوون، هۆڵەکە پڕ ببوو لە کوردانی ئەو شارە، ئەوە کۆتا کۆنسێرتمان بوو. کە ڕۆشتم بۆ هەندەران مۆڵەتی دوو مانگم لە فەرمانگەکەم وەرگرتبوو وام ئەزانی زۆر ئەمێنمەوە، بەڵام هەرچەندە بە فەرمی ڕۆشتبووین، بەڵام هەستم ئەکرد ژیان لەوێ جیاوازە و هەستم بە نامۆیی ئەکرد و بیری وڵاتم ئەکرد و

ئەمگووت چی لەو جوانییە بکەم کە هیچ پەیوەست نییە بە مێژوومەوە، پاشان دراوسێ و خزمی دێرینم کاکە نەورۆزی وەستا عوسمانی وەستا مەردان کە زانیبووی لە ستۆکهۆڵمم هات بە شوێنمداو دوو شەو بەو پەڕی ڕێزەوە و خزمەتێکی زۆرەوە لە ماڵیان بووم، دەبوایە بۆ گەڕانەوە بۆ کوردستان بگەڕاینایەتەوە بۆ دانیمارک و پارەی هەردوو سەرمان دابوو، بەڵام تاقەتم نەماو بۆ جارێکی تر بلیتی گەڕانەوەم لە سوید کڕییەوەو بەرە بەیانی ڕۆژی ٢٠١٣/١١/٢٧ نەورۆز بە ئۆتۆمبیلی خۆی هێنامیە فڕۆکەخانەی ستۆکهۆڵم و لەگەڵ زۆربەی ئەندامان لەفڕۆکەخانەی ستۆکهۆڵم ڕاستەوخۆ گەڕاینەوە فڕۆکەخانەی سلێمانی ..




ستۆکهۆڵم - لەگەڵ عەبدوڵڵا حەمەلاو بەگ

## دوای گەڕانەوە لەسەفەری دانیمارک و سوید

پاش ئەوەی کە گەڕاینەوە ئێمە قەرزاری کرێی هاتوچۆی فڕۆکەبووین، بۆیە لە مانگی ١٢چووم بۆ هەولێر وچوومە لای بەڕێوەبەری گشتی لاوان و زۆر هەوڵم دا تا بتوانم موعامەلەکان تەواو بکەم، هەرچۆنیک بوو کاری ئەوێ تەواو بوووە کاری تری زۆر مابوو لە بەڕێوەبەریتی گشتی بانکی هەرێم لە هەولێر و گەیشتمە بانکەکە وچەندین ژووراو ژووریان پێکردم، تا گەیشتە لای جێگری بەڕێوەبەری گشتی کە زۆر پاساوی هینایەوە ئەیگوت چۆن ئەبێت تۆ بەناوی شەش کەسەوە پارە وەربگریت؟ ئەمگوت من سەرۆکی ئەو تیپەم و بەرپرسیارم لێی و باوەڕی نەئەکرد و خەڵکی هەولێر بوو نەی ئەناسیم، زۆر نائومێد بووم پاشان هەموو نوسراوەکانم لێوەرگرت و چوومە لای بەڕێوەبەری گشتی بانکی هەرێم و فایلەکەم دا بە سکرتێری بەڕێوەبەرو دانیشتم و چاوەڕێم ئەکرد، بەڵکو هیچ تەگەرەیەک نەیەتە سەر بەڕێوەچونی موعامەلەکە، پاش کەمێک سکرتێرەکەی بانگی کردم و ناوەکەمی خوێندەوە وتی بەڕێوەبەر بانگت ئەکات کە چووم سەیرم کرد بەڕێوەبەری گشتی بانکی هەرێم کاک (عوسمان ساڵح ژاژڵەیی)یە کە پێکەوە لە کۆلێجی بەڕێوەبردن و ئابووری چوار ساڵ پێکەوە خوێندکار بووین، تەنانەت لە قوناغی سێی کۆلیج هەردووکمان لە ژورێکدا بووین لە بەشی ناوخۆیی لە گەڕەکی (راغبة خاتون) لە بەغدا، کە دیم ئیتر ئاهێکم پێدا هاتەوە و زۆر ڕێزی لێ گرتم وتی خەمت نەبێت چۆن ئەهێڵم بەدەستی بەتاڵ بڕۆیتەوە، لەگەڵ کاک عوسمان هاوڕێیەتیمان بەردەوام بوو لە دوای تەواو کردنی خوێندن، تەنانەت لەسەر دۆلابێک لە ژوورەکەی ئامێرێکی کەمانی دانا بوو نازانم بۆ؟ باش بوو کاری ڕاست بێ ئیمزای ڕەزامەندی بۆ کردم و پاش ئەوەی لەوێ تەواو بووم، بۆیان کردم بە (چەک) ناردمیانە بانکێک لە هەولێر کات گەیشتبووە یانزەی نیوەڕۆ و گەیشتمە بانکەکە و پاش چاوەڕوانی چەکەکەیان بۆ سەرف کردم و پارەکەم وەرگرت و کردمە عەلاگەیەکی ڕەش و سواری تاکسی بووم و چوومە بازاڕی دۆلارەکەی هەولێرو دینارەکانم گۆڕییەوە بە دۆلار بۆ ئاسان هەڵگرتنی، یەکسەر بێ ئەوەی نان بخۆم تاکسیم گرت بۆ تەرمیناڵی سلێمانی و یەکسەر سواری تاکسی بووم و گەڕامەوە بۆ سلێمانی، ئیتر ئاهێک هاتەوە بەگیانمدا و لەڕێگا بیرم ئەکردەوە باشە ئەگەر بەبۆنەی ئەو هاوڕێیەمەوە نەبوایە

و ئەو پارەم وەرنەگرتایە ئەو بڕە پارەم لە کوێ پەیدا بکردایە؟ بۆ عەسرێکی درەنگ گەشتمەوە سلێمانی و چوومەوە بۆ تیپ ئەبینم دوو کەس لەوێ بوون لەو ئەندامانەی لە سەفەرەکە لەگەڵمان بوون ئەوانیش توانا خورشید و فوئاد کەریم و بڕی پارەکەم دایە دەستیان و ئەوانیش بردیان بۆ ئەو کۆمپانیایەی کە بلیتەکانمان لێ بڕیبوون ئیتر لەو بەرپرسیاریێتیە ڕزگارم بوو .

## یادی هەڵەبجە لە ٢٠١٤/٣/١٦

زۆربەی ساڵەکان کە یادی کیمیابارانی هەڵەبجە دێتە پێشەوە ئامادەکارانی ئەو بەرنامانەی تایبەتە بەو ڕۆژە، چ پێشکەش کار یان ڕێکخەری بەرنامەکە، پەیوەندیم پێوە ئەکەن بۆ ئەنجام دانی بەرنامەیەکی تایبەت بەو ڕۆژە، هەروەها پەیوەندی کردن بە کەسانی پسپۆڕەوە لەو یادەدا، جاری وا هەیە ئەو بەرنامە لە دەرەوەی ستۆدیۆ یان لە ناو ستۆدیۆ ئەنجامی ئەدەین، بۆ ئەمساڵە لە ناو ستۆدیۆی کەناڵی کوردسات ئەو بەرنامەیەمان ئەنجام دا.

وە هەر کاتێک پێویستمان بە ئەندامی تر بێت چ وەک مۆزیک ژەن یان گۆرانی بێژ بانگهێشتیان ئەکەین ئەوانیش بە سوپاسەوە هاوکاریمان ئەکەن، هەروەها من هەر کەسێک شارەزا بێت لە بوارێکدا بانگهێشتی دەکەین، هەر ئەو ساڵە پەیوەندیم کرد بە ڕەوان شاد مامۆستا ئازاد حەمدی و ڕەوان شاد ئەسغەر ڕەشید و مامۆستا محەمەد حەمە تۆفیقیش وەک شارەزایەکی جینۆساید بانگهێشت کرابوو، گۆرانی بێژان خاتوو تارا ڕەسول و کاک شاخەوان کەیخەسرەو لە هەندەران گەڕابوونەوە بەشداریان لەگەڵ کردین، هەروەها کاک ئاریان کەریم و کاکە ئاری، وەخاتوونێکی ڕۆژ هەڵاتی بەناوی (نێرگز) بەشداری کرد، چەند بەرهەمێکیان پێشکەشکرد، لەوانە تارا ڕەسوڵ (بەتەنیا جێم مەهێڵن)ی وت، شاخەوان ئاوازێکی منی وتەوە بە ناوی (هەوای باخی میر) چەند بەرهەمێکی تر کە لە یادم نەماون هەروەها پیشکەشکاری بەرنامەکە ڕەوان شاد خاتوو (لانە)بوو، هەروەها مامۆستا ئازاد حەمدیش هاتبوو بۆ قسەکردن و لێدوان دەربارەی مێژووی هەڵەبجە.



تارا رەسوڵ ـ ئاریان کەریم ـ نێرگز



شاخەوان کەیخەسرەو



ئازاد صاڵح ـ ئازاد حەمدی. ئەوەی لەدواوە دەرچووە: عەزیز حەمە کەریم

## هونەرمەند مستەفا ئەحمەد شوێنەکەی تیپی پێشڕەوی دا  بە ئێمە

پاش ئەوە کەوتمە بیر کردنەوە لەگەڵ خۆمداو ئەمووت ! باشە من بۆ وا ئەکەم ؟ئەم هەموو ماندوو بونەو دوای ئەوەش پیاو خراپ بم؟منیش تاکێکم وەک ئەوان بۆ ئەوەندە ساویلکە بم؟ بۆیە ئیتر لە چالاکی وەستام و گوێم نەئەدایە هیچ.

بۆیە وردە وردە ئەمویست خۆم دوور بخەمەوە،تەنانەت لە ناو بارەگای تیپەکەش.

لە ساڵی (٢٠١٤) سەرەتای قەیرانی دارایی سەری هەڵدا بە هۆی نەناردنی بودجە لە بەغداوەو بە سەربەخۆ فرۆشتنی نەوتی هەرێمەوە و کوردستان کەوتە بارێکی ناهەموار، ئیتر (نەسریە) تیپە هونەرییەکان وەستا، چەندین تیپ هەڵوەشانەوە چ شانۆیی یان مۆزیکی لەبەر نەبونی کرێی بارەگای تیپەکانەوە، بەڵام ئێمە لە بینای دەبۆکەین کە موڵکی شارەوانییە و هەر لە سەرەتاوە شوێنێکی پەراوێز خراوەو کرێ نادەین، بۆیە ماینەوە لەو شوێنەدا، لەکۆتاییدا بڕی (١٥٠٠٠٠٠) یەک ملیۆن و پێنج سەد هەزار دینار مابوو لای ژمێریاری تیپ، بەتوانا ئەبوبەکرم وت هیچ خەرجی مەکە، لەو شوێنەی ئێمە بەرامبەرمان تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردی هەندێ کەل و پەل و کورسی و دۆلابە شکاو و کتێب و ئەرشیف هەیە، بەرپرسی ئەوان  هونەرمەند (مستەفا ئەحمەد) بوو، ڕۆژێکیان لە چایخانەی جمهوری دانیشتبوو، منیش لەوێ بووم چایەکم ئەخواردەوە، چوومە لای و پێم وت خۆ ئێوە نایەنە ئەو شوێنە و زۆربەی شتەکانتان کۆنەو بە کەڵک نایەت، شوێنەکەی ئێوە فراوانە و ئەو شتانەتان ئەخەینە شوێنێکەوە و وەک گەنجینەیەک لەوێ دایئەنێین با دیوارێک لەو هۆڵەدا دروست بکەین، نیوەی بۆ ئێمە نیوەشی بۆ ئێوە، هەرچۆنیک بێت قەناعەتم پێکرد، ئیتر ئەو کاتانە کەم کەسیان هاتوو چۆی تیپیان ئەکرد، ئیتر بە من و توانا خورشید و فوئاد کەریم خەریکی بووین و سەرپەرشتیمان ئەکرد ئیتر ئەوانی تر هەر ئاگایان لە هیچ نەبوو، ئەو بڕە پارەمان لەو شوێنەدا خەرج کرد.

ئیتر من شوێنێکی خۆمم دەست کەوت و ڕۆژانە بە تەنها لەو هۆڵە تەمرینم ئەکرد و کاتم بەسەر ئەبرد، وەک پێداویستی چەند کورسییەکی کۆن و مێزو ئەوانەی تێدا بوو لە گەڵیاندا خۆمم گونجان.

**یادی ٢٠١٥/٣/١٦ لەسەر گۆڕی شەهیدان کرایەوە**

ئەو ساڵە کەناڵی کوردسات پێی ڕاگەیاندین کە یادی کیمیابارانی هەڵەبجە بکەینەوە لەسەر مەزاری شەهیدان، بۆ عەسرەکەی بە ڕاستەوخۆ پەخشکرا، ئەم گۆرانی بێژانە بەشدار بوون:

لوقمان سەلیم، ئاڤان عوسمان، شیلان عوسمان، ئەنجام عبدالواحید.

جگە لەم گۆرانیبێژانە چەند بەرهەمێکمی ترمان پێشکەشکرد لەوانە کۆڕاڵی (هۆ خەڵکینە).



## کردنەوەی خولی مۆزیک لە خانەی مۆزیکی منالأن

لە هاوینی ئەو ساڵەدا خولێکی مۆزیکمان کردەوە بۆ فێرخوازان، هەندێ فێرخواز فێری مۆزیک ببوون، لەڕۆژی ٢٠١٥/٨/١٨ نمایشێکیان ئەنجامدا لە پەیمانگای پۆلەتەکنیکی سلێمانی.



## ساڵی ٢٠١٦ و یادگاری ساڵانی حەفتاکان لە فەیسبووک

لەم ساڵەشدا لە تیپی شنرویێ هیچ چالاکییەکی هونەریم نەبوو، بەڵکو بۆ خۆم خەریکی پرۆڤە کردن بووم وزیاتر تەنها بووم، لە فەیسبووک زۆرجار گۆرانییە کۆنەکانی تیپم مۆنتاج ئەکرد و خەریکی کۆکردنەوەی ئەرشیفەکان بووم و مامۆستا هەڵکەوت شێخ محەمەد چەند شریتێکی کاسێتی ساڵانی حەفتاو هەشتاکانی لامابوو چووم لێم وەرگرت، هەرچەندە کوالیتیان لەڕووی تۆمار کردن باش نەبوو، چونکە لە ئاهەنگدا تۆمار کرابوون، بەڵام ناو بەناو گۆرانیم بڵاو ئەکردەوە، بە تایبەت گۆرانی (هاوڕێی گیانی بەگیانی)کە ئاوازێکی هیندی بووکە ڕەوان شاد ئۆمێد نوری هێنابووی و تێهەڵکێشی هۆنراوەیەکی نیهاد شێخ عارفی کردبوو کە چیرۆکی عەشقێکی ڕاستەقینە بوو، بەدەنگی (ئازادی مەحمودی سەڕاج) نمایشمان کردبوو، کاتێ بڵاوم کردەوە خەڵک زۆری بە دڵ بوو، چونکە یادگاری ساڵانی حەفتاکان بوو، سۆراغی شاعیرەکەم ئەکرد بیبینم بە هۆی مامۆستا ڕەئوف حەمە عەلی پورزایەوە دۆزیمەوە، وتی لە هەندەران گەڕاوەتەوە و ڕۆژی٢٠١٦/٩/١ بە تایبەت چووم بۆ لای لە سلێمانی لای باخی گشتی یەکترمان دی و بەدەست خەتی خۆی هۆنراوەکەی بۆ نوسیم لەگەڵ کاسێتێک لە شیعرەکانی خۆی بەداخەوە لێم ونبوون.

ڕۆژێکیان کە ئەو گۆرانییەم بڵاو کردەوە (خوشکان)ی حەمە فەرەجی کۆێخا لەهەڵەبجەوە بە تایبەت هات بۆ تیپ بۆ لام ئەو گۆرانییەی بە ئاوازێکی تر بۆ وتم وهانی دام بگەڕێمەوە بۆ هەڵەبجە بۆ فێرکردنی فێرخوازان لە هەڵەبجە.

نیهادی شێخ عارف /ئازاد ساڵح /سلێمانی ٢٠١٦

لەبیرت دێ لە هەڵەبجە

لەبیرت دێ لە هەڵەبجە
شواران بەلا زولەبجە

ئەهاتی بەرەو کانیشێخ
بەیار لەسەر نوکی پەنجە
نیپەر ئەبوی بە پەردەی چاو
نازت ئەفرۆشت بەسەرما
ئەتوبیست لەهەڵسم کردنوش بەرم
منیش نەم ئەکرد لەسەرما

ئەهاتجارەکەی لەهاتنم
دوای پێکەنینت پێ کردم
لەبیرمە کە لەدڵی لام دا
بە پەنجە بانگت لێ کردم
هاتم بۆلات دوو دڵیش بووم
لەوەی کە پڕ ئەبووم کەی
نەم زانی کە نەزفمانی و
بە ئەتوی گلەیم لێ لەی

هاتم بۆلات دیم پێکەنین
دیم لێوی پڕخەندەی شیرین
ئەزموت خزمین
ووتم شادم
پرسیم ناوت وتت "نەسرین"

لەگەڵ
ڕێزم

شیعری (لەبیرت دێ لە هەڵەبجە) بەدەستوخەتی کاک نیهاد شێخ عارف

## گەڕانەوە بۆ هەڵەبجەو دروستکردنی فێرگەی موزیک

وە لە ڕێکەوتی ٢٠١٦/٩/١٤ گروپێکی ژنانی یەکگرتوو هەبوون و بانگیان کردم بۆ باسکردنی مێژووی هونەری مۆسیقای هەڵەبجەو یەک دوو کاتژمێر باسی ئەو ڕەوتە مۆزیکییەم بۆ کردن و لە کۆتایشدا یەک دوو کتێبیان پێشکەش کردم کە ڕۆشنا صالح سەرپەرشتی ئەکردن وئەمانیش هانیان دام کە بتوانم بگەڕێمەوە بۆ هەڵەبجەو بۆ کردنەوەی خولی مۆزیک .

ئیتر وردە وردە کەڵکەڵەی ئەوەم کەوتە سەر کە بتوانم لە هەڵەبجە بنکەیەکم هەبێت بۆ ئەوەی جارێکیتر گورو تین بخەمەوە هونەری مۆزیک لە هەڵەبجە، چونکە هەڵەبجە پێویستی بە فێرگەی موزیک بوو، بۆ ئەوەی هەر لەمناڵییەوە بناغەی هونەری بۆ دابنرێت.

هەروەها لەوە بێئومێد ببووم کە لە سلێمانی تیپەکە کۆ بکەمەوە، چونکە بیرو بۆچونی جیاواز درووست ببوو منیش تاقەتی ئەوەم نەمابوو کە جارێکی تر بگەڕێمەوە ناو چوار گۆشەی یەکەمەوە، کۆتایی ساڵی (٢٠١٦) نزیک ببووەوە منیش هەر بیرم ئەکردەوە چۆن ئەو بەرنامەیە جێبەجێ بکەم بە بێ ئەوەی بە هیچ کەس بڵێم ..

## چۆن فێرگەی (شنروێ)مان کردەوە لە هەڵەبجە

لە مانگی ١١ ی ساڵی ٢٠١٦ دەمەو ئێوارەیەک لە سەرەتای شەقامی مەولەوی کاتێک لە تیپ دەگەڕامەوە بەڕێکەوت کاک (ڕزگار حەمە نوری) ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای سلێمانیم دی تۆزێک ڕەتبووم لێی و دوایی گەڕامەوە، دوای چاک و چۆنی، پێم وت ئەمەوێت گەر بکرێت تەلەفۆنێک بۆ کاک (عەلی عوسمان) پارێزگاری ئەو کاتی هەڵەبجە بکەیت کە بزانم ئەتوانێت خانوویەکمان بۆ بەکرێ بگرێت بۆ ئەوەی فێرگەیەکی مۆزیک بکەینەوە بۆ فێربوونی فێر خوازان، ئەویش تەلەفۆنی بۆ کردو وتی با شەو خۆی تەلەفۆنم بۆ بکات و ژمارەکەیم وەرگرت، بۆ

شەو نزیکەی کات ژمێر(٩) تەلەفۆنم بۆ کرد وەڵامی دامەوە و وتی باشە بەسەرچاو وتم ئاخر هەر قسە نەبێت، وتی تۆ سبەی وەرە بۆ لام، بۆ بەیانی ڕۆژی ٢٠١٦/١١/٣ چووم بۆ لای و ئەویش فەرمانبەرێکی لابوو بە ناوی کاک (سەردەشت عوسمان) وتی پاش نیوەڕۆ بگەڕێن و خانوویەک بگرن بۆ فێرگەکە و من مانگانە کرێکەی ئەدەم، منیش دەرچووم لای و لە ناو جەرگەی شار نزیک باخی گشتی خانوویەک لێی نوسرابوو بۆ کرێ، ئەوەم دەست نیشان کرد بۆ پاش نیوەڕۆکەی کاک سەردەشت بە ئۆتۆمبیلی خۆی هات و منیش پێش ئەوە (ڕۆشنا صالح)م ناسیبوو کە لە گروپی بەرین بوو، هەرسێکمان پێکەوە چەند گەڕەکێک گەڕاین بەڵام من هەر ئەو خانووەم بەدڵ بوو، هەرچەندە کۆنیش بوو، بەڵام شوێنەکەی ناو جەرگەی شار بوو، ئیتر تەلەفۆنمان کرد بۆ خاوەنەکەی هەرچەندە خانووی براکەی بوو کە لە هەندەرانە، بەڵام براکەی کەسێکی چاک و ڕێکو پێکەودوایش دادە خوشکانی حەمە فەرەجی کوێخا هات لە گەڵمان و چووین بۆ دوکانەکەی (کاک وەزگێڵ) لەوێ (عەقد)ی کرێی خانوەکەمان پڕ کردەوە ڕێکەوتین مانگی بە (٢٠٠٠٠٠) دوو سەد هەزار دینار، بۆ ئێوارەکەی گەڕامەوە بۆ سلێمانی، تا ئەم کاتە هیچ کەس لە ئەندامانی تیپی شنروێ ئاگادار نەبوون، بۆ ڕۆژی دوایی هاتم بۆ تیپ لە سلێمانی و چوومە هۆڵەکەو کەمانەکەم بە دەستەوە بوو بۆ خۆم لەگەڵ لێدانی مۆزیک بیرم ئەکردەوە و نەخشەم دائەنا و چی بکەم و چی نەکەم، چونکە ئەم کارە بە یەک کەس ناکرێت، من لە ناخی خۆم کاک (عادل حەسەن)م دەست نیشان کردبوو، بۆیە تەلەفۆنم بۆ کردو پێم وت من شتێکی وام کردووە، خانوویەکیان بۆ گرتووم لە هەڵەبجە بۆ فێرگەی مۆزیک پێم وت جارێ وەڵامم مەدەرەوە و بیری لێ بکەرەوە، چونکە دەبێ ماڵ و منداڵ جێ بهێڵین و شەو بمێنینەوە و ئەمەش هەروا ئاسان نییە، ئەو وتی دێم لەگەڵت وتم ئاخر ئەمە ئاسان نییە هەر دووبارەی کردەوە و وتی هاوکارت ئەبم، ئیتر پێکەوە بڕیارمان دا نەخشەی چوونمان بۆ ئەوێ بکێشین.

ئەوەی کە ئاسان نەبوو بۆمان ئەو خانووە خانوویەکی ڕەق و تەق، هیچی تێدا نەبوو، خانوویەکی کۆن و زەوییەکەی کاشی نەبوو ئاوی دەرنەئەچوو، یەک دوو مۆزیک ژەن لە هەڵەبجە هەبوون، بە ناوەکانی (کرمان جەلال و ڕێباز عەبدوڵا) کە دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەکان بوون.

له سلێمانی بووم تەلەفۆنیان بۆ کردم وتیان  بە نیازن فێرگە بکەنەوە؟ وتم بەڵێ و ئەمەویێت پێکەوە جووڵە بخەینە هونەری مۆسیقا لەو شارەدا، لە وەڵامەکەی دیار بوو کە حەزی  نەئەکرد پێکەوە کار بکەین، وتم باشە من و عادل دێین بۆ هەڵەبجە و قسەی لەسەر ئەکەین، بۆ ڕۆژی دوایی من فەرشێک و مێزێک وسۆپایەک و چەند پێداویستی و قاپ و قاچاخم لە ماڵی خۆم برد، چەند کەسێکیش بە سوپاسەوە هاوکارمان بوون یەکێک لەوانە کاک (فریادی غەفوری حەبێ) و دادە (خوشکان حەمە فەرەج) کە گسکیان دەست نەکەوتبوو بە پەڕۆ ئەو خانوەیان گسک دابوو و پاکیان کردبووەوە، کاک فریادیش تەلەفزیۆنێکی بەکارهاتووی ماڵی خۆیانی هێنابوو، کە گەشتینە هەڵەبجە من و عادل شتەکانمان داگرت و لە سوچێکی هۆڵەکە داماننناو دوایی چووین بۆ باخی گشتی و ئەو دوو کەسەی کە ناوم هێنان هاتن، من کرمانم ئەناسی بەڵام ئەویتر ئەوە یەکەمجاربوو ببیینم، هەرچەندە باوکیم ئەناسی، ئیتر کەوتینە گفتوگۆ، ئێمە بە نیازێکی پاکەوە چووین بۆ ئەوەی بتوانین پێکەوە کار بکەین، بەڵام ئەوان ئەیان وت ئێمە تیپی خۆمان هەیە و (ناوی تیپی مۆسیقای هەڵەبجە)یە، وتم ئێمە ساڵی (١٩٧٣) بەو ناوەوە تیپمان داناوە و دوایی ناوەکەیمان گۆڕیوە بۆ تیپی شنروێ، وتم چەند کەسن؟ وتیان (٧) کەس، هەرچەند ئێمە نەرمیمان ئەنواند بەڵام ئەوان نەیان ئەویست لەگەڵمان بەشداربن، بۆیە وازمان لەو بیرۆکەیە هێنا، عادل یەک دوو مۆزیک ژەنی تری سەرەتایی ئەناسی چووین بۆ لایان ئەوانیش تاقەتیان نەبوو، ئیتر هەر خۆمان ماینەوە و گەڕاینەوە، ئیتر کات بەرەو سەرماو سۆڵەو باران ئەڕۆشت، شوێنەکەشمان پێویستی بە ئامێرو شتی ناو ماڵبوو، تا لەڕۆژی ٢٠١٦/١٢/٥ خۆم بە تەنها لەگەڵ کاک ئەریوان سەلاح بەڕێوەبەری لاوانی هەڵەبجە چووینە سەردانی خاتوو نوخشە ناسیح، قائیمقامی هەڵەبجە کە ئەو کاتە کاک ڕائید بەرزان عوسمان کە باوکی هاوڕێی منالیم بووە لە قوتابخانە و تەنانەت کۆلێج و دوایش لە ساڵی ١٩٨٣تا ساڵی ١٩٨٥ ئەو بەڕێوەبەری ڕۆشنبیری لقی هەڵەبجە بوو، منیش ژمێریار و بەڕێوەبەری هونەری ئەو فەرمانگەیە بووم، بەڵێنیاندا هاوکاریمان بکەن، بە سوپاسەوە کاک بەرزان هەمیشە هاوکارمانە لە کاتی ئەنجام دانی هەر کۆنسێرتێک ئەویش بە پاراستنی باری ئەمنی و چەندین مەفرەزەی پۆلیس تەرخان ئەکات بۆمان، بۆ ڕۆژی دواتر ئێمە پێویستمان بە هەڵواسینی پۆستەر

بـوو بـۆ ئەوەی ڕیکـلام بـۆ ئەوە بکەیـن فێرخـوازان لە خۆمـان کـۆبکەینەوە، دوو پۆستەرمان دروستکرد، یەکێکمان لای نزیک فێرگەکە هەڵواسی بە دیواری ماڵی سـەلاح بەگ و تەیمـور بەگ، دوهەمیشـمان بە دیـواری قوتابخـانەی ئەحـمەد موختـارەوە، بە ڕێکەوت کـاک (ئـارام شـەمێرانی)مان دی کە مـن یەکەم جـار بـوو ببیـنم و بردینـی بـۆ کافتریـاکەی لە مـوجەمەعی عەنەب کە چەنـدین وێـنەی کەسـایەتی هەڵەبـجەی هەڵواسـیبوو، پـاش ئەوە پێکەوە چـووین بـۆ لای خـاتوو کوێستان شێخ ئەکرەم بەڕێوەبەری شارەوانی هەڵەبجەو ئەویش  بە سوپاسـەوە (١٨) کورسی بۆ دابین کـردین بـۆ فێرخـوازان، پـاش ئەوە سـەرماو سۆڵەو بـاران دەستی پێکرد و بوو بە ساڵی ٢٠١٧ لەو ماوەیەدا بۆ دابین کردنی پێداویستی ئەو فێرگەیـە هەر خەریکی هـاتووچۆ بـووم، چەنـدین کەسـی دڵسـۆز پێداویسـتیان بـۆ دابین کردین، لە تیپی شنروی لە سلێمانی چەند ئامێرێکی لێبوو کە هەمـوو خـراپ ببـوون و شـکابوون  وەک ئـامێرێکی قـانون و سـەنتور و ئیقـاع، هاوڕێمـان کـاک عومەری چەلۆ ئامێرێکی چەلۆی خستە لامان، لەگەڵ کیبۆردێک، ئیتر وردە وردە پێداویستیم کۆ ئەکردەوە وپێش ئێمە تیپی شانۆی هەڵەبجە بارەگایان لە هەڵەبـجە هەبـوو، بەڵام دوایـی وازیـان لێهێنـا بـوو، هەنـدێ شـتی کۆنەیـان هەبـوو داوام لە مامۆستا کامەران ئەحمەد سـەرۆکی تیپەکەیـان کـرد ئەویش بە سوپاسـەوە وتـی چیتان بە کەڵک هات بیبەن و سوودی لێ ببینن ولە بینای ڕێکخراوەکانە لای کـاک (ئەنــوەری ڕابە) چـــووم گەڕام لەوشـــتانە کەوانتەرێــک وگســـکێکی کارەبـــاو سەلاجەیەکی لێبوو، پیکابێکم بۆ گرت و هێنام بۆ فێرگەکە، لەو کاتەدا کەس نەبـوو کەوانتـەرەکەم لەگەڵ هەڵگرێت و ڕۆژێکـی زۆر سـاردیش بـوو لەو کـاتەدا کـاک بەهنام ئەحمەد پەیدا بوو پێکەوە هێنامانە ژوورەوە، ئەو ڕۆژە زۆر ماندوو بووم، دوایی سـەلاجەو گسـکەکەم  ئیش پێکـرد هەردووکیـان ماتۆڕەکەیـان سـووتابوو، دوایی ڕەوان شاد کاک جەمیلی زاوامان مـاتۆڕێکی گسـکی تـازەی دامـێ و جـارێ زسـتان بـوو پێویسـتم بە سـەلاجە نەبـوو، بەو شـێوازە بەردەوام بـووم و چەنـد هاوڕێیەکی ترم چەند پێداویستیەکی تریان بۆ دابین کردین و ئیتر لە هەر شوێنێک شتێکم بدیایە هەمووشیان کۆنە بوون چونکە هیچ سەرچاوەیەکی مادیمان نەبوو، ئەو تیپـی هەڵەبجەیـەش کـە باسـم کـرد حـەوت کـەس بـوون، چووبـوونە لای پارێزگاری هەڵەبجە و بۆ ئەوەی خانوویـان بـۆ بگرێت، ئەویش وتبووی نـاتوانم

خانووتان بۆ بگرم ئێوە ژووریکیان بدەنێ، منیش وتم باشە، خانووەکەش بریتی بوو لە هۆڵێک و دوو ژوور و مەتبەخێک و لە خوارەوەش ژێر زەمینێک و بیرێکی دەستی تێدایە، کە ژوورەکەمان دانێ ئەوانیش کومباریک و سۆپایەکیان هێناو کومباریکیان تێدا ڕاخست، ئەو تیپە بۆ ماوەی ساڵێک لەو ژوورەدا بوون، تەنها لە یەک چالاکی بەشدار بوون، کە ئەویش چەند شەوێک بۆ یادی هەڵەبجە پرۆڤەیان تێدا کردو دوایش بە چۆڵی مایەوە تا خۆیان وازیان هێنا.

بەراستی زۆر کەسانی دڵسۆز پێیان خۆش بوو کە ئەو فێرگەیەمان دامەزراند و وردە وردە فێرگەکەمان کردەوە و یادی ٣/١٦ نزیک ببووەوە بۆیە لە سەرەتای مانگی ٣ چوومە چەند قوتابخانەیەک و بۆ ئەوەی بتوانم زیاتر بە کچان و کوڕانی هەڵەبجە وەک کۆرس بەکاریان بهێنم، چونکە زۆر لە ساڵان لە سلێمانیەوە کۆرسم ئەبرد، سەرەتا چوومە قوتابخانەی هەڵەبجەی کچان و بە سوپاسەوە مامۆستا (ژیان عینایەت) و مامۆستا (کاوە فۆن) هاوکاریان کردین، پاشان چوومە قوتابخانەی هەڵەبجەی سەرەتایی چەند منالێکم پەیدا کرد و هەروەها مۆزیک زانێک کاک ئەمیر ئەرسەلان و خوشکەکانی هاوکارمان بوون، چەند کوڕێکی گەنجیش هاتن بوون بە کۆرس و ڕۆژێک کچەکان هاتن کەزیاتر لە ٣٠ کەس دەبوون و دەنگە باشەکانیانم جیا کردەوە و دوای ئەوەش منالەکانیش، کە کۆڕالێکم دانابوو پێویستی بە منالْ هەبوو، دواتر لەگەڵ ئەندامانی تیپی مۆزیکی شنروێ ڕێک کەوتین کە پێکەوە کارەکە ئەنجام بدەین دەستمان کرد بە پرۆڤە کردن و مامۆستایەکی شانۆش بە ناوی وەرزێر مەنسور هات وەک هاوکارییەک بەشدار بوو لەگەڵمان، هەروەها چەندین کەس سەردانیان ئەکردین، خوا هەڵناگریت بەهار خان، بەهاری حەمە سەعید کەیخەسرەو بە خاوو خێزانەوە هاوکارمان بوون زۆر دڵسۆز بوون بۆ ئەو فێرگەیە وچەندین جار خواردنی بۆ درووست کردووین لە ماڵی کاک ئاری حەمە ئەمینی کاکە سەعە بە خۆی و مێردو منالیەوە ماڵەو ماڵ گەڕاوە بۆ کۆکردنەوەی کچان و کوڕان بۆ کۆرس بە ئۆتۆمبیل و توانای خۆی بە خۆبەخشانە، هەروەها کاک ڕێبوار هەڵەبجەیی زۆر دڵسۆزمان بوو، ماندوو بوونی زۆر چەشتووە بەو فێرگەیەوە، ئەو دوانە ببوونە بەشێک لە فێرگەکە.




**خۆئامادەکردن بۆ یادی شانزەی سێ لە ساڵی ۲۰۱۷ دا**

ئیتر دەستمان کرد بە پرۆڤە کردن بە دوو شێواز لە لایەک پرۆڤەمان بە کۆرسەکانی هەڵەبجە و لە لایەکی تریشەوە لەگەڵ ئەندامانی تیپی مۆزیکی شنرویێ لە سلێمانی و بۆ مۆزیک ژەن و ئەندامانی کۆرسەکان، پاش ئەوەی هەردوو لایەن کارەکەیان لەبەرکرد کە بریتی بوو لە دوو ئاواز یەکەمیان (کۆراڵی زامی هەڵەبجە) کە لە شیعری بەندەو شێرکۆ بێکەس بوو وە ئاوازی خۆم بوو، شیعرەکەی شێرکۆ بێکەس، ئاوازی عادل حەسەن بوو، ئاوازی دووهەم بە ناوی (پرسەی گەڵا) لە شیعری حەسەن هەڵەبجەیی و ئاوازی عادل حەسەن بوو، لە بەر نەبوونی کات ئاوازی دوهەم لە نمایشی ۲۰۱۷/۳/۱٦ نمایش نەکرا، بەڵام کۆرسەکان هەموویان لەبەر کردبوو، کاتێ هەردوو گروپەکە ئامادە بوون، ڕۆژی ۲۰۱۷/۳/۱٥ پاسمان گرت بۆ کۆرسەکانی هەڵەبجەو هێنامانن بۆ بینای دەبۆکە لە سلێمانی و هەموو پێکەوە کارەهونەریەکەیان لەبەرکرد و ئەم کۆراڵە بە دەنگی هونەرمەندی گۆرانی بێژ کاک (لوقمان سەلیم) ئەنجامدرا لەگەڵ خوشکێکی کاک ئەمیر ئەرسەلان کە سۆلۆیەکی ئەوی تیدا بوو. پاشان گەڕانەوە بۆ هەڵەبجە، ئا

بەم شێوازە سەختە کاری هونەری ئەکرێت، لە شیعر دانان ئاواز دانان وکۆکردنەوەی چەندین کۆرس و مۆزیک ژەن و کاری ئیداری و ڕاگەیاندن و زۆر ماندوو بوونی تر کە بە داخەوە لە کۆمەڵگای کوردیدا تا ئیستاش ڕێز لەو ماندوو بوونە ناگیرێت.

پاش ئەوە لە ڕۆژی ٢٠١٧/٣/١٦ ئەم (کۆراڵ)ە مان لەیاریگای گەورەی هەڵەبجە لە نزیک مۆنۆمێنتەکە نمایش کرد .

هۆنراوەی کۆڕاڵەکە

دوای ئەوە بۆ ماوەیەک پشومان دا، ئەمەوێت لێرەدا سوپاسی ئەو کۆرس و گۆرانی بێژو مۆزیک ژەنانە بکەم کە بە دڵسۆزی هاتن بە پیریمانەوە بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە هونەرییە. ئەمەش هۆنراوەی ئەو کۆراڵەیە:

ئێمە هەموو منالآنی سەر ڕووی زەمین
هاتوین چەپکە گوڵی ڕێزمان بۆ شار بێنین
شار چ شارێ پڕمەڵبەندی عەشق و ئەوین
شار چ شارێ شاری خەبات و ڕاپەڕین
یەکەمین داستانی عەشق لای (وەلی) نوسرا
یەکەمین چیرۆکی (ویژدان) لای(موختار) نوسرا
یەکەمین شریخەی تفەنگ لە شارەزوور تۆمارکرا
من بوکێکم لە دامێنی شنروێدا ڕاکشاوم
من هەڵەبجەم لەکانی عاشقانا هەڵقوڵاّم
کانی عاشقانت جێگای عەشقە
باخی گوڵاّنت وەک بە هەشتە

هۆنراوەی شێرکۆ بێ کەس :

چواردەی مانگ بوو
لەسەر گۆیژە با، قەڵەمەکەی فڕاندم
کە دۆزیمەوەو پێم نووسی
پۆل پۆل فڕین وشەکانم
پانزەی مانگ بوو

سیروان، قەڵەمەکەی بردم
وەختێ گرتمەوەو پێم نووسی
بوون بە ماسی شیعرەکانم
شانزەی مانگ بوو!
ئاخ شانزەی مانگ
کە شارەزوور قەڵەمەکەی لێوەرگرتم
وەختێ دایمەوە بنووسم
وەک هەڵەبجە
وشک بوو بوون پەنجەکانم

دواییش سوودم لە هۆنراوەیەکی فۆلکلۆری هەورامی وەرگرتوە و کردوومە بە سۆرانی، کە باس لە ئاوارەیی و دەربەدەری و ژیانی ناو ئۆردوگاکان ئەکات و خۆشم یەکێک بووم لەوانە.

ئەی یاران یاران ئازیز یارانم دوورەن
دڵەکەی غەمبارم ئازیز ماتەن مەلولەن
غەریب هەی غەریب غەریبی شاران
جێگای غەریبان ئازیز کۆچەو کەنارەن

دوایش هەڵەبجەم کردووە بە زام و گرکانی ڕاپەڕین:

سروودی بەرزی ئازادی لە ناو گەرومانا ئەچڕێ
ئەڕۆین ئەڕۆین بەرەو ئاسۆ بۆ رزگار کردنی گشت مرۆ
هێزو توانامان یەک ئەخەین تا بە سەرکەوتن ئەگەین
ئەوسا بۆ ئازادی ئینسان هەوڵ ئەدەین بە بێ وچان
بۆ ئازادی گشت مرۆڤ گشت مرۆڤ گشت مرۆڤ

ئیتر دوای ئەو چالاکییە بۆ ماوەیەکی زۆر ئەو قوتابییانە وەک کۆرس هاتووچۆیان ئەکردین و دوای ئەوە دابڕان، بەڵام ئێمە هەربەردەوام بووین لە هاتوو چۆ و دەستمان کرد بە هەڵواسینی تابلۆی فێرگەکە و من ڕۆژی ٢٠١٧/٤/٢٧ ڕۆشتمەوە بۆ هەڵەبجە و تابلۆی فێرگەکەمان هەڵواسی، ڕاگەیانراوێکم لە فیس بووک بڵاوکردەوە و نووسیم لە ڕۆژی ٢٠١٧/٥/١ دەست ئەکەین بە وانە وتنەوە.

## یەکەمین قوتابی فێرگەکەمان کێ بوو؟

یەکەمین قوتابی کە وانەم پێوتەوە فێرخواز (پێشواز نزار) بوو، بەتەنها وانەم پێ ئەوتەوە کە باوکی کاک نزار زۆر هاوکارمان بوو، پەردەی هەموو پەنجەرەکانی فێرگەکەی بۆ درووست کردین و بە خۆبەخشانە هەمووی بۆ هەڵواسین، یەکەمین شەوی وانە وتنەوەم لە ڕێکەوتی ٢٠١٧/٥/١١ وانەم بەو فێرخوازە وتەوە بە شەو، کە ئەوە یەکم فێرخوازی فێرگەکەمان بوو.



ئیتر وردە وردە فێرخوازان ڕوویان تێ دەکردین لە پێشدا چەند پیشەوەرێک وەک ئاسنگەر، وەک سەرتاش وەک وەستای ئەلەمنیۆم دواییش چەند کەسێک کە پێشمەرگە بوون و بەشەو وانەمان پێ دەوتنەوە و پاش ماوەیەک زۆربەیان نەیانتوانی بەردەوام بن و هەر لەو کاتەدا فێرخوازان چەندین ئامێری مۆزیکیان کڕی چونکە ئامێری مۆزیکمان زۆر کەم بوو.

## قوتابی زیاتر ڕوویان لە فێرگەکە کرد

دوای ئەوە کە خەڵک زانیان شۆێنەکەمان ئەکتیڤە و کار دەکەین ئیتر چەندین فێرخوازی زیرەک لە خوێندکاری ئامادەیی و زانکۆ لە کوڕو کچ هاتنە لامان زۆر بە جوانی وانەکانیان وەردەگرت هەیان بوو خوێندکاری کۆلێجی صیدلیە وئەندازیاری و زانست و چەندین مامۆستای سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی وانەیان دەخوێند، شەوی وا هەبوو زیاتر لە (٤٠) فێرخوازمان لابوو، هەشیان بوو بۆ ماوەیەکی کەم بەردەوام ئەبوون زۆر لە وانەکان تێ نەئەگەیشت و یان باری ژیانیان لەبار نەبوو دوور ئەکەوتنەوە، بەڵام هەر بەردەوام بووین یەکێک بڕۆشتایە یەکێکی تر ئەهاتە لامان بەم شێوەیە بەردەوام بووین.



پاش ئەوە فێرخوازەکان زۆر بوون و وە ئێمەش توانای ئەوەمان نەبوو کە (ستاند)ی نۆتە بکڕین بۆیان و ئەو خانووە ژێرزەمینێکی هەیە و منیش دارتاشی ئەزانم و مشارو درێل و پێداویستی دارتاشیم هەبوو، خوارەوەم کردبووە (وەرشەی دارتاشی) عادل لە ماڵەوە (مەعرەز)ێکی کۆنانیان هەبوو تەختەکانی هێناو منیش لە هەر شوێنێک پارچە تەختەیەکم بدیایە ئەمخستە ناو سندوقی

ئۆتۆمبیلەکەم، ئیتر دەستمانکرد بە درووست کردنی (ستاند)ی نۆتەو مێز بۆ ئامێرکانی سەنتور، قانون، کیبۆرد وتەپڵەک و بەو شتە ساکارانە کارەکانمان ئەنجام ئەدا و کارەکانمان بەڕێکرد ، خۆشمان کە لەوێ ئەماینەوە خواردنمان بۆ خۆمان دروست ئەکرد تا درەنگانی شەو فێرخواز لامان ئەمایەوە.

من هەر لە یەکەمین ڕۆژەوە لە دەفتەرێک هەر فێر خوازێک بهاتایە ناوی خۆی و ئەو ئامێرەی کە حەزی لێیەتی لەگەڵ ژمارەی مۆبایبەکەیم تێدا تۆمار ئەکرد لە ڕۆژی دەست بە کاربوونیەوە، بڕێک پارەی ڕەمزیمان وەردەگرت لێیان کە بڕەکەی (٤٠٠٠٠) چل هەزار دینار بوو بۆ ماوەی یەک مانگ بۆ هەر فێرخوازێک، بەکارمان ئەهێنا بۆ کرێی هاتووچۆ و بەنزین و خواردن .



## کەناڵەکانی راگەیاندن رووماڵی چالاکی فێرگەی شنرۆیان دەکرد

ئیتر دوای ئەوەی کە چالاکی فێرخوازەکان لە فێر بوونی مۆزیک بەردەوام بوو، ئێمەش بە لەخۆ بردوویی کارەکانمان ئەنجام ئەدا ئیتر دوای ئەوە چەندین کەناڵی تەلەفزیۆنی هاتن بۆ لامان و راپۆرتیان لەسەر فێرگەکەمان ئەکرد و لێدوانمان ئەدا دەرباری کارو چالاکیەکانمان.

لە ڕۆژی ٢٠١٧/٨/١٠ پەیامنێری کەناڵی (KNN) سەردانی کردین و ڕاپۆرتێکی لەسەر فێرگەکەمان کردو دوای چەند ڕۆژێک لەو کەناڵەوە پەخش کرا.



لە ڕۆژی ٢٠١٧/٨/١٧ کەناڵی ناوخۆیی (Halabja tv) و بەڕێوەبەرەکەی کاک (شنرۆێ ئەحمەد)وستافەکەی سەردانیان کردین و ڕاپۆرتێکی تێرو تەسەلیان لە سەر فێرگەکەمان کرد و لە شەوی ٢٠١٧/٩/٦ لە تەلەفزیۆنەکەیان پەخشکرا. پاشان چەند جارێکیتر پەخشیان کرد.



لە ڕۆژی ٢٠١٧/٨/٢٣ بەڕێوەبەری گشتی ڕۆشنبیری هەڵەبجەی ئەو کاتە کاک (پەرویـز نیـازی) ولێپرسـراوی بەشـی چـالاکی ئەو فەرمـانگەیە (سـەبا) و چەنـد فەرمـانبەرێکی تـر سـەردانیان کـردین وخەڵاتـی ڕێزلێنانیـان پـی بەخشـین لە پـای ئەرک و مانـدووبوونمان وە یەک دوو ئـامێری مۆزیکیـان پێشـکەش کـردین و نەخشەمان دانا بۆ ئەوەی لە مـانگی ٩ ی ئەو سـاڵە کۆنسـێرتێک ئەنجـام بدەین بە سپۆنسەریان .



ئێمە بەردەوام بووین لە فێرکردنی فێرخوازان و چالاکیمان زیاتر بوو، منیش لە فەیسبوک وێنە وڤیدیۆی ئەو چالاکییانە وفێرخوازەکانم بڵاوئەکردەوە، ڕۆژێکیان لەبەردەرکی سەرای سلێمانی پێشکەشکاری بەرنامەی (کارلێک)کاک (بەرزان کەریم)م دی، وتی ئەمەوێت ڕۆژێک ستافی بەرنامەکەمان بێینە هەڵەبجە و باس لە مێژووی هونەری خۆت و تیپی مۆزیکی شنروێ و فێرگەکە بکەیت، دوای چەند ڕۆژێک لە رۆژی ٢٠١٨/٨/٢٥ بەخۆیان و ستافەکەیان هاتن و بە کامێراو ڕووناکی و هەموو پێداویستیەکانەوە، لەژوورێکی گەرمدا کە نەدەبوو دەنگە دەنگ هەبێت و ڕووناکی بەهێزیان پێ بوو زوو زوو کارەبای خانووەکە ئەکوژایەوە، تەنانەت من ئەو ڕۆژە کراسێکم لەبەر بوو بۆ وێنە گرتن بەدڵیان نەبوو تا یەکێک لە فێرخوازەکان کاک (شاخەوان نەوڕۆڵی) کراسەکەی خۆی دامێ و کە نایلۆنی زۆر بوو هێندەی تر گەرمام بوو، بۆ ماوەی یەک کاتژمێر زیاتر لێدوانمدا لە مێژووی هونەریم و فێرگەکە، لە شەوی ٢٨/٢٧ ی/٨/٢٠١٧ لەکەناڵی کوردسات پەخش کرا.



ئێمە هەر لە چالاکی بەردەوام بووین هەموو هونەرمەندانی کوردستان دەست خۆشیان لێ دەکردین هەر لە شارەکانی کەرکوک، کۆیە، سلێمانی، لە رۆژی ٢٠١٧/١٠/١٨ شاندێکی سەندیکای هونەرمەندانی کوردستان لقی سلێمانی کە بریتی بوون لە مامۆستای مۆزیک زان (شێرزاد حەیدەری وکاک هێرشی کلارنێت و کاک سەردار خدر) سەردانی فێرگەکەیان کردین و ڕێنماییان دا بە فێرخوازان و کاک هێرش ئامێرێکی کلارنێتی پێشکەشکرد بە فێرگەکەمان سوپاس گوزاریان بووین.



## دروستکردنی ستۆدیۆیەک بەهاوکاری هاوڕێیان و دۆستان

بەوشێوازە بەردەوام بووین ودوای ئەوە ویستمان بەرهەمێک تۆمار بکەین و هێچ پێداویستیەکمان نەبوو کە بتوانین ستۆدیۆیەک دروست بکەین، ئیتر شەوی ٢٠١٧/١٢/١ بەخۆم وعادل وئەمیر ئەرسەلان وهاوکاری خوشکەکانی و خاتوو ئاریێز فەرهەنگ ویستمان گۆرانییەک کە ئاوازی خۆم بوو تۆمار بکەین و کاک (خالید عومەر) لاپ تۆپێکی هەبوو کەمێکیش لە تۆمار کردنی دەزانی و چەند بەتانییەکمان هێناو کردمان وەک ئەوەی ستۆدیۆ بێت و دەستمان کرد بەتۆمار کردنی دەنگەکەی و بەدڵمان نەبوو، ئیتر کەوتمە بیر کردنەوە بۆ دروستکردنی ستۆدیۆیەک لە ژێر زەمینی فێرگەکە و ئیتر هاوڕێیانم کە پۆستێکم کردبوو بەو بەتانیانەوە، بێ توانای داراییمانەوە، هاوڕێیانم کە بەدەیان هاوڕێم هەیە لەوێ، کەوتنە ئەوەی هاوکاریمان بکەن بۆ دروست کردنی ستۆدیۆیەک و کڕینی ئامێری دەنگی مۆزیکی بۆ پێداویستی فێرگەکە، یەکەمین کەس کە پەیوەندی پێوە

کردم برای بەڕێزم کاک(گۆران هەڵەبجەیی)بوو کە وتی بە هەموومانەوە هەوڵ ئەدەین هاوکاریتان بکەین، وتی بە هەموومانەوە هەوڵ و کۆششمان یەک ئەخەین و نامە ئەنێرم بۆ هاوڕێ و دۆستانم، پاش ئەوەش پێکەوە نوسراوێکمان نووسی و بڵاوم کردەوە لە فەیسبووک، ئیتر چەندین هاوڕێی بەڕێز هاوکاریان کردین و منیش دەستم کرد بە کڕینی چەندین پێداویستی ئامێری مۆزیک و دەنگی و هەمووی بە (پسوڵە) و یەکەکە یەکە شتەکانم بە وردی نوسیبوو، مەگەر نان خواردنێک یان پارەی هاتوو چۆیەکم لەو هاوکاریانە خەرج کردبێت و هەموویم بە پسوڵە ناردەوە بۆ کاک گۆران هەڵەبجەیی و کارێکی دڵسۆزی و هاوشاریانەیان بۆ کردین، من ناوی هەموو ئەو هاوڕێیانەم یەک یەک لایە و بڕی چەندیش هاوکارمان بوون لە سەر داوای خۆیان ناوەکانیان بڵاو ناکەمەوە، بەڵام وەک مێژوو لای خۆم ناوەکانم پاراستووە .



## ئامادەكردنی كۆراڵێك بۆ رۆژی ٢٠١٨/٣/١٦

لەسەرەتای مانگی یەک و دووی ساڵی ٢٠١٨ هەر خەریكی پرۆڤە كردن بووین بە فێرخوازەكانمان و بەردەوام هاتوو چۆمان ئەكرد تا سەرەتای مانگی (٣) كە بیرم ئەكردەوە ئەوە (٣٠) ساڵ بەسەر كیمیابارانی هەڵەبجە تێدەپەڕێت و ئەو شارە لە لایەن كاربەدەستانەوە پەراوێز خراوە و كە هەر لە سەرەتای ڕاپەڕینەوە بۆتە ململانێی حیزبی و شارێك كە خەڵكە ڕەسەنەكەی دەربەدەری شاران و وڵاتانن؟ بۆیە بیرم لەوە كردەوە بە هۆنراوە و مۆزیك و گۆرانی ئەو دەردە دڵیەی خۆم دەربخەم بیرۆكەكەم لە خەیاڵدا بوو، شەوانە لەگەڵ كاك عادلی هاو پیشەم ڕاو بۆچونمان ئەگۆڕییەوە، شێوازی ئاواز دانانی من زیاتر هەوڵ ئەدەم خۆم بتوانم هۆنراوەكان دانێم، چونكە هەستی شاعیر جیاوازە لە ئاوازدانەر مەگەر پێكەوە زۆر كاریان كردبێت، پاش ئەوەش دەبێ چەند بڕگەیەك لە هۆنراوەكە دەستكاری بكەیت، یان هۆنراوەیەك یان ئاوازێكی فۆلكلۆری تێهەڵكێش بكەیت، شێوازی ئاوازدانان وەك ئەندازیاری تەلارسازی وایە، چۆنیەتی ئاوازدانان لە كەسێكەوە بۆ كەسێكی تر ئەگۆڕێت، جاری واهەبووە لە پێشدا ئاوازەكەم داناوە ئینجا شیعرێكم كردوە بە بەریدا، یان بە پێچەوانەوە، هۆنراوەكەم لە بەردەست بووە ئینجا ئاوازەكەم بۆ داناوە و دەست كاری چەند بڕگەیەكم كردوە.

سەرەتا ئەوە هات بە خەیاڵمدا كە (٣٠) ساڵ تێپەڕیوە بە سەر ئەو كارەساتە، بیرم لەوە كردەوە كە گۆرانییەكی سادەو ساكار نەبێت، بە تایبەت ئەمزانی كە چەندین بەرپرس دێن بۆ بینینی چالاكی ئەو یادە، بۆیە بیرم كردەوە كە بەشێوازی (كۆڕاڵ) پێشكەش بكرێت، مانای كۆڕال بۆ ئەو كەسانەی مۆزیك نازانن حەز ئەكەم ڕوون كردنەوەیەكی كورت بڵێم لە سەری: كۆراڵ بریتییە لە گۆرانییەكی كۆمەڵی كە چەندین كوڕو كچ و گۆرانیبێژ تێیدا بەشدار ئەبن و ئاوێزان لەگەڵ گروپی مۆزیك و دابەش كردنی هارمۆنی و گۆڕینی چەندین ڕەزم و مەقامات، بیرۆكەی ئاوازەكەم بۆ هات و ئیتر ڕۆژ دوای ڕۆژ لە سەرەتای مانگی (٣)وە گۆرانی بێژەكەم هەڵبژارد كە ئەویش خاتوو (ئاڤان عوسمان) بوو، دواییش ڕۆژانە چەندین كۆرس دەهاتن بۆتیپەكەمان لە سلێمانی و ڕۆژ دوای ڕۆژ ئاوازو شیعری تازەم بۆ دائەنا بە چەندین مەقام دەستم پێ كرد وە كەوتینە پرۆڤە كردن لەگەڵیان لەگەڵ كاك عادل كە هاوكارم بوو چ لە دانانی هەندێ بڕگەی شیعریی یان دانانی

مۆزیک و نۆتە نوسینەوەی کە بە هەردووکمانەوە خەریک بووین، سەرەتای کارەکە بەم هۆنراوە بە ئاوازەکەشەوە هاتە خەیاڵم کە لە مەقامی حیجاز بوو.

وا سی ساڵە – واسی ساڵە

هەگبەی خەمم لە کۆڵەو بۆم ناکرێتەوە

فرمێسکی ناسۆری ژیان تەلیسمێکە ناسڕێتەوە

ئیتر پاش ئەوە ڕۆژانە کۆرس ئەهاتن و ئەو ڕۆژانەی لە سلێمانی بووینایە لەوێ پرۆڤەمان ئەکرد و ئەو ڕۆژانەی لە هەڵەبجە بووینایە پرۆڤەمان بە کۆرسەکان ئەکرد، بۆ گروپی مۆزیکیش هەندێ لە ئەندامانی تیپی مۆزیکم بەشداری پێکرد وەک توانا ئەبوبەکر، فوئاد کەریم، ئیبراهیم نجم الدین، تانگۆ ئازاد. لەگەڵ چەند مامۆستایەکی بەڕێز وەک مامۆستا چالاک سدیق، شێرزاد حەیدەری و پێشکار سالار، ڕێژین عومەر عەبدوڵا، زۆزک قەرەداغی، ڕەوەند کەمال، ڕەمزی عەبدوالقادر وچەندینی تر.

وە بۆ ئەم کارەش نزیکەی (٣٠ تا ٣٥) کۆرس بەشدار بوون هەروەها هونەرمەندێکی گۆرانی بێژی تر بەشدار بوون لەوتنەوەی چەند (صۆلۆ) واتە چەند بڕگەیەکیان لە کۆڕاڵەکە ئەوتەوە ئەوانیش (هاوڕێ ئارت) و م. (هەردی هادی) کە لە زۆربەی شارەکانی کوردستان بەشدار بوون تێیدا، لەڕۆژی ٢٠١٨/٣/١٢ هەموو کۆرسەکانی هەڵەبجەمان برد بۆ سلێمانی و هەموو پێکەوە پرۆڤەیان کرد بۆ ئەوەی هەموو پێکەوە لە کارە هونەرییەکە تێبگەن.



لە ڕۆژ ی٢٠١٨/٣/١٦ لە یاریگای سەرداخراوی زانکۆی هەڵەبجە نزیک مۆنۆمێنتەکە نمایشمان کرد و کارێکی جوان دەرچوو، چەندین کەسایەتی ئەو کارەیان دی هەر لە پارێزگاری هەڵەبجە و سلێمانی و چەندین لێپرسراو و شاندی بیانی ئەو کارەیان لا پەسەند بوو زۆربەی تەلەفزیۆنەکان بە ڕاستەوخۆ ئەو کارەیان گواستەوە، ئەمەش کۆی شیعرەکەیە و ئاوازەکەیشم بە نۆتە نوسیوەتەوە.







پاش نمایشەکە هەموو ئەندامانی کارە هونەرییەکە چووین بۆ چێشتخانەیەک لە عەنەب دوای چاوەڕوانییەکی زۆر نانی نیوەڕۆمان خواردو ئەوان ڕۆشتنەوە بۆ سلێمانی، منیش بۆ ئەوەی کەمێک پشوو بدەم چوومەوە فێرگەکە لە هەڵەبجە و دوای دوو ڕۆژ گەڕامەوە بۆ سلێمانی .

(هۆنراوەی کۆڕاڵی وا سی ساڵە)
بیرۆکەو داڕشتن: ئازاد ساڵح
هۆنراوە: ئازاد ساڵح + فۆلکلۆر
ئاوازومۆسیقا: ئازاد ساڵح
ئامادەکردنی مۆزیک: عادل حەسەن

کۆرس

وا سی ساڵە............ واسی ساڵە)

گۆرانی بێژ

هەگبەی خەمم لە کۆڵەوبۆم ناکرێتەوە
فرمێسکی ناسۆری ژیان تەلیسمێکە وناسڕێتەوە)
ئەم وڵاتە وێرانەیە ناخ و هەستی بێ لانەیە)
ڕۆژی ڕوونیان شەوە زەنگە و تروسکایی تێدانیە)[٢]

---

[٢] ئەم دێڕە هۆنراوەی عادلە

کۆرس

وا سی ساڵە

وا سی ساڵە

گۆرانی بێژ

واسی ساڵە کۆڕی شیعرم مات و چۆڵە

بەستەو ئاوازوگۆرانیم پڕ ناسۆرە)٢

هەموو:

واسی ساڵە

وا سی ساڵە

گۆرانی بێژ

خاک و خۆڵ و کانی و ئاوم بێ لانەیە

شاخ و گوندی کوردستانم وێرانەیە

گۆرانی بێژ (هاوڕێ ئارت)

وا سی ساڵە ئەم هەوارە پڕ شکۆیە

ناو جەرگی ئازارو خەم و رەنجەڕۆیە

سی ساڵ خەم و

سی ساڵ تەم و

سی ساڵ ئەستێرەی ئاسمانی

بێ جریوەیە

بێ جریوەیە

مۆسیقا

ڕەنگ زەردی خەزان  خەتای پایزەن

ڕەنگ زەردیەکەی من دووری ئازیزەن

یارانم دوورەن ماتەن مەلولەن

لەدووری یاران دڵەکەم مەلولەن

هەی لێ وەی لێ وەی لێ

هەی لۆ وەی لۆ وەی لۆ

گۆرانی بێژ:

هەی لێ لە دڵەکەی چۆڵی من
وەی لێ لە ئاهو ناڵەی من
هەی لێ وەی لێ وەی لێ
هەی لۆ وەی لۆ وەی لۆ
ئارۆڕام کەوتەن کۆنە هەواران
نە دەنگی بولبول نە سەدای یاران
ئارۆ ڕام کەوتە کەلی (ئەشکەوڵ)
من چاگەم زانا هەڵەبجە بی چۆڵ
هەی لێ وەی لێ وەی لێ
هەی لۆ وەی لۆ وەی لۆ

مـــــە قـــــا م

لەدوای سی ساڵ لە جەورو ستەمکاری
لە مەرگە سات و ئیش و ئازاری
شیعرو ئەوین نامرێ
گۆرانی و ئاواز نامرێ
وا ســـی ساڵە
واســـــــی ساڵە

ئیتر پاش ئەنجام دانی ئەم چالاکییە وەک و جاران خەریکی وانە وتنەوە بووین بە فێرخوازەکانمان و هەر جارەی تەلەفزیۆنێک ئەهات بۆ ئەنجامدانی ڕاپۆرتی هـونەری لە ڕۆژی ٢٠١٨/٥/٢٤ کەنـاڵی کوردسـتان (TV) و کەنـاڵی (Zagros) ی عەرەبی کاک ڕەحیم غەریب و کاک ئەمیر سالم هـاتن و (فیچەر)ێکیان لە سەر فێرگەکەمان کرد

## هەندێ چالاکی و بەرنامەی تەلەفیزیۆنی و راپۆرتی رۆژنامەوانی

لە شەوی (٢٠١٨/٦/١٠) ڕاستەوخۆ کەمانگی رەمەزان بوو بەشداریم کرد لە بەرنامەی (شەوانی کوردسات) بۆ لێدوان دەربارەی مێژووی هونەری مۆزیک لە هەڵەبجە .




لە ڕۆژی (٢٠١٨/٦/٢٨) کەنـاڵی (NRT) بەرنامەیـەکیان هەبـوو بە نـاوی (لە پەیامنێرانمانەوە) کاک وریا حەمەکەریم سەرپەرشتی دەکرد، بۆ ئەم مەبەستەش هەموو فێرخوازەکانمان چ وەک کۆرس و گۆرانی بێژو مۆزیک ژەنەوە و دوای نیوەڕۆکەی پاسێکمان بۆ گرتن و چووین بۆ گوندی خەرپانی کە چێشتخانەو کەبابخانەی لێبوو، شوێنی سەیرانگابوو، بەرنامەیەکی تێرو تەسەلمان ئەنجامدا بۆ ئەوکەناڵە و پاش چەند ڕۆژێک پەخشکرا، لەوێشدا کاک وریا حەمە کەریم بەڵێنی دا کە خۆبەخشانە کلیپی گۆرانییەکمان بۆ بکات.



ئێمەش بۆ هاندانی گەنجان و لاوان هەمیشە ڕیکلاممان ئەکرد بۆ ئەوەی فێرخوازان کۆببنەوە لە دەورمان وڕۆژی ٢٠١٨/٧/٤ لە فەیسبووک ڕێکلامێکی ترم بڵاو کردەوە کە دیزاینەکەی فیرخواز کاکە هێژا ئەمین بۆی درووست کردبووین.

له ڕۆژی (٢٠١٨/٧/٥) کەناڵی (Kurdistan 24) فیچەرێکی پێنج خولەکی لە سەر فێرگەکەمان کرد.

بەو هـــاوینە گەرمەو لەڕۆژی (٢٠١٨/٧/١٠) یەک ئـــامێری فێنـــک کەرەوە (موبەڕیدە)مان هەبوو، هەروەهـا مـاتۆڕی سـەلاجەی فێرگەکەشمان سووتابوو، بـۆیە بە هـاوڕێی دڵسـۆزم کـاک (محەمـەد سـالح) بەڕێـوەبەری فەرمـانگەی خانەنشـینی هەڵەبـجەی ئەوکـات، تەلەفـۆنم بـۆ کـرد پـاش چارەکێـک هـات بـۆ فێرگەکـەمان و لەگەڵ خۆیدا بە پیکابێک (موبەڕیـدە) یەکـی نـوێ و سـەلاجەیەکی پێشکەشکردین و بەکارمـان هێنـا بـۆ فێنککەرەوەی ژوورەکـان کە ئەم هەڵوێسـتە جوانە شایانی سوپاس و پێزانینە.



پاشـان لەڕۆژی (٢٠١٨/٧/١٢) تەلەفزیـۆنی (Xandan) هـاتن بـۆ ئەنجـام دانـی ڕاپۆرتێک و فێرخوازەکـانم کۆکردەوەو چـووین بـۆ بـاخی گشـتی هەڵەبـجەو ئەو ڕاپۆرتەیان لە سەر کردین.



## یەکەمجاربوو کۆنسێرت بەشەو بکەین

ئیتـر لە مـانگی ٨ ی ئەو سـاڵە (٢٠١٨) بیرمـان کـردەوە کە بە سەرپەرشـتی (بەڕێوەبەرێتی گشتی ڕۆشنبیری هەڵەبجە) کە بتوانین کۆنسێرتێک ساز بدەین بۆ فێرخوازەکان، من خولیام ئەوە بووە کە بە شەوێکی هاوین بتوانین لە باخی گشتی ئەو کۆنسـێرتە سـازبکەین کە بەڕێـوەبەرەکەی کـاک (پەروێـز نیـازی) و فەرمـانبەرانی زۆر هاوکارمـان بـوون، هەروەهـا یەکەمـین جـاریش بـوو بە شـەو کۆنسێرت ساز بکرێت، دەستمان کرد بە پلان دانان بۆ ئەنجام دانی ئەو کۆنسێرتە و بەڕێـوەبەری ڕۆشـنبیریش ڕێـک کەوتبـوو لەگەڵ (یانەوسـیاوچەمانە) کە لێپرسـراوەکەی کـاک (سـوبحان فەیـرۆز) کە تیپـی هەڵپەڕکێـی میللیـان هەیە و هەروەهـا بە هاوکـاری شـارەوانی هەڵەبـجە بە دابـین کردنـی بـاخەکەو کارەبـای موەلیـدەو ئەرک و مانـدوبوونیان لەو بـوارەدا، نـزیکیش ببـووینەوە لە جەژنـی قوربان و پێشنیارم کرد کە چەند ڕۆژێک دوای جەژن ئەنجام بدرێت.

ئیترکەوتینە دەست نیشان کردنی گۆرانی بێژو مۆزیک ژەن و کۆرسـەکانمان

له فێرخــوازانی کچــانی هەڵەبــجە دەستنیشـــان کــرد، لە گــۆرانی بێــژانیش بە سوپاسەوە چەند گۆرانی بێژیکی سلێمانی و هەڵەبجەو هەڵەبجەی تازەمان دیاری کرد لەوانە هونەرمەنـدان: ئاریـان کەریـم، ئاڤـان عوسـمان، ئەژیـن سـاڵح، جەلال فەرەج، شنیار تاقانە، سیروان لهۆنی، خالد عومەر.

ئێمە لە ڕێکەوتی ٢٠١٨/٨/٢٠ وە لە سلێمانی بە شەو لەگەڵ هاوڕێم کاک عادل لەگەڵ گــۆرانی بێژەکــان گۆرانییەکانمــان بــۆ دیــاری کــردن و هەر شـــەوەی (٢)کەسـیان ئەهـاتن بـۆ پـرۆڤە کـردن، تـا نـۆتەی گۆرانییەکانمـان نووسـییەوە بە هەردووکمانەوە و پاشان لە سـەرەتای مـانگی (٩)وە هەمـوو مۆزیک ژەنەکـان بە شەو لە سلێمانی پرۆڤەمان ئەکرد تا هەموو کـارە هونەرییەکانمـان لەبەر کرد، کە دەچووینەوە بۆ هەڵەبجە ئەو گۆرانییانەی کە کۆرسـی تێدا بـوایە بە کۆرسـەکانی هەڵەبجەمان لەبەر ئەکرد و تا ئامادە بووین بۆ ئەنجام دانی کۆنسێرتەکە.

لەم کارەدا خاتوو بەهار حەمە سـەعید و کـاک ڕێبـوار هەڵەبجەیی هـاوکارمـان بوون بۆ ڕاپەڕاندنی هەندێ کارو باری ئیداری .







لە ڕۆژی (٢٠١٨/٩/٤) بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری هەڵەبجە ڕیکلامی بۆ کۆنسێرتەکە کرد کە لە شەوی (٢٠١٨/٩/٦) لە باخی گشتی هەڵەبجە ئەنجام دەدرێ.

ڕۆژی (٢٠١٨/٦/٥) من ڕۆشتمەوە بۆ هەڵەبجە بۆ هاوکاری کردنی فەرمانبەرانی ڕۆشنبیری هەڵەبجە و بۆ بەیانی ڕۆژی دوایی واتە (٢٠١٨/٩/٦) لە بەڕێوەبەرێتی لاوان ستەیجێک هەبوو کە بۆ یادەکانی هەڵەبجە درووست کرابوو بە ئاسن کە چەند پارچەیەکی زۆر قورس بوون تا کرێکارەکانی شارەوانی دایان

تا زۆر ماندوو بوون و ئازاریان چەشت، هەرچۆنێک بوو تا ئێوارە ستەیجەکە بە هەموو شێوازەکان ئامادە بوو چ لە ڕووی روناکی و لە سلێمانیەوە کاک هێرش عبدالرحمن خوشکەزایەکی خۆی نارد و ئامێری دەنگی بۆ دانایین و لە ئێوارە گروپی مۆزیک و گۆرانی بێژەکان ئامادەبوون و ئاهەنگەکە لە کات ژمێر ٩ ی شەو دەستی پێکرد و بە سەدان کەس ئامادەی ئەو کۆنسێرتە بوون کە زیاتر لە هەزار کەس ئامادە بوون و ئەوە یەکەمین جار بوو کاری هونەری ئەوەندە خەڵک ئامادە بێت لەبەر چەند هۆیەک لەوانە دەمێک بوو کاری هونەری نەکرابوو بە شەویش بوو، ئێمەو تیپەکە ناسراو بووین و گۆرانی بێژەکانیش دەنگیان چاک بوو، کەس وکاری فێرخوازەکانیش و هەموو تەلەفزیۆنەکان ئامادە بوون، نمایشەکە شاعیر هێمن لەتیف و کچێک بێژەری بوون. لەپێشدا (یانەو سیاو چەمانە) ئاهەنگەکەی بە چەند گۆرانییەکی هەورامی بە پلەی باک و هەڵپەڕکێیەکی جوانیان کرد و پاشان بەرنامەی ئێمە دەستی پێ کرد کە بەم شێوەی خوارەوە بوو:

| ناوی گۆرانی بێژ | گۆرانی | هۆنراوە | ئاوازیان ئامادەکردن |
|---|---|---|---|
| ئاریان کەریم | سیاچەمانە | گۆران | فۆلکلۆر |
| | کیژە کوردەکە | فۆلکلۆر | کامکارەکان |
| ئاڤان عوسمان | خودای عەشق | زیاد ئەسعەد | زیاد ئەسعەد |
| | هەموو شەو | تاریق فایەق | هەڵکەوت زاهیر |
| جەلال فەرەج | ئەسمەرێ | فۆلکلۆر | حەسەن زیرەک |
| | کراس ڕەشێ | فۆلکلۆر | حەسەن زیرەک |
| ئەژین صالح | یادی بەخێر | فۆلکلۆر | ماملێ |
| | وەرە یار | فۆلکلۆر | حەسەن دەرزی |
| خالد عومەر | جەژنەن شادیەن | فۆلکلۆر | ئازاد ساڵح |
| | شەماڵ بیشەنێ | فۆلکلۆر | ئازاد ساڵح |
| شنیار تاڤانە | مەلە جوانەکە | پیرەمێرد | حەسەن کامکار |
| | هەوای باخی میر | فۆلکلۆر | ئازاد ساڵح |
| سیروان لهۆنی | ئامان خورشید گیان | فۆلکلۆر | فۆلکلۆر |

## قونسولگەری ئیتالیا و وۆرک شۆپێک بۆ ٣٠ موزیکژەن

لە ڕۆژی ٢٠١٨/١١/٢٩ قونسولگەری ئیتالیا بۆ لێک نزیک خستنەوەی کلتورەکان بۆ ماوەی چەند سەعاتێک (وۆرک شوپ)ێکیان بۆ زیاتر لە (٣٠) مۆزیکژەنی هەڵەبجە کردەوە تێایدا چەندین و زانیاری هونەری ئاڵ و گۆڕ کراو چەندین گۆرانی تێدا پێشکەش کرا و بۆ نیوەڕۆکەی نیوەڕۆ خوانێک لەلایەن ئەو شاندە هونەرییەوە ساز کرا لە چێشتخانەی (هەردی) لە هەڵەبجە.








### هەریەکەی بەسەر دەستە و تاقمێکدا دابەش بوو

هەمیشە ویستومە هەموو توانا هونەریەکانی هەڵەبجە یەک بخرێن بۆ ئەوەی کە بە توانایەکی باشتر هونەری ئەو شارە نیشان بدەین وە چەندین دەست پێشخەریم کردووە بۆ ئەو مەبەستە و لە شەوی ٢٠١٨/١٢/٦ زیاتر لە (٢٠) مۆزیک ژەنی ئەو شارە بە هەموو تەمەن و ئاستی هونەری جیاوازەوە کۆبوونەوەیەکمان لە (سەنتەری چالاکی گەنجان) ئەنجام دا و گەشتینە ئەو ئەنجامەی کە منیان کرد بە برا گەورە و پاش ماوەیەک جگە لە قسەکردن هیچ ئەنجامێکی کرداری نەبوو، چونکە هەر کەسەو خاوەن کلتوری و پاشخان و بیرو بۆچوون و ئاستی ڕۆشنبیری لەگەڵ ئەوی تر جیاوازبوو، هەریەکەی بەسەر دەستە و تاقمێکدا دابەش بووە و ئەوەش یەکێکە لە نەهامەتییەکان کە ئەم سیستەمە هێناویەتیە کایەوە.



**مەرگی ناوادەی کاکە ڕێهات**

لەرۆژی ١٢/١٢/ ٢٠١٨ هونەرمەندی گەنج و تازە پێگەیشتوو، کاکە ڕێهات بەکارەساتێکی دڵتەزێن کۆچی کرد، کاکە (ڕێهات عەزیز)عازف کلارنێتێکی بەتوانا بوو، بەداخەوە لە نیوە ڕێگەی تەمەنی گەنجیدا بەجێی هێشتین و داخێکی گەورەی خستە نێو خانەوادەیەکەیی و رۆشنبیران و هونەرمەندان.

بەم بۆنە خەمناکەوە بابەتێکم بۆ کۆچی دوایی ئەو هونەرمەندە جوانەمەرگە نوسی:

ڕێهات بۆ مۆزیکی کردە ئاوێزانی ژیانی؟

ئەمە پرسیارێکە بۆ ئەوەی لەم بوون و گەردوونە وردبببینەوە ... ڕێهات بۆچوونی جیاوازبوو بۆ ژیان .. خۆی لە هەناسەیەکدا ئەبینییەوە وەک هەناسەی کلارنێت.

ئەی هەناسە چییە؟ هەڵمژینی هەوایە؟ هەناسەدان و هەناسەدانەوەو داخە؟ ئەمانە پرسیارن؟ پرسیارێکی تر بۆچی موزیکی هەڵبژارد؟ وەڵامەکەی دیارە

چونکە لە ژینگەیەکدا گەورە بووبوو کە لەمناڵییەوە لەڕێی دایک و باوکی و براکەیەوە گوێبیستی موزیک بووە. پرسیارەکە ئەوەیە ئەی بۆ ئامێری کلارنێتی هەڵبژارد؟

سەرەتا حەزئەکەم کورتەیەک لەمێژووی ئامێری کلارنێت باس بکەم، بەڕای من سەرەتاکەی بۆ ساڵی (١٧٠٠) دەگەڕێتەوە، کلارنێت ئامێرێکی فودارەو لەداری رەشی ئەبەنوس دروستکراوە و ئامێرێکی رۆژئاواییە، بەڵام بەڕای من مادام ئامێرێکی فودارە لەرۆژهەڵاتەوە نزیکە و رۆژئاوا بەهۆی زیرەکی خۆیانەوە لەسەرەتادا لە تیپە سەربازییەکان بەکاریان هێناوە.

لەعێراقیش لەساڵی ١٩٢٣ لەدروستبوونی سوپای عێراقەوە هاتۆتە ناو تیپی سوپا، دوای ئەوە تاکە کلارنێت ژەنێک هەبێت کە کەمانچەو کلارنێتی ژەندبێت هونەرمەند (قادر دیلان)بووە، دوای ئەو هونەرمەند (شەوکەوت رەشید)بووە کە لەتیپی موزیکی سەربازی بووەو عودژەنێکی بەتواناش بووە.

لەتیپی مۆسیقای سلێمانیش هونەرمەند (عومەر سەرکار) و (عوسمان سەرکار) ئەم ئامێرەیان ژەندووە.

ئێمە کەتیپی مۆسیقای شنرویمان دروستکرد، حەزم لە سۆلۆی کلارنێت کردو لەتوانای رەوانشاد (ئیسماعیل حەمە سەعید) دڵنیابووم. مامۆستا هەڵکەوت لە ڕێکخراوی لاوان کلارنێتێکی هێنا بۆ ئیسماعیل کە تا ئەو ساتە ئۆکۆردیۆنی دەژەند، پارچە موزیکێکم دانا بەناوی (شنەی مۆردانە) ئەو سۆلۆکانی دەژەند، بۆ مێژوو دەیڵێم شەوی ١-١-١٩٨٠ لەهۆڵی هۆتێل حەسیب صالح بەشداری ئاهەنگێک بووین مامۆستا سەلاح رەئوف و ئیبراهیم محەمەد لەوێ بوون بەسۆلۆکانی کلارنێتەکەی ئیسماعیل زۆر سەرسام بوون، دوای ئەوە حەزم ئەکرد تیپەکە پڕبێت لە ئامێری هەوایی و ئاواتەخوازبووم هەر کەسێک مناڵێکی ببێت فێری ئامێری کلارنێتی بکات، چونکە سیحرێکی جیاوازی تێدایە.

کاکە ڕێهاتیش ئەم سیحرە جیاوازە بەرەو ئامێری کلارنێتی راکێشا، کاتێک ئەم هەستە ناسکە دەچێتە پەیمانگاو دوای پێنج ساڵ قاڵبوونەوە لەدنیای رۆحی نۆتەو سەرکەوتن و بێزاربوون لەهەموو ژیان لەهەموو موزیک پەنا بۆ ئامێرێک دەبات پڕ بە سینەی فووی پێدابکات و هەموو ئازارەکانی لێوەبکاتە دەرەوە، چونکە کە گوێت لە هەناسەکانی دەبێت وا ئەزانیت کە خۆتیت هەناسە هەڵئەمژیت، ئەویش

بەو هەستە جوانەو بەو هەناسانەی فووی دەکرد بە کلارنێتەکەیدا، چونکە هەموو دنیای لە کونەکانی ئەو دارە رەشەی کلارنێتدا دەبینییەوە.

دەبوو ژیاندۆست بوویتایە نەک مەرگدۆست، برام بۆ ئەم هەناسە سیحراوییەت بردە ناو گۆڕو بوویتە جەستەیەکی ساردوسڕ؟ گەر وانەبا دەتتوانی چەندین کاری داهێنان بکەیت، بەداخەوە سۆزت سواری بیرکردنەوەت بوو، تا ئەبەد خەمێکی نەبڕاوە دەبیت بۆ هەموو مرۆڤێک کە یەک تۆز هەستی مرۆیی تێدابێت.

کاکە ڕێهات ئەتوانم زۆر شت بنووسم بەڵام تازە هیچ سودێکی نییە، خۆزگە بمایتایە وەک هاوڕێیەک خەمەکانم بۆ سووک بکردیتایە، ئیتر سوننەتی ژیان وایە و ژیان بەردەوامە، بەداخەوە هونەرمەندە بلیمەتەکە هیچم پێ نییە جگە لە فرمێسک، تۆش لەو دنیایەی دیکەی کە هەڵتبژارد مۆزیکی نەمری بژەنەو هەموومان ئەبینەوە بەخاک و خۆڵ و دیارە ژیان رۆحی تێدایەو مردنیش بێ ڕۆحە.



## بۆیەکەمینجار ئاهەنگێک لەشەوی یەڵدا لەهەڵەبجە

لە سەرەتای مانگی ١٢ی ساڵی ٢٠١٨ خاتوو (سەمیرە ساڵح) سەرپەرشتیاری (مۆزەخانەی کلتووری هەڵەبجە) پەیوەندی پێوە کردم کە پێکەوە لەگەڵ (یانەو سیاچەمانە) و بە سەرپەرشتی بەڕێوەبەریتی ڕۆشنبیری هەڵەبجە کە بتوانین لە شەوی یەڵدا واتە ٢٠/لە سەر ٢١ ی/١٢ بتوانین یادێکی ئەو شەوە بە گۆرانی و تابلۆ و هەڵپەڕکێ و نمایشی جل و بەرگ ساز بکەین، بۆ ئەو مەبەستەش ڕۆژێکیان لە کافتریای ئەمنە سورەکە لە سلێمانی دانیشتنێکمان سازداو پێکەوە نەخشەمان بۆ دانا، دوای چەند ڕۆژێک چەند کچێکی بۆ ئامادە کردین و ئێمەش پێکەوە لەگەڵ مامۆستا عادل، چەند بیرۆکەیەکمان دانا کە لە شێوازی تابلۆی هونەری چەند تابلۆیەک ئامادە بکەین و چەند ڕۆژێک لە ژێر زەمینی فێرگەکە بەو زستانە پرۆڤەمان کردو فێری جوڵەو ئاوازەکانمان کردن، کە چەند تابلۆیەکی هونەری جوان بوون وەک:

تابلۆی هەنار هەنارە
ئەی خاوەر خاوەر خاوەر
مینەی لولک ژەن
بووک بردن و خەنەبەندان .

چەندین ئاوازو ئامادە کردنی جوانمان بۆ کردن، هەروەها (یانە و سیاچەمانە)ش چەند هەڵپەڕکێیەکیان ئامادە کردبوو، هەروەها گروپی مۆزەخانەکە نمایشی جل و بەرگیان تێدا نمایش کردو لە شەوی ٢٠ لەسەر ٢١ ی/٢٠١٨ لە هۆڵی یاریگای هەڵەبجە بە ئامادە بوونی سەدان کەس نمایشمان کرد .

هەروەها ئامادە بووان خواردنیان هێنابوو لەگەڵ خۆیاندا و تا شەوێکی درەنگ بەردەوام بوو، ئەو تابلۆیانە زۆر هونەری جوان بوون، بەڵام لەبەر بچووکی هۆڵەکەو تێکەڵ و پێکەڵی نمایش کاران و ئامادە بووان لە ئاستی هونەری و بیر کردنەوەی ئێمەدا نەبوو، بەڵام شەوێکی ناوازە و پڕ داهێنان بوو لە هەڵەبجە، کە ئەوە یەکەمینجار بوو یادی (شەوی یەڵدا) بەو شێوەیە بکرێتەوە.

## دیاری سەندیکای هونەرمەندان بۆ فێرگەی شنرویَ لە ساڵی ٢٠١٩

لە سـەرەتای سـاڵی ٢٠١٩ هەر وەک جـاران لەگەڵ فێرخوازەکـان بەردەوام بـووین و چەنـدین فێرخوازمـان هەبـوو هەرچەنـدە کـاتی دەوامـی قوتابخـانەی فێرخوازەکان بوو، شەوی ٢٠١٩/٢/٦ لە سەندیکای هونەرمەندانی کوردستانەوە/ لقی سلێمانی کـاک بەهـادین هەڵەبجەیی و کـاک هێرش عبدالرحمن سـەردانیان کـردین و دوو ئـامێری مۆزیکیـان پێشـکەش بە فێرگەکەمـان کرد(کەمانێـک و گیتارێک) و ئێوارە مانەوە لەگەڵمان کاک عادل برنج و شلەی پەتاتەی بۆ لێنان و یادەوەرییەکی خۆشبوو، پاشـان تـا درەنگانێک لامـان بـوون و شـەو گەڕانەوە بۆ سلێمانی سوپاس بۆ هەڵوێستی جوانیان.



## دانانی کۆڕاڵێک بۆ یادی هەڵەبجە لە ساڵی ٢٠١٩

**چامەکەی کەمالی بۆ ناتیق**

وا لە مانگی شوباتداین و یادی هەڵەبجە نزیک ئەبێتەوە، چەندین بیرۆکەم لابوو بۆ دانانی ئاوازێکی نوێ بۆ ئەو یادە، بەڵام دەمێک بوو کە ئەمویست سوود لە چامەکەی (کەمالی) واتە عەلی باپیر ئاغا بۆ ناتیق) ی شاعیر، کە ساڵی ١٩٨٤ مامۆستا ساجد ئاوارە بەراوردکارییەکی کردبوو لە نێوان (چامەکەی نالی بۆ سالم) و ئەم چامەیە و لە دووتوێی کتێبیکدا بڵاوی کردەوەو هەر لەو ساڵەدا مامۆستا ئەمین سەپان، مامۆستا ساجیدی هێنا بۆ هەڵەبجەو لە هۆڵی مەڵبەندی لاوان کۆڕەکەی برد بەڕێوە دەربارەی ئەو چامەیە، کاتی خۆی من ئەو کتێبەم لابوو، بەڵام هەروەک زۆربەی وێنەو ئەرشیفەکانم فەوتان، بەڵام لە بەردەرکی سەرا کتێب فرۆشێک هەیە کە کتێبی کۆنی لایە و ئەو بۆی پەیدا کردم، ساڵێک پیشتر چوومە لای کاک حەسەن هەڵەبجەیی خاوەنی کتێبخانەی (شێخ ڕەزای تاڵەبانی) لەسلێمانی، (دیوانی ناتیق)م کڕی کە کاک حەکیمی مەلا ساڵح چاپی کردبوو، گەڕانەوە بۆ یادەوەری و تاوتوێی شیعرەکان کە شیعری کلاسیکی بوون و من ئەوە یەکەم جارم بوو کار لە سەر دەقی کلاسیکی بکەم، چەند ساڵێکیش لەوەو بەر هونەرمەند (عەدنان کەریم) چەند بەیتێکی لە (چامەکەی نالی بۆ سالم) ئاوازی بۆ دانابوو، دکتۆر عبداللە جەمال سەگرمە ئامادە کاری مۆزیکی بۆ کردبوو، ئیتر ئەوە بووە خولیام لەوەو پێش بیرۆکەی ئاوازەکەم لابوو، وردە وردە ئاوازەکەم دانا و کاک عادلیش هاوکارم بوو لە تێبینیەکانی بۆ ئەو کارە، ئیتر ئەو شیعرە بووە خولیام کە تەواوی بکەم و ڕۆژ دوای ڕۆژ بیرۆکەی نوێم بۆ ئەهات، کە بیرم لە شیعرەکە ئەکردەوە ئەمویست بە چەند مەقامێک و گۆڕینی ڕەزمەکان (ئیقاعە)کانی گۆڕانکاری تێدا بێت و وردە وردە خەریکی نوسینەوەی نۆتەکانی بووین، لە سەرەتای مانگی (٣) دەستمان کرد بە پرۆڤەکردن، ئەمجارە ویستمان سوود لە خوێندکارانی (پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی) ببینین، بە مۆزیک ژەن و کۆرسەوە، چەند ڕۆژێک زۆر بە شەوقەوە هاتن کە زۆریان پێخۆشبوو بەشداربن لەو کارەدا، تەنانەت بەڕێوەبەری پەیمانگاش ڕێگای پێدان کە بەشدار بن، بەڵام سەرۆک بەشەکەیان بە بیانووی ئەوەی کە لە مانگی داهاتوو نمایشێکیان هەیە لە پەیمانگا ڕێگری لێکردن کە بەشدار بن، ئیتر ناچار بووین

کەسانی تر بهێنین و بە سوپاسەوە خێزانی کاک عومەری چەلۆ بە خاو خێزان و خوشک و کوڕەوە هاوکارمان بوون. دوای ئەوە بە خۆم و کاک عادلەوە پەیوەندیمان کرد بە چەندین کەسەوە و هەروەها فێرخوازەکانی خۆشمان بە مۆزیک ژەن و کۆرسەوە هاوکارمان بوون و توانیمان نزیکەی ٢٥ کەس کۆبکەینەوە و هەروەها مامۆستا بەڕێزەکانی هاوڕێمان لە پەیمانگاو قوتابخانەکانەوە هاوکارمان بوون و توانیمان کارەکە سەربخەین، بۆ دەست نیشان کردنی گۆرانی بێژەکان کاک (ئاریان کەریم)مان هەڵبژارد، ئەو کاتانەش خاتوو (تارا ڕەسوڵ) لە هەندەران بوو، ئاوازەکەم بۆ نارد و بە دڵی بوو کە بەشدار بێت، مامۆستا (سالار مەحمود) یش لە شیعری کاک (دیار هەڵەبجەیی) ئاوازێکی بۆ تاراو کاک نەجمەدینی غولامی دانابوو، تۆماریشیان کردبوو دەیان ویست لەو یادە بەشدار بن، بە سوپاسەوە کاک ئازاد تۆفیقیش بەڵێنی بە تارا دابوو کە خەرجی بلیتی فڕۆکەکەی بگرێتە ئەستۆی خۆی، لە سەرەتای مانگی سێدا تاراش هاتەوە و بە بەردەوامی پرۆڤەمان ئەکرد تا کارەکەمان بە سەرکەوتوویی ئەنجام داو لە ڕۆژی ٢٠١٩/٣/١٦ لە هۆڵی داخراوی زانکۆی هەڵەبجە لای مۆنۆمێنتەکە ئەو کۆڕاڵەمان پێشکەش کرد، زۆربەی تەلەفزیۆنەکان کارەکەیان گواستەوە، بەڵام بە پچڕ پچڕ، بەڵام سوپاس بۆ (Halabja tv) کە هەموو کۆڕاڵەکەی بۆ تۆمار کردین کە نزیکە ی (١٨) خولەک ئەبێت لە مەقام و ڕەزمی جیاواز، ئەمەش چەندین وێنەی پرۆڤەکانمانە :



## ئەمەش وێنەی نمایشەکەیە




بۆ دەقی شیعرەکان لە چامەکە هەندێ شیعرمان کەم و زیاد پێ کرد بۆ ئەوەی لەگەڵ ئاوازەکەدا بگونجێت و ئەمەش دەقی ئەو شیعرەیە کە کردمانە ئاوێزانی کۆڕاڵەکە.



دەخیلی بەختم ئەی بادی خۆش خەرامی سەبا
لەباتی بەندە برۆ بۆ هەڵەبجە تۆ ئێستا
بچۆرە خزمەتی ئاتق سەلام و حورمەتی من
بەشەوقەوە بکە عەرزی جەنابی مامۆستا
بپرسە ئاخۆ هەڵەبجە چۆنە ئەمسالیش
بەکەیف و زەوق و ئاهەنگە هەروەکو ئەوسا
دەماخی بەرزە سەری سپیە کێوی هەورامان
وەیاخو مێزەری توردا لەداخی جەورو جەفا
شنروێ سەوزە بابچین بۆ سەیران
لەگەڵ تاقمی بەهیە و ئەختەرخان
زەمانی ڕاوەکەوە شاخی بەرزی شنروێ
پڕە لەدەنگی تفەنگ و لە گرمەو سەدا
بەڕۆژی جومعە ئەچن بۆ گولان و کانی شێخ
بچوکو گەورە بەشەوق و بەزم و سەفا
درەختەکانی بەنەشئەو شەفافە باخی مێر
وەیاخو وشکە لەبەر بەفر و شیدەتی سەرما
پڕە لەلالەو گوڵ ئاخۆ چەمی گوڵەبۆز
ڕواودڵێی گوڵەزەردە و ترێ و سەوزگیا
ئەبینی دەستەی یاران کاتی ئێواران
بەدەنگیخۆشەوە فاضل ئەڵێ مەقامی سەبا

ئەماوە ئێستا سەیرانگاکانی وەکو جاران
چلۆنە حاڵەتی باخی هەناری کانی عاشقان
جەنابی ئاتق گەربەزووی جوابم باتەوە
بەکەرەم غەرقی لوتفی خۆیم ئەکا
بڵێ لەوەزعی هەڵەبجە سوئالت فەرمووبوو
لەشاخ و داخ و لەرز و باخ و لەجێگا سەیرانی
منیش ئەڵێم ئەک هەڵەبجە
بەڵکو هەموو خاکی کوردان
بریندارە پڕ ئازارە..

١- خەرام / لەنجە
[illegible]

## ناسینی من بۆ حەکیمی مەلا ساڵح

لە ڕێکەوتی ٢٠١٩/٤/٣ چووم بۆ کتێبخانەی هەژار موکریانی لەهەڵەبجە بۆ کڕینی کتێبێک بە ڕێکەوت کاک (حەکیمی مەلا ساڵح)م دی و ئەم وێنەمان پێکەوە گرت کە چەندین یادەوەری بەبیرهێنامەوە



ناسینی من بۆ ئەو زاتە ئەگەڕێتەوە بۆ هاوینی ساڵی (١٩٧٢) ئەگەرچی پێشتر واتە لەلاپەڕەکانی تردا کەمێک باسم کردووە، بەڵام مادام ئەم لاپەڕەیە تایبەتە بەکاک حەکیم حەزم کرد هەندێکی دووبارە بکەمەوەو هەندێک زیادەشی بخەمە سەر.

ئەو کاتە باوی تیپی وەرزشی بوو ئێمە لە گەڕەکی کانی قوڵکە بە تایبەت لەو گەڕەکەی کەماڵی (عەلی شەمعەی) لێبوو، کە لە منداڵیەوە هەندێکیانم ئەناسی تیپێکی وەرزشمان دانابوو بە ناوی (تیپی وەرزشی مەهاباد) حەکیمیش سەرپەرشتی تیپێکی تری ئەکرد لە گەڕەکی کانی عاشقان بە ناوی (تیپی وەرزشی ناتیق) یارییەکمان کرد پێکەوە، پیشتر چەند یارییەکی ترمان کردبوو لەگەڵ چەند تیپێکی تردا، ئەو تیپەی ئێمە بریتی بوون لەم کەسانەی کە لەبیرم بێت: من لە بەرگری بووم، ئەوانی تر (ئەحمەد قادر، ئەدهەم مەلا عەلی، لەتیفی مامە حەمەم،

ئەحمەدی عەلی حەمە شەریف، وەهبی مەحمود سەروپێ، جەمالی شێخ حەسەن، چەند کەسیکی تر) لەو یارییەدا نزیک گۆڵی تیپەکەی بەرامبەرەوە تۆپێک بە ئاسمانەوە هات، دوو کەس خۆیان بۆ بەرز کردەوە حەکیم و جەمالی شێخ حەسەن لە تیپەکەی ئێمە کە ئەو دوانە خۆیان بەرز کردەوە سەریان بەر یەکتر کەوت منیش نزیکیان بووم، ئیتر جەمال سەری زۆر ئازاری داو بوورایەوە و بردمانە نەخۆشخانەی سەرەوە لە هەڵەبجە هەر چاک نەبوو تووشی (غیبوبە) بوو، تەنانەت بردیشیان بۆ بەغدا بۆ چارەسەر هەتا چەندین ساڵ کاردانەوەی لەسەر هەبوو، ئیتر منیش زۆر لەوە ترسام و هەرگیز توخنی یاری نەکەوتمەو وازم هێنا، ئەوە یەکەمین ناسینم بوو بۆی، پاش ئەوە لە ساڵی (١٩٧٦) ئێمە ئاهەنگێکمان گێڕا لە هۆڵی سانەوی کوڕان لە ڕێکەوتی ١٩٧٦/٧/١٧ حەکیمیش شانۆگەرییەکی نووسیبوو کاک جەمالی مەلا قادر دەریهێنا.

هەر لەو ساڵەدا چەندین ئەکتەرو ئەدیب، ویستمان بەشێکی (کۆمەڵ و هونەر ویژەی کوردی) بکەینەوە، چووین بۆ سلێمانی و ئەوانەی لە بیرم بێت: جەمالی مەلا قادر، سەید تەها شێخ حەمە ئەمین، مستەفای ئەحمەد شیرین، ساڵح هەژار بوو، من وحەکیمیش بووین کە لە هەموویان منالتر بووین، بەڵام ئەو لقە نەتوانرا بکرێتەوە.

ئیتر پاش ئەوە حەکیم چەند شانۆگەرییەکی تری ئامادەکرد، لەوانە (مەسەلەی ویژدان) ئەحمەد موختاری کرد بە شانۆگەری و ئەو سەرپەرشتی تیپی شانۆی ئەکرد و پێکەوە هاوکار بووین و پرس و ڕامان بە یەکتر ئەکرد، تەنانەت لە ساڵی (١٩٨٠) مەڵبەندی لاوان گۆڤارێکی دەرکرد بە ناوی (شنروێ) من و حەکیم یەکێک بووین لە دەستەی نووسەران، تەنانەت ئەگەر کارێکی هونەریمان بکردایە پێکەوە ئەمانکرد، پاش ئەوە هەر چالاکییەک بکرایە پرسیان بە ئێمە ئەکرد، تەنانەت کە (لقی ڕۆشنبیری جەماوەر) کرایەوە پێکەوە بەشدار بووین لە کردنەوەیدا، تا ساڵی (١٩٨٣) ئەو کاتەی ئەو چووە دەرەوە بوو بە پێشمەرگەش هەر پەیوەندیمان هەبوو، ئیتر ئەو کەوتە نووسینی ئەدەبی و لە بواری شانۆ دوورکەوتەوە.

هەمیشە وەک دوو کەسی چالاک و سەرەکی بووین، ئەو لە بواری شانۆ و من لە بواری مۆزیک.

ئەم وێنانەش ئەو یادەوەرییانە دەر ئەخات کە پێکەوە هاوکار بووین:



گۆڤاری شنروێ

گۆڤارێکی مەلبەندی لاوانی هەڵبجەیە
مانگی جارێک دەری ئەکات

دەستەی نووسەران

* ئەنوەر محمد ڕەشید
* بەیاد عەبدولقادر
* حەکیم صالح
* ئازاد حەمە صالح

## لەساڵی ٢٠١٩ دا سەیارەکەیان دزیم

ئیتر لە سەرەتای مانگی چوارەوە من کەوتمە نووسینەوەی رەشنووسی بیرەوەرییەکانم لە فەیسبووک و هەر شەوەی بەشێکم دادەبەزاند و تا مانگی ٦ لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ فێرخوازان خەریکی وانە وتنەوە بووین.

من لە سەرەتای ساڵی (٢٠١٨) خانەنشین کرام، تا ناوەڕاستی ساڵی (٢٠١٩) هیچ مووچەیەکم وەرنەگرت و هیچ سەرچاوەیەکی ئەوتۆی دارابیم نەبوو، جگە لە بڕە پارەیەی کە لە فێرخوازان وەرمان ئەگرت بۆ وانە وتنەوە و ژیانێکی مەمرەو مەژی بوو، تا لە ناوەڕاستی ساڵی (٢٠١٩) ئەو بڕە پارەیان بۆ خەرج کردم کە کەڵەکە ببوو کە نزیکی هەشت ملیۆن دینار ئەبوو، منیش بەو بڕە پارە (ئۆتومیلێکی سدریک مۆدیل ٢٠٠٢)م کڕی، من ئۆتۆمبیلەکەم لەبەردەم فێرگەکە ئەوەستاند، بەیانییەکی زوو بوو کاک عادل چووە دەرەوە وتی کاک ئازاد ئۆتۆمبیلەکەت دیار نەماوە، تووشی شۆک بووم باشە بۆ؟ دەیان خەیاڵ ئەهات بەسەرمدا تا پۆلیس و ئاسایشم تێگەیاند، بۆ ڕۆژی دوایی بە ڕێکەوت کاک عادل بە سواری تەکسییەک لەڕێگای عەنەبەوە بەرەو خورماڵ تەکسییەکە ئەڕۆیشت بۆ سلێمانی و بەڕێکەوت ئۆتۆمبیلەکەی بینیبوو تەلەفۆنی بۆ کردم و وتی ئۆتۆمبیلەکەتم دۆزیوەتەوە، ئیتر پۆلیس هات و ئەبینم نە مەکینەی تیدا ماوە نە تایە، لەو کاتەدا وەزیری ڕۆشنبیری کاک (حەمەی حەمە سەعید) بەو ڕێگایەدا نازانم لە تەوێڵە هاتبووەوە یان بیارە بەوێدا تێپەڕی و وەستاو وتی ئەوە چییە منیش وتم (سەیارەکەیان دزیوم) وتی باشە بۆت چاک ئەکەمەوە، هەر ئەو قسەیە بوو تا ئیستاش نەمدیوەتەوە، پاشان دەرکەوت کە کەسێکی (کەم عەقڵ) بردوویەتی و بۆ ماوەیەک گرتیان و پاش ماوەیەک هەر ئاگام لێ نەبوو بەریان دابوو، ئەمەش لە پای چی نازانم بۆ ئەم کابرایە کەسی نەدۆزیەوە من نەبێت؟؟

ئیتر لە ماوەی ئەو چەند مانگەدا تا کۆتایی مانگی هەشتی ساڵی (٢٠١٩) ، (٥٧) بەشم لەیادەوەرییەکانم لە فەیسبووک بڵاوکردەوە و هەروەهاش بەردەوام بووم لەگەڵ فێرخوازەکانماندا .

## تۆمارکردنی گۆرانی بارانە بۆ هونەرمەند ئازادە ڕەش لە ساڵی ٢٠١٩دا

لە سەرەتای مانگی ٩ ی سای (٢٠١٩) بریارمان دا کە چەند بەرهەمێک تۆمار بکەین، من ئاوازێکم دانابوو کاتی خۆی وە لە ساڵی (١٩٩٥) تۆمارمان کردبوو بەناوی (بارانە) بۆ هونەرمەند ئازادە ڕەش دەنگەکەیمان لە تیپی مۆسیقای سلیمانی لە بیناکەی تۆفیق قەزاز مامۆستا ئەنوەر قەرەداغی بۆی تۆمار کردبووین هەروەها وێنە گرتنەکەشی هەر خۆی بۆی وێنەگرتین کە ئەوکات تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان لە بینای زانکۆ بوو، پایزی هەمان ساڵ خۆیشی لە سەرچنار وێنەی بۆ گرتین و لە شەوی ١٩٩٦/١/١ بۆ یەکەمین جار پەخش کرا هەر ئەو شەوە یەک دوو جار لێدرا، ئیترپاشان ئەو گۆرانییە ون بوو، دیار نەما زۆر سۆراخمان کردوو چووین بۆ تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان کە ئەو کاتە کاک عەباس عەبدوالرەزاق (عەباسی ڤیدیۆ) بەڕێوەبەری بوو بەڵام هەر نەدۆزرایەوە و بۆیە بڕیارمان دا بە هاوکاری چەند ئەندامێکی تیپی مۆزیکی شنروێ سەر لەنوێ تۆماری بکەینەوە لە شەوی ٢٠١٩/٩/٤ لە ستۆدیۆکەی کاک عومەری چەلۆ (ستۆدیۆ لاوە) من و کاک عادل دەنگی کەمانەکانمان خستە سەرو بۆ شەوانی دواتر ئەندامانی تیپی شنروێ (ئەرکان، فوئاد، توانای نای، ئیبراهیمی دەف) ئەوانیش دەنگی ئامێرەکانی تریان خستە سەروپاشان کاک (نیازی سەنتور) دەنگی قانون و هەروەها کۆرسەکانیش، هەر بریتی بوون لە مۆزیک ژەنەکان، دەنگی کچیش ئاشتی خانی خێزانی کاک عومەرو بوکەکەی کۆرس بون تیایدا و پاشان دەنگی کاک (ئازادە ڕەش)مان خستە سەرو کاری دەنگ تەواوبوو، کاتی خۆی کاک وریا حەمە کەریم گفتی دابوو کە بۆمان وێنە بگرێت بە خۆبەخشانە، بە سێ جار واتە سێ ڕۆژی جیا وێنەمان گرت یەکەم ڕۆژ لە ٢٠١٩/١١/١ ئەندامان چووین بۆ باخەکانی گوڵان لە هەڵەبجە، هەروەها ئەوەی جێگای سوپاسە خوێندکارانی پەیمانگای هونەرە جوانەکانیش بە کوڕو کچەوە خۆبەخشانە لەگەڵ چەند فێرخوازێکی فێرگەکەمان هاتن بۆ وێنە گرتن، دوو کچیش خۆیان ئامادە کرد بۆ نواندنی کلیپەکە ئەوانیش (دیە وریا و شانۆ ئامانج) بوون، بۆ ڕۆژی دووهەم ئەندامان چووین بۆ خورماڵ و بەشێکی ترمان وێنە گرت، تا لە مانگی ١٢ ی ٢٠١٩ ڕۆژێکیان باران باری و کاک وریا حەمە کەریم کۆرسەکان و گۆرانی بێژ و منیش لەگەڵیان چووین بۆ گوندی خەرپانی لەوێ ئەو کلیپەمان تەواو کرد و لە ڕۆژی

٢٠١٩/١٢/٨ کلیپەکە تەواوبوو، دامان بە تەلەفزیۆنەکان و ئەوانیش پەخشیان کرد، لەوانەیە لای زۆر کەس تۆمار کردن و کلیپ کردنی گۆرانییەک هەروا ئاسان بێت، نەخێر چەندین ماندوو بوونی تێدایە هەر لە ئاواز و شیعرەوە تا دەگاتە نۆتە نوسینەوە و تا دەگاتە کۆکردنەوەی مۆزیکژەن و کۆرس و گۆرانی بێژ و دوایش کاری چاککردنی دەنگ و پاشان (میکس کردنی) و پاشان کاری وێنە گرتن و مۆنتاج و چوونە دەرەوە و هاتوو چۆ و خواردن و جلو بەرگ و چەندین وردەکاری تر، تا ئەو کارە دێتە بەرهەم وە لە پێش هەموویانەوە توانای مادی، ئەوە نمونەیەک لەو نمونانە .





## بەشداری کردنم لە تیپی ئۆرکسترای سەمفۆنیای سلێمانی

هەر لە مانگی ٩ ی ئەو ساڵە (تیپی ئۆرکسترای سەمفۆنیای سلێمانی) بە سەرپەرشتی (دکتۆر عەبدوڵا جەمال سەگرمە) نیازی کۆنسێرتێکیان هەبوو، کاک عادلی هاوڕێم بەشدار بوو، دکتۆر عەبدوڵا جەمال بە عادلی وتبوو با کاک ئازادیش بەشدار بێت، کە پێی وتم بە خۆشحاڵیەوە لە ئێوارەی ٢٠١٩/٩/٧ یەکەم پرۆڤە ئامادە بووم، من ئەوە دووهەم جارم بوو کە لە تیپی ئۆرکسترا بەشداربم، جارێکیان لە ساڵی ٢٠٠١ کە لە زانکۆی سلێمانی نمایشکرا و یەک شەویان بەشداریم کرد، بۆ شەوی دووهەم نەمتوانی لەبەر ئەوەی باوکم کۆچی دوایی کرد.

بۆ ماوەی یەک مانگ بە بەردەوامی ئێواران لە کاتژمێر ٦ تا ٨ ی شەو پرۆڤەمان ئەکرد، شوێنی پرۆڤە کردنەکەش (مەڵبەندی ڕۆشنبیری زانکۆی سلێمانی)بوو، چەند مۆزیک زانێک بۆ ئامێرە فوودارەکان و کۆنتەراباص لە وڵاتی ئۆکرانیاوە بانگهێشت کرابوون، چونکە ئەو ئامێر ژەنانە دەگمەنن لای خۆمان، لە ئێوارەی ٢٠١٩/١٠/٥ لە هۆڵی زانکۆ نمایشکرا و چەندین پارچە مۆزیکی سەمفۆنیا و تەنانەت کاری کوردیشی تێدا بوو لە دانانی د.عبدالله جەمال و دڵشاد محەمەد سەعید، جەماوەرێکی بەرچاو ئامادەبوون.



## دوو ئاواز بۆ هونەرمەند خالید عومەر

لە کۆتایی مانگی ١٢ ی ساڵی (٢٠١٩) ئاوازێکی ترم بۆ هونەرمەند (خالید عومەر) ئامادە کرد بە ناوی (خاوەر +هەڵیخە) کە دوو ئاواز بوون پێکەوە گرێ دراوبوون و بە هاوکاری چەند ئەندامێکی تیپی مۆزیکی شنرۆێ لای کاک عومەری چەلۆ (ستۆدیۆ لاوە) تۆمارمان کرد و لە ساڵی (٢٠٢٠) کلیپمان بۆ کرد، ئەمەش دواهەمین چالاکی هونەریم بوو لە ساڵی (٢٠١٩).





ئەوەی ئاشکرایە لە سەرەتای ساڵی ٢٠٢٠ نەخۆشی پەتای کۆرۆنا لە هەموو جیهان سەری هەڵدا کە لە وڵاتی چینەوە پەیدابوو، بە داخەوە بووە هۆی لەدەست دانی چەندین ملیۆن مرۆڤ لە جیهاندا و بە داخەوە چەندین کەسانی ئازیزو برادەرمان بە هۆی ئەو پەتا نەگریسەوە گیانیان لە دەستدا، هەندێکیان بە هۆی ئەو نەخۆشیەوە هەندێکی تر بە هۆی نەخۆشی ترەوە، پێش دەست پێکردنی (کەرەنتینە) لە ڕۆژی ٢٠٢٠/١/٨ هاوڕێم کاک سەلاحە ڕەش خەریکی دەرهێنانی فلمێکی دۆکیمنتاری بوو لە سەر مێژووی سینەماکەی هەڵەبجە بە هۆی ئەوەی من لە نزیکەوە ئاگاداری کردنەوەی ئەو سینەمایە بووم چونکە خاوەنەکەی کاک (حەمەی لاسلکی) بوو کە دراوسێمان بوو، لە هاوینی ساڵی (١٩٧٠) ئەو سینەمایە کرایەوە، هەروەها ڕەوان شاد بەختیاری عومەری خەزانیشی لەگەڵ بوو، چونکە ئەویش ئاگادار بوو، ئەو سینەمایە لە پێشدا هاوینە بوو واتە (سەقف)ی نەبوو کەواتە بە شەو سینەما ئیشی ئەکرد، پاشان لە هاوینی ساڵی (١٩٧٣) کاک عومەری خەزان بە هاوکاری کوڕەکانی یەکێکیش لەوانە بەختیاری کوڕی، سەقفی جەمەلۆنیان بۆ درووست کرد ئینجا بە ڕۆژ ئیشی ئەکرد، من چیم لە خەیاڵدا بوو دەربارەی ئەو فلیمە بۆم باس کردن بەوردی و پاش ماوەیەک سەلاح کردیە فلمێکی دۆکیمنتاری .



لە بەرواری ٢٠٢٠/٣/١٤ لە کوردستان و هەموو شارەکانی عیراق و هەروەها جیهانیش باری نائاسایی ڕاگەیەنراو (کەرەنتینە) دەستی پێکردو هەموو خێزانەکان لە ماڵەکانیان مانەوە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ و لە هەموو چالاکییەک وەستاین .

## شیوەنێک بۆ کۆچی دوایی هونەرمەند ئەسغەر رەشید

بەداخەوە و لە سەرەتای کەرەنتینەوە لە شەوی ٢٠٢٠/٣/٢٧ هاوڕێ و دراوسێی ئازیزم هونەرمەند (ئەسغەر ڕەشید) بە نەخۆشی کۆچی دوایی کرد و بەڕاستی لەدەست دانی ئەو هاوڕێیەم گریاندمی و تاساندنمی کە یەکێک بوو لە هەرە هاوڕێ و دراوسێی ماڵ بە ماڵ بووین لە ماوەی (سی) ساڵ لە هەڵەبجەدا

منیش ئەو شەوە ئەم پەیڤانەم بۆ نووسی و شیعرو ئاوازێکیشم بۆ دانا .

هاوڕێم ئەسغەر گیان

ئاخ مردن ئەی ئەو تەلیسمەی کە نازانیت چ کاتێک بەرۆکت ئەگرێت وئیتر کات و شوێنی بۆ نییە ..ئەم ئێوارە تووشی شۆک بووم بە بیستنی هەواڵی کۆچی لە ناکاوت کاکە ئە سغەر گیان، نازانم لە کام چرکە ساتی منالییەوە دەست بکەم بە گێڕانەوەی یاددەوەریم دراوسێیەکی دیوار بە دیواری ٣٠ ساڵ لە تەمەن... و لە چرکەیەکدا بکوژێتەوە زۆر ستەمە، هەر لە تەمەنی منالی و یاری کۆڵان و گەڕەک و دوو گۆڵی، ئێمەو ئێوە نەک هاوسێ بووین، بەڵکو هاوڕێ و هاوخەم و هاوسۆز یادەوەرییەکی بەرجەستەی زیندوو کە هەرگیز ناسڕێتەوە هەر لە باوکتەوە کاک رەشیدی قەساب کە پێم ئەوت بەڵکو پێستی بەردوگم بۆ بێنە ئەیکەم بە تەپڵ و هەر بۆ سبەی مەلا بانگدان ئەیدا لە دەرگاو یەکسەر پێستێکی نەرم و نۆڵی مەڕێکی ئەدامێ و منیش ئەمبەست لەو شەربەیەی کە بۆ پێستەکەم دانابوو، ئێستاش تەپە تەپی دەستی دادە ئامینی دایکتم لە گوێدایە کە مەلا بانگدان بە دەنگی ساج و مایەی دەستیەوە دەستی ئەکرد بە نان کردنی هەورامی و زۆربەی بەیانیان موچەیەک نانی گەرمی لە دیوارەکەوە ئەدایە دەستمان، یان دەست و

پەنجـە و مەچەکـی مانـدووی کە تەشـی دەڕسـت بـۆ لفـکەو منـیش بە کـامێرای سینەماییەکەم وێنەم ئەگرت، خێزانیکی کەمدەست بەڵام لەناخەوە جوان و نە فس بەرز، ئێسـتاش تـامەزرۆی دەنگـی ئـە و مکـەبەرەیەم کە لە مـاڵی سـەید حەسـەنی سەعاتچییەوە هەڵواسرابوو بە دار تووەکەیماڵتانەوە ئێستاش تامەزرۆی شەوقی ئەو گلۆپە سەیارم کە لە بن گەڵای دار مێوو دار تووەکـانەوە بە شـەوان شـەوقی ئەدایەوە، ئێوە هەمـوو بە براو خوشـکەوە هـەرلە منـاڵیەوە پێکـەوە هـۆگر بـووین، ناهی خوشکت لەگەڵ بەیانی خوشکم لە سەربان چێشتە قولێیان ئەکرد...

ئەو کاتەی کە ئەحمەدی برات خەریکی درووست کردنی پەیکەر بـوو بە قـاڵبی بـۆرەک لەسـەر سـەربانەوە سـەیـرم ئـەکـرد ئـەو کـاتەی کە پـێکەوە چـووین دیدارێکمان سازدا لەگەڵ مینەی لولک ژەن، کە دەستم دایە مۆزیک، کاک حەسەنی برات یەکەمین کەس بوو کەمانێکی لای کاک عوسمانی رەسام کڕی، ئەو کاتەی کە هەر خۆت مێرد منداڵ بوویت خەریکی وێنە کێشـان بوویت لەو ژوورە گڵەی کە تێیدا دەژیان بە فانۆسی سیحری وێنەی عەلی مەردانت ئەکێشا .

نـازانم یادەوەریت چۆن تومـار بکـەم کە بە سـەدان یـادەوەری تـاڵ و شـیرینم لەگەڵ خۆت و براکانت هـەیە، بەو هـەمـوو نـەهـامەتیەی ژیـان هـەمیشـە خـۆڕاگر بوون، سەربەرز و نەفس بەرز، ڕۆژیک وا دەرنەئەکەوتن کە نائومێدن لە ژیـان، هەر کارێکی هونەریت بکردایە پێش هـەمـوو کەس ڕای منت بە هێند وەرئەگـرت، تەنانەت کە تابلۆی شاعیرانت وێنە کرد خۆم بە داری جاوی (داری جاوی دارێکی قاوەیی رەق بوو) چوارچێوەکانم بۆ درووستکردیت .

هۆ برای هەمیشە لە یاد نەچووم، فرمێسکی خـەمـی مـن بـۆ تـۆ لەنـاخێکی خـەم هـەژێـنە کە یادەوەرییەکـان وێنایـان کـردوون، کاکـە ئـەسـغـەر گیـان ئێسـتاش شاعیرانی هەڵەبجە: هەر لە گۆران ومەولەوی و نـاتیق و سـاڵح هـەژار و حیلمـی و شـاهۆ هـەمـووی کە بە دەسـت و پەنـجەی خـامەی ڕەنگینـت کێشـات و کردتـە پیشـانگایەکی هـەمیشـەیی هـەمـوو خەمنـاکن و شـین ئـەگێـرن، هـەمـوو منـاڵانی ئـۆپەرێتی سـەوزەو دارە شـکاوەکەی کە منـاڵان ئازاریـان ئـەدا هـەمـوو چـاو بە فرمێسکن و هـەمـوو شـەوانـی ماندووبوونت لەسـەر شـانۆ بـۆ درووسـت کردنـی دیکـۆر، شـینی مەرگـی لە ناکـاوی تـۆ ئـەکـەن، تـۆ بوویت پانۆرامـای ئـازارەکـانی هەڵەبجـەت کردە تـابلۆ، هـەمیشـە خـەم و ئـازارەکانت لە کـۆڵ بـوو بە تەنهـایی لە

ئۆردوگاکانی سونغور وژیانی مەمرەو مەژی و ئاوارەیی هەر خەریکی کاری هونەری بوویت تەنانەت گەشیتە تاران بۆ دیکۆری فلیمی سینەمایی، ئەتۆ بوویت خۆ بەخشانە لە ڕێکخراوەکان کارت دەکرد بێ بەرامبەر، دەست پاک و داوێن پاک، تەنانەت خەمت لەگەڵ منالآنی بێ سەرپەرشت هاوخەمیان بوویت و کتێبێکت چاپ کرد کە وێنەی منالآنی بێ دایک و باب و بێ سەرپەرشت و چاپ کردنیشت بە هاوکاری کەسانی خۆ بەخش بوو، ئێستاش هاوڕێکانت ئێواران لە لای سەرای ئازادی چاوەڕێتن بۆ ئەوەی پێک شاد ببنەوە لە عوسمانی نەجیبە و ئایارو نەبەزو چەندانی تر بە داخەوە، ئاخ مردن ئەوە تۆ چ ئە فسونێکیت، تۆ چ بارگەی خەمێکی هەرساتەی نا ساتەی هەواڵی گورچک بڕ وەک مارێکی ژەهراوی ئەدەیت پێمانەوە، نازانم چۆن ئەو هەموو یادەوەرییە بنوسمەوە؟ ناتوانم ئاخر ئێمە ژیانێک پێکەوە بووین بۆ لە پڕ لەم زەمەنی کۆرنایەدا کە نەتوانین ئەو هەموو هاوڕێیەت لە پرسەکەدا ریزی خەم بگیرین بۆ ئازیزیکی هونەرمەندێکی شێوەکاری هەست ناسک و نەفس بەرزو ژیان پڕ خەم. ئەی هاورێ و دراوسێ و خەمی ژینم کاکە ئەسغەر خەمت لەلام ئازارێکی تا بلێی گورچک بڕو بە سۆیە، ناخم پڕ پڕە لە گریان، هۆ کەسە بێوەیەکە هەمیشە خەمێکت لە کۆڵ نابوو ڕۆحت شاد هەی ڕۆح پەپولەکە.



## شیوەنێک بۆ هونەرمەند سابیرکوردستانی

بە داخەوە هەر کۆست دوای کۆست لە بەرواری ٢٠٢٠/٨/١١ هاوڕێیەکی دێرینی ترم بە نەخۆشی کۆرۆنا گیانی لە دەست دا کە زۆر ئازاری دام ئەویش کۆچی دوایی هونەرمەند سابیر کوردستانی بوو

وای برام ڕۆ سابیر گیان هۆ دەنگە زوڵاڵەکەی کەرکووک، چ بڵێم چ بنوسم؟ قوڕگم گیراوە لەبەر گریان ژیانی تۆ چیرۆکە، دیرۆکێکی زۆر خەمناک، زۆر تەمومژ، تەم و مژی چاوەکانت وەک غەریبی رۆح و جەستەی شەکەت و ماندووت، عە شقی تۆ بۆ هونەر هەر لە منداڵیەوە بوو، بیرم دێت سەرەتای ساڵانی حەفتاکان بوو لە هەر دوو باڵت بە هەوادا با دەدا وا بزانم یەکەمین گۆرانیت بوو.. بۆ تەلە فزیون شیعرەکەی بەم شێوەیە بوو:

بە هەرمێ و هە نار بێ، یارم شەدە لار بێ، خەنجەر بێنە بمکوژە، با گیانم رزگار بێ.

سابیر توو بی خودا دوای تۆو عەلی مەردان کێ مەقامی الله وەیسی و قەتارو خاوکەرو پێنجگا ئەڵێتەوە؟ کێ لە تۆ شیکتر، پاکتر، بەڕەوشتتر بە قسەی سوعبەت و پێکەنین، بەو نابینایییەوە تۆ هەمیشە رووناکی بوویت، لەو روناکیش تاریکی نازانم زمانی گۆم وەستاوە، بە داخەوە تۆ ئێستا جەستەیەکی بێ رۆحیت، تۆ چیرۆکێکی نەبڕاوەیت، دواترین پەیوەندیم بۆت پێش دوو مانگێک بوو کە تیلم بۆ کردیت و وتم کاک سابیر با ئاهەنگێک ساز بکەین لە هەڵەبجە، شەوێک بێ هیچ بەرانبەر بە شاهیدی هاورێکانم وتی ئامادەم، بە داخەوە مەرگ و داخی ئەم دەسەڵاتە و نەخۆشی نەگریسی کۆرۆنا ئاواتەکانی خستە ناو خاک، سابیر گیان هەقە هەرچی سەرۆکی حکومەتە کڕنوش بەرن بۆ هونەری بەرزی تۆ، ئەوان خاکیان فرۆشت تۆ نا، بە دەنگ و بە ئاوازەکانت نیشتیمانت کڕیوە، بە مەقامەکانت، ئەوە تۆیت دوای خۆشت ئاوازو دەنگی ناوازەت بە نەمری دەمێنێتەوە.

لە چلەکەشیدا وتارێکم لەسەر نووسی بەم شێوەی خوارەوە:

نووسینێکم بۆ چلەی هونەرمەندی هاوڕێی کۆچ کردووم سابیر کوردستانی

ماوەیەک لە مەوپێش لە مەڵبەندی ڕۆشنبیری زانکۆی سلیمانی ئامادەی ناساندن و دابەش کردنی کتێبی (سەمای فریشتەکان)ی هونەرمەند عبدالعزیز مەجید بووم.

نەقیبــی ســـەندیکای هونەرمەنــدان کـــاک نیـــاز نـــوری دوای تەواو بـــوونی مەراسیمەکە پێی وتم کاک ئازاد بەڵکو شتێک بنوسیت بۆ چلەی کاک سابیر و بۆم بینێرە بە چەند نووسەر و هونەرمەندێکمان وتوە هـەر کەسـەی شتـێک بنوسـێت وئەیکەین بە نامیلکەیەک لەو ڕۆژەدا دابەشی ئەکەین، وتم چاکە، ئەمڕۆ ئەو یادە کـرایەوە وگروپێکـی مۆزیـک بەشـداربوون لەگەڵ چەنـد گـۆرانی بێژیـک لەوانە محەمەد رەئوف کەرکوکی کەسێکی نابینـاش گورانیەکانی کاک سـابیری چـاک ئەوتەوە، من بە هۆی سەرقاڵیمەوە لە کۆتاییدا توانیم ئامادە بم، ئەوەی مەبەستمە نامیلکـەکـە دابەش کـرا و ئـەم هونەرمەنـدو نووسـەرانە بەشـدارییان لە نووسـین کردبوو، کە لە نامیلکەکە یەک دوای یەک وتارەکانیان بڵاوکرابووەوە

وریا ئەحمەد، ئازاد ساڵح، زانا مەحمود هەژار، دیاری قەرەداغی، توانا حەمە، د. مارف عومەرگوڵ، فەرهەنگ غـەفور، چـالاک سـدیق، عـادل محـەمـەد کریم، نیـاز نوری مەلا محەمەد.




هیوادارم ئەمە دوا کۆسـتی هونەرمەنـدان بێت هـەرگیـز یـادی کـۆچ کردووانـی ئازیزمان نەکەینەوە .

تێبینی/ دەقی وتارەکەم کە بۆ سابیر کوردستانیم نوسیوە لەبەشی وتارەکـانی ئەم کتێبەدا بڵاوکراوەتەوە. من هیچ وێنەیەکم نەگرت بە سوپاسەوە ئەم وێنەم لە واڵی کاک حەمە رەئوف کەرکوکی وەرگرتوە

حەسرەتێک بۆ گیانی هاوڕێی هونەرمەند سابیر کوردستانی

نازاد صالح

نازانم چۆن وەک دەنکە زیخی ناو کانیاوی خەیاڵم کۆکەمەوە و وەک ملوانکەو بیهۆنمەوە و بیکەمە مل
و گەردنی دەنگ و ئاوازەکانت .تۆ ئەی ئەورەس و عەندەلیبی هەناسە ی شەتاوی کەرکوک، قەناری کاروانی
مەقامی خاوکەرو اللە وە یس ی و ئای ئای و هیجران و گەڕەکەکانی
رە حیم ئاواو ئیمام قاسم وتە پە ، دەشتی لەیلان و کاکی بە کاکی گەرمیان .تۆ .هە ر لە تەمەنی مێرد
منالی و هە رزەکاریەوە گوێ کراوی سە داو دەنگی عەلی مەردان و سەلاح داودو حسین عە لی چەندینی
تر بوویت بەو کلتووری دەوڵە مەندە بوویت .خۆڕسکانە فێری هە موو وەزن و مەقامێک بوویت لە تووڵانی
هەتا کوورتی بە چریکە دەنگت و ئاشنا بوون .هەستی داهێنەرانەت تێدا خولقاو بە لەدەست دانی بینایت
هێندەی تر ڕۆ چویتە ناو قووڵایی ناخی خۆتەوە هە موو جوانیەکانت لە ئاوازو شیعرو گوێگرتنەوە لە
مێژوودا نمونەی ئە و داهێنەرانە زۆرە هەر لەئەبو علا المعری و تەها حسین و د.کامل البصیر ئە وان
بواری شیعرو ئەدەب



## بەرنامەیەک لە باخەکانی گوڵانی هەڵەبجە بۆ کەناڵی کوردسات

لە ڕێکەوتی ٢٠٢٠/١٠/٢٨ بەرنامەیەک هەیە لە کەناڵی کوردسات بە ناوی (GPS) کاک (نەهرۆ شەوقی)پێشکەش کارێتی و بە هۆی کاک (خەسرەو حاجی مەحمود)وە پەیوەندی پێوە کردم بۆ ئەنجام دانی بەرنامەیەک کە چەندین کەس بەشداری تێدا کرد و بەرنامەیەکی سەرکەوتوومان لە باخەکانی (گوڵان) ئامادەکرد کە سێ چوار گۆرانیمان تێدا نمایش کرد لە وتنی (خالید عومەر) و (مەستان) و دوای چەند ڕۆژێک لە تەلەفزیۆنی کوردسات پەخش کرا کە چەندین کیژو کوڕی هەڵەبجە بەشداریان تێدا کرد.

**بەشداریمان کرد لە چلەی خوالێخۆشبوو، ع.ع. شەونمی شاعیر و روناکبیر**

وە لە ڕێکەوتی ٢٠٢٠/١١/١٢ بە کۆرس و گۆرانی بێژو چەندین فێرخوازەوە بە شداریمان کرد لە چلەی کۆچی دوایی و پەردەلادان لە سەر پەیکەری شاعیر و نووسەرو ئاوازدانەر مامۆستا ع.ع.شەونم .لە هۆڵی زانکۆی هەڵەبجە کە سرووودی بەناوبانگی (جەژنە جەژنی کوردستانە)مان پێشکەشی ئامادەبووان کرد بەخۆبەخشانە.






## تۆمارکردنی کلیپێک بۆ گۆرانی هەی خاوەر و هەڵیخەی خالید عومەر

لە ڕێکەوتی ٢٢/١١/٢٠٢٠ توانیمان لە گوندی عەبابەیلێ گۆرانی (هەی خاوەر +هەڵیخە) کلیپ بکەین کە زیاتر لە ٢٥ کەس بەشدار بوون و دواتر بە چەند ڕۆژێکی تر کلیپەکە تەواو بوو بۆ هونەرمەند (خالید عومەر)





## کۆچی دوایی ئەو مامۆستایەی لەمناڵیمدا هۆگری مۆسیقای کردم

لە ٢٠٢٠/١٢/١٥ بە داخەوە هەواڵــی کــۆچی دوایــی مامۆســتا (حەمەی دادە ڕەعنا)م بیست ئەو مامۆستایەی کە لە مناڵیەوە منی فێری عەشقی مۆزیک کرد و حەسرەتێکی گەورەی خستە ناخمەوە و منیش ئەم پەیڤانەم بۆ نووسی:

چاوەکانم پڕفرمێسکە، ناخم مات و مەلول بۆ مەرگی یەکەمین مامۆستای مۆزیکی ژیانم مامۆستا حەمە سەعید ناسراو بە حەمەی دادە ڕەعنا

بە بیستنی هەواڵی مەرگت مامۆستای ئازیزم منت گەڕاندەوە بۆ مێژوویەکی دوور، هێجگار دوور گوزەر ئەکەم بە ناو یادەوەری مناڵیما وەک تروسکاییەک دەڕۆمەوە ناو یادەوەری مناڵیم لە کۆڵانی جولەکان کە بتوانم ماوەی چوونە قوتابخانەم لە ساڵی ١٩٦١ کە چوومە پۆلی یەکەمی سەرەتایی، ئەو ساڵە خاڵە حەمە عەلیم وەک مامۆستا لە تەوێڵە دامەزرا، لە پۆلی یەکی سەرەتایی بووم، یەکەمین کەس کە منی داخڵی قوتابخانە کرد بیرم دێت ئەحمەد رەشید بوو ئەو ساڵێک پێش من بوو دایکم تەسکەرەکەی دایە و لە گەڕەکی کانی قوڵکە ماڵی شاعیر شاهۆ کرابووە قوتابخانە، مامۆستا ئەحمەد ئەفەندی بیارەیی بەڕێوەبەری بوو، یەک دوو ڕۆژ لەو مەکتەبە بووم دوایی هە موومانیان ڕیز کرد بۆ کانی عاشقان، بینای مەکتەبێکی تازە کرابووەوە بە ناوی حەمدون، شوێنەکە دوور بوو دوای ئەوە باوکم نەقڵی کردم بۆ لای مامۆستا شیخ فاتح لە گەرەکی سەرا لەوێش هەستم بە نامۆیی کرد، دوور بوو لە ماڵمان لە کانی قوڵکە، لەوێش هەفتە یەک دەوامم کرد، دوکانی باوکم لە گەڕەکی پیر محەمەد بوو بە هۆی ناسیاوی لەگەڵ زۆربەی مامۆستاکان وتی نەقڵت ئەکەم بۆ مەکتەبی ئاشتی لای فەرەجە فەندی ئیتر چوومە قوتابخانەی ئاشتی لە پۆلی یەکەم، یەک جار فەرەجە ئەفەندیم لە بیرە کە ڕیز کرابووین زۆر سامناک بوو بەو منالیە لێی دەترسام، بیرم دێت مامۆستایەکمان هەبوو ناوی مامۆستا حەوێز بوو جارێک بردینیە گۆڕەپانەکە بە جلی وەرزشیەوە ئای چەند خۆش بوو کە مامۆستا دەیووت پانتۆڵی رەش و کراسی سپی و فانیلەی عەلاگە لەبەر بکەن خەتێکی سپیش لە نێوان پانتۆڵە رەشەکە هەبوو، دوای ماوەیەک بەرێوەبەر گۆڕدرا وەک خەونی مناڵی لە بیرمە ئیتر مامۆستا ئەحمەدی مەحمود مام عەزیز بووە بەرێوەبەرمان، منیش لەگەڵ

ڕوداوەکان ڕاهاتم . ئەو کاتانە وەک کوڕی گەورەی ماڵ جوانترین جل پۆشتەو پەرداخ، باوکم سالْحی مەلا سابیر بۆ بەغداد هاتوو چۆی ئەکرد کە ئەڕۆشت دەفتەر و قەڵەم و جانتا و هەموو شتێکی ئەهێنا. دوکانەکەی پڕ بوو لە چکلێت و نوقڵ و فستق و حەبی کالمین هی کۆکە جۆراو جۆر جوانترین کێک و شەکرلەمەی درووست ئەکرد، تەنانەت تا ئێستاش ئاسمانی هەڵەبجە بۆنی کێک و شەکرلەمەی باوکم و دەنگی ئاوازەکانی منی لە بیرە.

ئەو مامۆستایانەی لە پۆلی یەک کوردی پێ دەوتین ناوی مامۆستا بورهان بوو خەڵکی سلێمانی بوو، هەر ئەوەم لە بیرە (دارا دوو داری دی)لە قاتی سەرەوە بوو یەکەم ژوور لەو کەسانەی لە بیرمە تەلەبە بوو لەگەڵم حەمە عەلی حەمە مراد و شەوکەتی برای و ئیتر لە پۆلی دوو چووینە ژورێکی تر وەهبی مەحمود و کەمالی خالْی و چەند مامۆستایەک موتەبق بوون لەوانە زاهیر ئەفەندی و مامۆستا سەلاح حیلمی و مامۆستایەک خەڵکی سلێمانی بوو بە ناوی نەجات ئیمزایەکی زۆر قورسی هەبوو.

لە ساڵی ١٩٦٣ هەموومان ئاوارە بووین چووین بۆ ناوچەی سازان لە دێی(تلەوەرێ) بە هۆی ناسراوی مامە سالْح باوکی عومەری رەسام، ئەو خێزانە گەورەیە بە سواری وڵاخ چووین، یەک مانگ لەوێ خۆمان حەشاردا وەک سەیرانیک وا بوو، لە ساڵی ١٩٦٤ خالْم حەمە عەلی بەرێوەبەری قوتابخانەی سیروان بوو، مامۆستا ئەحمەد بەرێوەبەرمان بوو لەو مامۆستایانە لە بیرم بێت مامۆستا حەمە عەلی کوردی پی دەوتین، مامۆستا ئەکرەم جوگرافیا و مامۆستا حامد حساب و مامۆستا عومەر کوردی و حساب و مامۆستا نوری حەمەی مەحمود ئەفەندی زیندە وەرزانی و مامۆستا سالْح دەست و خەتی زۆر خۆش بوو عەرەبی و مامۆستا رەسوڵ و مامۆستا باقی دین. یەک کەسیان زۆر جیاواز بوو ئە ویش مامۆستا حەمەی رەعنا، ئەو پیاوە هەموو ژیانی منی گۆڕی، هەندێ جار نائومێد دەبم و دەڵێم خۆزگە منیش وەک ئەوانی تر گە لحۆ ئەبووم، نا بەس منت فێری ئەوە کرد بە دوای جوانیدا بگەڕێم. ئێستاش تۆ جەستەت مردووە، گیانت زیندووە کێ تۆ ئەناسێت من نەبێت؟ چاک چاک لە بیرمە منالْ بووم تەمەنم دە ساڵ بوو ئەتوت ئازاد برۆ کە مانچەکەم بۆ بێنە لە ماڵی خوشکم شوکریەی ژنی حەمەلەی کەبابچی، پاڵ ماڵی مستەفای کەمال خەفاف لە بیرتە؟کە بە دزیەوە

کەمانچەکەم ئەکردەوە و بۆ ئەوەی بۆ یەکەمجار ببینم؟ لە بیرتە لە ناو پۆلدا تیپێکی کۆرست درووست کردبوو؟

لە پۆلی چوار ساڵی ١٩٦٤ من بووم سەرکۆ بوو کۆزاد بوو ئەفراسیاب بوو، کە ئاوازەکانت ئەژەند بە کەمانچەکەت من ناخم ئەهەژا وەک شیعری جوان، هەموو گۆرانییەکانم لە بیرە، یەکسەر دەستم هە ڵ ئە بڕی ئەزانی چی بوو؟جەژنی دارو درەختە، مەوتنی، ئەریٚ لەیلی، ئەی وەتەن چەند خۆشەوستی، بڕوا بکە چەندین دەنگی ئاوازی کەمانچەم بیستووە ناگاتە ئەو چێژەی لە دەنگی کەمانەکەی تۆم بیستووە، تۆ قوتابخانە بوویت بۆ کەسانی تر، گەر تۆ نەبوویتایە منیش نە ئەبووم منیش نەبوومایە سەدانی تر نە ئەبوون من درێژ کراوەی رۆحی تۆم، لە بیرم دێت دوای چەندین ساڵ دابڕان وتت ئازاد گیان من شانازی بە تۆوە ئەکەم، منیش ئەڵیم مامۆستا گیان نەک من هەر هەموومان شانازی بە گیانی تۆوە ئەکەین، پەیکەرێکیت لە ناخماندا و لە جەرگە ی شاردا بۆ درووست ئەکەین، چ بڵێم جگە لە حەسرەت و گریان؟ زۆر بە داخەوە مامۆستا گیان من ئەزانم چەند گەورەیت چ بکەم لە وڵاتی غەریبی گیانت سپارد.



### ساڵی ٢٠٢٠ هەر نەڕۆیشت تا مەرگی مامۆستا ئازاد حەمدیشمان دی

ئەو ساڵە هەمووی نەهامەتی بوو لە ڕۆژی ٢٠٢٠/١٢/٢٩ هەواڵی کۆچی دوایی مامۆستا (ئازاد حەمدی) تاساندمی کە هەر لە سەرەتای لاویێتیەوە هاوڕێی خاڵە (حەمە عەلی)م بووە و ناسیاوییەکی تەواوی لەگەڵ باوکمدا هەبووە و چەندین یادەوەریم لەگەڵیدا هەبووە بە داخ و پەژارەیەکی زۆرەوە ئەو پیاوە جوان و نیشتیمان پەروەرە کۆچی دوایی کرد.

کە خاوەنی دوو بەرگ لە کتێبی کەسایەتییەکانی هەڵەبجەو یادەوەری مامۆستایەک لە هاوار و بەشدار بووە لەگەڵم لە چەندین بەرنامەی تەلەفزیۆنی.



## ساڵی ٢٠٢١

لەڕێکـەوتی ٢٠٢١/١/٦ وەک نـوێنەری فێـرگەی مـۆزیکی شـنروێ لە هـۆڵی مۆنۆمێنتی هەڵەبجە ئامادەبووم لە ناساندنی کتێبە شیعری هاوڕێی شاعیرم کاک دلاوەر هەڵەبجەیـــی کە لە ئوســـتوراليا دەژی بە نـــاوی (ســـۆزی دووری) بە سوپاسەوە داهاتی کتێبەکانی پێشکەش کرد بە فێرگەی شنروێ بۆ ئەوەی بتوانین خزمەتـی فێرخوازەکـانی پێـبکەین، ئەوە مـایەی خۆشـحاڵییە کە هاوڕێیانمـان لە هەندەران بە ئەرک و ماندووبوونمان ئەزانن، سوپاس هەستی جوانیان ئەکەین.
دلاوەر هەڵەبجەیی داهاتی کتێبەکـەی پێشـکەش بـە فێرگـەی مـوزیکی شـنروێ کرد

## دیدارێکی کورت لەگەڵ هونەرمەند عوسمان کێمنەیی

پیاوێک لە بۆنی عەترو دەنگ و ئاواز شیکپۆش، ڕۆح جوان کە دیم یەک وشەم لە ناخدایە هەمیشە پێم ئەڵی ئەزانن چییە؟ خەفەتی بە یەک شت ئەخوارد نەپارەیە نە سەروەتە نە سامانە وتی خۆزگە هەرچی مـاڵ و سـامانی دنیـام لە دەست بـایە بەڵام دەنگم لە دەست نەدایە، بە ڕاستی چەندین جار ئەو وشـەیەی پێوتـوم، بـەڵام لە ناخیدا رای ئەگەیەنم.
ئەم دوای عـەسـره ٢٠٢١/١/١١ بەڕێـکەوت هونەرمەنـدی ناسـنامەی گـۆرانی نـاوچەی هـەورامـان بەڕێـز مامۆسـتا (عوسـمان کەیمنەیـی)م چـاو پـێکەوت لای چایخانەکەی نزیکی گۆڕەپانی (سەرا) چوومە لای دانیشتم ماوەیەکی زۆربوو بە خزمەتی نەگەیشتووم، کەوتینە باسی گۆرانی و یادەوەرییەکانی و وتـی مامۆسـتا هـونەر چـی بـۆ کـردین لە ژیـان جـگە لە مەینەتـی وتـی ئێسـتا هێنـدە تـاقەتی چاوپێکەوتنم هەر نەماوە، منیش وتم ئەمنیش نیو سەدە لەو بوارەدا کارم کردووە مایەمـان هـیچە، بەڵام ئیتـر ئەوە قەدەرە بەختمـان یـاوەری ئەم نەهـامەتیە بـوو، پاشان نیو کاتژمێرێک چەندین پرسیارم لێکرد، هەر لە سـەرەتای دەسـت پێکردنـی گۆرانییەوە هەندێ زانیاری دامێ. هێندەی بتوانم دەینوسم، وتی هەر لە سـەرەتای

منالّیمەوە هەرچیم دەبیست لە گۆرانی لە دێکەی خۆمان کەیمنە لە بەرم ئەکرد هێندە زیرەک بووم، لە سەرەتای ساڵانی چلەکانەوە گۆرانی ئەڵێم و زیاتر لە هەزار شاییدا بەشداربووم، هەر لە هەورامانەوە تا کەلار و دەربەندیخان و قەرەداغ و هەڵەبجە، لەگەڵ نەسروڵا کەیکاوس تەوێڵەیی وئەلیلە و مام حەیدەر، ئەحمەدی نازداریٚ، مستەفا محی الدین(مچەی محە)حەمە حسین کەیمنەیی و جەمیل و چەندینی تر. وتم کەی بوو چوویتە ئیزگەی کرماشان؟ وتی کۆتایی پەنجاکان لەگەڵ حەمە حسین بوو کە گۆرانی(کۆرپەلەی قەد باریک)م وتوە باسی کرد عود ژەنێکی فارسی لێبووە ئەو کاتە لە کاتی پرۆڤە پێی ووتم (ئاغا من بگۆم شما برۆ پایین تۆ دەچیتە باڵا واتە من بە تۆنی گرِ مۆزیکت بۆ دەژەنم تۆ بە تۆنی بەرز دەیلێیت، باسی ئەوەی کرد کە سایزەر گۆرانی کوردی تێک داوە، بەرێزی وتی چەندین کەس گۆرانییەکانمیان تێکداوە زۆر جار گلەیم لێکردوون، وتی من حەزم لە ئامێرە ڕۆحییەکانە وەک کەمان و عود و نای وکەبتوانم ناخی خۆم دەربرِم.

یەکەمین کەس کە لە هەڵەبجە دەنگی تۆمار کردبێت لە چایخانەکەی حەمە کەریمی چایچی کە رەشەی حەمە کەریمی کورِی کە من لە یادمە هەمیشە کڵاوێکی لە سەردا بوو تەسجیلێکی گۆرەندیکی هەبووە بۆی تۆمار کردووە، پاشان لە چایخانەی حەمە پایەدەر. من هەر لە سەرەتای ساڵانی شەستەکانەوە بە دەنگی ئاشنا بووم ئەویش لە ڕێگای تەسجیلی چایخانەکانەوە کە زۆر جار گۆرانی کاک عوسمان و جەمیلیان دەخستە سەر و گۆرانیەکانیان لێدەدا. دواتر بۆ یەکەمین جار لە نەورۆزی ساڵی (١٩٧٠)بوو کە بە بۆنەی بەیانی یانزەی ئازارەوە پارتی لە خورماڵ ئاهەنگێکیان گێرِا و لەو ئاهەنگەدا کاک عوسمانم دی کە گۆرانی وت. پاشان لە سەرەتای ساڵانی هەشتاکانەوە ماڵیان هاتە هەڵەبجەو لە نزیکەوە یەکترمان ناسی و برِیامدا هەرچۆنێک بێت گۆرانی لە تەلەفزیۆن بۆ تۆماربکەین و توانیمان لە ساڵی (١٩٨٣) دوو گۆرانی لە تەلەفزیۆنی کەرکوک بۆ تۆمار بکەین .. سەرەتای هە شتاکان جارێکیان چوومە ماڵیان دوای عەسرێک بوو شەش حەوت تەسجیلی سانکیوی دانابوو لەگەڵ قەفەزێکی کەو ئەو کاتە باسی کرد وتی شەوانە هەموو تەسجیلەکان دەخەمە سەر ڕیکۆردو بە جاریٚ هەموویان پرِ ئەکەمەوە. کەوەکەش کە گوێی لە دەنگم ئەبێت دەست ئەکات بە خوێندن. (بۆیە هە ندیٚ شریتی دەنگی قاسپەی کەوی تێدایە)پاشان باسی ئەو دوو گۆرانییە کرد کە ساڵی

١٩٨٣ ئێمە وەک تیپی شنرویّ بۆمان تۆمارکرد لە تەلەفزیۆنی کەرکوک بە ناوی (کاڵە بەی . کەتانە) کە هەردووگۆرانییەکە من بۆم ئامادە کرد، وتی من بەو گۆرانییانە هەموو کورد ناسیمی بە تایبەتی هەورامانی ئەودیو، پاشان باسی دەنگ تێک چوونەکەی کرد بە حەسرتەوە زۆر خەمناک بوو، وتی شەوێکی بەهار بوو ساڵی ١٩٩٢ لە مەریوان بووم میوانی چەند کەسێک بووم کە کاتێ چایان بۆ دانا بووم ئاگام لێ نەبوو پیاڵەکەیان گۆڕی وتی ئیتر دوای ئەوە دەنگم تێکچوو ئیتر نازانم چیان تێکردبوو، وتی ئەوتاوانبارانە یەک دوانێکیان مردوون. بەردەوام بوو وتی چوار جار لە تاران نەشتەرگەریم بۆ کردووە سەرکەوتوو نەبووە. لێم پرسی کات چۆن بەسەر ئەبەیت؟ وتی زیاتر لە ماڵەوەم لە سلێمانی. یان جار جار دڵسۆزی کوڕم باخێکی بچکۆلەی هەیە لە (گەچێنە) جاری وا هەیە مانگێک لەوێ دەبم. بە پێکەنێکەوە وتی گەر ڕێگاش هەبێت جار جار ئەچم بۆ مەریوان چونکە لەوێش ژنیکی ترم هەیە. وتم گەر بتوانین بەرهەمێکت بۆ نوێ بکەینەوە و بە دۆبلاج و مۆزیکی نوێ بۆت بکەین؟ کاک عوسمان هەرچی بڵێم ناڵێ نا یەکمان خۆش ئەوێت وتی بەڵکو تەمەن ڕێگا بدات، پاشان کات درەنگ بوو کاتژمێریک چەندین باسمان کرد و کات درەنگ بوو ماڵ ئاواییمان لە یەککرد.



## هەوڵدان بۆ دروستکردنی تیپێکی کۆرس لە قوتابیانی قوتابخانەکان

هەر لە سەرەتای ئاشنا بوونم لە گەڵ مۆزیک ویستوومە لە هەڵەبجەدا تیپێکی مـۆزیکی تـۆکمە درووسـت بـکەم یـان تیپیکـی کـۆرس کە بتـوانن بەرهەمە هونەرییەکان بە شێوازێکی جوان بڵێنەوە بۆ ئەم مەبەستەش چەندین هەوڵـم داوە وە چەندین قوتابخانە گەڕاوم، بەڵام زۆر لەو هەوڵانە وماندوو بوونمان بە هەدەر ڕۆشـتووە لەبەر چەنـدین هـۆ یەکێـک لەوانە جێهێشـتنی ئەو مۆزیـک زانـانە بۆشارەکانی تری کوردستان یان هەنـدەران و یان لەبەر ئاستەنگی کۆمەڵایەتی کەس و کاریان کە نەیان هێشتوە بەردەوام بن لەو بوارەدا، پاش ماوەیەکی کەم وازیان هێناوە و هەوڵ و ماندوبوونی ئێمەش بە هەدەرچووە. بۆ ئەم مەبەستەش چەنـدین هەوڵـم داوە خـۆم چـوومەتە قوتابخانەکـان لەنـاو قوتابخـانەکە کـۆم کـردوونەتەوە، بـۆ ئەم مەبەسـتەش لەڕۆژی ٢٠٢١/٢/٢٤ سـەردانی قوتابخـانەی بنەڕەتـی (ئاسـۆ بـامۆکی)م کـرد و چەنـدین دەنگـی کچـانی خوێنکـاری ئەو قوتابخانەم تاقی کردەوە و زیاتر لە (٣٠) کچ ئامـادە بوون بەڵام بەداخەوە پاش چەند ڕۆژێک زۆربەیان ون بوون و دیارنەمان لەبەر ئەو هۆیانەی کەباسم کرد و چەندین جار سـەردانم کردن بە خۆبەخشـانە، بەڵام هەوڵەکانم هەمووی بە زایە چوون .



## باسکردنی مێژووی موزیکی هەڵەبجە بۆ کەناڵی کوردسات

وەک بە ئەزمـونترین هونەرمەنـدی بـواری گـۆرانی و مۆزیـک لە مێـژووی هونەری مۆزیک لە هەڵەبجەدا هەمیشە ڕادیۆ و گۆڤارو تەلەفزیۆنەکان بەسـەرم دەکەنەوە بـۆ بـاس کردنـی مێـژووی مۆزیـک لە هەڵەبـجەو ئەزمـون و کـارە هونەرییەکـانم لە تیپـی مـۆزیکی شـنرویّ لە ڕێکـەوتی ٢٠٢١/٣/٦ لە تەلەفزیـۆنی کەناڵی (KURDSAT) بانگهێشت کرام بۆ لێدوان دەربارەی باس کردنی مێژووی هونەری مۆزیک لە هەڵەبجەو ڕۆڵی لە شارستانییەتی ئەو شارەدا.



## پەیوەندی لەگەڵ پەیمانگای گۆتەی ئەڵمانی

لە سەرەتای دەست بەکاربوونمان لە فێرگەی مۆزیکی شنروێ و دامەزراندنی چەندین هاوڕێ بە دڵسۆزی خۆیانەوە خەمخۆری منداڵانی و ماندوو بوونی ئێمە بوون. کەمن ئەو کەسانەی بێ بەرژەوەندی هاوکارمان بوون لەو بوارەدا. یەکێک لەو کەسە جوانە هاوڕێیەکی بەڕێزو دڵسۆزم کە لە ئەمریکا دەژی بەڕێز کاک (ئادەم) کە خاتوونێکی ئەڵمانی مۆزیک ژەن و سەرۆکی پەیمانگای (گۆتە Gouethe)ی ئەڵمانی لە هەولێر خاتوو (ئەنایس بۆلیک) بۆ ئەم مەبەستە دیدارێکی لە شاری هەولێر و لە چێشتخانەیەک بۆ ساز کردین لەگەڵ ئەو خانمە، نزیکەی یەک کاتژمێر زیاتر باسی کارو چالاکی ئەو فێرگەمان بۆ کرد بۆ ئەوەی بتوانن سپۆنسەری چەند چالاکییەکمان بۆ بکەن، گفتی ئەوەی دا کە لەنزیکەوە سەردانمان بکات بۆ ئەوەی لە کارو چالاکیەکانمان ئاگاداربن. لەڕۆژی ٢٠٢١/٤/١٠ وە پەیوەندیمان لەگەڵ ئەو پەیمانگایە پەیدا کرد .



## پەیمانگای گۆتە سەردانی هەڵەبجەیان کرد

پاش چوونمان بۆ هەولێر لە ڕێکەوتی ٢٠٢١/٦/٨ خاتوو (ئەنایس بولیک)و چەند فەرمانبەرێکی پەیمانگای (گۆتە) سەردانی هەڵەبجەیان کردو خۆیان لە نزیکەوە فێرخوازەکانیانی بینی و لە کارو چالاکیەکانمان ئاگاداربوون. زۆریان پێخۆش بوو. پاشان لە پاش نیوەڕۆکەی پێکەوە چووین بۆ ناوچەی هەورامان و بەو سروشتە جوانەی سەرسام بوون و لە چێشتخانەیەک لامان داو نانی نیوەڕۆمان خوارد و پاشان بۆ عەسرەکەی گەڕانەوە بۆ هەولێر و ئێمەش بەو دیدارە شاد بووین.





## کۆچی دوایی هونەرمەندی تیپەکەمان کاک(ئومێدی نوری حەمەی نانەوا)

به داخێکی گرانەوه هاوڕێ و مۆزیک ژەنی دێرینی تیپی مۆسیقای هەڵەبجە لە ڕۆژی ۲۰۲۱/۹/۹ بە نەخۆشــی کۆرۆنـا کـۆچی دوایـی کـرد و یـادەوەری و خەونەکانمی وەبیر هێنامەوە ڕۆحی شادبێت.



**یادەوەریەکانم لەگەڵ ڕەوانشاد ئومێدی نوری حەمەی نانەوا**

بەهاری سـاڵی (۱۹۷۱) بـوو لـە سـەیرانێکی قوتابخـانە لە سـەیرانگای (دوکـان) گەڕابووینەوە بۆ سلێمانی پیش ئەوەی بگەڕێینەوە بۆ سلێمانی بە پیکابێک، نمە باران ئەباری پیکابەکە وەستابوو لە فولکەی سجنی کۆن و پارکی دایکی ئیسـتا، ئـێمە کـۆزادی حەمەی نانەوامـان لەگەڵ بـوو لەو سـەیرانەدا و ئەو کـاتە لە پـۆلی سێهەمی ناوەندی بووین، بەڕێکەوت ئومێد هاتە نزیکی پیکابەکە، قاتێکی چاکەت و پانتۆڵی لەبەربوو، دەستی کرد بە چاک و چۆنی لەگەڵ کۆزاد، باسـی قوتابخـانەی لێ پرسی وا بزانم بە شەو ئەیخوێند ئەویش لە پۆلی سـێهەم بـوو، ئەوە یەکەمـین

جارم بوو کە بیبینم و نەم ئەناسی، تا دواتر پۆلی سێهەمی تەواو کردو باوکی دایمەزراند بوو لە هێزی (پاسەوانی سنوور، حرس الحدود) تا ساڵی (١٩٧٣) نەمدیبیەوە، تا ئەو ئێوارەی ڕۆژی ١٩٧٣/٤/٢٥ کە لەگەڵ مستەفای کەمال خەفاف هاوڕێ بوون بە بۆنەی ئەوەی کە هەردووکیان باوکیان پێشمەرگەی پارتی بوون پێکەوە بە منالی هەردووکیان ماڵیان لە تەوێلە بوو. دوای ئەوە ئیتر بووین بە هاوڕێی یەکتر. ڕۆژانە لەگەڵ مستەفا و فوئادی حەمەی مەحمود ئەفەندی پیاسەمان ئەکرد و پێکەوە مۆسیقامان دەژەند، هەرچەندە لە من گەورەتر بوو بەڵام هاوڕێیەتیمان بەهێزبوو، چەندین جار ئەچوومە ماڵیان و لە خێزانێکی رۆشنبیر بوون، کچەکانیان مامۆستا (پەروین و نیشتیمان) مامۆستا بوون و (پەیمان و نیان)ی خوشکیشی خوێندکاربوون، کە ئەچومە ماڵیان ڕێزێکی تەواویان لێدەگرتم. ئومێد هەر لە سەرەتای منالیەوە کەسێکی زیرەک و ورد بوو لە بواری ئەلکترۆن و کارەبا و دواییش مۆزیک. وەک لەگەڵ مستەفا بۆیان باس کردم هەر بە هەرزەکاری ئیستگەیەکی ڕادیۆیی دروستکردوە. دوای بەیانی یانزەی ئازاریش لە لاوان ئیستگەیەکی ڕادیۆیی لە هەڵەبجە درووست کردبوو کە شەپۆلەکانی هەموو هەڵەبجەی گرتۆتەوە. پاش دامەزراندنی تیپەکەش ئەو یەکەمین کەس بوو کە ئاوازو شیعرێکی بۆ سروودێک دانا بە ناوی (کوردستان کوردستان ..جێی دلێرو نەبەزان) هەروەها لە ساڵی (١٩٧٤) یش کە چالاکییەکی ترمان بوو ئاوازو شیعرێکی سروودی تری دانا بە ناوی (پارتی پیشرەوی گەلە/ هەڵقولاوە لەم گەلە/ بە پشتیوانی سوپا/ نانەوێ قەدئەم گەلە/ پێشڕەوە پێشڕەوە / بۆ خەبات و تێکۆشان/ شەڕکەرە جەنگاوەرە/ لە دژی داگیرکەران/ هەر لە خانەقین و زاخۆ هەموو خاکی کوردستان/ لە ژێر ئالای پارتیمانە پارتیمان) بەم شێوە بوو، ئیتر هەرچی چالاکی هەیە پێکەوە بووین. ئەو ئۆکۆردیۆنی ئەژەند. یەکەمین ئۆکۆردیۆن لە سەرەتای دامەزراندنی تیپەکەوە ئۆکۆردیۆنێک بوو کە لە عوسمانی ڕەسامی کڕیبوو کە قەرزی لە جەمالی مەلا قادر کردبوو. پاش ئەو ساڵانە ئەو حەزی لە کاری ئیداریش بوو، هەرچی کۆبونەوەمان بکردایە ئەینوسییەوە، کاتێک لە مالیەی هەڵەبجە فەرمانبەر بوو لە بەشی (ڕۆنیۆ) ئیشی ئەکرد و هەرچی نوسراوێکمان هەبوو ئەو بەڕۆنیۆ چاپی ئەکردو جار جار ئەچووم بۆ لای لە فەرمانگەکەی. هەر ئەویش بوو لەگەڵ مستەفا وتیان تۆ ببە بە

سەرۆک تیپ هەرچەند لە هەردووکیان منالتر بووم، جگە لە توانای کارەبا و ئەلکترۆن و مۆزیک لە نواندنیش بە توانا بوو، بیرم دێت ساڵی (١٩٧٢) نواندنی ئەکردو تەنانەت دوو شانۆگەریشی نووسی بە ناوی (ئەوەی هەڵخەڵەتا هەڵخلیسکا) ئەوی تریان بەناوی (کێ کردی و کێ خواردی؟).

ئەو سەرسام بوو بە گۆرانی هیندی چونکە چەند ساڵێک لە سلێمانی بووە و سەردانی سینەماکانی (ڕەشید و سیروان)ی کردوە وحەزی لە دەنگی (محەمەد رفیع)بوو زۆربەی گۆرانییە هیندیەکانی فلیمە هیندییەکانی لەبەربوو. لە هەموویشی تێدەگەیشت و گۆرانی هاوڕێی (گیانی بە گیانی ئەلقەی پەنجەت موبارەک بێت) کردبوو بە کوردی. یان ئاوازێکی هیندی تری ئاوێزانی شیعرێکی نیهادی شێخ عارفی کردبوو بە ناوی (لەبیرت دێ لە هەڵەبجە. ئێواران بە لارو لەنجە . ئەهاتی بۆ ڕێی کانی شێخ. بە ناز لە سەر نووکی پەنجە. ئەها جارەکەی کەهاتم ڕووی پێکەنینت تێکردم . لە بیرت دێ لە ڕێ لامدا . بە پەنجە بانگت لێ کردم ..هتد). ئەو بەردەوام بوو لە سەر ژەنینی ئۆکۆردیۆن .تا ساڵی ١٩٧٩ کاتێک مامۆستا هەڵکەوت شیخ محەمەد ئامێرێکی (ئەرگۆن)ی کارەبایی هێنا ئیتر زۆر حەزی لەو ئامێرە نوێیەبوو. پاش ئەو ئیسماعیل حەمە سەعیدی حەمە ئەمینی حەلاو چووە سەر ئامێری ئۆکۆردیۆن.

تەنانەت کاک ئومێدیش پێشنیاری ئەوەی کرد کەناوی تیپەکەمان بگۆڕین بەناوی (شنروێ) هەرچەندە ئەو حەزی لە مۆزیکی (سەماعی) بوو، کەمێک نۆتەی ئەزانی بەڵام هەستی بیستنی زۆر چاک بوو. لە ساڵی (١٩٨٠)ش ئاوازێکی تری دانا بۆ شیعرێکی (ئەحمەد موختار جاف) بە ناوی (لە خەو هەڵسن درەنگە میللەتی کورد خەو زەرەر تانە/ هەموو تأریخی عالەم شاهیدی فەزل و هونەرتانە) ئەم ئاوازە هەموو مۆسیقاکەی من بۆم ئامادەکرد و لە مانگی (٢) ی (١٩٨٠) لە هۆڵی ئامادەیی کچان نمایشمان کرد لە گەڕەکی سەرا. پاش ئەوە تیکەڵاویمان درووستبوو. وردە وردە تاقەتی نەما لە مۆزیک تا لە ئاهەنگی سینەماکەی هەڵەبجە (پێشکەشکار)ی ئاهەنگەکە بوو. ئیتر ئەوە دوا کاری هونەری بوو لەگەڵمان، بە داخەوە ٢٠٢١/٩/٩بە هۆی نەخۆشی کۆرۆناوە کۆچی دواییکرد ورۆحی شادبێت.



لێرەدا کاک ئومێد، ئامێری ئۆرگ دەژەنێت



لێرەدا کاک ئومێد، ئامێری ئۆکۆردیۆن دەژەنێت

## شیوەنێک بۆ هاوڕێی دێرینم کاکە فوئادی حەمەی مەحمود ئەفەندی

بەداخێکی گرانەوە ڕۆژی ٢٠٢١/٩/١٩ هەواڵی کۆچی دوایی هاوڕێی دێرینم کاکە (فوئادی حەمەی مەحمود ئەفەندی) بیست کە لە شاری لەندەن کۆچی دوایی کرد و ئەم هەستەم لە ناخی خۆم دەربڕی:

شینێک لەناخمەوە بۆ مەرگی هاوڕێی دێرینم کاک فوئادی حەمەی مەحمود ئەفەندی.

بەداخێکی زۆر گرانەوە هەواڵی کۆچی دوایی هاوڕێی منداڵی و قوتابخانە و هونەریم و یەکێک لە دامەزرێنەرانی (تیپی مۆسیقای هەڵەبجە)ی ئەوساو (تیپی مۆسیقای شنروێی)ئێستا. ئاخ مردن ئەو دەستەواژە ترسناکەی کە مرۆڤ لە بوونی مرۆڤایەتییەوە واتاکانی نەزانیوە و هەرچەند بیری لێ دەکەمەوە و ئەخوێنمەوە لە قورسترین بیری فەلسەفی و ئاینی و هەموو دینە زەمینی و ئیبراهیمیەکانەوە، پرسیارێکی قورسە، ئەبێت هەموو تامی بکات، خۆش نییە مردن و کوژانەوەی هەموو پێکهاتەی مرۆڤ و ئاژەڵ. من هەمیشە بە ئاواتەخوازی ئاژەڵم کە مانای عەقڵ و هۆشمەندی نازانێت .کە نازانێت کەی ئەمرێت، نەگبەت مرۆڤە لە ساتی لە دایکبوونییەوە مردن لە ڕێگای دانراوە بۆیە هەوڵی نەمری داوە ئەویش بە درووستکردنی بە هەشت و دۆزەخ و پاداشت و سزا لەو دونیا کە کەس نەهاتۆتەوە تا بزانین چۆنە؟ وەک خواردن، میوە وچێژ. بۆیە دونیای مرۆڤ بە دوای ژیانێکی سەرمەدی گەڕاوە و چەندین ئاین و خودای بۆخۆی درووست کردوە، هەر کۆمەڵگایەک لە ئاستی هۆشمەندی بیرو باوەڕی خۆی....چ تەلیسیمێکیت شەوو ڕۆژ لە خەیاڵی هەموو مرۆڤێکیت. دەبێ مانات چی بێت یان خودی بوون لە چییەوە هاتووە؟ لە هێزیکی میتافیزیکی؟یان وەک زانست بەدواچوونی بەردەوامی بۆ دەکات لە تەقینەوە مەزنەکەوە؟ ئەمانە پرسیار گەلێکن کە لێکۆڵینەوەی وردی زانستی سات بە سات بە دواداچوونی بۆ ئەکات. بەمردن و کوژانەوەی ڕۆح جەستەی هەرتاکێک هەموو شتەکان کۆتایی دێت مەگەر بەس یادەوەرییەکان و بە داخبوونی ئەو کەسەی لەگەڵیدا ژیاوەو یادەوەرییان پێکەوە هەیە بمینێتەوە.

پڕ بە دڵ بە بیستنی هەواڵی کۆچت خەم هەموو یادەوەرییەکانی خستەوە یادم لەو کاتانەی کە ساڵانی شەستەکان لە دوکانی باوکت لە گەڕەکی پیرمحەمەد کە دوکانی (حەمەی مەحمودە ئەفەندی) سەروو دوکانی باوکم بوو بەرامبەر دوکانی حاجی ئەورەحمانە فیڵە، کە زۆر جار تۆ و کاک ئەحمەدی براتم ئەبینی لەوێ.
پاشان لە ساڵی (١٩٧١) کە پێکەوە لە پۆلی سێهەمی ناوەندی بووین، کە یەکەمین ساڵبوو ناوەندی شارەزوور کرابووەوە و مامۆستا شێخ ساحێب کۆمەڵێ قوتابی نوخبەی هەڵبژاد بوو ئێمەش یەکێک بووین لەوانە، لە بیرم دێت لەو ساڵەوە جگەرەت ئەخوارد تۆو بەهادینی شێخ جەلالی موفتی دراوسێتان.
داخم ناچێ برای شیرینم کە وشەکان ئەنووسم چاوم پڕ گریانە ناخم پڕ حەسرەت و فیغانە.
ئەوساڵەی کە لە پۆلی سێی ناوەندی دەرچووین چەند قوتابییەک تەقدیمی ئامادەیی پیشەسازی و کشتوکاڵی بەکرەجۆیان کردبوو. بیرم دێت چەند کەسێک پێکەوە هاتین بۆ سلێمانی بۆ ئەوەی لەو ئامادەییانە وەربگیرێین. چوار کەس بووین پێکەوە گیانی کۆچ کردووت و بەندەو عەبدوڵای ئەوڕەحمانی خەلیفە و عەزیزی مەحمودی مستەفا بەگ بۆ کشتوکاڵ .ئەو کاتە مامۆستا هۆگری مەحمودە درێژ مامۆستای پیشەسازی سلێمانی بوو، بۆ شەوەکەی هەموومان لە ئوتێل سیروان لای ئەسحابە سپیماینەوە لە ژوورێک. یەکەم جار بوو کە لە هوتێل بخەوم. ئێوە وەرگیران .من هاتمەوە لەپۆلی چواری ئامادەیی وەرگیرام.
ئەڕۆمەوە یادەوەرییەکانم لە کۆڵانەکەتان نزیک نەزرگای پیر محەمەد وماڵتان لە کۆڵانی مزگەوتی (خانم) بوو.
لە پاڵ ماڵی شێخ جەلالی موفتی و هاوڕێی شیخ بەهادین و نصرالدین و سەفادین وئیسماعیل. دراوسێی دوکانی دارتاشی دەرویش باڵەخانەو کە پیاوێکی سپی کەلەی قژ درێژ و ڕیشێکی زۆر و پشت چەماوە. کە هەموو جارێک دەچوومە مزگەوتی خانم چەند دوکانێک سەرنجیان ڕائەکێشام و ئەوەستام یەکێکی تر لەوانە دارتاشخانەی حەمەی ڕەشەی یابە لە دوکانەکەی کۆتری ڕاگرتبوو قەفەسی بۆ درووست کردبوو. بەرامبەری دوکانی حەدادەکان. کە چەند برایەک بوو تەورو داس و خاکەناس و چەندین کەرەستەی کشتوکاڵیان درووستئەکرد. یەکێک لە دواوە بە (موشەدەمە)کورەکەی ئەگەشانەوە و دەست و مەچەکی وەستا مەحمود و عومەرو بەکر....

هـاوڕێی شـیرینم بەڕاسـتی مەرگـت تاسـاندمی تـۆ یەکەمـین کەس نیـت لە خێزانەکەتان بەو نەخۆشیە نەگریسە گیان لە دەست بدەیت. ئەوە مامۆستا نوری برات کە بە لاوێتی کۆچی کرد کە مامۆستای سەرەتایمان بوو. ئەوە ئەمیرە خانی خوشـکت کە پـێکەوە لە پـۆلی پێـنج و شەشـی ئامـادەیی پـێکەوە بـووین. مەرگ هەمووتانی لەدەست داین..

حەزی مۆزیـک لە خانەوادەکەتـان خۆڕسـکانە بـوو. هەر لە هەرزەکـاریتەوە شمشـاڵێکی ئاسـنت پـێ بـوو زۆر جـار کە دەچـوویتە گـوڵان و شـێخ سـمایل بـۆ سەعیکردن بە دەمتەوە بوو. زسـتانی سـاڵی ١٩٧٢ بـوو لەگەڵ شـانۆگەرییەک کە سـیف الـدینی شـێخ محـەمـەدی نـانەوا و سـەید تەهـاو ئەحمەدی شـاە محـەمـەد و چەندینی تر ئێوەش گروپێکی مۆزیکتان درووست کـرد، تـۆ وەک شمشـاڵ ژەن بە شمشاڵێکی زەرد. بورهانی موزەمید بە ئامێری عود و عەبدوڵای حەمە خانە ڕۆڵە بە دەف زنجـان. شـەوێک نمایشـتان کـرد. بـۆ ڕۆژی دووهەم باوکـت: حەمەی مەحمـودە ئەفەنـدی لە کـاتی دەسـت نـوێژ گـرتن توشـی سـەکتە بـوو کەوتە نـاو حەوزەکەی مزگەوتی خانم، ئیتر تۆش تاسەبار بوویت بەشداریت نەکرد.

ئای هـاوڕێی گـۆڕ غەریـبم هـاوڕێیەتی ئێمە بەو هەمـوو دابـڕانە لە یەکتـر هـەر بەردەوام بوو  لە مانگی چواری ساڵی ١٩٧٣ من و مستەفاو ڕەوان شـاد ئومێدی حەمەی نانەوا کە بەداخەوە بەم نزیکانە بە نەخۆشی کۆرۆنا کـۆچی دوایـی کـردو کەسـەرێکی گەورەی خسـتە نـاخمەوە، هـاوینەکەی لە پـۆلی دووی پیشەسـازی هاتیتەوە پەیوەندیت پێوە کردین و بوویتە ئەندامێکی سەرەکی تیپەکە  من ئـامێرم هەبـوو، مسـتەفای کەمـال خەفـافیش و ئومێـدیش کە ڕەوان شـاد هونەرمەنـدی بلیمەتی شانۆ جەمالی مەلا قادر بیست دیناری بە قەرز دابوویە ئۆکۆردیۆنێکی لە کاک عوسمانی ڕەسام کڕیبوو. تۆش هاتیت بۆ سلێمانی ئەو کاتە خاڵـت مامۆسـتا ئەنوەر قەرەداغی لە چالاکی زانکۆ بوو. لەوێ کەمانێکی ئەڵمانی شـەرقی دابـوویە لات و بەڵام سێ ژێی پێوە بوو، ئەو کاتە پێداویستی و کتێبی مۆسـیقا هـەر نەبـوو ناچار بووین بە (پەتی تەزبیح)ژێی صولمان بۆ درووسـت کـرد، چـونکە لە بەشـی کارەبا بوویت. کاتێ یەکەمین ئاهانگمـان گێڕا لە ١٩٧٣/٧/١٤ بە مـکەبەرەی ڕادیـۆ مایکرۆفۆنـت بـۆ درووسـت کـردین و بـۆ ئەوەی دیـار نەبێـت ئەتخسـتنە نـاو خوێدانێکی باغەی  هێلکەییەوە.

تاسەی کۆچت هەژاندوومی یادەکانت دوای نزیکەی پەنجا ساڵ هەر لە بیرە زۆر ڕۆژ دوای پرۆڤە زۆر حەزت لە هەنجیری باخی گوڵان بوو باخەکەی شێخ وەلی وپێکەوە ئەچووین من و مستەفاو تۆو ئومێد کە بە کیلۆ بۆی ئەهێنانین ئەتوت ئای کە بە لەزەتە. هاوڕێیەتیمان زۆر سەیر بوو خوشەویستیت هێندە زۆر بوو بۆم هەمیشە ئەتوت ئازاد دڵەکەم، ئەی پێکەنینەکەت و سوعبەتەکانت ...ئەوە هەستی هونەریت بەرز بوو ئەو ساتانە سەرسامی گۆرانیەکانی أم كلثوم بوویت و هەوڵت ئەدا گۆرانی (القلب يعشق كل جميل) بژەنیت. جارجار ئەتوت بەخوا ئازاد کەمانچە قورسە خەریکم ئەیدەم بە ئەرزا...

دوای بۆردومانەکەی ساڵی ١٩٧٤ ئێمەو ئێوە ماڵمان هاتە سلێمانی، ئێمە لە خانوویەکی کرێ بووین لە گەڕەکی ئیبراهیم پاشا، ئێوەش چوونە ماڵەکەی مامۆستا ئەنوەر کە ئەوان چووبوونە دەرەوە. جار جار سەردانم ئەکردیت و ئەرشیفەکانی مامۆستا ئەنوەر لەوێ بوون نیشانی منت ئەدا و جارێکیان وتت مامۆستا شەماڵ سائیب هاتووە پێی وتوین کە ئەو ئەرشیفانە بشارنەوە نەوەک حکومەت بیگرێت.

ساڵی ١٩٧٤ من چوومە بەغدا و لە کۆلێجی ئابووری و بەڕێوە بردن وەرگیرام، تۆش ئەو ساڵە هەرچەندە دەرچووی پیشەسازی بوویت لەگەڵ چەند هاوڕێیەکت کە پەیمانگای مامۆستایان لە هەولێر تازە کرابوەوە چوونە ئەوێ و تۆ بوویت، ئاواتی حەمەی مەلا کەریم، ڕەوان شاد مامۆستا عومەر شیرەمەڕی، مامۆستا ڕەئوف حەمە عەلی، مامۆستا مەحمود برای مامۆستا ئەمین سەپان.

پاشان یەکەم دامەزراندت لە دێی تەکیەی قەرەداغ بوو کەمانەکەشت بردبوو لەگەڵ خۆت..

پاشان لە سلێمانی لەگەڵ تیپی مۆسیقای سلێمانی بەشداری چەندین چالاکی هونەریت کردوە.

لەگەڵ شەڕی نەگریسی ئێران عێراق لەگەڵ چەند کەسێک هاتنە هەڵەبجەو لە سەربازی ساڵی ١٩٨٢ چوونە ئێران و لەوێش بۆ هەندەران و وڵاتی ئینگلتەرە و شاری لەندەن. ئیتر لە یەکتر دابڕاین.

تا دوای ڕاپەڕین ..کە چەند ساڵێک جارێک ئەهاتیتەوە یەکەم کەس منت بەسەر ئەکردەوە و ئەهاتیتە لام، هێندە خەمخۆر بوویت لەو کاتی قات و قریەدا چەندین

جار هاوکارم بوویت یان خۆت یان ئەت وت لای ئەحمەدی برام بۆم داناویت.

هەر جارێک هاتبیتەوە بەدیدارت شادبووم . لە هەندەران ساڵانی کۆتایی هەشتاکان لە مەڵبەندی ڕۆشنبیری کورد گروپێکی مۆزیکتان دامەزراند بە ناوی تیپی مۆزیکی کوردستان . چەند بەرهەمێکتان تۆمار کرد و کاسێتێکت دامێ کە خۆت چەند گۆرانیەکت وتبوو و ئاوازی خۆت بوو بە شێوازی ڕۆژئاوایی.

کە ئەهاتیتەوە پێکەوە ئە چووین بۆ خورماڵ، بێستان سوور، پێنجوین. هەمیشە ئەتوت ئێستاش هەوایەکی دەشتی شارەزوور نادەم بە هەموو لەندەن.

جارێکیان پرسیم لێت تۆ ماوەیەکی زۆرە لە دەرەوەیت یادەوریت هەیە. وتت یادەوەری لە پێنج ساڵیەوە ڕۆئەچێتە ناو ناخەوە. من ئێستاش بیری جێ نەزرگای پیرمحەمەد ئەکەم کە بە مناڵی ئەچووم بۆی.

ساڵێکیان هاتیتەوە ساڵی ٢٠٠٠ بوو هاتمە ماڵی ست ڕووناکی خوشکت لە ئیسکان پیانۆکەی ماڵی تۆفیق وەهبی کە خزمی باوکت بوو لە بەغداوە لە ماڵیان داتنابوو کە هی کوڕەکەی تۆفیق وەهبی بەگ بوو بە ناوی ئازاد، تێک شکابوو وتم بیدە بەمن چاکی ئەکەمەوە تۆش دڵت نەشکاندم وتت بیبە کە مێژووی دروستکردنی سەد ساڵ زیاتربوو، بەڵام چووم بیخەمەوە مۆزەخانە کەس نەیویست، منیش لە کاتی نۆژەن کردنەوەی خانوو شووێنم نەبوو، ناچار بە کریکارێکم وت بیبە بۆ خۆت ئەویش هەر لەو شوێنەدا بە پیک تێی کەوت و بە ئاسن و زەرد فرۆشتی بۆ خۆی بە کیلۆ بەداخەوە لەم وڵاتە ڕێزی ئەنتیک ناگیرێت.

پێش شەش حەوت مانگ لەمەوپێش تێلت بۆ کردم وتت تووشی شێرپەنجە بووم و وتت مەعنەویاتم بەرزەو منیش لە ناخەوە ئەگریام ئەمزانی دەردێکی بێ چارەیە.

دوا تەلەفۆنت ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان بوو لە بازار بووم نیوەڕۆکەی بوو وتت نەخۆشییەکەم زۆری بۆ هێناوم ئازارم زۆرە، وتم سەردانێک بکە، وتت لێرە عیلاجم بۆ ئەکەن ناتوانم ئەگینا حەزم لە پیاسەیەکی لای گوڵان و گوڵپ و سەرگەت و ئاوی بێستان سوورە، بەڵام ناتوانم.

بەداخەوە ئەمشەو هەواڵی کۆچی ناوادەت هەژاندمی بیرەوەری چەندین ساڵەی هێنایەوە یادم، هەمیشە لە یادمیت هاوڕێی بەوەفاو دێرینی مناڵی و گەنجی

وپیریم، بەداخم بۆت. سەرەخۆشی خۆم ئاڕاستەی خانەوادەت، براکانت کاک ئەحمەد و کاک بەختیارو ڕێبوار و مامۆستا ئەنوەر قەرەداغی.

بەداخەوە یەکێک لە کەسە ئازیزەکانم لە دەستدا و گیانت و جەستەت شاد بێت.

ئەوە مردنە و قەدەری هەمووانە یادت بە خێر هاوڕێی دێرینم



## دیداری خاتوو ئەنایس و دکتۆر عەبدوڵا جەمال سەگرمە

لە ڕێکـەوتی ٢٠٢١/٩/٢٢ خـاتوو (ئەنـایس بۆلیـک) کە سـەرۆکی پەیمانگـای (گۆتە)یە و لە هەولێرەوە هـاتبووە سلێمانی حەزی ئەکرد ئاشـنایەتی پەیدابکات لەگەڵ مۆزیک زانێک و پسپۆڕێکی مۆزیکی ڕۆژئاوایی و کە خۆی واتـەنی خـاتوو (ئەنایس) مۆزیـک ژەنێکە لە تیپی ئۆرکسـترای شـارێکی ئەڵمانیـا و منیش بۆ ئەو مەبەستە پەیوەندیم کرد بە دکتۆر (عەبدوڵا جەمـال سـەگرمە) سـەرۆکی بەشـی مـۆزیکی ئەکادیمیـای هـونەرە جوانەکـانی سـلێمانی، بـۆ عەسـرەکەی پێکەوە لە مۆڵی(citystar) پێکەوە دانیشـتێکمان ئەنجامـدا کە کـاتێکی سـوودبەخش بـوو، ڕاو بۆچوونمان گۆڕییەوە لە بـوارە جیاجیاکـان و سـتایڵە جۆراو جۆرەکـانی مۆزیـک سوپاسی ماندوو بوونی هەردوو بەڕێزیان دەکەین، بە ڕاستی بیر کردنەوەم وایە هەمیشە لەگەڵ لووتکەکان لە بواری زانستی مۆزیک کار بکەم.



ئازاد سالح . خاتوو ئەنایس . د.عبدوڵا جەمال سەگرمە

## خۆئامادەکردن بۆ کۆنسێرتێکی هەمەچەشن لە باخی گشتی هەڵەبجە

خەریکـی خۆئامـادەکردن بـووین بـۆ کۆنسـێرتێکی گشـتگیر لە گـۆرانی و هەڵپەڕکـێ، گرووپی (فێرخـوازانی فێرگەی شـنرۆێ) گرووپـی (خانمـانی شـار) کە هەندێکیان بریتی بوون لەو کۆرسانەی ساڵانی حەفتاو هەشتاکان لەگەڵمان بوون، لەگەڵ گرووپی هەڵپەڕکێی (ئەسـتێرەکان) و هونەرمەنـدانی ئـامێرە میللییەکـان بە سپۆنسەری (پەیمانگای گۆتەی ئەڵمانی) بۆئەم مەبەستەش نزیکەی شەست کەس ئەبـوون بە هەمـوو بەشـدارانەوە. ئەوەی جێگـای بـاس کـردنە پرۆڤەکانمـان لە سلێمانی لە (کـۆمەڵەی هونەرەجوانەکـانی سـلێمانی) ئەنجامـدا ئەویـش بەهـۆی هـاوڕێی بەڕێزمـانەوە کـاک هێـرش عـومەڕەزا کە ئاسـانکاری بـۆ کـردین و بە سوپاســەوە ئەنــدامانی کــۆمەڵ هەمــوو هاوکارمــان بــوون بــۆ ئەنجامــدانی پرۆڤەکانمـان لەوێ، چـونکە لە تیپـی خۆمـان لە بینـای دەبـۆکە هـیچ خـزمەت گوزارییەکی تێدانەبوو وەک ئـاو و کارەبـاو پێداویسـتی فێنک کەرەوە. بۆمـاوەی زیـاتر لە دوو هەفـتە پرۆڤەمـان کـردو لە شـەوی ٢٠٢١/١٠/١٤ کۆنسـێرتێکی ناوازەمان لە باخی گشتی هەڵەبجە ئەنجام داو کە لەمێژووی چەند ساڵەی شـەوە پـایزەی وای بە خـۆیەوە نەدیـوە و بە هاوکـاری مامۆسـتایان و خوێنـدکارانی پەیمانگاو کۆمەڵی هـونەرە جوانەکـانی سـلێمانی و تیپـی منـاڵانی فێرخوازانمـان و گرووپی خانمانی شار، هەڵپەرکێی گرووپی ئەسـتێرەکان و هونەرمەنـدە ئـامێر ژەنە میللیەکان، گۆرانی بێژان (ئاریـان کەریـم . شـوان قەرەداغـی . پێشـڕەو هەورامـی. کیـژان. شـانۆ ئامـانج . یـار بەختیـار. ژیـوار اسـماعیل)کە بەسـەدان کەس بـاخی گشتییان ڕازاندبووەوە بە دیکۆریکی نایاب و نـاوازەی دەسـت ڕەنگینی مامۆسـتا (رەئوف حەسەن) بە سەرپەرشـتی و سپۆنسـەری (پەیمانگـای گۆتەی ئەڵمـانی و بەڕێوەبەرەکەی خاتوو (ئەنایس بۆلیک)و هاوکارانی بۆ ماوەی دوو کات ژمێر لە چـالاکی جـۆراو جـۆر ئەو جەمـاوەرە زۆرەمـان هەژانـدبوو. چەنـدین کەنـاڵی ڕاگەیاندن ئامادەبوون، شۆڕشێکی هونەریمان نایەوە کە لە یادەوەری هەموویاندا نەخشێنراوە، زیاتر لە شەست بەشدار بوو ئەنجامیاندا کە یەک مانگ زیاتربوو هەموو هەوڵەکانمان چڕ کردبووەوە بۆ ئەنجـام دانـی و هـونەری هەڵەبجەمـان بە

دەیان کەسانی ئەڵمانیا .فەرەنسا ..ناساند. تەنانەت خاتوونە ئەڵمانیەکە هاتە ناو هەڵپەڕکێکە. مایەی شانازییە کە بەماندووبوون و بیرو هزری خۆمان و ژەنیارو بەشداران کە توانیمان تاڕادەیەکی زۆر سەرکەوتوو بین کە زیاتر لە هەزار کەس ئامادە بوون.





## بەڕێز :

فێرگەی موزیکی شـنروێ بە هـاوکاری کۆمەڵێک لـە مامۆسـتایان وخـوێندکارانی پەیمانگا و کۆمـــەڵەی هونەرە جـوانەکانی سلێمـانی و بەسپۆنسـەری پەیمـانگای گۆتەی ئەڵمانی و بە بەشداری (چەند گۆرانیبێژێک, گرووپی خانمانی شار، گرووپی هەڵپەرکێی ئەستێرەکان، فێرخـوازانی فێرگـەکەمان و گرووپی ئـامێرە میللییەکـان) (شـەوە ئاهەنگێکی پاییزە) سـاز دەکات.

**خۆشحاڵین بە ئامادەبوونتان لەم شـەوە ئاهەنگەدا**

**شوێن: باخی گشتی هەڵەبجە   پێنج شەممە ١٤ / ١٠ / ٢٠٢١   کاتژمێر: ٨ ی شەو**

---

**سەرپەرشتیاری گشتی بەرهەم**
خاتوو ئەنایس بویلیک

**بەرهەمەکان**

**ئەم شان و ئەوشانت**
ئاواز: مەریوان سەعادەدین
هۆنراوە: فۆلکلۆر
موزیک: چالاک سدیق
وتنی: ناریان کەریم

**ئەی ژیانی**
ئاواز و هۆنراوە: فۆلکلۆر
موزیک: عادل حەسەن
وتنی: شانۆ ئامانج - ژیوار ئیسماعیل

**ئەسیمەکەی**
ئاواز: حەسەن یوسف زەمانی
هۆنراوە: عوسمان ئەحمەدی
وتنی: شوان قەرەداغی

**ڕەنگ زەردی خەزان**
هۆنراوە: فۆلکلۆر
ئاواز و موزیک: ئازاد سالح
وتنی: شانۆ ئامانج - یار بەختیار

**ڕازیانە**
ئاواز و هۆنراوە: فۆلکلۆر
وتنی: شوان قەرەداغی

**گەشتێک بە ناو گۆرانییە دێرینەکاندا**
ئاواز و هۆنراوە: فۆلکلۆر
موزیک: ئازاد سالح
وتنی: گرووپی خانمانی شار

**ئەشمیل گیان**
ئاواز و هۆنراوە: فۆلکلۆر
موزیک: عادل حەسەن
وتنی: پێشڕەو هەورامی

**خاڵداری + بۆ تۆرای**
ئاواز و هۆنراوە: فۆلکلۆر
موزیک: ئازاد سالح
وتنی: ماکۆک شالاو

**وەی خانم گیان**
ئاواز و هۆنراوە: فۆلکلۆر
موزیک: عادل حەسەن
وتنی: پێشڕەو هەورامی

**چەندی گەڕام لە شاران**
ئاواز: هۆمەر دزەیی
وتنی: پرۆشە بەرهەم

**بەکۆترێکی سپی**
وتنی: ڕەنو سەلاح

**چەند بەرهەمێکی هەڵپەڕکێ بە هاوکاری هونەرمەندە میللییەکان**

**بەشداربووانی گرووپی فێرگە و تیپی شنروێ بە هاوکاری خوێندکاران و مامۆستایان**

| | |
|---|---|
| ئازاد سالح | کەمان |
| عادل حەسەن | کەمان |
| هیرش عمر رەزا | کەمان |
| ئەلەند ئەحمەدین | کەمان |
| باکۆ بەختیار | کەمان |
| ئەشکان ئاوات | کەمان |
| ئازیل محەمەد | عود |
| باکو ئەفراسیاب | قانون |
| لاوک ڕزگار | ساز |
| ئاسان ئەنوەر | کلارنێت |
| توانا ئەبوبەکر | نەی |
| عومەر عەبدولا | چەلۆ |
| ئیبراهیم ئەحمەدین | زەرب |
| ئەرکان عبدالقادر | دەف |

**گرووپی خانمانی شار**
بەهار حەمە سەعید - سەرپەرشتیاری گرووپ
عەتیە فەتحولا
ڕووناک ئەحمەد
ئاشتی عارف
کوێستان وەهاب
پەیمان حەسەن
مەهاباد ستار
شەپۆل غەفوور

**گرووپی ئامێرە میللییەکان**

| | |
|---|---|
| عەدنان سەعید | باڵەبان |
| گەرمیان سەعید | شمشاڵ |
| شاهۆ شەمیران | شمشاڵ |

**گرووپی منداڵان**

| | |
|---|---|
| ماکۆک شالاو | گۆرانیبێژ |
| لاوەند ڕزگار | پیانۆ |
| ڕاسۆ مەنزەر | پیانۆ |
| درەو هاوکار | سیتار |
| دیبێ هاوکار | سیتار |
| ڕامی ئیبراهیم | سیتار |
| ڕەنو سەلاح | گیتار |
| ئاڤێ ئەریوان | گیتار |
| ئیما ڕێبوار | گیتار |
| پرۆشە بەرهەم | گیتار |
| ئارین ڕێبوار | کەمان |
| شانیا سەرکەوت | کەمان |
| لیان یادگار | کەمان |
| وانەر قەیسەر | کۆرس |
| وژنەر قەیسەر | کۆرس |
| ساریا مەهدی | کۆرس |
| ئاریا مەهدی | کۆرس |
| شەویار شالاو | کۆرس |
| بەستە ڕزگار | کۆرس |

**گرووپی هەڵپەڕکێی ئەستێرەکان**
ڕێبوار ئالیب
هەنار ئارام
باوان عومەر
سۆنیا عارف
باخان محەمەد
ئاراس ئارام
هێمن ئیدریس
بێگەرد عومەر
نەورۆز محەمەد

---

**هونەرییەکان**
دیکۆری شانۆ: ڕەئوف حەسەن
جێبەجێکاری دەنگ: ئەمیر ئەرسەلان و هاوکاران
ڕووناکی: ڕزگار شەوکەت
پێشکەشکار: ڕەنگین سەلام
چاودێران: ڕێبوار هەڵەبجەیی - شاخەوان نەورۆلی
کارمەندان: ئیسماعیل - لایەق - کەریم - بێستوون

**دیزاین**
بیـــــار ڕەشید

**سوپاس بۆ بەڕێزان:**
- پارێزگاری سلێمانی
- پارێزگاری هەڵەبجە
- سەرۆکی شارەوانی هەڵەبجە
- بەڕێوەبەری گشتی ڕۆشنبیری هەڵەبجە
- بەڕێوەبەری پۆلیسی هەڵەبجە
- پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی
- پەیمانگای هونەرە جوانەکانی هەڵەبجە

GOETHE INSTITUT

**بە سپۆنسەری پەیمانگای (گۆتە)ی ئەڵمانی**

فێرگەی موزیکی شنروێ
بە هاوکـاری کۆمەڵێک مامۆسـتا و خوێندکـاری پەیمانگا و کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی
(شـەوە ئاهـەنگێکی پـاییزە) ساز دەکات

بەشداربووانی شەوەئاهەنگەکە پێکهاتوون لە:
١-گرووپی موزیکی فێرگە و تیپی شنروێ بە هاوکاری مامۆستایان و خوێندکاران
٢- گرووپی (خانمانی شار) بە گەشتێک بە ناو گۆرانییە دێرینەکاندا
٣- گرووپی منداڵانی فێرگەی موزیکی شنروێ
٤-گرووپی هەڵپەڕکێی ئەستێرەکان
٥- گرووپی موزیکی ئامێرە میللییەکان

**شوێن: باخی گشتی هەڵەبجە**

**پێنج شەممە ١٤ / ١٠ / ٢٠٢١   کاتژمێر: ٨ ی شەو**



خاتوو ئەنایس . ڕۆزە خان

باخی گشتی هەڵەبجە وتاری پەیمانگای گۆتە ئەخوێنێتەوە



ئاریان کەریم



## بەخشینی مەدالیای ڕێز لێنان بۆ یادی هونەرمەندی گەل تاهیر تۆفیق

هەر بەردەوام بووین لە فێرکردنی فێرخوازان و هاتوو چۆکردن بۆ هەڵەبجە و شەویّکیان خەریکی (چا) خواردن بووم لە هەڵەبجە تەلەفۆنێکم بۆ هات لە لایەن مامۆستا (دەوەن مەولود) سەرۆکی تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە بۆ ئەوەی لە ساڵیادی هونەرمەندی گەل (تاهیر تۆفیق) خەڵاتی ڕێز لینان بە چەند هونەرمەندێکی دیرین بدرێت لە هەر شارێک و یەک کەسیان هەڵبژاردبوو.

لە ڕۆژی ٢٠٢١/١١/١٠ دوای نیوەڕۆکەی بە تەنها ڕێکەوتم بۆ شاری کۆیە لە چێشتخانەکەی سەر پردەکەی دوکان دابەزیم، بەڕێکەوت مامۆستا ئەنوەر قەرەداغی وکاک هێرشی عومەر ڕەزام دی چایان دەخواردەوە ولەگەڵیان دانیشتم ودوایی بەرەو کۆیە بەڕێ کەوتین و پێکەوە لە کانی وەتمان نانی نیوەڕۆمان خوارد. پاشان کاتژمێر سێی پاش نیوەڕۆ گەشتینە هۆڵی زانکۆی کۆیە. هۆڵ جمەی ئەهات لە کەسانی هونەر دۆستی شاری کۆیە و میوانانی هونەرمەندی شارەکانی تری کوردستان. بەرنامەی (یادی ٣٤ ساڵەی کۆچی دوایی هونەرمەندی گەل تاهیر تۆفیق)دەستی پێکرد. بەوتاری سەرۆکی بەشی ڕاگەیاندنی زانکۆی کۆیە و سەرۆکی تیپی باواجی کۆیە مامۆستا (دەوەن مەولود) وپاشان بەڕێوەبەری گشتی ڕۆشنبیری هەولێر کاک (فەرهەنگ غەفوور) پێش وتارەکەی مەقامێکی وت ودوای کەمێک قسەی کرد. ئەوەی داوای ئەندامانی تیپی مۆسیقای کۆیە بوو کە هۆڵێکی شایستەیان هەبێت کە بە ناتەواوی بەجێ ماوە. کە ئەو هەموو توانا جوانە هەیە، چ مۆزیکژەن چ دەنگی جوان. پاشان ناوی ئەو هونەرمەندە بە ئەزمونانە کە بانگهێشت کرابوون یەک دوای یەک ناوەکانمان خوێندرایەوە و هەر یەک خەڵات و دیارییەکی وەرگرت بەم شێوەی خوارەوە:.

١ـ مامۆستا خالید سەرکار لە سلێمانی

٢ـ شوکر خەیات لە کەرکوک

٣ـ مامۆستا زرار محەمەد مستەفا ڕەواندوزی لەڕەواندوز کە خۆی نەهاتبوو کەسێکی تر بۆی وەرگرت

٤ـ هونەرمەندی گۆرانی بێژ ئیبراهیم سابیر لە کۆیە .

٥ـ هونەرمەندی گۆرانی بێژ خەلیل موراد وەندی لە خانەقین

٦ـ هونەرمەندی مۆزیکزان مامۆستا جەمال دهۆکی لە دهۆک
٧.گۆرانی بێژ (خالە دێهاتی) لە رەواندوز
٨ـ گۆرانی بێژ سەلاح پشدەری باوکی هەڵویست و هەردی سەلاح لەدەڤەری پشدەر و قەڵادزێ .
٩ـ ئازاد ساڵح لە پارێزگای هەڵەبجە
بۆ هەر هونەرمەندێک بەڕێزێک خەڵاتەکەی پێشکەش ئەکرد .

پاشان بەرنامەیەکی جوان بە تیپێکی دەست و پەنجە جوان هەمووی ژەنیاری بەتوانا کە بریتی بوون لە ١٨ ژەنیار کەیەک دوای یەک ناوەکانیان دەخوێندرایەوەو بە چەپڵە ڕێزانی گەرم پێشوازی لێدەکرا، لەدڵی خۆما وتم ئەم شارە چەند ڕێزی هونەرمەندانی نەک خۆیان بەڵکو بانگهێشتی ئێمەشیان کردووە بۆ ڕێز لێنان. تیپێکی گەنج و دەست و پەنجە شوشەیی، هەموو چاویان بڕیبووە نۆتەکان بە هێمنی بێ شڵەژان، گۆرانی بێژەکان بە توانا و بێ شڵەژان و کۆک کردنی دەنگ بەشێوەیەکی زۆر نمونەیی و دەنگی هەموو ئامێرەکان وەک یەک دەهات ڕوناکی جوان، بەڵام بەداخەوە هۆڵی شانۆکە بچوک بوو بۆ ژەنیارەکان، ڕێزی ئەو هونەرمەندانە سەرسامی کردبووم، کەسانی ڕۆشنبیر لە پیاوو ژن چونکە شاری کۆیە زۆربەی خەڵکە ڕەسەنەکانی خۆی تێدا ماوە هەستم کرد لە ناو شارێکی نمونەیدام. وەک شارەکەی ئێمە وێران و کیمیا باران نەکراوە وخەڵکە ڕەسەنەکەی دەربەدەر بێت هۆکارەکەی ڕیسوا بێت. هەڵەبجەی ئێستا شارێکە کەسە شارییەکانی دەربەدەربوون. ئێستا بریتیە لە کەسانی نامۆ بە کلتووری ئەو شارە و تەنانەت … پاشان بەرنامەی مۆزیک دەستی پێکرد

## خۆئامادەکردن بۆ ئاهەنگی شەوی یەڵدای ساڵی ٢٠٢١

ئیتر پاش ئەوە خۆمان ئامادە کرد بۆ یادکردنەوەی ئاهەنگی شەوی یەڵدا لە شەوی ٢٠ لەسەر ٢١ی ٢٠٢١/١٢ . پێش ئەوە (هۆڵی بۆنەکان)مان هەڵبژارد بۆ ئەنجام دانی ئەو ئاهەنگە. بۆ ئەم مەبەستەش چەند شەوێک لەگەڵ چەند کارمەندێک خەریکی دانانی دیکۆرەکە بووین و بەگڵۆپ وڕووناکی ڕازاندمانەوە و ئەمجارە بە (٣) گروپ بەشداریمان کرد، کە ئەم کۆنسێرتەش هەر بە سپۆنسەری پەیمانگای (گۆتە)ی ئەڵمانی بوو. گروپی یەکەم تیپێکی پێکهاتوو لە چەند ئەندامێکی تیپی شنرویێ و فێرگەی شنرویێ لە هەڵەبجەو چەند مامۆستایەک. گروپی دووهەم (تیپی هەڵپەڕکێی نەتەوەیی) گروپی سێهەم بریتی بوون لە گروپی مناڵانی فێرگەی شنرویێ. ئەوەی جێگای باس کردنە ئەو شەوە بارانێکی زۆر بەخوڕ باری و زۆربەی ئامێرە دەنگییەکانی تەڕکرد. کارەبا کوژایەوە و بە نیوەو ناچڵی بەرهەمەکان پێشکەشکران، تەنانەت گروپی منالان لە بەر گلۆپی مۆبایل بەرهەمەکانیان پێشکەشکرد. مولیدەی هۆڵەکەش لەکار کەوتبوو- ئەو کەسەی ئیشی پێئەکرد کەم تەرخەم بوو، ئەو گۆرانی بێژانەی بەشداریان کرد بریتی بوون لە: محەمەد ڕەئوف کەرکوکی . ئاریان کەریم . تارا رەسوڵ . تابلۆ ئومێد، ڕیڤین ئاراس و تیپی هەڵپەرکێش دوو تابلۆی زۆر جوانیان پێشکەش کرد هەر لەبەر گرنگی نەدان بە درووستکردنی ئەو هۆڵە ئەوە بوو پاش بەفربارینی زستانی ساڵی ٢٠٢٢ ئەو هۆڵە سەقفەکەی بەرگەی بەفرێکی نەگرت و داڕماو تا ئێستاش وەک کەلاوە وایە، ئەمەش کەمتەرخەمی کاربەدەستانی ئەو شارە دەردەخات کە هیچ گرنگی بە هونەر نادەن .

GOETHE
INSTITUT

## به سپۆنسەری پەیمانگای ( گۆتە ) ی ئەڵمانی

**فێرگەی موزیکی شنروێ و گروپی منداڵانی فێرگە**
**بەبەشداری چەند مامۆستایەکی موزیك ژەن و**
**کۆمەڵیك هونەرمەندی گۆرانی بێژ و تیپی کەلە پوورو هونەری میللی**
**سلێمانی ***

**(لە شەوی یەڵدا ئاهەنگێك ساز دەکات)**

شەوی دووشەممە ٢٠ لەسەر ٢٠٢١/١٢/٣١

**شوێن**

**هۆڵی بۆنەکان بەرانبەر**
**بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە**

**کاتژمێر ٧/٣٠ ی شەو**

محمد رووف کرکوکی

ناریان کریم

تارا رسول

تابلۆ نوید

ڕێڤین ئاراس



تیپی کەلە پوورو هونەری میللی سلێمانی

## هونەرییەکان

دیکۆر/ ئازاد صالح
جێبەجێکاری دەنگ/ خالد عمر
رووناکی/ رزگار شەوکەت
پێشکەشکار/ شلك حسین

دیزاین/ فاضل محمد

سوپاس بۆ بەڕێزان:

پارێزگاری هەڵەبجە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری و هونەری هەڵەبجە
بەڕێزان پۆلیس و ئاسایشی هەڵەبجە
پەیمانگای هونەرە جوانەکانی هەڵەبجە

GOETHE INSTITUT

بە سپۆنسەری پەیمانگای ( گۆتە ) ی ئەڵمانی

فێرگەی موزیکی شنروێ و گرووپی منداڵانی فێرگە وبەشداری چەند مامۆستایەك وهونەرمەندی گۆرانی بێژ و تیپی کەلەپوورو هونەری میللی سلێمانی
بە سپۆنسەری پەیمانگای ( گۆتە )ی ئەڵمانی

( لە شەوی یەڵدا ئاهەنگێك ساز دەکات)

بەشداربووانی ئاهەنگەکە:

١- فێرگەی موزیکی شنروێ
٢- گرووپی منداڵانی فێرگە
٣- تیپی کەلەپوور و هونەری میللی سلێمانی

شوێن/ هۆڵی بۆنەکان
بەرانبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی هەڵەبجە

دوو شەممە ٢٠-٢٠٢١/١٢/٢١ کاتژمێر ٣٠/٧ شەو

---

## سەرپەرشتی گشتی بەرهەم

خاتوو ئەنایس بویلیك anais.boelicke

## بەرهەمەکان

### ئاریان کریم

*گۆرانی بەس تەنها ئەمشەو
هۆنراوەی بەرزان هەستیار
ئاوازی بهجت یەحیا
ئامادە کردنی غمگین فرج

*گۆرانی کیژە کوردەکەی
ئاوازی فۆلکلۆر
ئامادەکردنی کامکاران

*گۆرانی ئای هەوار
ئاوازی صباح هەورامی
هۆنراوەی فۆلکلۆر
ئامادە کردنی فاروق باپیر

### تارا رسول

*گۆرانی گیانەکەم بۆ وات لێ کردم
ئاوازی شەوکەت رشید

*گۆرانی گیان گیا
ئاوازی فۆلکلۆر
ئامادەکردنی انور قەرەداغی

*گۆرانی دە پێم بڵێ
ئاوازی سەفین خەراجیانی

### محمد رووف کرکوکی

*گۆرانی خەجێ گیان
ئاواری/ محمد رووف کرکوکی
ئامادەکردنی خالد فرج

*گۆرانی لە میحرابی عەشق
ئاواز ی محمد رووف کرکوکی
ئامادە کردنی انور قەرەداغی

*گۆرانی هەوری لە قەدی ئاڵاوە
ئاوازی علی مەردان

### تابلۆ ئومێد

*گۆرانی کیژۆڵەی ئازدار
لە گۆرانییەکانی عزیز شاروغی

*گۆرانی ئەی شەمسی شەو
هۆنراوەی وەلی دێوانە
ئاوازی کریم کابان

*گۆرانی گوڵ نیشان- مەلول گیان
ئاوازو هۆنراوەی فۆلکلۆر

### رێڤین ئاراس

*گۆرانی شەوی یەڵدا
ئاوازی عدنان کریم

## بەشداربووانی گرووپی موزیك

| | |
|---|---|
| ئازاد صالح | کەمان |
| عادل حسن | کەمان |
| چالاك صدیق | کەمان |
| عمر عبدللە | چەلۆ |
| فاضل محمد | عود |
| توانا ابوبکر | نای |
| باکۆ افراسیاب | قانون |
| لاوك رزگار | ساز |
| ارکان عبدالقادر | زەرب |
| شازە قادر | دەف |

## بەرهەمی گرووپی منداڵان

*گۆرانی ئای لەیلا عەمرم
وتنی ماکوك شالاو
ئامادەکردنی ئازاد صالح

*گۆرانی شارەزوور
وتنی درود دێنێ
ئامادە کردنی عادل حسن

joy ful
وتنی کۆرس

Titanic
وتنی سانا زانا

*تیپی کەلەپوور و هونەری میللی سلێمانی
بریتین لە ١٧ سەماکار

## گرووپی

رانۆ مەنزەر
لاوەند رزگ
رامی ابراهی
درەو هاوک
دێنێ هاوک
تاڤی ئەریوا
رەنو صلاح
ئارش ئەژی
ئارۆس عوس
هاودەم ابر
شازە قادر

کۆ

وانە
شەو
ئاریا
وژنە
فادی
لیان
سانا
ماک

## چەند خوێندکارێکی زانکۆ پەیوەندییان کرد بە فێرگەکەمانەوە

لە سەرەتای مانگی (١)ی ساڵی (٢٠٢٢) بەردەوام بووین لەگەڵ فێرخوازەکانماندا وهەفتانە سەردانی هەڵەبجەمان ئەکرد بۆ ئەوەی لە کاتی خوێندنی قوتابخانەشدا بە پێی توانا ئامادە بن بۆ فێربوونی مۆزیک، ئاوازی نوێمان بۆ ئامادە دەکردن و دوای ئەوەش چەند کیژێکی زانکۆی هەڵەبجە کە خەڵکی سلێمانی بوون دەیان ویست فێری مۆزیک بن. بۆیە منیش خۆبەخشانە بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک هاوکاریم کردن .





## ئەنجامدانی (فیچەر)ێک لە لایەن دەنگی ئەمریکاو تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان

لە ماوەی چەند هەفتەیەک لەوەو پێش پەیامنێری تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان و دەنگی ئەمریکا کاک (فەرحان حەمە خان) دەیوست (فیچەر)ێک لەسەر فێرگەکەمان ئامادە بکات و لە شەوی ٢٠٢٢/٢/١٠ بە خۆی و ستافی کامێرامانەکەوە هاتن بۆ تۆمارکردنی چەند بەرهەمێک. زۆربەیان بە جلی کوردییەوە ئامادەبوون و هەندێکیان نەیانزانی بوو کە بەرنامە هەیە گەڕانەوە بۆ ماڵەوە و خۆیان گۆڕی یان منداڵێکی تر دایکی جلەکانی هێنا بۆ فێرگە لەوێ گۆڕی. ئەم بینی چ بە شەوق وزەوقێکەوە هاتن. ئەوە مایەی خۆشحاڵییە کە بتوانین هونەری هەڵەبجە بگەیەنینە ئەمەریکا. پاش ژەندنی چەند بەرهەمێک لەلایەن هەموو ئاستەکانیان. ئێمەش لێدوانماندا و تەنانەت باوکی فێرخوازەکان

ئامادە بوون و لێدوانیاندا و خۆشحاڵ بوون بۆ بەشداری کچ و کوڕەکانیان لەو خولە مۆزیکییە بەردەوامانە.



## فێرخوازەکانمان کردووە بە سێ گروپەوە

لە ٢٠٢٢/٢/١١ تۆڕی میدیایی (ڕوماڵ) بە خۆیان و ستافەکەیان و بە سەرپەرشتی بەڕێوەبەرەکەی کاکە ڕێبین حەمە ئەمین هاتن بۆ فێرگەکەمان بۆ ماوەی دوو کاتژمێر لامان مانەوە و ڕاپۆرتێکیان لەسەر کارو چالاکی فێرگەکەمان ئەنجامدا، تێیدا چەند بەشێک لە بەرهەمەکانی فێرخوازەکان بە هەموو ئاستە جیاوازەکانەوە نمایش کرد و دایک و باوکی چەند فێرخوازێک دەربارەی هاندانی مناڵەکانیان لێدوانیانداو دەست خۆشیان کرد. ئێمە فێرخوازەکانمان کردووە بە سێ بەشەوە: بەشی سەرەتایی کە خەریکی تەمرین کردنن لە سەر ئامێرەکان. بەشی ناوەند کە گروپێکی زیاتر لە پانزە فێرخوازمان لێدروست کردون بە مۆزیک ژەن و گۆرانی بێژو کۆرسەوە. بەشی پرۆفیشناڵ کە ئاستی ژەندنیان لە ئاسێکی باڵادایە و دەتوانن بە سەرکەوتوویی لەگەڵ گروپی بە توانا کارو چالاکی ئەنجام بدەن



## بانگهێشت کردنمان بۆ دیداری عەلی مەردان لە کەرکوک

لە ڕۆژی ٢٠٢٢/٣/٨ وەک میوانێکی تایبەت لە لایەن سەندیکای هونەرمەندانی کوردستان/لقی کەرکوک وبە هۆی مامۆستای بەڕێزەوە چالاک سدیق بانگهێشت کرابووین بۆ دیداری کەرکوک بۆ مەقامات خولی (عەلی مەردان) بە سەرپەرشتی مۆزیک ژەنی جیهانی و یۆنسکۆ(نصیر الشمە) کە چەندین هونەرمەندی بە ئەزموون بانگهێشت کرابوون. لە سەر ئاستی کوردستان و عێراق، سەرەتا شاندەکە کۆبووینەوە و بردیانینە سەر قەڵای دێرینی کەرکوک کە چەندین ئاسەواری مێژووی دێرینی تێدابوو. کە دەیان جار بە لای ئەو قەڵایەدا تێپەڕیوم و بۆ جارێکیش سەردانم نەکردوە و ئەمە یەکەم جارم بووە کە پڕ بوو لە ئاسەواری دێرینی هەموو نەتەوە و ئاینە جیاجیاکان کە بۆ سەردەمی زۆر کۆن ئەگەڕێتەوە. وەک مزگەوتی پێغەمبەر (دانیال) کە جوولەکە بووە و قەبرستانی سەربازە تورکەکان و خانووی کوردو ئاسووری و جولەکان. بەڕێوەبەری شوێنەواری کەرکوکیش زۆر زانیاری وردی لەو بارەوە شرۆڤە کرد و لە هەمووشارەکانی کوردستان و بەغداوە هونەرمەندان ئامادە بوون و من بۆ خۆم زۆر بەدوای شوێنەواری مێژوویی ئەگەڕێم سوودێک و چێژێکی تایبەتم دی لەمێژووی دێرینی دۆڵی میزۆپۆتۆمیا. پاشان پشوویەک و نان خواردنێک و دوایش چووینە ناو هۆڵی سەنتەری ڕوناکبیری کەرکوک بە چوار زمان نوسراوە. کەرکوک بۆ خۆی خەڵکەکەی جوانە مۆزائیکی پێکەوە ژیانی ئاینزا و نەتەوەی جوانە. ئەوە کوردە قەتارو ئەڵاوەیسی خۆی هەیە تورکمانە قۆریاتی خۆی هەیە، عەرەبە مەقاماتی خۆی هەیە و ئاسورییە کلتووری جوانی خۆی هەیە. تەنانەت جل و بەرگیش یەکێک جلی کوردی، یەکێک کەواو سەڵتە ئەوی تر سدارە، ئیتر کلتوری جیاواز تێکەڵ بووە .بۆ وا نەبێت مرۆڤەکان دوور لە دەمارگیری نەتەوەیی ئاینی و ڕەگەزی پێکەوە نەژین؟ ئینجا نمایشەکە بە تیپی هونەری کەرکوک دەستی پێکرد و چەند بەرهەمێکیان پێشکەش کرد لە مەقاماتی شەرقی و کوردی وەک (ئۆرفە و حوسەینی و قەتارو خاوکەر وگۆرانی ڕاوەستاوە لەو بانە. پاشان گروپی (بیت العود) بە سەرپەرشتی هونەرمەندی بە توانای عود ژەن (محمد العطار) و چوار گەنجی بە توانای ئامێر ژەنی عود کە چەند بەرهەمێکی جوانیان پێشکەش کرد

وەک (رقصة الفرسان) لە دانانی نصیر الشمە و دەست و پەنجەیان وەک شوشە وابوو کە هێندە جوان دەیان ژەند و سەماعیەکی جوانیان نمایش کرد لە دانانی سامی البسیم و پاشان مۆزیکی (سۆلاڤ) لە دانانی غانم الحداد.

پاشان تیپی (بیت المقام فی کرکوک) چەند بەرهەمێکی جوانیان لە کلتووری تورکمانی و عەرەبی و کوردی پێشکەش کرد کە ئەگەڕایتەوە بۆ ڕۆژانی برایی و تەبایی. ئەوەی جێگای تێڕامانە من لەم دیداردەدا ئاشنایم پەیدا کرد لەگەڵ بە توانا ترین عود ژەن (محمد العطار) ئەوانەی ئامادە بوون جگە لە کەڵە هونەرمەندانی کورد، وەک مامۆستا ئەنوەر و خالید سەرکارو خلیل موراد وەندی و لە عەرەبەکانیش وەک (حبیب الظاهر)کە من سوود مەندبووم لە کتێبەکانی بە ناوی (اصول الموسیقی الشرقیە)پاشان ئامادە بوونی سەرۆکی سەندیکای هونەرمەندانی عێراق، سەرپەرشتیاری گروپی ژنانی سوید و گروپی کلتوری عێراقی مامۆستا (علاء المجید) و پێشکەشکارانی تەلەفزیۆنی کەرکوک (هاشم الجباری) ودەرهێنەری بە توانا (ناصر حسن) گۆرانی بێژی ناسراو خلیل موراد وەندی و هونەرمەندانی کۆیە و کەلارو چەمچەماڵ بەڕاستی ڕۆژێکی جیاواز بوو دەروونم حەسایەوە.





عودژەنی بەتوانا محەمەد العطار، ئازاد سالْح / کەرکوک





## نوسینێکی برای بەڕێزم کاک جەمالی دەلاک لەسەر مێژووی هونەریم



کاک جەمالی دەلاک یەکێکە لەو کەسە ڕۆشنبیرانەی کە خەمخۆری هونەرمەندانی کوردە لە هەر چوار پارچەی کوردستان و لە سەر ژیانی دەیان هونەرمەندی گۆرانی بێژو مۆزیک ژەن و شانۆکار، چەندین زانیاری درووستی لە هەموو بوارەکان نووسیوە کە بۆتە ئەرشیڤێکی گرنگ بۆ مێژووی هونەری کوردی

لە ڕۆژی (٢٠٢٢/٤/٢) نووسینێکی لە ماڵپەری (کوردستان TV) لەسەر ژیان و بەرهەمەکانی من بڵاکردبووەوە. بە سوپاسەوە وەک خۆی بڵاوی ئەکەمەوە .



ئازاد سالّح شنرویّ ..

## ئەو هونەرمەندە ژەنیارەی خەمی هونەری مۆسیقا و گۆرانی شارێکی لەکۆڵ گرتووە

کوردستان TV

نووسینی :جەمالی دەلاک

هونەر بەگشتی گوڵستانێکە کە لێوڕێژە لە گوڵی گەشاوەی جوان و بۆنخۆش، هەریەکەیان بۆن و بەرامەیەکی تایبەت دەبەخشن، میللەتانی سەر ڕووی ئەم زەمینە هەریەکەیان لەو پێگە جواگرافیایەی خۆیاندا شانازی بەهونەر و هونەرمەندەکانیانەوە دەکەن، ئێمەش وەک نەتەوەیەکی بندەست و بێ دەوڵەت مافی خۆمانە کە شانازیی بە هونەرمەندانی خۆمانەوە بکەین، چونکە لەهەموو ڕوویەکەوە هونەرمەندان لەهەموو بوارەکانی هونەر بەگشتی و هونەرمەندانی بواری مۆسیقا و گۆرانی پێگەیەکی بەرزو بەنرخیان هەیە، چونکە هەریەکەیان لەژێر سایەی زوڵم و ستەمی داگیرکەران، بوێرانەو خۆنەویستانە لەدوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر خۆیان دروست کردووە مێژوویەکی بایەخدارییان نەخشاندووە، هونەرمەندان زیاتر لەنیوەی تەمەنیان بێ دابڕان بە هونەری مۆسیقا و گۆرانی نەتەوەکەیان بەخشیوە

بەشێک لەو هونەرمەندە مۆسیقا ژەنانە دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەکانن و هەندێکیشیان بەبێ ئەوەی دەرچووی هیچ ئەکادیمیایەکی مۆسیقا بن، دڵسۆزانە و بەخولیاو حەزێکی زۆرەوە خۆڕسک فێری ئامێرەکانی مۆسیقا بوون و ژیانیان لەوپێناوەدا بەختکردوەو ئەمڕۆ بوونەتە هونەرمەندێکی ناودار و مامۆستا و وانەی مۆسیقا بە قوتابیەکانیان دەڵێنەوە جێ پەنجەو ماندوبوونیان دیارە.

یەکێک لەو هونەرمەندە ژەنیارانەی لەشارێکەوەخۆی دروست کردو ئەو خەمە گەورەیەی خستە سەرشانی و بەڵێنی بەخۆیی و شاری ئەدیبان و ڕۆشنبیران و شاعیران وهونەرمەندان (هەڵەبجە) دا، کە تادواساتەکانی ژیانی لەخزمەتی پێشکەوتنی هونەر و مۆسیقا و گۆرانیدا بێت، ئەویش هونەرمەندی ژەنیار کە ماوەی نیوسەدەیە بۆ هونەری مۆسیقا و گۆرانی ژیاوە ئێستا بۆتە پێشەنگی

بواری هونەری مۆسیقا و ئالآی مۆسیقا و ئاواز و گۆرانی لەشاری هەڵەبجەدا بەرزکردۆتەوە ، ئەویش هونەرمەند (ئازاد ساڵح مەلا سابیر) ناسراو بە (ئازاد ساڵح شنروێ)

هونەرمەند ئازاد ساڵح مەلاسابیر ، لەیەکێک لەگەڕەکە کۆنەکانی شاری هەڵەبجە، گەڕەکی جولەکان لە خانەوادەیەکی مام ناوەندی و ڕۆشنبیر، لەساڵی (١٩٥٥) چاوی بەژیان و شارە لەدڵاشیرینەکەی هەڵەبجە هەڵهێناوە، تەنانەت دایکی خاتوو (بەدری حسێن بانەیی) و باوکیشی(ساڵح مەلا سابیر) هەرلەوگەڕەکە (جولەکان) لەدایکبوون.

هونەرمەند ئازاد ساڵح شنروێ، براگەورەی (٤) خوشک و (٣) برایە .

هونەرمەند وەک هەرمنداڵێکی ئاسایی، لەگەڕەکەیان ژیانی منداڵی بەسەر بردووە، لەبەرئەوەی باوکی باری ئابووری تاڕادەیەک باش بووە و خاوەن دوکان بووەو کەسێکی کاسب و ڕوو خۆش و ڕۆشنفکر و کۆمەڵایەتی بووە، بەردەوام بۆدابینکردنی پێداویستیەکانی دوکانەکەی، ڕووی لەشاری سلێمانی و بەغداد کردووە و کاڵای بۆ دوکانەکەی هێناوە، ئازادی کوڕی زۆر خۆشویستووە و هەرجارێک گەڕابێتەوە بۆشارەکەی هەڵەبجە دیارییەکی نایابی بۆ کوڕە شیرینەکەی هێناوە، لەسەردەمانێکدا پایسکیلی سێ تایەی بۆ کڕیوە ، کە زۆر دەگمەن بووە و منداڵانی هاوڕێی گەڕەک ئاواتیان بۆ خواستووە کەئەوانیش وەک ئازاد ساڵح بەختەوەر بن، لەلایەکی دیکەوە لەبەرئەوەی خاڵەکانی مامۆستا و ڕۆشنبیر بوون، بەردەوام چاودێری و ڕێنوێنیان کردووە کە خۆی بەشی لاوەکیەوە سەرقاڵ نەکات و هەموو کات هۆش و بیری لەلای قوتابخانە وگرنگی بە خوێندنەکەی بدات، خاڵەکانی زۆریان خۆشویستووە و لەژیانیدا کاریگەری زۆری خاڵەکانی لەسەربووە.

هونەرمەند ئازاد ساڵح ، لەساڵی (١٩٦١) دەخرێتە بەرخوێندن، لەقوتابخانەی(ئاشتی) دوای هاتنی بەعسییەکان بۆ سەر کورسی دەسەڵات ناوی قوتابخانەیەکەیان دەگۆڕدرێت بۆ (انتصار) ، کاتێک هونەرمەند قوتابی پۆلی چوارەمی سەرەتایی دەبێت، مامۆستایەکیان هەبووە بەناوی (حەمەی ڕەعنا)، ئەم مامۆستا بەڕێزە دەرچووی بەشی شێوەکاری پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغداد بووە، هەروەها شارەزایی لەژەنینی ئامێری ڤیۆلۆن هەبووە، لەناو

قوتابییەکان چەند قوتابییەک هەڵدەبژێرێت، تیپێکی کۆرس بۆ سروود خوێندن دروست دەکات و مۆسیقای سروودەکانی ئەوسەردەمەیان بۆ دەژەنێ و لەپاڵ ئەو کارانەشدا زانیارییان لەسەر هونەری مۆسیقا و ئەو سروودانە پێ دەبەخشێت.

لەم قۆناغەوە هونەرمەند هەست و هۆشی بۆ لای دنیای هونەر هەنگاو دەنێ و حەزو خولیا و ئارەزووی بۆ مۆسیقا لەناخیدا چرۆ دەکات، لەلایەکی دیکەوە باوکی خاوەنی ڕادیۆ بووە و بەردەوام لەڕێی ئەو ڕادیۆیەوە گوێبیستی ئاواز و میلۆدی و دەنگی خۆشی هونەرمەندانی کورد و عەرەب بووە.

هونەرمەند بیرەوەرییەکانی منداڵی و دەنگ و ئاوازەکانی ئەو سەردەمەی ڕادیۆی کوردی بەغدا مان بۆدەگێڕێتەوە(هەر لە منداڵیەوە گوێ بیستی دەنگی مامۆستا تاهیر تۆفیق بووم، کاتێ مەلاشووی هزرم کرایەوە بە گۆرانی و موزیک، لە سەرەتای سالآنی شەستەکانەوە بە هۆی ڕادیۆی کوردی بەغداوە کە ساڵی (١٩٣٩) دامەزراوە، گوێ بیستی دەنگی هونەرمەندان (عەلی مەردان ،ڕەسوڵ گەردی، حەسەن زیرەک، شەماڵ سائیب، حەسەن جزیری و محەمەد عارف جزیری، نەسرین شیروان، گوڵبەهار، عیسی بەرواری، فەخری بامەڕنی، فوئاد ئەحمەد، کەریم کابان)، دوای ئەوانیش حەسەن دڵسۆز، خەلیل مرادوەندی، چەندین مەقام و گۆرانی بەو دەنگانە ئاشنا بووم، کە لە ماڵەوە کە ڕادیۆیەکی (سیرا) ی ئەڵمانی و پاشانیش (فلێبس)ی هۆڵەندی و لە دوکانی باوکیشم کەڕۆژانە میللی ڕادیۆیەکەی دوکانی باوکم ئەگێڕا بۆ ئیزاعەی کوردی و کە بەیانیان بە دەنگی بولبولێک ئەکرایەوە و پاشانیش گۆرانییەکانی بەیانیانی ڕادیۆکە لە خەو خەبەری ئەکردمەوە و بەدەنگی گوڵبەهار (بولبول سپێدە بخوێنە هەر بخوێنە وبەری بەیانە، زیڕەی فنجانەکەی کەریم کابان وئازیز بەهارەی شەماڵ سائیب و کراس زەردێی تاهیر تۆفیق) لەگەڵ نان خواردنی نان و ماست و چای بەیانیانی هەڵەبجە پێشوازی ڕۆژێکی نوێم ئەکردو دوایش خۆم ئەگۆڕی و ئەچووم بۆ قوتابخانە، ئەوە یادەوەری و فلاش باکی منالێمە لەگەڵ ئەو دەنگانە) [1].

باوکی هونەرمەند لەبەرئەوەی خاوەنی دەنگێکی خۆش بووە و ئەو هەستە پڕ ئارەزووی بۆ مۆسیقا لەکوڕەکەیدا بەدی کردووە، ڕێگری لێنەکردووە و بەڵکو هاوکاریشی بووە.

دوای تەوابوونی قۆناغی سەرەتایی، لەساڵی (١٩٦٧) هونەرمەند ئازاد ساڵح دەچێتەناوەندی هەڵەبجە و درێژە بەخوێندن دەدات، لەم قۆناغەدا هونەرمەند ئازاد ساڵح و هاوڕێ قوتابیەکانی ڕووبەڕووی گرفتێکی زمان دەبنەوە، خوێندن و خوێندنەوە پێشتر بەزمانی دایک خوێندوویەتی و ئێستا لەقۆناغی ناوەندی دەبێت خوێندن و خوێندنەوە بەعەرەبی بخوێنن، ئەوەش کاریگەرییان لەسەر دادەنێت و ئەوساڵە سەرکەوتوو نابن و لەخوێندن دوادەکەون.

لەساڵی (١٩٧٠) لەپۆلی دووەمی ناوەندی دەبێت، لەلایەن مامۆستای (وێنە) بەناوی (حەمەفەرەج ئەحمەد مراد) زۆر گرنگی بە هونەرمەند ئازاد ساڵح دەدرێت و زیاتر چاوی دەکرێتەوە و ئاشنا دەبێت بەدنیای هونەر.

شاری هەڵەبجە، لەسەرەتای دروستبوونیەوە ڕۆڵ و کاریگەری لەسەر ڕەوتی (نەتەوەیی و ئەدەبی و ڕۆشنبیری و هونەری) لە دەڤەری هەورامان و شارەزوور و تەنانەت کوردستانیش هەبووە، لەم شارەدا بەدەیان ئەدیب و نووسەر و شاعیر و ڕۆشنبیر و هونەرمەندی تێدا درووست بووە، کە کارو بەرهەمەکانیان بەتەواوی کوردستاندا بڵاوبوونەتەوە، بەهۆی ئەو پێگە گرنگەی هەڵەبجە بەدرێژایی مێژوو هەیبووە ، تیپی مۆسیقای سلێمانی بەمەبەستی نمایشکردنی کار و چالاکییە هونەرییەکانیان و ئاشناکردنیان بە دانیشتوانی شاری هەڵەبجە، لەڕێکەوتی (١٩٧١/٩/١) بۆماوەی (٢) دوو شەو لەشاری هەڵەبجە تیپی مۆسیقای سلێمانی ئاهەنگی مۆسیقا و گۆرانی سازدەکەن، هونەرمەند ئازاد ساڵح لاوێکی خوێن گەرمی تەمەن (١٦) ساڵ، زۆر سەرسام دەبێت بە دەست و پەنجەی ژەنیارە بەتواناکانی تیپی مۆسیقای سلێمانی و دەنگی خۆش و بەسۆزی هونەرمەندان (حەسەن گەرمیانی و تۆفیق عەلی) ئەو ئاهەنگە دووشەوە لێوڕێژە لە سۆزی مۆسیقا و میلۆدی خۆشی کوردی و دەنگی ئەو هونەرمەندانە، کاریگەری زۆر لەسەر هەست و نەستی هونەرمەند ئازاد ساڵح دادەنێ .

هونەرمەند لەتەمەنی منداڵیەوە لەبەر ئەوەی خولیای مۆسیقای هەبووە، هەست و دەست و پەنجەی خستۆتە کار، لەتەختە ئامێری (سەنتور)ی دروستکردووە، هەروەها حەزی ئەوەندە زۆر بووەکە لەقابلەمە ئامێری جومبوشی دروستکردووە.

## هونەرمەند ئازاد ساڵح و تیپی مۆسیقای هەڵەبجە

ئەگەر بەووردی باس لەژیانی هونەری ئەم هونەرمەندە باوەڕبەخۆبووە و عاشقی مۆسیقا بکەین، هیچ گومانی تێدانییە ئەو ژیانە پڕ هەورازو نشێوەی هونەرمەند دەبێت لە پەرتوکێکی قەبارە گەورەدا بنوسرێتەوەو بخرێتە بەردییەی خوێنەران، هونەرمەند ئازاد ساڵح چەند بەشێکی ژیانی تایبەتی و هونەری لەواڵەکەی خۆیی لەتۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبوک زۆر بەوردی و بەئەمانەتەوە ئەو مێژووەی خستۆتە بەردییەی هاوڕێیان و خوێنەران،

تیپی مۆسیقای هەڵەبجە، بیرۆکەی سێ کەسایەتی بووەکەلەخەمی مۆسیقادا بوون، مەبەستیان بووە وەک شارەکانی تری کوردستان لەشاری هەڵەبجە تیپێکی مۆسیقا دامەزرێنن و ڕەوتی هونەری مۆسیقا و گۆرانی بەرەوپێش بەرن، ئەو سێ کەسایەتییە (ئازاد ساڵح مەلا سابیر ، مستەفا کەمال خەفاف و ئومێد نوری) لەڕێکەوتی (١٩٧٣/٤/٢٦) بڕیار لەسەر دامەزراندنی تیپێکی مۆسیقا دەدەن و ناوی دەنێن (تیپی مۆسیقای هەڵەبجە) و هونەرمەند ئازاد ساڵح دەکەن بەسەرۆکی تیپەکە، هەرسێ کەسایەتی خولیاو ئارەزوویەکی زۆریان هەبووە بۆ مۆسیقا، بەبێ ئەوەی لەلای هیچ مامۆستایەک وانەی مۆسیقا بخوێنن و دەرچووی ئەکادیمیا یان پەیمانگایەکی هونەری بن، هەر سێ هونەرمەند پێکەوە بڕیاردەدەن کەلەسەر پێ خۆیان ڕاوەستن و ئەو خەونە بهێننەدی لەشاری هەڵەبجە و هەریەکەیان بەهەرشێوەیەک بێت ئامێری مۆسیقا پەیدادەکات.

ڕۆڵ و پشتیوانی و هاوکاری خانەوادە چەند گرنگە بۆ منداڵەکانیان کە خولیای مۆسیقا بن و بەهەموو شێوەیەک هاوکاری بن لەسەرخستن و ڕۆشنکەرەوەی

ڕێگای هونەر، وەک لەسەرەتا ئاماژەم پێدا خانەوادەی هونەرمەند زۆر پشتیوانی بوون، هونەرمەند لەدەفتەری یادەوەرییەکانیدا بەوشێوەیە چۆنیەتی دابینکردنی پارە و کڕینی ئامێری (کەمانچەکەی) نوسیوە :

(دایکم یەک لیرەی ڕەشادی بۆ فرۆشتم بە (٥) پێنج دینار، باوکیشم (٥) پینج دیناری دامێ، پارەکە بوو بە (١٠) دینار، ئەگەڕام بۆ کەمانچە، لەمانگی (٥)ی (١٩٧٣) دابوو ، (ئەحمەدی مسگەر) کەمانچەیەکی چیکی و ئۆکۆردیۆنێکی هەبوو، من و ئومێد چوین بۆماڵەکەیان کەمانچەکەی بە (١٠) دینار پێ فرۆشتم، کەمانچەیەکی ڕەشی چیکی بوو، زۆر دڵم پێی خۆشبوو)[٢]

ئەو سێ کەسایەتیە دەبنە دەستەی دامەزرێنەر و دەنگۆی دامەزراندنی تیپی مۆسیقای هەڵەبجە بەناو شاردا بڵاودەبێتەوە، هەندێک کەسایەتی دیکە وەک موزیکژەن و گۆرانیبێژ دەچنە ناو تیپەکەوە و ئەندامەکانیان زۆردەبن (شازاد شێخ کەریم، عەزیز مستەفا بەگ، سەروەت حەمە کەریم کوردستانی، سەرکۆ ئەحمەد و سیروان عەلی ڕەزا هاواری وەک گۆرانیبێژ) هونەرمەند ئازاد ساڵح بەشەو بە ڕۆژ سەرقاڵی خۆفێرکردن و پرۆڤەکردن دەبێت بەئامێرە شیرینەکەی تا ماوەی (٢) مانگ ، بەبێ ئەوەی نۆتە بزانێت.

هونەرمەند و مامۆستا (عوسمان محەمەد ئەمین) ئەندامی تیپی مۆسیقای سلێمانی سەردانی شاری هەڵەبجە دەکات و لەنزیکەوە ئەو کۆمەڵە لاوە پڕ وزە و عەشقە بۆ مۆسیقا دەبینێ، باسی مۆسیقا و نۆتەی مۆسیقایان بۆدەکات و چەند ئاوازێکی گۆرانیان بۆ دەژەنێ، بەم کارەی مامۆستا عوسمان زیاتر دەبێتە هاندەر و پشتیوانی کە بەردەوام بن لەسەر ئەو ڕێگا پیرۆزەی هونەری مۆسیقاو گۆرانی.

هونەرمەند، دوای ئەوەی دەست و پەنجەکانی لەسەر ژێکانی کەمانچەکەی ڕادەهێنێ و بەشێوەی گوێگرتن (سەماعی) خۆی فێردەکات، یەکەم ئاوازێک بەشێوەی سەماعی ژەنیویەتی یەکێک لەگۆرانییەکانی هونەرمەند (حەسەن زیرەک) بووە بەناوی (لایە لایەت بۆدەکەم) .

لەدوای دوو مانگ زیاتر لە دامەزراندنی تیپی مۆسیقا و پرۆڤەکردن، بڕیاردەدەن کە ئاهەنگێک سازبکەن، لەگەڵ ئاهەنگی گۆرانی و مۆسیقا شانۆگەرییەکیش پێشکەش بکرێت، دوای ماندوبوون و هەوڵدانێکی زۆر و پرۆڤەکردن لە هۆڵی سانەوی هەڵەبجە و خۆئامادەکردن بۆ ئەو ئاهەنگە، تا لەڕێکەوتی (١٩٧٣/٧/١) یەکەم نمایشی هونەری مۆسیقاو گۆرانی ئەنجام دەدەن، هونەرمەندانی بەشداربووی ئاهەنگەکە بریتی بوون لە : (ئازاد ساڵح ، فوئاد محەمەد مەحمود، مستەفا کەمال ئامێری (کەمانچە)، ئومێد نوری ئامێری (ئۆکۆردیۆن) ، حیکمەت تۆفیق ئامێری (شمشاڵ) ، عەزیز بابان ئامێری (دەف سنجار) ، شازاد نەقشبەندی ئامێری (ئیقاع) ، بەهاوکاری چەند گۆرانیبێژێک ، بۆماوەی (٥) شەو، ئەو ئاهەنگە و شانۆگەرییە بەردەوامی دەبێت، دڵ و هەست و نەستی ئامادەبووان خۆش دەکەن، لەلایەن خەڵکەوە پێشوازییەکی گەرمیان لێدەکرێت، دوای دەنگدانەوەیەکی باش و دەستخۆشی لەلایەن جەماوەرەوە،

لـەڕێکـەوتی (١٩٧٣/٧/٢٠) تیپـی مۆسـیقای هـەڵەبجـە، لەشـارۆچکەی (تەوێڵـە) بۆماوەی (٢) شەو ئاهەنگی مۆسیقا و گۆرانی و شانۆگەرییەکە پێشکەش دەکەن ، دواتر لە(خورماڵ) و پاشـان یـەک شـەو لـە شـارۆچکەی (پێنجوێن) ئـەو نمایشـە هونەرییە پێشکەشی دانیشتوانی پێنجوێنی دەکەن.

تیپی مۆسیقای هـەڵەبجە، ڕۆژ لـەدوای ڕۆژ گەشـەدەکەن و گرنگـی زیـاتر بـە کارە هونەرییەکانیان دەدەن، بەردەوام دەبن لەسەر گەشەکردنی هونەری مۆسیقا و گـۆرانی لەشـاری هـەڵەبجـە، هونەرمەنـدان لـەدەوریان کۆدەبنـەوە، ئاهـەنگێکی دیکەی تیپی ناوبراو بەبۆنەی یادی دامەزراندنی (پارتی دیموکراتی کوردستـان) سـازدەکەن، لـەڕێکـەوتی (١٩٧٣/٨/١٦) لـە گۆڕەپـانی سـانەوی هـەڵەبجـە چەنـد سـروودێک پێشـکەش دەکـەن، بۆیەکـەمجار هونەرمەنـدی دەنـگ زوڵاڵ و قوتـابی قوتابخانـــەی هونەرمەنـــدی گـــەورە (ســـەیدعـــەلی ئەســـغەری کوردســـتانی ١٨٨٢_١٩٣٧/٢/٤) هونەرمەند (عومەر میرزا نەسروڵڵا، ناسراو بە عومەر خەزان ١٩٢٩_٢٠٠٨/١/١٢) بەشدار دەبێت لەگەڵیانداوسەرەتا مەقامێک دەخوێنێ :

(ناوی کورد وەک مانگ لەئاسمان دیارە ئەدرەوشێتەوە<br>
وابەدەوری ڕۆژی ئازادیی گەلا ئەخولێتەوە<br>
هەوری چڵکن چۆن ئەتوانێ بێت بەری بگرێتەوە<br>
چۆن بەواتەی دەم، گەلی وا ناوەکەی ئەسڕێتەوە<br>
کورد خەڵاتی ناوێ، مافی خۆی دەوێ بێ چەند و چوون<br>
مافی کورد فەرزە لەسەر تەئریخ ئەبێ بدرێتەوە)

دواتر گۆرانی (کۆچی یارم کۆچی سوورە) لەگەڵ ئەو هونەرمەندە دەست و پەنجە هونەرییانەی تیپی مۆسیقای هەڵەبجە پێشکەش بەجەماوەری ئامـادەبووی ئەو یادە دەکات.

هونەرمەنـد ئـازاد سـاڵح، دوای ئـەو کـارە هونەرییانـەی لەگـەڵ هـاوڕێ هونەرمەندەکانی لەشـاری هـەڵەبجەو دەوروبـەری ئەنجامیاندا و سـەرکەوتنیان بەدەستهێنا، زیاتر ڕۆدەچێتە نێو قوڵایی دنیا جوانەکەی هونەری مۆسیقا و بیر لە دانـانی ئـاواز دەکاتـەوە، لەسـەرەتای سـاڵی (١٩٧٤) ئـاواز لەسـەر هـۆنراوەیـەکی

شاعیر (شێخ لەتیف شێخ عارف قەرداخی ١٩٣٦_ ٢٠١٨/٦/٢٠) بەناوی ( ئەو هیوای کەپێی ژیام - شەپۆلی مەرگ ڕاپێچی کرد)

هونەرمەند ئازاد ساڵح باس لەو ئاوازە دەکات و کاریگەری کێی لەسەر بووە (ئەو شیعرە لەڕۆژنامەی (ژین) کە (کاکەی فەلاح) سەرپەرشتی دەکرد بەرچاوم کەوت، شیعرێکی جوان بوو، منیش زۆرجار گوێم لە (حەمە ئەمین عەبدولکەریم ١٩٠٣_ ١٩٧٨/٢/١٥، ناسراو بە مینەی لولەکژەن) ئەگرت ، کاتێک شێلمی ئەفرۆشت خۆڕسکانە شمشاڵی دەژەند، بایی چەندت بکڕیایە زیاتری دەژەند، منیش سوود و ئیلهامم لەو ئاواز و شیعرە وەرگرت) [٣] .

هونەرمەند بەهاوکاری ئەندامانی تیپی مۆسیقای هەڵەبجە، بە جۆش و خرۆشێکی هونەری بەرزەوە لەڕێکەوتی (١٩٧٤/٢/١٨) ئاهەنگێکی قەشەنگ لێوان لێو لە دەنگی خۆش و سۆزی مۆسیقا سازدەکەن، لەم ئاهەنگەدا بۆیەکەمجار کچانی هەڵەبجە بەجلی ئاڵ و واڵای ڕەنگینی کوردییەوە لەسەرشانۆ بە کۆرس بەشداربوون، لەلایەن جەماوەر و ئامادەبووانی ئاهەنگەکەوە هونەرمەند چەند خەڵاتێکی پێدەبەخشرێت.

لەیادی یەکەم ساڵی دامەزراندنی تیپی مۆسیقای هەڵەبجە (١٩٧٤/٤/٢٦) لەباتی چەپکە گوڵ و خەڵاتکردنی ئەو هونەرمەندە خۆنەویست و دڵسۆزانەی بواری مۆسیقا و گۆرانی، بەداخەوە لەو ڕۆژەدا هەڵەبجە لەشاری بەغداوە ناپاڵم و بۆمبی وێرانکەری بەدیاری بەسەردا باری، بەهۆی دەستپێکردنەوەی شۆڕشی ئەیلول و بۆردومانی شاری هەڵەبجە لەلایەن فرۆکەکانی بەعسی خوێنڕێژەوە، وێرانکردنی ئەو شارە، وەک شاری قەڵادزێ لە (١٩٧٤/٤/٢٤) ، هەڵەبجە و هەڵەبجەیەکان خۆشی و ئارامییان لێستاندن و تیپی مۆسیقای هەڵەبجە پەرتەوازەبوون، زۆریان بەرەو ڕۆژهەڵاتی کوردستان، لەبەر نائارامیی شاری هەڵەبجەو ناوچەکە، بەڵام هونەرمەند ئازاد ساڵح ، لەبەرئەوەی قوتابی پۆلی شەشەمی وێژەیی بووە و تاقیکردنەوەی بەکەلۆری هەبووە، بۆئەومەبەستە ڕووەدەکاتە شاری سلێمانی و بەیەکەمی وێژەیی لەسلێمانی دەردەچێت.

هونەرمەند ئازادساڵح، دوای دەرچوونی لەقۆناغی ئامادەیی، لەمانگی (١٠ی ١٩٧٤) ڕوودەکاتە شاری بەغداد بەمەبەستی درێژەدان بەخوێندن لەزانکۆ، هونەرمەند بەحەزوو ئارەزووی کە لەکۆلیژی هونەر وەربگیرێت، بەڵام لەوکاتەدا

ئەوکۆلێژە لەزانکۆکانی بەغداد دا نەبووە، چارەنووس بەرەو کۆلێژێکی دیکەی دەبات: (لە مانگی شەشی سالّی ١٩٧٤ تاقیکردنەوەمان ئەنجامدا، من یەکەمی سلێمانی بووم لە بەشی وێژەیی، هەموو کۆلێژێک وەریدەگرتم ، من بەڕاستی حەزم لە بەشی موزیک بوو لە کۆلێژی هونەرەجوانەکانی بە غدا بەلاّم ئەو کاتە ئەو بەشە نە بوو ،ناچار وتیان کۆلێژی بەڕێوەبردن و ئابووریی هەلّبژێرە، دوای موزیک حەزم لە یاسا بوو، ئیتر قەدەر و قسەی کەس و کار وای کرد ئەو کۆلێجە هەلّبژێرم) [٤].

هونەرمەند کاتێک لەشاری بەغداد دەخوێنێ و ڕۆژانە تێکەلاّوی زیاتری دەبێت لەگەلّ هاوڕێ قوتابیەکانی و زیاتر چاوی دەکرێتەوە و کاریگەری زێدەتر لەسەر هەست و بیرکردنەوەی دادەنێ و بەلاّم حەزو خولیاو ئارەزووەکەی بۆ مۆسیقا هەرلەبرەودا دەبێت ، لەبەغداد هونەرمەند ئامێرێکی کەمانچە دەکڕێتەوە و شەوانە لەگەلّ هاوڕێکانی لەوژوورەی کە بەکرێ گرتبووی بەژەنین و پرۆڤەکردن و خوێندنی وانەکانی خۆی سەرقالّ دەکات ، لەهەمان کاتیشدا لەبەغداد دەچێتە خولی مۆسیقا بۆ فێربوونی (نۆتە).

هونەرمەند لەپشووی هاویناندا دەگەڕێتەوە بۆ شاری هەلّەبجە، لەهاوینی سالّی (١٩٧٧) لەزێدەکەی خولێکی مۆسیقا دەکاتەوە و چەندین فێرکار لەخولەکەدا بەشداردەبن ، لەهەمان سالّدا هونەرمەند کاتێک قوتابی پۆلی سێیەمی کۆلێژ دەبێت، لەبەر حەزو ئارەزوویەکی زۆری بۆ مۆسیقا، بۆ یەکەم جار خامەی دەخاتە کار و بابەتێک لەسەر مۆسیقا دەنوسێت و لەڕۆژنامەی (هاوکاری) ئەوکات بلاّوی دەکاتەوە.

لەسالّی (١٩٧٨) بڕوانامەی (بەکالۆریۆس) بەدەست دێنێت و دەگەڕێتەوە شاری هەلّەبجە ولەبەڕێوەبەرایەتی کارەبای هەلّەبجە وەک کارمەند بەناونیشانی (ژمێریار) دادەمەزرێت.

تیپی مۆسیقای هەلّەبجە بەهەولّ و تێکۆشانی بێ وچانی هونەرمەند ئازاد سالّح و هاوڕێ هونەرمەندەکانی زیاتر گەشە دەکات و چالاکی هونەرییی ئەنجام دەدەن و هونەرمەندان زیاتر ڕوودەکەنە تیپی ناوبراو، لەسالّی (١٩٧٩) هونەرمەندی دەنگخۆشی شارەکەی هەلّەبجە (هوشیار حەمەفەرەج) پەیوەندی بەتیپی مۆسیقای هەلّەبجەوە دەکات و لەگەلّ هونەرمەندانی ژەنیاری تیپی مۆسیقای هەلّەبجە بەرهەمەکانی تۆماردەکات و دەبێتە ئەندامی تیپ.

دوای حەوت ساڵ تێپەڕبوون بەسەر ناوی تیپی مۆسیقای هەڵەبجە، ناوی تیپ دەگۆڕێت بۆ (تیپی مۆسیقای شنروێ) و ناوی شنروێ دەبێتە نازناوی هونەرمەند و لەنێوەندی هونەری هونەرمەند بە (ئازاد ساڵح شنروێ) دەناسرێت.

ئازاد ساڵحی هونەرمەند لەدەستپێکی کاری هونەرییەوە جیا لەو ئارەزووە بێ ئەندازەی بۆ مۆسیقا، مەبەستی بووە لەهەموو بوارەکانەوە زێدەکەی گەشـەبکات و بەردەوام وەک سەربازێکی ون تێکۆشاوە، هونەرمەند بـەهاوکاری مامۆستاو هونەرمەنـد (هـەڵکـەوت شـێخ محەمـەد) تیپێکـی مۆسـیقا بـۆ منـداڵان لەهـەڵەبجـە دادەمەزرێنن بەناوی (ماملێ)، بەڵام بەداخەوە بەهۆی ئەوەی هونەرمەند لەهەمان سـاڵدا (١٩٨٠) دەبێت بەسـەرباز، چـالاکی و تێکۆشـانی هونـەری تیپی مۆسـیقای شنروێ تا ساڵی (١٩٨٣) ڕادەوەستێت.

هونەرمەنـد، ئـەو هونەرمەنـدەی کەهـەموو ژیـانی خـۆی بەخشـیوە لـەپێناو هونـــەری مۆســـیقا و گـــۆرانی، هەمیشـــە بـــەڕاســـتگۆیانە کارەهونەرییـــەکانی ئەنجامداوە، یەکێک لەخەسڵەتە جوانەکانی هونەرمەند لەدرێژەی ژیانی هونەریدا لەهـەر قۆنـاغێکی تەمـەنی هونەریـدا ڕۆژێـک لـەڕۆژان لەگـەڵ هەرهونەرمەنـد و کەسایەتییەک کاری کردبێت، زۆربەئەمانەتـەوە لەبیرەوەریەکانیدا باسـی ڕۆڵ و هاوکاری و پێگەی کارەکەی کردووە،

لەساڵی (١٩٨٣) تیپی مۆسیقای شنروێ کارە هونەرییـەکانیان دەگوازنـەوە بـۆ تەلـەفزیۆنی کـەرکوک، چـوار گـۆرانی بـۆ هـەردوو هونەرمەنـدی هـەورامان و هەڵەبجە (عوسمان کێمنەیی و محەمەد ئیبراهیم عەبدول ، ناسراو بەحەمە قوتوو) بۆهەریەکـەیـان دوو گـۆرانی تۆماردەکـەن (کەتانـە و کاڵەبـەی) بـۆ هونەرمەنـد (عوسمان کێمنەیی) ، گۆرانی (قاسم خان و ئامین و ئامین) بۆ هونەرمەند(حەمـە قوتـوو) ، لـەپاش تۆمـارکردنی ئـەم بەرهەمانـە، لەسـاڵی (١٩٨٤ و ١٩٨٥) دوو ئۆپەرێت بۆ منداڵان ئامادەدەکەن و لەتەلەفزیۆنی کەرکوک تۆماری دەکەن.

لەدوای ئەو کارەساتە پڕ تراژیدیایەی خنکاندنی شارێک بە گازی کیمیایی و شەهیدکردنی شاری هـەڵەبجەو ئـەو هـەموو قوربانییـەی لێکەوتـەوە، هونەرمەند ئـازاد سـاڵح یـەکێک بـووە لـەو هونەرمەندانـەی کـە ئـەو کارەسـاتە جـەرگبڕەی بەچاوەکانی دیوەو لەو ڕووداوە ترسناکەدا ژیـاوەو کاریگـەری لەسـەر دانـاوە، وەک هاوشـارییە ڕزگاربووەکـانی، ئـامێری کەمانچەکـەیـی و چەلۆکـەی تیپـی

مۆسیقای شنرۆی بەکۆڵیدا دەدات و بەرەو ڕۆژهەڵاتی کوردستان و لەشاری (سەقز) دەگیرسێتەوە، لەوبارودۆخە ناهەموارەدا ئازاد ساڵحی هونەرمەند لەژێر خێمەیەکدا بەخۆیی و کەمانچەکەیەوە خەم و ئازاری دەروونی و هاوشارییەکانی و زێدەکەی هەڵەبجە بگەیەنێتە دەوروبەر و ئەو ئازارە پڕ ژانەبەسوێیە کەم بکاتەوە، لەوژیانە سەختە لەلایەک مەرگی ئازیزانت بینیبێت و لەلایەک لەزێدەکەت دوور بیت، بەڵام هونەرمەند کۆڵ نادات لەشاری سەقزو مەهاباد چالاکی هونەری ئەنجام دەدات.

لەدوای ڕاپەڕینەی بەهاری ساڵی (١٩٩١) هونەرمەند لەشاری سلێمانی دەژی و لەساڵی (١٩٩٢) هونەرمەند ئازاد ساڵح و هونەرمەندانی تیپی مۆسیقای شنروێ، بەهەستی بەرزی هونەری و دەست و پەنجەی زێڕینیان هەموو ساڵێک بەشداری مەراسیمی یادی هەڵەبجە دەکەنەوە،

هونەرمەند هەمیشە بەڕۆحێکی گەش و پیرۆزەو لە هونەرەکەی ڕوانیوە، بەردەوام بەشداربووە لە ئاهەنگ و بۆنە نەتەوەیی و یادە نیشتمانیەکان و دەیان بەرنامەی تەلەفزیۆنی لەکەناڵەکان، هەروەها وەک تاک بەشداری کردووە لەگەڵ تیپە مۆسیقیەکان.

هونەرمەند ئازاد ساڵح ، هەمیشە چرایەکی گەش بووە، دەوروبەری خۆی ڕوناک کردۆتەوەو چێژ و ئارامیی پێ بەخشیون، لەوماوە دوورو درێژەی کاروانی خەبات و تێکۆشانی هونەریدا، بەدەیان قوتابی لە کوڕو کچ بەشێوەیەکی ئەکادیمی زانستی مۆسیقا، فێری مۆسیقاکردووە تەنانەت خودی منداڵەکانی خۆشی، کەواتە من هەرچەندی بنووسم ناتوانم مافی تەواو بدەمە ڕەنج و ماندوو بوون و تێکۆشانی هونەری ئەم مامۆستا پێشەنگەی بواری مۆسیقا، چونکە ئەو دەیان قوتابیەی لەسەر هەست و نەست و میهرەبانی هونەرمەند پێگەیشتوون و بوونەتە هونەرمەندی بەتوانا ئەوان گەواهیدەری ئەو ڕاستییەن. هونەرمەند خاوەنی دەیان ئاوازە کەبۆهونەرمەندانی داناوەو بەدەنگە خۆشەکانیان خوێندوویانە.

کاتێک کەباسی مێژووی هونەری مۆسیقاو گۆرانی شاری هەڵەبجە بکرێت ، ناو و نازناوی هونەرمەند بەرجەستە دەبێت و دەبێتە پێشەنگ لەوبوارەدا .

گەر بەویژدانەوە چاوێک بە مێژووی هونەری مۆسیقادا لە شاری هەڵەبجە دا بگێڕین، ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێت، گەر ئەم مامۆستا ڕابەرە لە مێژووی

مۆسیقای شاری هەڵەبجەدا دەربکەین، ئەوکات مێژووی مۆسیقا لەشاری هەڵەبجەدا لاسەنگ دەبێت! ئەمەش بەو مانایە دێت ئەم مامۆستا ڕابەرە سەنگی هێندەی سەرجەم هاوڕێکانی دەبێت کەلەم بوارەدا کاریان کردووە، ئەم هونەرمەندە پێشەنگە هەموو ژیانی خۆی و ماڵ و منداڵی بەخشییە هونەری مۆسیقای شارەکەی. مێژوو شاهیدی ئەوەیە کە ئەم مامۆستا ڕابەرە بۆ هونەری چی کردووە، تەنانەت مێژووی شانۆی هەڵەبجە قەرزاری ئەم مامۆستا پێشەنگەیە، زۆربەی ئۆپەرێت و مۆسیقای شانۆییەکان نەخشی دەستی ئەم مامۆستا پێشەنگە بوون [٥].

فێرگەی میوزیکی شنروێ.!

هونەرمەند لەسەر ڕەوڕەوەی شەمەندەفەرەکەڕێگا دەبڕێ و هەربەردەوامەو چاو لەئاسۆیە، لە (٤٤) ساڵی تەمەن بێ ڕاوەستان، جارێکی دیکە لەخەمی منداڵانی شارەکەیەتی (هەڵەبجە) واز لە ژیانە تایبەتیەکەی دێنێتەوە دەگەڕێتەوە لەزێدەکەی بەو ئاستە بەرزەی تەمەنی لاوی (فێرگەی میوزیکی شنروێ ، بۆ فێربوونی سەرجەم ئامێرەکانی موزیک، بەهاوکاری هونەرمەند و مامۆستا (عادل حەسەن) دەکاتەوە، شەو و ڕۆژی خستۆتە سەریەک و بەردەوام لەڕێگای هەڵەبجەیە لە فێرگە مۆسیقیەکەی خزمەت بە منداڵان و لاو گەنجی ئەو شارە دەکات (ئەم فێرگەیە بیرۆکەی مامۆستا ئازاد بوو، منی ئاگادار کردو داوای لێکردم کە هاوکاری بم ، منیش زانیم کە کارەکە پیرۆزە، بێ دوودڵی ڕەزامەندیم دا، لەساڵی (٢٠١٧) ئەم فێرگەیەمان دامەزراند، سەرەتا خانوویەکمان گرت لەسەر پارێزگاری هەڵەبجە، تاماوەی (٣) سێ ساڵ کرێی خانەوەکەیان بۆ داین و ئێمەش بەڕۆحیەتیکی بەرزەوە دەستمان پێکرد، ئێستا بۆ ماوەی (٦) شەش مانگە ڕێکخراوی (گۆتە) ی ئەڵمانی ئەوئەرکەیان لەئەستۆ گرتووە، ژمارەیەکی زۆر لەمنداڵ و گەنج وکچ و کوڕ و مامۆستا و پزیشک و یاریدەدەری پزیشک و ئەفسەری پۆلیس و ئاسایش و تەواوی پیشەوەرەکانی ناوبازاڕی هەڵەبجە، هاتوون و بەشێکی زۆر لە (هاواری)یەکان ڕاهێنانیان پێدەکەین، ئەم فێرگەیە بێ جیاوازی لەبیرو ڕای ئایینی، هەموو کەسێ بۆی هەیە بێتە فێرگەکەو تائێستا چەندین کاری جوانمان پێ ئەنجام داون) [٦].

تیپی مۆسیقای هەڵەبجە و (شنروێ) ی ئێستا هەرلەسەرەتای دروستبونیەوە، لەخەمی بەرەو پێش بردنی ڕەوتی هونەری ئاوازو مۆسیقادا بووە، سەرەڕای لەمپەرو ئاستەنگەکانی بەردەم ئەو تیپە مۆسیقیە، بەڵام بەهەوڵ و تێکۆشان و کۆششی دڵسۆزانەی هونەرمەند ئازاد ساڵح و هەموو هونەرمەندانی خۆشەویستی تیپی مۆسیقای شنروێ بەبێ ماندووبوون مۆسیقا و گۆرانی یان بۆ ئارامی و جوانیەکانی ژیان چڕیوە.

ئاشکرایە کە تیپی مۆسیقای شنروێ دەرگای ئاوەڵاکردوە بۆ زۆر لە هونەرمەندانی گۆرانیبێژ تا بەهاوکاری دەست و پەنجە پڕهەستە هونەرییەکانیان هاوکاریان بن لەتۆمارکردنی بەرهەمە هونەرییەکانیان، یەکێک لەو هونەرمەندە دەنگخۆش و لێوڕێژە لەسۆزی هونەری هونەرمەند (هوشیار حەمەفەرەج) ە کەلەساڵی (١٩٧٩) وە ئەندامی تیپی ناوبراووە، سەبارەت بەهونەرمەندی موزیکژەن و ئاوازدارنەر ئازاد ساڵح دەڵێت (لەهەموو شارێکدا هەندێ کەس هەن وەک چڵەگەنمێکی باڵابەرز دیارن لەبواری شانۆ و وەرزش و شێوەکاری، گەر کەسانێک دیاربن ئەوە کاک ئازاد ساڵح ە لەبواری موزیک باڵای لەهەمووان بەرزترە، پشکی شێری بەردەکەوێ لە خزمەتکردن و کۆڵنەدان، ئەم هونەرمەندە دەستی منی گرت و هێنامیە نێو دنیای گۆرانی ، زۆر بەپەرۆش و دڵسۆزانە هانی ئەدام بۆئاوازدانان، یارمەتی دەدام و ئاوازەکانی بۆ ڕێک دەکردمەوە بەباش و خراپییەوە، کاک ئازاد منی دروستکرد و منی کردە گۆرانیبێژ هەرگیز ناتوانم ئەو قەرزە گەورەیەی بدەمەوە ، کاک ئازاد هەیەتی بەسەر من و هونەرمەند عومەر خەزان و حەمەقوتوو و ئازادە ڕەشەوەو زۆرێک لەهونەرمەندانی تر، جوانی کاک ئازاد ساڵح لەوەدایە لەوەتی هەیە هەردەبەخشێ)[٧] .

لەشارەکەی حاجی قادر و دڵدار و ئەختەر و سێوە و خاڵە تایەر، مەلائەسعەد ، هونەرمەند ئازاد ساڵح لەبەرامبەر ئەو مێژووە جوان و پاک و بێگەردەی خەڵات دەکرێت..!

لەیادی (٣٤) ساڵ بەسەر تێپەڕبوون بەسەر ژیانئاوایی هونەرمەندی گەل (تایەر تۆفیق) لە (٢٠٢١/١١/١٠) لەشاری کۆیە، تیپی مۆسیقای باواجی خەڵاتی ڕێزلێنانی بەخشییە (١٠) هونەرمەندی گەورەی گەلەکەمان، لەبارەتەقای ساڵانێکی زۆر خزمەتکردنیان بە هونەری ڕەسەنی ئاوازو گۆرانی کوردی، یەکێک لەو

هونەرمەندانە، هونەرمەندی ژەنیار و ئاوازدانەر (ئازاد سالْح شنروێ) خەڵاتی ڕۆژی هونەری لەشاری کۆیە پێ بەخشرا.

دەخوازم ئەم هونەرمەندە ڕابەر و پێشەنگی مۆسیقا و گۆرانییە هەربەردەوام بێت لەبەخششی هونەری بەتەندروستی باشەوە، ئەوئاڵا بەرزەی هونەری مۆسیقاو گۆرانی و ئاوازی کوردی کە هونەرمەند ئازاد سالْح شنروێ بەرزی کردۆتەوە هەرلەشەکانەو لوتکەی شکۆداری هونەردا بمێنێتەوە.

سەرچاوە :

(١، ٢، ٣، ٤) تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبوک، والّی هونەرمەند ئازاد سالْح شنروێ، بیرەوەرییەکانی هونەرمەند.

(٥) مامۆستا ئازاد سالْح، هونەرمەندێکی ڕابەر و پێشەنگی بواری هونەری مۆسیقا لە شاری هەڵەبجەدا. کۆچەر میرزا ئەنوەر، فەیسبوک ٢٠٢١/٧/٢٨

(٦) پەیوەندی تەلەفۆنی لەگەڵ هونەرمەند و مامۆستا (عادل حەسەن) لەڕێکەوتی ٢٠٢١/١٢/٥ (ج،د)

(٧) پەیوەندی لەڕێی ماسنجەرەوە بە هونەرمەندی دەنگخۆش (هۆشیار حەمە فەرەج) لەڕێکەوتی (٢٠٢١/١٢/٦) (ج،د)

## کۆنسێرتێک بۆ خاتوو هانی هونەرمەند

لەڕۆژی ٢٠٢٢/٤/٥ لێپرسراوی پەیمانگای گۆتەی ئەڵمانی خاتوو (ئەنایس بۆلیک) و چەند فەرمانبەرێکیان وەک کاک شەماڵ و خاتوو نەورەس، سەردانی سلێمانیان کردو پیشنیاری ئەوەیان کرد کە لە مانگی داهاتوو کۆنسێرتێک ساز بکەین بۆ فێرخوازانی فێرگەکەمان و گروپێکی مۆزیک لە سلێمانی و بە بەشداری گۆرانی بێژی کوردستانی ڕۆژ هەڵات کە لە ئەڵمانیا دەژی خاتوو (هانی) پلانمان دانا چۆن ئەو کۆنسێرتە سازبکەین. ئەوەی مایەی خۆشحاڵی بوو کە خاتوو (ئەنایس) لەماجیدی مۆڵ لەسلێمانی داوەت نامەیەکی پێشکەش کردم بۆ ئەوەی بچم بۆ ئێوارە خوانێک لە شاری هەولێر.




لەراستەوە: شەماڵ . ئازاد . ئەنایس . نەوڕەس/ماجدی مۆڵ /سلێمانی

بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ ئەو کۆنسێرتە بۆ شەوی ٢٠٢٢/٤/٧ لەگەڵ کەسوکارو باوک و دایکی فێرخوازەکان کۆبوونەیەکمان ئەنجامدا بۆ ئەوەی خۆیان ئامادە بکەن بۆ ئەو کۆنسێرتە لە مانگی داهاتوو، پاش ئەوە دەستمان کرد بەپرۆڤە کردن لەگەڵ فێرخوازەکان بۆ ئامادە کردنی کاری هونەری بۆ ئەو کۆنسێرتە.





له ڕێکەوتی ٢٠٢٢/٤/٢٧ بە تەنها چووم بۆ هەولێر کە پەیمانگای (گۆتە) ئێوارە خوانێکی ساز کرد بۆ ئەو کەسایەتی و لایەنانەی کە ئەو پەیمانگایە کاری لەگەڵ کردوون لە هەموو عێراق کە نزیکەی سەد کەس دەبوون و منیش وەک نوێنەری هەڵەبجە بەشدار بووم لە هۆتێل (ڕۆتانا) و ئێوارە خوانێکی ناوازە بوو میوانداریەکی جوانیان بۆ میوانەکان ساز کرد، بۆ شەو زۆربەی میوانەکان گەڕانەوە ،بەڵام من لەبەر درەنگی کاتەکەو دووری ڕێگاکە لە هۆتێل ژوورێکی تایبەتیان بۆ گرتم و بۆ سبەی بەیانییەکی گەڕامەوە بۆ سلێمانی .






Goethe-Institut Irak is delighted to invite you to a joint Iftar on Wednesday April 27th, 2022. We are looking forward to meet in the garden of Al-Bustan restaurant / Rotana Hotel, Erbil, to have a pleasant gathering with you. This invitation is addressed to you with a companion.

Kindly notify us by April 10, 2022 at
**huzan.abdullah@goethe.de**
if you can attend the Iftar and include the name of your companion.

We are looking forward to see you!

Best regards



ئازاد . ئەنایس، ئۆتێل ڕۆتانا / هەولێر



ئیتر بڕیاردرا لە بەرواری ٢٠٢٢/٥/٢١ لە باخی گشتی هەڵەبجە ئەو کۆنسێرتە ساز بکرێت و ئێمەش خۆمان ئامادە کرد بۆ پرۆڤە کردن و خەریکی ئامادە کردنی چەند بەرهەمێک بووین بۆ فێرخوازەکان.





لە ڕۆژی ٢٠٢٢/٥/٦ نوێنەری پەیمانگای (گۆتە) کاک (موعتەز) کە کوردی سوریایە سەردانی فێرگەکەمانی کرد بۆ ئەوەی لە نزیکەوە ئاگاداری خۆ ئامادەکردنمان بێت بۆ ئەو کۆنسێرتە، بۆ ئەم مەبەستەش چەند وێنەیەکی چرکاند بۆ ڕێکلام کردن



لە ڕێکەوتی ٢٠٢٢/٥/٢١ کات ژمێر ٨ی شەو کۆنسیرتەکە دەستی پێکرد و کە ئێمە (٤) گۆرانیمان ئامادە کردبوو بەم شێوەی خوارەوە کە هەموو فێرخوازەکان بەشداربوون:

١.ئێمە منالێن جوانین، ئاوازو هۆنراوەی ئازاد سالح

٢.ئێمە ئێمە، ئاوازو هۆنراوەی ئازاد سالح

٣.بەهاران خۆشەن، ئاوازو هۆنراوەی عادل حەسەن

٤.خانمی خانمی، هۆنراوەی فۆلکلۆر، ئاوازی ئازاد سالح

بەم شێوە لە سەر ئەم کۆنسێرتەم نووسی

ئەمشەو لە کەرنەڤاڵیکی کەم وێنەدا کە لە مێژووی کۆن و نوێی هەڵەبجە شەوی وا جوان نەبووە ئەویش بە سەرپەرشتی پەیمانگای (گۆتە)ی ئەڵمانی و فەرەنسی کە چەندین شاندی بیانی هاتبوون چ لە ئەڵمانیا، فەرەنسا و قاهیرە و سەدان کەس لە ناوەوەو دەرەوەی هەڵەبجەوە هاتبوون ببووە شارێکی گەشتیاری شەوێکی پڕ لە ئاهەنگ و گۆرانی و سەماو هەڵپەرکێ کە سێ گروپ بەشدار بوون تێداو یەکەمین بەرهەم بەرهەمی فێرگەکەمان بوو. پاشان گروپی (ڕەزبەر) کە لە سلێمانیەوە هاتبوون و پاشان هونەرمەندی بە توانا (هانی خان) وە

گروپە جوانەکەی کە لە ئۆکرانیا و چین و چەند وڵاتیکی ترەوە هاتبوون زیاتر لە ٢٠٠٠ کەس لە کاتژمێر ٨ تا ١١ ی شەو هەموو ئامادە بوون. دەنگی هانی ئاسمانی هەڵەبجەی هێنا بووە لەرزین کە زیاتر لە ٤٥ خولەک ئاوازی ئەچڕی. ئەمشەو باخی هەڵەبجە ببووە چراخان لە ڕووناکی و سەماو ئاوازی جوان. ئەوە بۆ ئێمە مایەی شانازییە کە ئەم فێرگە بە بەردەوام بوونمان بۆتە هۆی ئەوەی بە هەزاران کەس ئامادەبن. سڵاو بۆ هەموان من پێنج شەوە لە هەڵەبجەم بۆ ئەوەی سەرکەوتووبین.











لە شـەوی ٢٠٢٢/٥/٢٦ سـایتی پەیمانگـای گـۆتە ئەم وێـنەو نوسـینانەی بـڵاو کردەوە دەربارەی ئەم کۆنسێرتە:

شـەممەی پێشـوو، پەیمانگـای گـۆتە لە عێـراق کۆنسـێرتەکانی هەڵەبـجەی ئەنجامدا !

کۆنسـێرتەکانی هەڵەبـجە بە هەمـاهەنگی پەیمانگـای گـۆتە لە عێـراق لەگەڵ بەڕێوبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری و هونەری لەهەڵەبجە کرا .

کۆنسـێرتەکان پێکهـاتبوون لە گروپـی فێـرگەی میـوزیکی شـنروێ، گروپـی ڕەزبەر، ئینجا گروپێکی تایبەت لەگەڵ هـانی بـوون بـەناوی (هـانی و مانـگ) (واتـە کۆنسـتێرتەکەی هـانی نـاوی مانـگ بـوو چونکـە بەشـەو ئەنجامـمانـدا) کە چەنـد پارچەی میوزیکی و گۆرانییان پێشکەش بە ئامادەبووان کرد.

ئـەوەی مایـەی نیگـەرانیم بـوو ئـەوە بـوو کـە بەرپرسـێک لەهەڵەبجـە لـەکاتی کۆنسێرتەکەدا بانگی کردم وتی لەکاتی تەواوبوونی ئاهەنگەکەدا یەکسـەر (هـانی) دەخەنـە سـەیارەکەوە و ڕەوانـەی سـلێمانی ئەکـەنـەوە، چونکـە هەڵەبجـە پڕە لـە ئیتلاعـات، ئیتـر زۆرم پێنـاخۆش بـوو، لـەبری دەستخۆشـی و ئاهـەنگی قەشـەنگ، لۆمەی کردم.







**Last Saturday, Shnrwe Music School, Razber Band and Hani and the Moon performed musical pieces and songs in Halabja!**
**Halabja Concerts was organized by Goethe-Institut Irak in collaboration with Directorate General of Arts and Culture in Halabja.**



## کۆتایی

خوێنەری بەڕێز ئەوەی کە نوسراوە لە بیرەوەری موزیک و ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی کوردستان و عێراق بەگشتی و هەڵەبجە بەتایبەتی، کە لەسەرەتاکانی شەستەکانی سەدەی بیستەمەوە دەستپێدەکات تادەگاتە مانگی پێنجی دووهەزارو بیست و دوو، پشتم بەچەند شتێک بەستووە، یەکەمیان هەندێ لەو بیرەوەرییانە کاتی خۆی یاداشتم کردووە، بەهۆی بارودۆخی سیاسی هەڵەبجە، بەشێک لەو یاداشتانەم فەوتاوە لەگەڵ زۆر شتی تردا، بەشێکی تریشی پشتم بەستووە بەزاکیرەی خۆم، واتە ئەوەندەی بیرم مابێت هەوڵم داوە ئەو رۆژانە بخەمە ناو ئەم کتێبەوە بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە دنیای هونەر بەگشتی و موزیک بەتایبەتییەوە هەبێت، بەشێکی تریشی پەیوەندی بە چاودێریکردن و خوێندنەوەی خۆمەوە هەبووە لەرابردوودا و زانیاریم لەسەر کۆکردۆتەوە، وەک مێژووی تەلەفیزیۆن و رادیۆ و دنیای هونەر و راگەیاندن و کاریگەری لەسەر من، هەوڵم داوە جگە لە بیرەوەری زانیاری بەخوێنەر بگەیەنم.

لەکۆتایی کتێبەکەدا هەستم بەوە کرد بە ئەرکێکی قورس هەستاوم، بەوەی تا رادەیەک توانیومە موزیکی شارێکی گەورەی وەک هەڵەبجە دۆکۆمێنت بکەم، کە من زیاتر لە نیو سەدە تیایدا ژیاوم و ڕۆڵم هەبووە لەپێشخستنی موزیکی کوردی ئەم شارە. بۆ ئەوەی نەوەی کۆن و نوێ بزانن رابردووی ئەم شارە لە سەردەمە جیاوازەکاندا ئاستی هونەر بە گشتی و موزیک بە تایبەتی چۆن بەڕێکراوە و گەنجانی ئەم شارە فەرهاد ئاسا رووبەڕووی ئاستەنگ و لەمپەرەکان بوونەتەوە و تا رادەیەکی باش توانیومانە پێشەنگیش بین. لەم کارەیشمدا دەکرێ ناوی هەندێ کەسم نەبردبێت بێگومان بە ئەنقەست نەبووە و هێندەی بیرەوەری و تەمەن یارمەتی دابم هەوڵم داوە مافی کەسم نەخواردبێت، ئەگەر مافی کەسێک بیرچووبێت خۆشحاڵ دەبم بە نووسین یا بە ئاگادارکردنەوەم پەیوەندیم پێوە بکات تا لە چاپێکی دیکە یا بە نووسینێک مافەکەی بۆ بگێڕمەوە.

لەکۆتاییدا هیوادارم وەک چۆن گوێگران و بینەران لەرابردوو و ئێستادا چێژیان لەبەرهەمەکانی تیپی موزیکی شنروێ وەرگرتووە، بەهەمان شێوە، هەم چێژ هەم سوود لەم کتێبەش وەربگرن.

ئازاد سالح ٦/ ٩/ ٢٠٢٢

## تیپی مۆسیقای هەڵەبجەو چەند سەرنجێک

کەباسی گۆرانی و مۆسیقا ئەکەین لە هەڵەبجەدا ئەبێت بگەڕێینەوە بۆ ساڵانی بەر لە ئێستا، ئەبێ بگەڕێینەوە بۆ ئەو کاتەی کە کوڕو کاڵ و پیاو و ژن لە رۆژانی بەهاراندا هەموو بەرەو گوڵان و چەمی گوڵەبۆزو باخی میرو کانی ماران و کانی شێخ و باسی شمشاڵەکەی مینەو دەنگی خولەی شێلاری بکەین و رەشبەڵەک و کۆڕی شاعیرانی وەک ئەحمەد موختارجاف و تایەر بەگ و گۆران و ع.ع.شەونم و عەلی باپیر ئاغا.. بەڵێ ئەم سروشتە جوانە تێکەڵ بە هەست و نەست و جۆش و خرۆشی خەڵکی ئەم شارە بووە و هەستی بزواندوون و چی لە دڵیاندا هەبووە بە هەڵبەست و گۆرانی دەریان بڕیوە.

ئەوەبوو لە ساڵانی ٥٨-٦١ تیپی نواندن دروستبوو، وەچەندین شانۆگەرییان پێشکەش کرد، یەکێک لەوانە مەم و زین بوو، کە دەرهێنەرەکەی مامۆستا ع.ع.شەونم بوو، پاشان باری ناهەمواری کوردستان ئەو جۆش و خرۆشەی لەناوبرد و شاردییەوە تا ساڵانی حەفتا، ئەوە بوو چەند تیپێکی نواندن پێکهات وە لەگەڵیاندا تیپی مۆسیقای هەڵەبجە دروستبوو، بەهاوکاری چەند لاوێک هەر چەندە هیچ کەس نەبوو یارمەتیان بدات، وە لە ٢٦-٤-١٩٧٣ دا ئەم تیپە پێکهات، وەچەند ئاهەنگێکی ساز کرد لەهەڵەبجەو دەورپشتی (تەوێڵەو خورماڵ و پێنجوێن) وە چەند گۆرانی بێژێک بەشداری لەگەڵ دا کرد وەک عومەری خەزان و سیروان عەلی و ئازاد مەحمود وە لەیادە نەتەوەییەکاندا بەشدارییان ئەکرد وە چەند سروود و گۆرانییەکی تازەیان پێشکەش کرد، چەند ئافرەتێکیش بەشدارییان کرد بە شێوەی کۆرس و گۆرانی بێژ.

پاشان ئەم تیپە لەکارکردن وەستاو ئەندامەکانی پەرەوازە بوون و ئەندامەکانی هەندێکیان ئێستا لە تیپەکانی سلێمانیدا هاوبەشی ئەکەن و ئەوانی تر بەهۆی باری تایبەتەوە دوورن لە شارەکە.

ئەوەبوو ساڵی ١٩٧٦ توانیمان ئاهەنگێکی بچکۆلە بگێڕین بۆ ماوەی دوو رۆژ بە بێ بەرامبەر، وە هەر لەم ساڵەدا هەوڵدرا بۆ ئەوەی بەشێکی کۆمەڵ و هونەر و وێژەی کوردی لقی سلێمانی بکەینەوە بەڵام کەس نەیزانی چی بەسەرهات؟ جا لەبەر ئەم هەیە یارمەتیدانی هونەرمەندان بۆ دروستکردنی ئەم تیپە هەنگاوێکە بۆ پێشخستنی هونەری کوردی، چونکە ئەم ناوچەیە زۆر دەوڵەمەندە بە کەلەپوری نەتەوایەتی کوردییەوە.

ئازاد صالح – ئەندامی تیپی مۆسیقای هەڵەبجە - مانگی ١٠ی ١٩٧٧



تیپی مۆسیقای هەڵەبجەو چەند سەرنجێک !

کە باسی گۆرانیو مۆسیقا ئەکەین لە هەڵەبجەدا ئەبێت بگەڕێینەوە بۆ ساڵانی بەر لەئێستا ... ئەبێت بگەڕێینەوە بۆ ئەو کاتەی کە کوڕوکاڵو پیاو وژن لە رۆژانی بەهاراندا هەموو بەرەو گوڵانو چەمی گوڵەبۆزو باخی میرو کانیمارانو کانی شێخو باسی شەمشاڵەکەی مینەو دەنگی خولەی شێلاری بکەینو رەشبەڵەکو کوڕی شاعیرانی وەك ئەحمەد موختار جافو تایەر بەگو گۆران ع. ع. شەونمو عەلی باپیر ئاغا .. بەڵێ ئەم سروشتە جوانە تێکەڵاو بەهەستو نەستو جۆشو خرۆشی خەڵکی ئەم شارە بووەو هەستی بزواندنو چی لە دڵیاندا بووە بە هەڵبەستو گۆرانی دەریان بڕیوە .

ئەوە بوو لە ساڵانی ٥٨ ـ ٦١ تیپێکی نواندن دروست بوو وە چەند شانۆگەرییەکیان پێشکەش کرد یەکێك لەوانە مەموزین بوو کە دەرهێنەرەکەی مامۆستا ع. ع. شەونم بوو . پاشان باری نا هەمواری کوردستان ئەوجۆشو خرۆشەی لەناو بردو شاردیەوە تا ساڵانی حەفتا ئەوەبوو چەند تیپێکی نواندن پێك هاتوە لە گەڵیاندا تیپی مۆسیقای هەڵەبجە دروست بوو بە هاوکاری چەند لاوێك هەر چەندە هیچ کەس نەبوو یارمەتی بدات وە لە ٢٦ـ٤ـ١٩٧٣ دا ئەم تیپە پێك هات .. وە چەند ئاهەنگێکی سازکرد لە هەڵەبجەو دەوروپشتی (تەوێڵەو خورماڵو پنجوێنو) وە چەند گۆرانی بێژێك بەشداری لەگەڵدا کرد وەك عومەری خەزانو سیروان عەلیو ئازاد مەحمود وە لە یادە نەتەوایەتیەکاندا بەشداریان ئەکرد وەچەند سروودو گۆرانیەکی تازەیان پێشکەشکرد .. چەند ئافرەتێکیش بەشداریان کرد بەشێوەی کورسو گۆرانی بێژ .

پاشان ئەم تیپە لە کارکردن وەستاو ئەندامەکانی پەرەوازە بوونو ئەندامەکانی هەندێکیان ئێستا لەتیپەکانی سلێمانیدا هاوبەشی ئەکەنو ئەوانی تر بەهۆی باری تایبەتیەوە دوورن لەشارەکە .

ئەوەبوو لەساڵی ١٩٧٦دا توانیمان ئاهەنگێکی بچکۆلە بگێڕین بۆماوەی دوو رۆژ بەخۆڕایی وەهەرلەم ساڵەدا هەوڵدرا بۆ ئەوەی بەشێکی کۆمەڵی هونەرو وێژەی کوردی لقی سلێمانی بکەینەوە بەڵام کەس نەیزانی چی بەسەر هات ؟

جا لەبەر ئەم هۆیە یارمەتی دانی هونەرمەندان بۆ دروستکردنی ئەم تیپە هەنگاوێکە بۆ پێشخستنی هونەری کوردی چونکە ئەم ناوچەیە زۆر دەوڵەمەندە بەکەلەپوری نەتەوایەتی کوردیەوە .

ئازاد حمە صالح
ئەندامی تیپی مۆسیقای هەڵەبجە

رۆژنامەی هاوکاری

## مینەو شمشاڵەی

هونەرمەندێکی میللی لێهاتوو کە گوێت لەدەنگی شمشاڵەکەی ئەبێ، دەروێش عەبدوڵای پاڵەوانی تۆمارە هەرە نەمرەکەی (گۆران)ت بیرئەخاتەوە، خاڵە مینەو شمشاڵەکەی، خاڵە مینەو خۆشەویستی ئاوازو هونەری وجوان، ئاوازی کوردی رەسەن...

چاوم پێی کەوت قسەم لەگەڵ کردو بۆم دوا، بە شمشاڵەکەی ئاوازی خۆشی دا بەگوێما..

ئەم هونەرمەندە میللییە، خاڵە مینەیە کە رۆژگارێکی زۆرە سەرگەرمی ئەم کارە پیرۆزەیە و هەزاران کۆڕی شاعیران و ئەدیبانی کوردی وەک ئەحمەد موختارو تایەربەگی گەرم کردووە، هەروەک خۆی وتی ئاهەنگ نەبووە بەشداریم تیا نەکردبێت، هونەرمەند نەمامی باخی ژیانی بەرەوسیس بوون نزیک بووەتەوە، پیری دەستەویەخەی وەستاوەو چنگی لەگەرووی لاوی گیر کردووە.

لەسەر بەردێک کزۆڵەی کرد و کۆچانەکەی کە تاکە هاوڕێیەتی لە تەنیشت خۆیەوە دایناوە، لەپاش کەمێک حەسانەوە حەزم کرد ئەو خۆی بەهەمووان بناسێنێ؟

هەناسەیەکی هەڵکێشاو وەک یادرگارێکی کۆنی بەبیردا هاتبێتەوە وتی ناوم حەمە ئەمین کوڕی عەبدولکەریمە لەبیاوێڵە نزیک هەڵەبجە لەدایک بووم.

بەڵام کە پرسیارم لێکرد دەربارەی ساڵی لەدایک بوونی وەک زۆر لە پیرانی کورد ساڵەکەی نەزانی، بەڵام تەنها شتێک کە لەبیری بوو سەفەربەرلک بوو.

هەروەکو خۆی وتی تەمەنی نزیکەی حەفتاو هەشت ساڵ ئەبێت، وەک هەموو منداڵێکی تری کورد سەرەتای ژیانی بەشوانی و بەرگەوانی بەسەربردووە لەدەوروبەری بیاوێڵە لەبەر ئەوە بەناچاری پەنایان ئەبردە بەر هەندێ کار بۆ رۆژگار بردنەسەر.

هونەرمەند وتی پیاوێکم لەگەڵ بوو، ناوی حەمە ئەمین بوو، شمشاڵی زۆر جوان ئەزانی، هەموو کاتێ خۆمم لێوە نزیک ئەکردەوە و سەرنجم ئەداو تەنها ئاواتم ئەوەبوو کە رۆژێک بێت منیش بتوانم وەکو ئەو شمشاڵ لێ بدەم.

لەبەر ئەوە لە قامیش شمشاڵێکم دروست کرد، کەوتمە فوپیاکردنی بەڵام

پچڕپچڕ بـەردەوام بـووم، ئـارەزووم بـۆ شمشـاڵ زۆربـوو، ئینجـا وردە وردە گۆرانییەکانی نیشان ئەدام و منیش بەدوای ئەودا لێم ئەدا.

ئەوەی شایانی باسە هونەرمەند بۆ هەر کونێک لە کونـەکانی شمشـاڵەکەی کـە بریتیە لە شەش کون، ناوێکی تایبەتی بۆ داناوە بەم شێوەیە:

١ـ فەتاح پاشایی ٢ـ ئەحمەد بەگی ٣ـ هەوارە لانکێ ٤ـ کەتان لەمل ٥ـ قلیجی ٦ـ مەملی مەمانە مەمۆ. وە ئەوەش بەپێی دەنگەکانی مۆسیقا کـە ئێسـتا بـۆی دانـراوە (دۆ، ڕێ ، مـی، فـا، صـوڵ، لا، سـی) ئەگرێتـەوە. زۆربـەی ئـەم ئاوازانـە گـۆرانی فۆلکلۆرین بۆ ئەوەی شارەزای کونەکان بێت و لەیەکیان جیابکاتەوە.

لەگـەڵ حەسـەن زیـرەک لـە ئاهەنگێکدا لـە هەڵەبجـە بەشـداری کـردووە، بـەڵام زۆربەی ژیانی لـەماڵی ئەحمـەد موختـار جافدا بەسـەربردووە وە شمشـاڵ ژەنـی بووە، هەر لەبەرئەوە بووە مەقامێکی بەناوی ئەحمەد بەگەوە داناوە، کاتێ ئەحمەد بەگ کوژرا، ئەمیش توشی گەلێ سزاو ئاوارەیی بووە، ماوەی دوو ساڵ لـە ئێـران گیراوە بەهۆی بەشداربوونی لەگەڵ ئەحمەد موختار جافدا.

لەبـەر ئـەوە خـاوەنی هونـەرێکی بـەرزە، زۆر لای خـەڵک خۆشەویسـتە، وە تائێسـتاش خـەڵک زۆر پێخۆشـحاڵن ئەگـەر لـەلایان دانیشـێت، وەکـاتێ پرسـیارم لێکرد دەربـارەی گـۆرانی بێژانـی کـورد زۆر بـەڕێزەوە سـەیری مامۆسـتا عـەلی مەردانی ئەکرد، گۆرانی هەورامیشی بەدڵە.

وە بۆ ئەوەی ئەو هونەرە بەرزەمان لەدەست نـەچێت بـەهیوام کاربەدەسـتان ئاوڕێـک لەکەسـانی وەک ئـەم هونەرمەنـدە میللییـە بدەنـەوەو بـە پێـی توانـا بەدەنگییـەوە بچـن، هونەرمەنـدەکانی مۆسـیقای سـلێمانیش بـانگکراون ئـاوازی ڕەسـەنی کـوردی لـەم کـابرا هونەرمەنـدە گەورەیـە وەربگـرن و بیژێننـەوەو چاویشیان لەخاڵە مینە مرۆڤ بێت.

تێبینـی/ ئـەم چاوپێکەوتنـە لـە ڕۆژنامـەی هاوکـاری لـە ١٢/١/ ی سـاڵی ١٩٧٧ بڵاوکراوەتەوە، کە لە ئامادەکردنی هێرش محەمەد ئەمین بوو، ئەوی ڕاستی بێت من وەک ئازاد صالح لەگەڵ کـاک هێرش ئـەم چاوپێکەوتنـەمان ئامـادەکردووە لـە هەڵەبجە، بەڵام دەبوو بەناوی کاک هێرشەوە بڵاوبکرێتـەوە، چونکـە ئـەوکات ئـەو پەیامنێری ڕۆژنامەی هاوکاری بوو.

هونەرمەندە موسیقیەکانمان بانگکراون بۆ ناسینی موسیقای کوردی رەسەن :

# مینەو شمشاڵەکەی

هونەرمەندێکی میللـــــی لێهاتوە ، کـە گوێت لەدەنگی شمشاڵەکەی ئەبێ . (دەرویش عبداللە )ی پاڵەوانی تۆمـــارە هەرە نەمرەکەی « گوران »ت ئەخاتەوە بیر ، خالە مینـــەو شمشاڵەکەی خالـــــمینەوخۆشەویستیەو ئاوازو هونەری جـــــوان ، ئاوازی کوردی رەسەن ··

چاوم پێی کەوت ·· قسەم لەگەڵکـــــردو بۆم دوا ·· بەشمشاڵەکەی ئاوازی خۆشی دابەگوێما ···

ئەم هونەرمەندە میللیە ·· خالەمینەیە کـــــە رۆژگارێکی زۆرە سەرگەرمی ئـــــەم کارە بیرۆزەیەو هەزاران گـــــۆرانی شاعیرانو ئەدیبـــــانی کوردی وەك ئەحمەد موختارو تایـــــەر بەگی گەرم کردوە ·· هەروەك خـــــۆی وتی ئاهەنگ نەبوە بەشداریم تیا نەکرد بێـت · هونەرمەند تەمامی باخی ژیانی بەرەو سیس بوون نزیـــــك بوەتەوە ، پیری دەستەویەخەی وەستاوەو چنگی لـــــە گەرووی لاوی گیر کردوە ·

لەسەر بەردێك کزۆلـــەی کردو کۆچانەکەی کە ئاکـــــە

هاورێیەتی لە تەنیشت خۆیەوە دایناوە . لەپاش کـــــەمێ حەسانەوە · حەزم کرد ئـەو خۆی بەهەموان بناسێنێ ؟

هەناسەیەکی هەلکێشـــــاو وەك یادگارێکی کۆنی بەبیردا هاتبێتەوە وتی ناوم حەمەئەمین کوڕی عەبدول کەریمە لـــــە دێی بیاوێلە نزیك هەڵەبجە لە دایك بووم ·

بەلام کە پرسیارم لێکـــــرد دەربارەی ساڵی لەدایك بوونی وەکو زۆر لە پیرانی کـــــورد ساڵەکەی نەزانی بەلام تەنها شتێك کە لەبیری بوسەفەر بەڵك بوو ·

هەروەکو خۆی وتی تەمەنی نزیکەی ۷۸ ساڵ ئەبێت وەك هەموو مندالێکی تری کـــــورد

سەرەتای ژیـــــانی بەشوانیو بەرگەلەوانی بەسەربردوە لە دەوری بیـــــاوێلە لەبەر ئەوە ناچار پەنایان ئەبردە بـــــەر هەنـــــدێ کار بۆ رۆژگار بردنەسەر ·

هونەرمەند وتی : پیاوێکم لەگەڵدا بو ناوی حەمە ئەمین بوو شمشاڵی زۆر جوان ئەژانی هەمووکاتێ خۆمم لێوە نزیـك ئەکردەوەو ســـــەرنجم ئەداو تەنها ئاواتم ئەوەبوو کـــــە رۆژێك بێت منیش بتـــــوانم وەکو ئەو شمشاڵ لێبدەم ·

لـــــەبەر ئەوە لەقامیش شمشاڵێکم دروستکـــــردو کەوتمـــــە فووبیاکردنی بەلام بچـر بچرو بەردەوام بوونمو ئارەزووم لەشمشاڵ خێرا فێر بووم · ئینجـــا وردە وردە گۆرانیەکانی نیشان ئەداو منیش بەدوای ئەودا لێم ئەدا ·

ئەوەی شایەنی باســـــە هونەرمەند بۆ هەرکونێك لـــە کونەکانی شمشاڵەکەی کـــــە بریتیە لەشەش کـون ناوێکی تایبەتی بۆ داناوە بـــــەم شێوەیە : ۱ ــ فەتاح پاشایی · ۲ ــ ئەحمـــــەد بەگی · ۳ ــ هەوارەلانکێ · ٤ ــ کەتان لسەل · ٥ ــ قلیچی ٦ ــ مەملی مەمانە مەمۆ · وەئەوەش بەپێی

دەنگەکانی مۆسیقایە کـــــە ئێستا بۆی دانراوە ( دۆ . رێ . می . فا . صول . لا . سی ) ئەگرێتەوە · زۆر بەی ئـــەم ئاوانە گۆرانی فۆلکلۆرین بـۆ ئەوەی شـــــارەزای کونەکان بێتو لە یەکیان جیا بکاتەوە ·

لە گەل حەسەن زیرەك لـە ئاهەنگێکدا لـــــە هەڵەبجە بەشداری کردوە . بەلام زۆربەی

ژیانی لەماڵی ئەحمەد موختار جافدا بەسەر بردوە وەشمشاڵی ژەنی بووە . هەر لەبەر ئــەوە بووە مەقامێکی بەناوی ئەحمەد بەگەوە داناوە . کاتێ ئەحمەد بەگ کۆژرا ئەمیش تووشــی کـــەلێ سزاو ئاوارەیی بووە ماوەی دوو ســـــال لەئێران گیراوە بەهۆی بەشدار بوونی لەگەل ئەحمەد موختاردا ·

لەبـــــەر ئەوەی خاوەنی هونەرێکی بەرزە زۆر لای خەلك خۆشەویستە وە تـا ئێستاش خەلك زۆر پێخۆشحالن ئەگەر لەلایـــان دانیشێت · وەکاتێ پرسیارم لێکـــــرد دەربارەی گۆرانی بێژانی کـــــورد زۆر بەرێزەوە سەیری مامۆســـتا عەلی مەردانی ئەکردو گۆرانی هەورامیشی بە دلە ·

وە بۆ ئەوەی ئەو هونـــــەرە بەرزەمان لەدەست نەچێـــت بەهیوام کاربەدەستان ئاوڕێك لەکەسانی وەك ئەم هونەرمەندە میللیە بدەنەوەو بەپێی توانـا بەدەنگیەوە بچنو هونەرمەندەـ کانی موســـیقای سلیمانیش بانگکراون ئاوازی رەســـەنی کوردی لەم کابرا هونەرمەنـدە کەورەیە وەربگـــــرنو ·· بیژێننەوەو ·· چاویشیان لەخالەمینەی مرۆڤ بێ ·

ئامادەکردنی هێرش محمد امین

# « بـیـاف » ی گـۆرانـیـبـێـژ

لـــە ساڵی ۱۹٦۳دا مۆمی ژیـــــانی ئافرەتێك کوژایەوە سەرنجی جیهانی راکێشابور ، بایەخێکی زۆریشی پێ ئەدراو ئێستاش هـــــەر ئەو بایەخ پێدانەی پتر دەبێت · لـــــە دەروونی فەرەنســـــاییەکانو خەلقانی تری چوار گۆشـــــەی جیهاندا دەنگ ئەداتەوە ·

ئـــەو ئافرەتەش ( ئیدیت بیاف )ی گۆرانیبێژە کـــــە هێشتا هەر لـــە دالو دەروونی گوێگراندا دەژیت ، لـــــەم دواییەداوبەبۆنەی تێپەربوونی چواردە ساڵ بە سەر کـــۆچ کردنیدا ، لـــــە شاری پاریس پیشانگایەکی تایبەتی لـــــە ســـەر کرایەوە · مۆزەخانەـ کەشی بـــە ناوی ( مۆزەخانەی بیاف )ەوە دەرگـــــای خرایە سەرپشت ( دینیـــس کاســـــیۆن )ی خۆشکیشی کتێبێکی لە سەر بلاو کردەوە لـــــە کاتێکدا تەلەفزیۆنی فەرەنسا پرۆگرامێکی درێژی لە ســـــەر بیاف بە بۆنەی یادی کۆچ کردنیەوە پیشاندا ؛

زۆر کەس هەن ( بیاف )یان نە دیتوەو نەیان ناسیوە ئەوە نەبێت دەنگەجوانو نایابەکەی دەبیســـــنو گـــــوێی لێ دەگرن لەگـــــەل ئەوەشدا رۆژ نییە چـــــەپکە گول نەخەنە سەر گۆرەکەی لە گۆرستانی ( بیر ــ لاشیز ) ·

( جۆن کۆکتۆ )ی هاورێی دلسوزی ، دەربارەی دەلێت :

( وەك بلێیت ئەوە خاتوو بیاف نییە گۆرانی دەلێت : بەلکوو بارانەوەدا دەبارێت ·· بایەو هاژەی دێت ·· تیشکی مانگەو بال ئەدات بەیەکدا ··)

« شـیـعری نوێو تاقی کردنـــەوە »

یەکێتیی نووسەرانی کورد ــ لقی هەولێر ، لە سەعات چواری ئێوارەی رۆژی پێنج شـــــەممەی رێکەوتی ۱٥ــ۱۲ــ۱۹۷۷دا ، کۆرێکی ئەدەبی ، لـــە هۆل لاوانی هەولێر لەگەرەکی سێتاقان ساز دەکاتو شاعیری لاو عەبدوللا عەبباس بانگ دەکات بـــــۆ پێشکەش کردنی لێکۆلینەوەیێکی ئەدەبی فراوان بەم ناونیشانەی سەرەوە هەموو رۆشنبیرو ئەدب دۆستێك بانگ کراون بۆ ئامادە بوون لەو کۆرەدا ·

دەستەی بەرێوەبەری
یەکێتیی نووسەرانی کورد ــ لقی هەولێر

هەوالێکی زانستی

## چاری نەخۆشی درەخت

لە ژاپۆن رێگایەکی زانستی دۆزراوەتەوە بـــۆ چاری نەخۆشی داری سنەوبەر ئەویش بە گەیاندنی شەپۆلی کارەبای موگناتیسیەوە کە کرمی ناو دارەکە ئەکوژێو ئاپەلی ئەو کرمانە دارەکە لەناوبەرن ·

ئەم رێگایە دوای ئەوە دۆزراوەتەوە کە کـــرم داویەتیە هەندێ داری سنەوبەر وە داری سنەوبەریش کەرسەیەکی بنەرەتـی دروست کردنی خانوە لـــــە ژاپۆن ·

مرواریەلا لەشـــــیعری کلاسیکیماندا

ئەو گولانەی دەشتو کێوانەبەرەو سامانی دل ·

● چاپکراوی نوێ ●

● پورە فەرەنگیز : تـــۆ ئەشیەکەی ـــن بریـــس ، مینەکەی حۆت بدە بە نیـــوە

دەرچووە · چی نووسراوە دەربـــارەی کورد ؟

## کۆچی دوایی خاڵە مینە. مانگی ٢ی ساڵی ١٩٧٨

هونەرمەندی میللی لێهاتوو، کە گوێت لەدەنگی شمشاڵەی ئەبێ و دەروێش عەبدوڵای پاڵەوانی هەڵبەستە هەرە نەمرەکەی (گۆران)ت بیر ئەکەوێتەوە، (خاڵە مینە) و شمشاڵەکەی، خاڵە مینە خۆشەویستییە و ئاواز و هونەری جوان، ئاوازی کوردی رەسەن.

کە کاک (هێرش محەمەد ئەمین) نوسراوەکەی دەربارەی (خاڵە مینە)ی بۆ هێنام و بۆی باسکردم، چ هونەرمەندێکی مەزنە، ئەو چەند دێڕەی سەرەوەم کردە پێشەکی نوسراوەکەی کاک هێرش و لە هاوکاری ژمارە (٤٠١) بڵاوکرایەوە، ئەوەشم لەبیر نەچوو، کە لەسەرەوە ناونیشانەکە بنوسم (هونەرمەندە مۆسیقییەکان بانگکراون بۆ ناسینی مۆسیقای کوردی رەسەن: مینەو شمسالەکەی)

ئێوارەی ١٩٧٨/٢/٧ زەنگی تەلەفۆن لێیدا، هونەر دۆستێ لە سلێمانییەوە ئەم هەواڵەی گەیاند (ئەو هونەرمەندە میللییەی لە ژمارەی رۆژی ١٩٧٧/١٢/١ دا بە خوێنەرانی کوردستانتان ناساند، شەوی ٣/٤ی/ ١٩٧٨ کۆچی دوایی کرد)

خاڵە مینەی شمشاڵ ژەن کۆچی دوایی کرد، نەمناسیەوە، نەمبینیوە، دوای نوسینەکەی (هاوکاری) بەڕێکەوت لای دۆستێک بەهونەری مۆسیقای میللی گوێم لە شمشاڵەکەی بوو، زۆرم پێخۆش بوو، ئەو پێشەکییەم پڕ بە پڕی هونەرەکەی خاڵە مینەبوو، ئەگەر کەمتریش نەبووبێ...

شمشاڵەکەی خاڵە مینە خۆشەویستیەو ئاوازو هونەری جوان..

ئیدی خاڵە مینە کۆچی دوایی کردو شمشاڵەکەی کەوتە لاوە، خاڵە مینە کە تۆ ئێستا لەپارچەیەک زەوی دەشتی شارەزوور راکشاوی و نامەوێ گلەیی لە هونەرمەندە مۆسیقازانەکانمان بکەم ، بەڵکو دوای (هاوکاری) ژمارە (٤٠١) هاتینە لات و دوای ئەم کۆچە بێ وادەیەشت لەیادت نەکەن.

بەهرە

تێبینی / بەهرە، ناوی خوازراوی عەبدوڵا عەباس بوو.

## هەرچارەی نووسینێك

# کۆچی دوایی خاڵە مینە

● ( هونەرمەندێکی میللی لێهاتوە ، کە گوێت لە دەنگی شمشاڵەکەی ئەبێ « دەروێش عبداللە »ی پاڵەوانی هەڵبەستە هەرە نەمرەکەی « گۆران »ت بیر ئەکەوێتەوە، « خاڵەمینە »و شمشاڵەکەی « خاڵەمینە » خۆشەویستیەو ئاوازو هونەری جوان ، ئاوازی کوردی رەسەن ) .

● کە کاك « هێرش محمد أمین » نوسراوەکەی دەربارەی « خاڵەمینە »ی بۆ هێنام‌و بۆی باسکردم ، چ هونەرمەندێکی مەزنە ، ئەو چەند دێڕەی سەرەوەم کردە پێشەکی نوسراوەکەی کاك « هێرش » و لە « هاوکاری » ژمارە (٤٠١)دا بلاوکرایەوە ، ئەوەشم لەبیرنەچوو ، کە لە سەرەوە ناونیشانەکە بنوسم ( هونەرمەندە مۆسیقیەکان بانگکراون بۆ ناسینی مۆسیقای کوردی رەسەن : مینەو شمشاڵەکەی ) ..

● ئێوارەی ٧ـ٢ـ١٩٧٨ زەنگی تەلەفۆن لێیدا ، هونەر دۆستێ لە سلێمانیەوە ئەم هەواڵەی گەیاند ( ئەو هونەرمەندە میللی‌یەی لە ژمارەی رۆژی ٨ـ١٢ـ١٩٧٧دا یە خوێنەرانی کوردستانتان ناساند .. شەوی ٣ـ٤ی ـ٢ـ١٩٧٨ .. کۆچی دواییکرد ) ...

● « خاڵە مینە »ی شمشاڵ ژەن .. کۆچی دوا دوایی‌کرد .. نەمناسیەوە ..



نەمبینیوە .. دوای نوسینەکەی « هاوکاری » بە رێکەوت .. لای دۆستێك بە هونەری مۆسیقای میللی گوێم لە شمشالەکەی‌بوو ... زۆرم پێ خۆش‌بوو .. ئەو پێشەکیەم ... پڕ بەپڕی هونەرەکەی ... خاڵە مینەبوو .. ئەگەر .. کەمتریش نەبوبێ ...

شمشالەکەی خالە مینە .. خۆشەویستیەو ئاوازو هونەری جوان ..

وە.. وا .. خالە مینە .. کۆچی دوایی‌کرد .. شمشمالەکەی کەوتە لاوە .. « خاڵە مینە » کە تۆ ئێستا لە پارچەیەك زەوی دەشتی شارەزور راکشاوی‌و نامەوێ گلەیی بکەم لە هونەرمەندە مۆسیقازانەکانمان بەڵکو ... دوای « هاوکاری » ژمارە (٤٠١) هاتبنە لاتو دوای ئەم کۆچە بێ وادەیەشت ... لەیادت نەکەن ..

**بەهرە**

## ئاهەنگێکی هونەری لە هەڵەبجە

ڕۆژی یەکشەمە ڕێکەوتی ١٩٨٣/٢/٦ تیپی مۆسیقای شنرویَ و تیپی نواندنی هەڵەبجە ئاهەنگێکیان سازکرد لە هۆڵی سینەمای هەڵەبجە بۆ ماوەی شەش ڕۆژ، لەم ئاهەنگەدا چەند گۆرانییەک پێشکەش کراو گۆرانی بێژی میللی (محەمەد ئیبراهیم عەبدول) گەرمکەری ئاهەنگەکە بوو، هەروەها گۆرانی بێژی ناوچەی هەورامان عوسمان گەچێنەیی بەچەند گۆرانییەک ئاهەنگەکەی ڕازاندەوە و هونەرمەندان چەند گۆرانییەکیان پێشکەش کرد.

دوابەدوای ئەمان تیپی نواندنی هەڵەبجە شانۆگەری (کێشە)یان پێشکەش کرد لەنوسینی سەلاح حاجی عەلی و دەرهێنانی بۆ سەر شانۆ : کامەران ئەحمەد بوو.

تێبینی / ئەم هەواڵە هونەرییە لەلایەن ئەحمەد عەبدولڕەحمان ئامادەکراوەو لە ١٩٨٣/٣/٣ لەرۆژنامەی هاوکاری بڵاوکراوەتەوە.

ئاهەنگێکی هونەری لە هەڵەبجە

ڕۆژی یەکشەممە ڕێکەوتی ٦-٢-١٩٨٣ تیپی مۆسیقای شنرویَو تیپی نواندی هەڵەبجە ئاهەنگێکیان سازکرد لە هۆلی سینمای هەڵەبجە بۆ ماوەی شەش رۆژ ، لەم ئاهەنگەدا چەند گۆرانیەك پێشکەش کراو گۆرانی بێژی میللی محمد ابراهیم عبدول گەرم کەری ئاهەنگەکە بوو ، هەروەها گۆرانی بێژی ناوچەی هەورامان عوسمان گەچێنەیی بە چەند گۆرانیەك ئاهەنگەکەی رازاندەوەو هونەرمەندان چەند گۆرانیەکیان پێشکەش کرد .

دوا بەدوای ئەمان تیپی نواندی هەڵەبجە شانۆگەری ( کێشە )یان پێشکەش کرد لە نووسینی صلاح حاجی عەلی و دەرهێنانی بۆ سەرشانۆ کامران احمد بوو.

احمد عبدالرحمن

شارستانیەتی مرۆڤایەتی بەهەوڵ و کۆششی میللەتان بونیاد نراوە، هەر نەتەوەیەک بەپێی گونجاندنی باری ئابوری و رامیاری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی خۆی بەشداری تێدا کردووە.

لەبواری ئەدەب و هونەریشدا کە سەرخانی ژێرخانە ئابوورییەکەیەتی، بیری مرۆڤایەتی ئاوێزانی یەکدی بووە بۆ داهێنانی ئەدەب و هونەری جیهانی.

هەر نەتەوەیەک بەپێی رۆڵی مێژوویی خۆی، یۆنانییەکان رۆڵێکی گرنگیان دیوە بۆ پێشکەوتنی زانست، فەلسەفە، مەنتیق، مۆسیقا، شانۆ... هتد، بەهەمان شێوە بابلییەکان لەداهێنانی نوسی، فیرعەونەکان لە ئەهرامەکان، ئاشوورییەکان، ساسانییەکان، پاشانیش شارستانیەتی ئیسلامی.

تەنانەت تێکەڵبوونی ئەو شارستانیەتە لەبواری هونەری مۆسیقا و گۆرانییدا بووە هۆی داهێنانی نوسینی نۆتەی مۆسیقا، هەروەها داهێنانی چەندەها ئامێری مۆسیقا وەک (قانون، ساز، عود، رەباب، گیتار، هارب) پاشانیش بەهۆی بەشداری کردنی کەنیسە. ئەوروپا لەمۆسیقدا چەندەها ئامێری دی وەک ئۆرگۆن، پیانۆ وە چەندەها ئامێری ژێداری دی هاتە کایەوە.

دەتوانین بڵێین وابەستەیی کورد بەشارشتانیەتی رۆژهەڵاتەوەو پاپەندبوونی بەئاینی زەردەشتەوە رۆڵێکی گرنگی هەبووە لەبەرەوپێشچوونی هونەرکەیدا، هەربوونی مۆسیقاو گۆرانی لە ئاتەشکاکاندا تا دەگاتە بواری کارکردن و بۆنە کۆمەڵایەتییەکانی دی، تەنانەت هاوسێ بوونی کورد لەگەڵ (فارس، تورک، عەرەب) بەشێوەیەکی ئاشکراو دیار کاری کردۆتە سەر هونەرەکەی، تەنانەت لەبەکارهێنانی ئامێرە مۆسیقییەکانی وەک (سەنتور، ساز، عود، قانون)و ئاوێتەبوونیان لەگەڵ ئامێرە مۆسیقا کوردییەکان وەک (باڵەبان، شمشاڵ) بەڵکو بوونی کورد بەنەتەوەی ژێردەست هونەرەکەشی پەرتکراوە و فەرهەنگی کوردی وابەستەی هونەری (فارس، عەرەب، تورک) بووە، بەڵکو سامانێکی هونەری

لەدەستدا، بەوەی کە میللەتانی سەردەست خۆیانیان کرد بەخاوەنی هونەرەکەیی و بە سامانی میللی خۆیانیان دانا، بەڵام لەگەڵ ئەم بارە ناهەموارەداو بەدرێژایی مێژوو لەم لاو لەولا مرۆڤی کورد هەوڵیداوە شان بەشانی خەباتی شۆڕشگێڕی هونەرەکەی بپارێزێت و لەناو نەچێت، ئەویش بەهۆی چەند کەسانێکەوە چ لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان یان باشور یان باکور.

بۆیە پێویستە بۆ مێژوو هەوڵ و کۆششی ئەو سەربازە نادیارانە لەیاد نەکەین و لەمێژووی هونەری کوردیدا تۆماریان بکەین، چونکە ڕۆڵێکی گرنگیان دیوە بۆ پەرەپێدانی هونەری گۆرانی کوردی.

یەکێک لەو گروپانە خێزانی (کامکار)ە، کە ساڵانێکی دوور و درێژە ئەسپی خۆیان لەم بوارەدا تاوداوە، تا ئێستاش بەردەوام کاری هونەری دەکەن.

ئەو کەسەی ئەم خێزانەی فێری خۆشەویستی مۆسیقا کردووە، باوکی ئەم خێزانەیە کە هەشت کوڕ و کچێکی عاشقی مۆسیقا کردووە، ئەم هونەرمەندەش مامۆستا (حەسەنی کامکار)ە.

بەڵێ مۆسیقا هێندە هونەرێکی شایستەو والایە کە پاپەندی هیچ توێژو چینێک نییە بەتایبەتی خۆی بزانێت، بەڵکو کەسانێک کە خولیایەکی خۆڕسک و بەهرەیان تێدایە دەتوانن لەو دەریا بێ بنەدا مەلەوانی بکەن، کوردستانی ڕەنگینیش بەدیمەنی جوانی ـ ژیانی ساکاری کۆمەڵایەتی ـ فۆلکلۆری پڕ باری (١) لەگۆرانی و مۆسیقا کە نەوەکان سینە بەسینە دەماودەم یەک لە دوای یەک بەجێیان هێشتووە.

حەسەنی کامکار لەساڵی ١٣٠٢ ک ــ ش ، بەرامبەر ١٩٢٣ز لەشاری سنە لەدایک بووە، هەر لەمناڵییەوە خولیای مۆسیقا بووە، بەجۆرێک کە زۆربەی ئاواز و گۆرانییەکانی لەبەرکردووە، خۆی دەڵێ: (یەکەمین پردی پەیوەندی نێوان ئەم و هونەری مۆسیقا بەهۆی (سەتار) ژەنێکی نابیناوە بووە بەناوی (عەلی خان) کە کاکی کامکار دەڵێت (بەماندووبوون و گیروگرفتێکی زۆرەوە چەند پولێکم کۆکردەوە ئامێرێکی (تار) لەعەلی خان کڕی، بەنهێنی خۆم رادەهێنا هەرچەندە چەند جارێک باوکم و کەسانی تری خێزانەکەم لەدوور و نزیک سەریان دەشکاندم لەبەر ئەوە نەبوو کە من ئەو سازەم پەیدا کردبوو، بەڵکو دەیانویست کە خۆم بەکاری ترەوە خەریک بکەم) بەڵام پاش تەمەنی ١٢ساڵی، بوارێکی

چاوەڕوان نەکراو بەهانایەوە دێت و لە خوێندنگەی سەربازی دادەمەزرێت، ئەویش کە تەنها جێگایەک بووە لەچاو سوورکردنەوەی باوکی دەربازی دەبێت و ئەو سۆز و خۆشەویستییەی بۆ مۆسیقا هەیبوو بێتەدی و پاشانیش بەو خۆشەویستییە بۆ مۆسیقا منداڵەکانی پەروەردە بکات.

حەسەنی کامکار بێجگە لە ئامێری تار کە خۆی فێری بووبوو، لەدەستەی مۆسیقای سوپا لەگەڵ چەندەها ئامێری (بادی) ئاشنایی پەیداکردووە، پاش پانزە ساڵی رووی کردۆتە ئامێری وایلۆن(کەمان) و شارەزایی تێدا پەیداکرد.

کامکار لەم کاتەدا بەدواوە رووی کردە کۆکردنەوەو نوسینەوەی جۆرەها گۆرانی فۆلکلۆری کوردی کە پتر لە ٤٠٠ گۆرانی کۆکردەوە ئەو کاتانەی کە کەم کەس بیریان لەم کارە دەکردەوە. وە بەماندووبوونی شەوانە و رۆژانی توانی چەند خولێکی فێربوون بکاتەوە، پاشان بوو بە پەیمانگای هونەری لەشاری سنەو توانی چەندەها مۆسیقاژەن پێبگەیەنێت، لەوانە هەشت کوڕو کچێکی، هەروەها زۆربەی هونەرمەندانی کوردستان، بۆیە زۆربەی کوڕەکانی رۆڵێکی گرنگیان دیوە لە پێکهێنانی گروپی کامکار کە کوڕەکانی ئەمانەن:

١ـ هۆشەنگ کامکار: هۆشەنگ لە ساڵی ١٩٤٦ لەشاری سنە هاتۆتە دنیاوە، هەر لەمناڵییەوە لای باوکی دەستی کردووە بە خوێندنی ئامێری سەنتور، پاشان لە ئامێری (وایلون ـ کەمان) پسپۆڕی پەیداکردووە، لە پەیمانگای مۆسیقای (صەبا) کە لەلایەن باوکییەوە بەڕێوەدەبرا، بەردەوام بووە. بۆ ماوەی ساڵێک مۆسیقای کلاسیکی جیهانی خوێندووە، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ سنەو بۆ ماوەی چەند ساڵێک بەناونیشانی کارمەندی مۆسیقا لەفەرهەنگ و هونەری سنە دادەمەزرێت و لەساڵی ١٩٦٩ دەچێتە دانیشگای هونەرە جوانەکانی تاران و لەبەشی قەرهەنگسازی(تألیف) بەپلەی یەکەم خوێندن تەواودەکات بۆ بەردەوام بوونی لەزانستی مۆسیقا بەرەو ئیتالیا دەچێت و بۆ ماوەی یەک ساڵ لە ئەکادیمیای (سانتاچی چیلیا) رۆما بەخوێندنی(هارمۆنی) (٣) خەریک دەبێت، پاشان بەرەو ئەمەریکا دەچێت لەدانیشگای (سان فرانسیکۆ) لە مێژووی مۆسیقا بڕوانامەی (فوق لیسانس – ماجستێر) وەردەگرێت، لەساڵی ١٩٧٨ دەگەڕێتەوە تاران، لەدانیشگای هونەرە جوانەکان – فارابی دەستدەکات بە وانە وتنەوە، جگە لەم کارەی چەند کارێکی تیۆری ئەنجام دەدات و چەند کتێبێک وەردەگێڕێت لەوانە:

أ‌ـ (دەستگای شور و فۆرمەکانی مۆسیقای سونەتی ئێران) کە نامەی بڕوانامەکەیەتی بەزمانی ئینگلیزی.

ب - وەرگێڕانی کتێبی (مۆسیقای روسیا لەسەدەی نۆزدەهەم)

ت - وەرگێڕانی (بنەمای ئۆرکستراسیون) لەدانراوەکانی (ریمسکی کوسا کورف) کە بەچاپی گەیاندووە.

ج - وەرگێڕانی کتێبی (هارمۆنی سەدەی بیستەم) دانراوی (پرسی چتی)

ح -وەرگێڕانی کتێبی (فوک دانواشیون) دانراوی (جان ورالّ) لەکارە مۆسیقییەکانی کە زۆربەی بە ئۆرکسترایەکی گەورە ئەنجام دراوە و ئاوێتەی ئامێرە میللییەکانی کردووە، توانیویەتی (گل همیشە بهار) بەدەنگی شەهرامی نازری وە (کنسرتینو) بۆ ئامێری تار و ئۆرکسترا مۆسیقای وێنەیی بۆ فیلمی (پردی ئازادی) کە خەڵاتی یەکەمی وەرگرتووە لە ڤیستیڤاڵی فەجر، کاسێتی گۆرانی بەناوی (بهاران بیایید) بەدەنگی شەهرامی نازری، بێژەن کامگار کاسێتی (در گلستانە) لەشیعری (سهرابی سپهری) بەدەنگی شەهرام - کاسێتی (بیا حافز) بەدەنگی بێژەن کامکار.

٢ـ بێژەن کامکار: لەساڵی ١٣٢٨ ک. ش، ١٩٤٩ز لە سنە هاتۆتە دنیاوە، سەرەتاییەکانی مۆسیقای وەرگرتووە، لە شەش ساڵییەوە هەستی کردووە کە دەنگی خۆشە بۆیە هەر لەو کاتانەوە لەگەڵ رادیۆی سنە هاوکاری کردووە بەبەرنامەی منالان دەستی پێکردووە.

بێژەن تا تەمەنی ٢٦ ساڵی هەموو چالاکییە هونەرییەکانی خۆی لە چوارچێوەی خێزان و رادیۆ سنە و فەرهەنگ و هونەر تێپەڕی نەکردووە، ئەو ساتانە سالانی پڕ باری بێژەن بووە کە پایەی هونەری خۆی پەرەپێداوە، تا ساڵی ١٩٧٤ دەچێتە تاران لە دانیشگای هونەرە جوانەکان بەشی مۆسیقا، هەمان کات پەیوەندی دەکات بەگروپی(شەیدا) ٤ بەسەرپەرشتی (محەمەد رەزا لطفی) ئاشنایەتی هونەری لەتەک شەهرام نازری، محەمەد رەزا شەجەریان دەکات. پاشان لەگەڵ گروپی (عارف) هاوکاری دەکات، پاش ساڵی ١٩٧٩ لەکۆمپانیای (روح افزا) وەک گۆرانی بێژ بەچەند کاسێتێک بەشداری دەکات کە دەکاتە نزیکەی ٢٠ گۆرانی، بێژەن پسپۆڕی لە ئامێری (تار)دایە، بەڵام لەم گروپەدا (رباب) دەژەنێت، وە لەزۆربەی کاسێتەکاندا ئامێری دەف بەکار دەهێنێت.

بەرهەمـەکانی بێـژەن وەک گـۆرانی بێـژ: بەرهـەمی هۆشـەنگی بـرای بـەناوی (کجابید ئەی شـەهیدان) پارچەیـەک لـە (حەصـار) لەبەرهـەمی حسێن عـەلی زادە، (زەردی خەزان) بەرهەمی ئەرسەلان کامکار، پاشـان چەنـد وڵاتێک دەگـەڕێت بـۆ پێشکەشکردنی بەرهەمەکانی وەک ئەڵمانیا، سویسرا، بەلجیکا، سوید.

٣- پێشەنگ کامکار: لەساڵی ١٩٥١ لەشاری سنە لەدایک بووە، لەتەمەنی حەوت ساڵییەوە لەسەر دەستی باوکی ئاشنای مۆسیقا دەبێت، خولیای خـۆی لـەئامێری سەنتور بەکارهێناوە، پاشان هاوکاری لەگـەڵ رادیـۆی سـنە دەکـات مـاوەی پێنج سـاڵ درێـژە بـەو کـارەی دەدات ، پاشـان بـۆ مـاوەی چـوار سـاڵ لەدامـەزراوەی فەرهەنگ و هونەر دەبێتە مامۆستای ئامێری سەنتور، ساڵی ١٩٧٧ دەچێتـە تـاران لە دانیشگای هونـەرە جوانـەکان بۆ بەدەسـتهێنانی بڕوانامـەی لیسـانس. پێشـەنگ یەکێکە لە دامەزرێنەرانی گروپی شەیدا و تاک ژەنی ئامێری سـەنتور بـووە لایـان، پاشان چەند بەرهەمێکی لەگەڵیان ئەنجام داوە.

٤- ئەرسەلان کامکـار: لەسـاڵی ١٩٦٠ لەشـاری سنە هاتۆتـە دنیـاوە، لەتەمـەنی حەوت ساڵییەوە ئاشنایەتی لەگەڵ مۆسیقا پەیداکردووە، پاشـان لـەگروپی منـاڵان بەشـداری دەکـات، ئینجـا لەسـەر دەسـتی بـاوکی ئـامێری(وایەلۆن – کەمانچـە) فێردەبێت و پەیوەندی بە فەرهـەنگ و هونـەرەوە دەکـات و بـە ئـامێرژەنی عـود – کەمان بەشداری چەندەها ڤیستیڤاڵ دەکات لەسەرانسەری ئێران.

پاش ئەوە ئاشنایەتی لەگەڵ مۆسیقای کلاسیکی رۆژئاوا پەیدا دەکات و سـاڵی ١٩٧٩ دەچێتە دانیشگای هونەرە جوانەکان بەشی مۆسیقا، وانەکانی لەژێر دەستی (منوچری انصاری) دەخوێنێت، پاشـان دەچێتـە ئۆرکسـترای سـەمفۆنی تـاران، تـا ئێسـتاش لـە چالاکییەکانـدا بەشـداری دەکـات، پـاش دوو سـاڵ لەپـەروەردەکردنی خۆی (هارمۆنی و ئاهەنگسازی) لەسەردەستی براگەورەکـەی (هۆشـەنگ) یەکـەم کاری هونەری خۆی بەناوی (سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی) پێشکەش کـرد، کە جێی رەزامەندی بوو، پاش ئەمە گوڕێکی دی دایـە بـەرخۆی بـۆ بەرهـەمهێنانی (زەردی خەزان) (سویت سەمفۆنیای کوردی) .

فـۆرمی کارەکـانی سـوود وەرگرتنـە لـە مۆسـیقای فۆلکلـۆری کـوردی و پشـت بەستن بە بنەماکانی مۆسیقای زانستی جیهانی لەو بەرهەمانـەی کـە بـەم شـێوەیە ئـەنجامی داوە: (کونشـرترتو بـۆ کەمانچـەو ئۆرکسـترا) کـە کـارێکی هـاوبەشـی ئەرسەلان و ئەردەشێری برایەتی.

٥ـ ئـەرژەنگ کامکـار: لەسـاڵی ١٩٥٦ ک. ش لەسـنە لـەدایک بـووە، هـەر لـە منداڵییەوە ئاشنای مۆسیقا بووە، لەمنداڵییـەوە شـارەزای ئـامێری سـەنتور دەبێت پاشان لە ئۆکسترای سنە بە ئامێری (زەرب) لەگەڵ باوکی بەشداری دەکات.

تـا سـاڵی ١٩٧٦ لـە ئۆرکسـترای فەرهـەنگ و هونـەر بـەردەوام دەبێت، پاشـان دەچێتە تاران، پاش خوێندنی ناوەندی دانیشگای هونەرە جوانەکان بەشی نـەخش و نیگار، هەمان کات پەیوەندی دەکات بە رادیۆی ئێرانەوە لەگەڵ گروپی (شـەیدا)، بەسەرپەرشی (محەمـەد رەزا لـوطفی) هاوکاری دەکات ، ئـەرژەنگ خـۆی دەڵێت (ئـەو کاتـەی هاوکـاری خـۆم لەگـەڵ گروپـی (شـەیدا) کـرد لـە ئـامێری زەرب پێشکەوتنێکی چاکم بەدەست هێنا، هەر ئەو هۆیە وای لێکردم کە لەگەڵ ئەو گروپە بەردەوام بم) هەرچەندە کاری سەرەکی ئەرژەنگ نەخش و نیگـارە، بـەڵام حـەز و ئارەزووی خۆی لەو ئامێرەدا دەبینێتەوە.

٦ـ ئەردەشـێر کامکـار: لەسـاڵی ١٩٦٢ز لەسـنە هاتۆتـە جیهانـەوە، لەتەمـەنی حەوت ساڵییەوە لەژێر چاودێری باوکی ئاشنایەتی لە ئامێری (وایلۆن – کەمانچە) پەیـداکردووە، لەتەمـەنی ١٠سـاڵییەوە لـە ئۆرکسـترای (باریـد) لـە فەرهـەنگ و هونەری سنە و تاران و شارەکانی دی، بەشداری کردووە.

هەر لەو رۆژانـە لـە پـاڵ ئـامێری (وایلـۆن – کەمانچـە) فێری ئـامێری (جـۆزە – کەمانچـە) بـووە، لـە تەمـەنی ١٩ سـاڵییەوە لەگـەڵ گروپـی (عـارف – شـەیدا) بەسەرپەرشتی محەمەد رەزا لطفی – پەروێزی مشکاتیان – حسێن عـەلی زادە ، بەشداری کردووە.

ئەردەشێر بـەهۆی هۆشـەنگی بـرای – محەمـەد رەزا لطفی ئاشـنای مۆسـیقای ئێران بووە، لەچەند بەرهـەمێک بەشـداری کردووە لەوانـە کۆنسـێرتی کەمانچـەو ئۆرکسترا کە کاری هاوبەشی ئەردەشێر و ئەرسەلانی برایەتی.

٧ـ ئەردەوان کامکار: لەسـاڵی ١٩٦٨ ز لەشـاری سـنە لـەدایک بـووە، هـەروەک براکـانی تـری هـەر لەمناڵییـەوە خولیـای مۆسـیقای لادروسـتبووە، لـەژێر دەسـتی باوکی فێری ئامێری سەنتور بووە، هەر لە مناڵییەوە لەگەڵ گروپی نەوجەوانان لە فەرهـەنگ و هونـەری سـنە بەشـداری کـردووە، لەسـاڵی ١٩٧٨ دێتـە تـاران لـەژێر دەستی برای گەورەی (پێشەنگ) وانە دەخوێنێت و چەند کاسێتێک تۆمار دەکات.

ئـەردەوان شـارەزاييەكى چـاكى لـە تـەكنيكى ئـامێرى سـەنتوردا هەيـە، وەك تەكنيكەكانى تاك ژەنى (ماهور) (اصفهان) هەروەها (كنستينو و اركسترا) كە كارى هاوبەشى خۆى و براكەى هۆشەنگ.

شێوازى كاركردنى هونەرى كامكارەكان

گەر سەرنجێك لەكارە هونەرييەكانى كامكارەكان بدەين، دەبينين ئەم خێزانە لەدەوروبـەرێكى كوردنشـين پـەروەردە بـوون، هـەر هەمووشـيان لـە منالْييـەوە ئاشناى مۆسيقا بوون بۆيە جێگاى سەرسوڕمان نييە كە بڵێين مۆسيقا لاى ئەمان خۆڕسكەو لـە منالْييـەوە ئاشـناى گۆرانييـە فۆلكلۆرييـە كوردەوارييـەكان بـوون چ بەهۆى باوكيان يان راديۆ يان دەماو دەم، لەزارى خەڵكييەوە ئاشناى بوون.
كـارێكى گرنگـى تـرى ئـەم گروپـە ئەوەيـە كـە هەرچەنـدە هـەر لەمنالْييـەوە مۆسيقايان وەك خولياپەك لەژێر چاودێرى باوكيان بووە، زۆربەيان مۆسـيقايان كردووە بەكارى سەرەكى ژيانيان، وە دانيشگاى هونەرييان خوێندووە، بەتايبەتى هۆشەنگ – ئەرسەلان، كە هۆشەنگيان مۆسيقاى لە ئيتاليا و مێژووى مۆسيقاى لە ئەمـەريكا خوێنـدووە كـە ئەمـەش لـەكارەكانيا رەنگـى داوەتـەوە، وە ئەرسـەلان پسپۆڕى لە ئاهەنگسازى و زانستى هارمۆنى هەيە، ئەوانى تريش زۆر بليمەتانە لە ئامێرەكانيان پسپۆڕييان وەرگرتووە، وە زۆربەى ئەو ئامێرانەى بەكارى دەهێنن جۆراوجۆرە.
كەواتە بە ئاوێتەكردنى ميلۆدييە(٥) كوردييەكان + زانستى مۆسيقاى جيهانى + كاريگەرى مۆسيقاى ئێرانى وە لەبەكارهێنانى ئامێرەكان.
ئامێرە ميللييەكان وەك (تار – سەنتور – عود – نـاى بـادى – زەرب) + ئـامێرە رۆژئاواييەكان (وايلۆن – ڤيولا – چلو – ترامپيت) هـەروەها سـوود وەرگرتنيـان لەكەلەپورى كۆنى مۆسيقاى ئێرانى.
تەنانـەت هۆشـەنگ خـاوەنى شـێوازێكى تايبـەتى خۆيـەتى كـە خـۆى نـاوى (مۆسيقاى ميللى كوردى) لێنـاوە، كـە ئـەم زاراوەيـە بەشـێوەى جۆراوجـۆر بـەكار دەهات.

هــەروەها داڕشــتنەوەی گۆرانییــەکان گــۆرانی بێژانــی وەک ســەید عــەلی ئەسغەری کوردستانی، عەلی مەردان بە داڕێژراوێکی هاوچەرخانە و تێکەڵ بەزانستی هارمۆنی.

هەروەها داڕشتنی کاری وەک (کونشرتو بۆ کەمانچەو ئۆرکسترا) یان (سویت سەمفۆنیای کوردی) کە یەکەم کارە لەهونەری کوردییدا بکرێت.

خاڵێکی تری ناوچەی سنە بەزاراوەی ئەردەڵانی ئاخاوتن دەکەن، وە نزیکییان لەناوچەی هەورامان – لوڕستان، سودێکی تەواویان لە فۆلکلۆری ئەو ناوچانە وەرگرتووە لەکارەکانیاندا وەک خۆشە هەورامان – باران بارانە.

بۆ ئەو میلۆدییە فۆلکلۆریانە هەوڵیان داوە کە زۆربەی ئامێرەکانیان میللی یان ئێرانی بن وەک ئامێرە ژێدارە بێ کەوانەکان لەوانە: (تار ، سەتار، قیچک، جۆزە، عود، نای بادی، زەرب، سەنتور) کە شێوازی پێشەکی مۆسیقا یان میلۆدی کوردین بەڵام زۆر بەوەستایانە کاتەکانی ورد کراونەتەوە لەنێوان بارە مۆسیقاییەکاندا پشووی مۆسیقای جیا بەدی دەکەین کە ئامێری دەف پڕ ئەکرێتەوە، تەنانەت لەڕووی شێوازی دەربڕینەوە کۆمەڵێ سۆزی مۆسیقایی ئاوێتەیان بووە وەک بەکارهێنانی نەرم ژەنی piano یان هێز ژەنی Fort هەستدەکەین کە زۆربەی رەزمەکانی رەزمی خێران کە سەرچاوەکەی لە میلۆدییە کوردییە رەسەنەکان وەرگرتووە.

هەروەها بەکارهێنانی شێوەی هۆرە، سیاچەمانە، چ بە ژەندن یان دەنگ.

ماوەتەوە سەر ئەوەی بڵێین گروپی کامکار تەنها بە ئێرانەوە وابەستەنین بۆ پێشکەشکردنی هونەرەکەیان بەڵکو ساڵانە چەندەها گەشتی هونەری ساز دەکەن بۆ هەندەران بۆ ناساندنی هونەری کوردی کە دەتوانین بڵێین کە تاکە گروپن بە ڕێک و پێکی بە شێوازێکی هونەری هاوچەرخ بیانییەکان و کوردانی دەرەوە و میللەتان بە هونەری کوردی ئاشنا دەکەن.

سەرچاوە بەفارسی:

مردان موسیقی سنتی ایران، تألیف حبیب اله نصیری فر تهران ١٣٧٠هـ

تێبینی : ئەم بابەتە لە رۆژنامەی ئەدەب وهونەری کوردستانی نوێ ژمارە ١٥٢٦ رۆژی پێنج شەمە لە ١٩٩٧/١٢/٢٥ بڵاوکراوەتەوە.

ساڵی پێنجەم ژمارە: ١٥٢٦ پێنج شەممە ١٩٩٧/١٢/٢٥

# خێزانی کامکارو مۆسیقای کوردی

ئازاد صالح_ تیپی مۆسیقای شنروێ

شارستانیەتی مرۆڤایەتی بەهەوڵو کۆششی میللەتان بونیادنراوە. هەرنەتەوەیەك بەپێی گونجاندنی باری ئابووری، رامیاری، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی خۆی بەشداری تێدا کردووە.

لەبواری ئەدەبو هونەریشدا کەسەرخانی ژێرخانە ئابووریەکەیەتی بیری مرۆڤایەتی ئاوێزانی یەکدی بووە بۆ داهێنانی ئەدەبو هونەری جیهانی. هەرنەتەوەو بەپێی رۆڵی مێژوویی خۆی. یۆنانیەکان رۆڵێکی گرنگیان دیوە بۆ پێشکەوتنی زانست_ فەلسەفە_ مەنتیق_ مۆسیقا_ شانۆ_ هند بەهەمان شێوە بابلیەکان لەداهێنانی نووسین. فیرعەونەکان لەئەهرامەکان، ئاشوریەکان، ساسانیەکان، پاشانیش شارستانیەتی ئیسلامی.

تەنانەت تێکەڵبوونی ئەو شارستانیانە لەبواری هونەری مۆسیقاو گۆرانیدا بووەهۆی داهێنانی نووسینی نۆتەی مۆسیقا، هەروەها داهێنانی چەندەها ئامێری مۆسیقا وەك (قانون_ ساز_ عود_ رەباب_ گیتار_ هارب) پاشانیش بەهۆی بەشداری کردنی کەنیسە، ئەورووپا لەمۆسیقادا چەندەها ئامێری دی وەك ئۆرگۆن_ پیانۆ_ وەچەندەها ئامێری ژێداری دی هاتەکایەوە.

وەچەندەها ئامێری ژێداری دی هاتەکایەوە.

دەتوانین بڵێین وابەستەیی کورد بەشارستانیەتی رۆژهەڵاتەوەو پابەندبوونی بەئاینی زەردەشتەوە رۆڵێکی گرنگی هەبووە لەبەرەوپێش چوونی هونەرەکەیدا، هەر بوونی مۆسیقاو گۆرانی لەئاتەشگاکاندا ئادەگاتە بواری کارکردنو بۆنە کۆمەڵایەتیەکانی دی_ تەنانەت

هۆشەنگ کامکار

هاوسێتیوونی کورد لەگەڵ (فارس_ تورك_ عەرەب) بەشێوەیەکی ئاشکراودیار کاری کردۆتە سەر هونەرەکەی، تەنانەت لەبەکارهێنانی ئامێرە مۆسیقایەکانی وەك (سەنتور_ ساز_ عود_ قانون)و ئاوێتەبوونیان لەگەڵ ئامێرە مۆسیقا کوردیەکان وەك (باڵەبان_ شمشاڵ) بەڵکو بوونی کورد بەنەتەوەی ژێردەست هونەرەکەشی پەرت کراوەو فەرهەنگی کوردی وابەستەی هونەری (فارسی_ عەرەب_ تورك)بووە. بەڵکو سامانێکی هونەری لەدەستدا بەوەی کەمیللەتانی لەدەست خۆیان کرد بەخاوەنی هونەرەکەی و بەسامانی میللی

خۆیانیان دانا. بەڵام لەگەڵ ئەم بارە ناهەمووارەداو بەدرێژایی مێژوو لەملاو لەولا مرۆڤی کورد هەوڵی داوە شان بەشانی خەباتی شۆڕشگێری هونەرەکەی بپارێزێتو لەناونەچێت. ئەویش بەهۆی چەند کەسانێکەوە چ لەرۆژهەڵاتی کوردستان یان باشوور یان باکوور. بۆیە پێویستە بۆ مێژوو هەوڵو کۆششی ئەو سەربازە نادیارانە لەیاد نەکەینو لەمێژووی هونەری کوردیدا تۆماریان بکەین. چونکە رۆڵێکی گرنگیان دیوە بۆ پەرەپێدانی هونەری گۆرانی کوردی، یەکێك لەو گروپانە خێزانی (کامکارە) کەساڵانێکی دوورودرێژە ئەسپی خۆیان لەم بوارەدا تاوداوە تائێستاش بەردەوام کاری هونەری دەکەن.

ئەو کەسەی ئەم خێزانەی فێری خۆشەویستی مۆسیقا کردووە، باوکی ئەم خێزانەیە کە هەشت کورو کچێکی عاشق مۆسیقاکردووە، ئەم هونەرمەندەش مامۆستا (حەسەنی کامکارە)_

بەڵێ... مۆسیقا هێندە هونەرێکی شایستەو واڵایە کەپابەندی هیچ نویرو چینێك نییە بەتایەتیی خۆی زانیت. بەڵکو کەسانێك کە خولیایەکی خۆرسكو بەهرەیان تێدایە دەتوانن لەو دەریا پێ بنەدا مەلەوانی بکەن. کوردستانی رەنگینیش بەدیمەنی جوانی_ ژیانی

مەلەوانی بکەن. کوردستانی رەنگینیش بەدیمەنی جوانی_ ژیانی

ساکاری کۆمەڵایەتی_ فۆلکلۆری پڕباری(١) لەگۆرانیو مۆسیقا کەنەوەکان سینە بەسینە دەماودەم یەك لەدوای یەك بەجێیان هێشتووە.

حەسەنی کامکار لەساڵی ١٣٠٢ ك_ش، بەرامبەر ١٩٢٣/ز، لەشاری سنە لەدایك بووە. هەر لەمنداڵییەوە ئالوودەی مۆسیقابووە. بەجۆرێك کەزۆربەی ئاوازو گۆرانیەکانی لەبەر کردووە. خۆی دەڵێ: «یەکەمین پردی پەیوەندی نێوان ئەمو هونەری مۆسیقا بەهۆی (سەتار) ژەنێکی نابیناوە بووە بەناوی (عەلی خان) کەکاکی کامکار دەڵێت «بەماندووبوونو گیروگرفتێکی زۆرەوە چەند پوولێکم کۆکردەوە ئامێری (تار)ێکم لەعەلی خان کری، بەنهێنی خۆم رادەهێنا هەرچەندە چەند جارێ باوکم کەسانی تری خێزانەکەم لەدوورو نزیك سەریان دەشکاندم لەبەرئەوە نەبوو کەمن ئەوسازەم پەیدا کردبوو بەڵکو دەیانویست کەخۆم بەکاری ترەوە خەریك بکەم». بەڵام پاش تەمەنی ١٢ ساڵی بوارێکی چاوەڕواننەکراو بەهانایەوە دێتو لەخوێندنگای سەربازی دادەمەزرێت. ئەویش کەتەنها جێگایەك بووە لەچاوسوور کردنەوەی باوکی دەرباز بێتو ئەوسۆزو خۆشەویستیەی بۆ مۆسیقا هەیبوو بێنێتەوە و پاشانیش بەو خۆشەویستیە بۆ مۆسیقا منالەکانی پەروەردەبکات.

حەسەنی کامکار بێجگە لەئامێری (تار) کەخۆی فێری سوبوبوو. لەدەستەی مۆسیقای سوپا لەگەڵ چەندەها ئامێری بادی (٢) ئاشنایی پەیدا کردووە. پاش پازدە ساڵ

حەسەن کامکار

رووی کردە ئامێری وایلۆن (کەمان)و شارەزایی تێدا پەیدا کرد. کامکار لەم کاتە بەدواوە رووی کردە کۆکردنەوەو نووسینەوەی جۆرەها گۆرانی فۆلکلۆری کوردی کەپتر لە (٤٠٠) گۆرانی کۆکردەوە ئەوکاتانەی کەم کەس بیریان لەم کارە دەکردەوە. وەبەماندووبوونی شەوانەورۆژانی توانی چەند خولێکی فێربوون بکاتەوە پاشان بوو بەپەیمانگای هونەری لەشاری سنەو توانی چەندەها مۆسیقا ژەن پێگەبەیێنێت، لەوانە هەشت کورو کچێکی هەروەها زۆربەی هونەرمەندانی کوردستان.

بۆیە زۆربەی کورەکانی رۆڵێکی گرنگیان دیوە لەپێکهێنانی گروپی کامکار کەکورەکانی ئەمانەن:

١) هۆشەنگ کامکار: هۆشەنگ لەساڵی ١٩٤٦ز لەشاری سنە هاتۆتە دنیاوە. هەر لەمنداڵییەوە لای باوکی

١) هۆشەنگ کامکار: هۆشەنگ لەساڵی ١٩٤٦ز لەشاری سنە هاتۆتە دنیاوە. هەر لەمنداڵییەوە لای باوکی

دەستی کردووە بەخوێندنی ئامێری سەنتور پاشان لەئامێری وایلۆن (کەمان) پسپۆڕیی پەیداکردووە. لەپەیمانگای مۆسیقای (صەبا) کەلەلایەن باوکیەوە بەڕێوەدەبرا بەردەوام بووە.

بۆ خوێندنی ناوەندی چۆتە تاران لەپەیمانگای میللی باڵا خۆی ناونووس کردووە.

بۆماوەی ساڵێك مۆسیقای کلاسیکی جیهانی خوێندووە پاشان دەگەڕێتەوە سنەو بۆ ماوەی چەند ساڵێك بەناونیشانی کارمەندی مۆسیقا لەفەرهەنگو هونەری سنە دادەمەزرێتو لەساڵی ١٩٦٩ دەچێتە دانشگای هونەرە جوانەکانی تارانو لەبەشی ئاهەنگسازی (تألیف) بەپلەی یەکەم خوێندن تەواو دەکاتو، بۆ بەردەوامبوونی لەزانستی مۆسیقا بەرەو ئیتاڵیا دەچێتو بۆ ماوەی یەکساڵ لەئەکادیمیای (سانتاچی چیلیا) رۆما بەخوێندنی (هارمۆنی٣X) خەریك دەبێت. پاشان بەرەو ئەمریکا دەچێت لەدانیشگای سانفرانسیسکۆ لە(مێژووی مۆسیقا) بڕوانامەی فوق لیسانس (ماجستێر) وەردەگرێت لەساڵی ١٩٧٨ دەگەڕێتەوە تاران. لەدانیشگای هونەرەجوانەکان_ فارابی دەست دەکات بەوانە وتنەوە. جگە لەم کارەی چەندکارێکی تیۆری ئەنجام دەدات و چەند کتێبێك وەردەگێڕێت لەوانە:

١) «دەستگای شورو فۆرمەکانی مۆسیقای سونەتی ئێران» کەنامەی بڕوانامەکەیەتی بەزمانی ئینگلیزی.

٢) وەرگێڕانی کتێبی (مۆسیقای روسیا لە سەدەی نۆزدەهەم»

٣) وەرگێڕانی «بنەمای ئورکستراسیون» لەداناوەکانی «ریمسکی کورساکوف» بەچاپی گەیاندووە.

٤) وەرگێڕانی کتێبی «هارمۆنی سەدەی بیستەم» داناوی (پرسی چتی).

٥) وەرگێڕانی کتێبی «فوگ داناشیون» داناوی (جانوورال) لەکارە مۆسیقاییەکانی کەزۆربەی بەئورکسترایەکی گەورە ئەنجام دراوەو ئاوێتەی ئامێرە میللیەکانی کردووە توانیویەتی (گل همیشەبهار) بەدەنگی شەهرامی ناضری، وە(کنسرتینو) بۆ ئامێری تارو ئورکسترامۆسیقای وێنەیی بۆ فیلمی (پردی ئازادی) کە خەڵاتی یەکەمی وەرگرتووە لەفیستڤاڵی فەجر_ کاسێتی گۆرانی بەناوی (بهاران بیایید) بەدەنگی شەهرام ناضری، بێژەن کامکار کاسێتی (در گلستانە)، لەشیعری سهرابی سپهری بەدەنگی شەهرام_ کاسێتی (بیاحافظ) بەدەنگی بێژەنی کامکار.

٢) بێژەن کامکار: لەساڵی ١٣٢٨ ك_ش ١٩٤٩ز لەسنە هاتۆتە دنیاوە. سەرەتاییەکانی مۆسیقای لای باوکی وەرگرتووە لە ٦ ساڵییەوە هەستی کردووە کەدەنگی خۆشە بۆیە هەر لەو کاتانەوە لەگەڵ رادیۆی سنە هاوکاری کردووە بە بەرنامەی منالان دەستی پێ کردووە. بێژەن

لەو کاتانەوە لەگەڵ رادیۆی سنە هاوکاری کردووە بە بەرنامەی منالان دەستی پێ کردووە. بێژەن

تاتەمەنی ٣٦ ساڵی هەموو چالاکیە هونەرییەکانی خۆی لەچوارچێوەی خێزانو رادیۆی سنەو فەرهەنگ وهونەر تێپەری نەکردووە. ئەو ساتانە ساڵانی پڕباری بێژەن بووە کەپایەی هونەری خۆی پەرەپێداوە تا ساڵی ١٩٧٤ دەچێتە تاران لەدانیشگای هونەرەجوانەکان بەشی مۆسیقا، هەمان کات پەیوەندی دەکات بەگروپی (شەیدا) (٤) بەسەرپەرشتی محمد رضا لطفی ئاشنایەتی هونەری لەتەك شەهرام ناضری، محمد رضا شجریان دەکات. پاشان لەگەڵ گروپی (عارف) هاوکاری دەکات پاش ساڵی ١٩٧٩ لەکۆمپانیای (روح افزا) وەك گۆرانی بێژ بەچەند کاسێتێك بەشداری دەکات. کەدەگاتە نزیکەی ٢٠ گۆرانی، بێژەن پسپۆڕی لەئامێری (تار)دایە بەڵام لەم گروپەدا (رباب) دەژەنێت وەلەزۆربەی کاسێتەکاندا ئەمێری دەف بەکار دەهێنێت.

بەرهەمەکانی بێژەن وەك گۆرانی بێژ: بەرهەمی هۆشەنگی برای بەناوی (کجایید ئەی شەهیدان) پارچەیەك لە (حەصار) لەبەرهەمی حسین علیزادە (زەردی خەزان) بەرهەمی ئەرسەلان کامکار. پاشان چەند وڵاتێك دەگەڕێت بۆ پێشکەش کردنی بەرهەمەکانی وەك ئەلمانیا_ سویسرا_ بەلجیکا_ سوید.

٣) پشەنگ کامکار: لەساڵی ١٩٥١ لەشاری سنە لەدایك بووە لەتەمەنی ٧ ساڵییەوە لەسەر دەستی باوکی ئاشنای مۆسیقا دەبێت. خولیای خۆی لەئامێری سەنتور بەکارهێناوە پاشان هاوکاری لەگەڵ رادیۆی سنە دەکات ماوەی ٥ ساڵ درێژە بەو

کارەی دەدات. پاشان بۆ ماوەی ٤ ساڵ لەدامەزراوی فەرهەنگو هونەر دەبێتە مامۆستای ئامێری سەنتور ساڵی ١٩٧٧ دەچێتە تاران لەدانشگای هونەرەجوانەکان، بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامەی لیسانس، پێشەنگ یەکێکە لەدامەزرێنەرانی گروپی شەیداو، تاکژەنی ئامێری سەنتور بووەلایان. پاشان چەند بەرهەمێکی لەگەڵیان ئەنجام داوە.

٤) ئەرسەلان کامکار: لەساڵی ١٩٦٠ لەشاری سنە هاتۆتە دنیاوە لەتەمەنی ٧ ساڵیەوە ئاشنایەتی لەگەڵ مۆسیقا پەیدا کردوە پاشان لە گروپی منالان بەشداری دەکات. پاشان لەسەر دەستی باوکی ئامێری دایلون (کەمانچە) فێردەبێتو پەیوەندی بەفەرهەنگو هونەرەوە دەکاتو بەئامێرژەنی عود_ کەمان بەشداری چەندەها فیستیڤاڵ دەکات لەسەرانسەری ئێران.

پاش ئەوە ئاشنایەتی لەگەڵ مۆسیقای کلاسیکی رۆژئاوا پەیدا دەکاتو ساڵی ١٩٧٩ دەچێتە دانشگای هونەرەجوانەکان بەشی مۆسیقا وانەکانی لەژێر دەستی (منوچری انصاری) دەخوێنێت. پاشان دەچێتە ئورکسترای سەمفۆنی تاران تا ئێستاش لەچالاکیەکانیدا بەشداری دەکات. پاش دوو ساڵ لەپەروەردەکردنی خۆی بەکاری (هارمۆنی ئاهەنگسازی)

لەسەردەستی برا گەورەکەی هۆشەنگ یەکەم کاری هونەری خۆی بەناوی (بەیادی سید علی اصغری کوردستانی) پێشکەش کرد کەجێی رەزامەندی بوو پاش ئەمە گورێنکی دی دایەخۆی بۆ بەرهەمهێنانی (زەردی خەزان) (سویت سەمفۆنیای کوردی).

فۆرمی کارەکانی سوودوەرگرتنە لەمۆسیقای فۆلکلۆری کوردیو پشت بەستن بەبنەماکانی مۆسیقای زانستی جیهانی لەو بەرهەمانەی کەبەم شێوە ئەنجامی داوە.

(کونشرتو بۆ کەمانچەو ئورکسترا) کەکارێکی هاوبەشی ئەرسەلانو ئەردەشێری برایەتی.

٥) ئەردژەنگ کامکار: لەساڵی ١٩٥٦ ك_ش لەسنە لەدایك بووە هەر لەمنداڵییەوە ئاشنای مۆسیقا بووە. لەمنداڵییەوە شارەزای ئامێری سەنتور دەبێت پاشان لەئۆرکستڕای سنە بەئامێری (زەرب) لەگەڵ باوکی بەشداری دەکات.

تا ساڵی ١٩٧٦ لە ئۆرکستڕای فەرهەنگو هونەر بەردەوام دەبێت پاشان دەچێتە تاران پاش خوێندنی ناوەندی دانشگای هونەرەجوانەکان

بەشی نەخش ونیگار هەمان کات پەیوەندی دەکات بەرادیۆی تێرانەوە. لەگەڵ گروپی (شەیدا) بەسەرپەرشتی محمد رضا لطفی هاوکاری دەکات، ئەرژەنگ خۆی دەڵێت «ئەو کاتەی هاوکاری خۆم لەگەڵ گروپی (شەیدا) کرد. لەئامێری (زەرب) پێشکەوتنێکی چاکم بەدەست هێنا هەر ئەوهۆیە وای لێ کردم کە لەگەڵ ئەو گروپە بەردەوام بم» هەرچەندە کاری سەرەکی ئەرژەنگ نەخش ونیگارە. بەڵام حەزو ئارەزووی خۆی لەو ئامێرەدا دەبینێتەوە.

٦) ئەردەشێر کامکار: لەساڵی ١٩٦٢ز لەسنە هاتۆتە جیهانەوە. لەتەمەنی حەوت ساڵییەوە لەژێر چاودێری باوکی ئاشنایەکی لەئامێری وایلون «کەمانچە» پەیدا کردوە. لەتەمەنی ١٠ ساڵیەوە لەئورکسترای (باربد) لەفەرهەنگو هونەری سنەو تارانو شارەکانی دی بەشداری کردوە.

هەر لەو رۆژانە لەپاڵ ئامێری وایلون (کەمانچە) فێری ئامێری (بجوزە_ کەمانچە) بووە لەتەمەنی ١٩ ساڵییەوە لەگەڵ گروپی (عارف_شەیدا) بەسەر پەرشتی محمد رضا لطفی_ پەرویزی مشکاتیان_ حسین عەلی زادە، بەشداری کردوە. ئەردەشێر بەهۆی هۆشەنگی برای_ محمد رضا لطفی ئاشنای مۆسیقای ئێران بووە.

لەچەند بەرهەمێك بەشداری کردوە لەوانە کۆنسرتی کەمانچەو اورکسترا کەکاری هاوبەشی ئەردەشێرو ئەرسەلانی برایەتی.

٧) ئەردەوان کامکار: لەساڵی ١٩٦٨ز لەسنە لەدایك بووە هەروەك

اورکسترا کەکاری هاوبەشی ئەردەشێرو ئەرسەلانی برایەتی.
٧) ئەردەوان کامکار: لەساڵی ١٩٦٨ز لەسنە لەدایك بووە هەروەك

براکانی تری هەر لەمنداڵیەوە خولیای مۆسیقای لادروست بووە لەژێر دەستی باوکی هونەرمەندی لەسەر ئامێری سەنتور. هەر لەمنداڵیەوە لەگەڵ گروپی نەوجەوانان لەفەرهەنگو هونەری سنە بەشداری کردووە لەساڵی ١٩٧٨ دێتە تاران لەژێر دەستی برای گەورەی پێشەنگ وانە دەخوێنێتو چەند کاسێتێك تۆمار دەکات. ئەردەوان شارەزاییەکی چاکی لەتەکنیکی ئامێری سەنتوردا هەیە وەك تەکنیکەکانی تاکژەنی (ماهور) (اصفهان) هەروەها (کنسرتینو وارکسترا) کەکاری هاوبەشی خۆیو براکەی هۆشەنگە.

## شێوازی کارکردنی هونەری کامکارەکان

گەر سەرنجێك لەکارە هونەریەکانی کامکارەکان بدەین دەبینین ئەم خێزانە لەدەورووبەرێکی کوردنشین پەروەردە بوون. هەر هەموویشیان لەمنداڵیەوە ئاشنای مۆسیقا بوون. بۆیە جێگای سەرسورمان نیە کەبڵێین مۆسیقا لای ئەمان خۆرسکەو لەمنداڵیەوە ئاشنای گۆرانیە فۆلکلۆریە کوردەواریەکان بوون چ بەهۆی باوکیان یان رادیۆ یان دەماودەم لەزاری خەڵکیەوە ئاشنای بوون.

گرنگی گرنگی تری ئەم گروپە ئەوەیە کە هەرچەندە هەر لەمناڵیەوە مۆسیقایان وەك خولیایەك لەژێر چاودێری باوکیان بووە زۆربەیان مۆسیقایان کردووە بەکاری سەرەکی ژیانیان و دانشگاکانی هونەرییان خوێندووە [illegible]

بۆل ٨

## ریتم لەنێوان ژیان و مۆسیقادا

ژیان هەمووی دەریایەکە لە ریتم(١) کە هەرگیز شەپۆلەکان داناسەکنێ، ئەو گەردوونەی لەچوار دەورمانە دیاردەکانی لە ریتمیکی رێک و پێکدا دەسورێتەوە، بۆیە هانزفون بیلوف دەڵێت (لەسەرەتاوە بوون ریتمێکی کۆک و پڕاوپڕە) ئەوەی بەئاشکرا هەستی پێدەکرێت سوڕانەوەی هەسارەکانە و دەرکەوتنی .... خۆشاردنەوەیان تەنانەت ژیانی هەموو بوونەوەرەکان چ نییە جگە لەو ریتمە گەردوونییە مەزنە نەبێت.

لەسەرەتای بیری مرۆڤایەتییەوە بیرۆکەی ریتم بیری مرۆڤی هەژاندووە لەو دیاردە گەردوونیە تێڕاماوە، بۆیە تیۆر لەدوای تیۆر دەهێنێتە ئاراوە بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کە ڕێچکەی گەردوون بریتییە لە ریتمێکی مەزن کە ژیانی بوونەوەر چرکەیەکە لەساتەکانی تەنانەت بیرۆکەی سوڕی بێکۆتا (العود الابدی) واتە چەند بارە بوونەوەی لەسەرەتاوە بۆ کۆتا، بێکۆتایی هاتن بەر هەرجارەی سوڕێکی گەردوونی و لێکچوونی سوڕەکان کۆنترین تیۆرە لەبیری مرۆڤایەتی هەر لە (ئەنکسمدیس)ەوە لە چەرخی یۆنانی کۆنەوە تا دەگاتە فەیلەسوفی هاوچەرخ (نیتشە) .

ریتم لە دەوروبەرماندا خۆی حەشارداوە لەیەک بەدوای یەکدا هاتنی شەو ورۆژ – سوڕی مانگ – وەرزەکانی ساڵ– تەنانەت لەجەستەی بونەوەریشدا بەهەست و نەستیەوە .

لەهەر جێگایەک بوونەوەر هەبێت، ریتم هەیە کۆچکردنی پەلەوەرو گیانداران ئیقاعی تایبەتی خۆی هەیە، کۆچی مرۆڤ –گۆڕانی ئارەزووەکان– گۆڕینی مۆدێلی جل و بەرگ و خواردن خواردنەوە لە ریتمێکی ڕێک و پێکدا بەردەوامە، مێژووناسەکان لەسوڕی گۆڕینی شارستانیەتیەکان بەدی دەکەن (تعاقب الضارات)، ئابوری ناسەکانیش دەڵێن (هەڵکشان و داکشانی) ئابوری لەسوڕەیەک لەدوای یەکەکاندا ریتمێکی تایبەتی هەیە. بەڵکو گەر زیاتر رۆبچینە ناو وردەکاری ماتەرەوە لەناوی ئەتۆمدا لەنێوان گەردیلەکاندا بەدی دەکەین کە هەریەکەی جۆرە تەزوویەکی هەیە، کەواتە هەموو بوون و ....... رادەیەک ریتمێکی تایبەتی هەیە، سروشت رێچکەیەکی شەپۆلداری هەیە دەگەڕێتەوە لەو جێگایەی دەستی پێکردووە، بەشێوەی سوڕی تایبەتی ئەمەش وایکردووە لە هونەرمەندێکی مەزنی

وەک لیونارد دافنشی کە زۆر بە قوڵی ڕۆ چووبووە ناو سروشتەوە کە بڵێت هەموو وێنەکانی سروشت ریتمێکی شەپۆلدارەو خودی هەر بوونەوەرێکیش بەندە بەم هەڵچوون و داچوونەوە کە ئەم شەپۆلە دروستی دەکات.

ریتم چییە؟ وشەی ریتم (rhythm)ی زمانی ئەوروپییەکان لە زاراوەی rhuthmos ی یۆنانییەوە وەرگیراوە ئەویش لەفرمانی rheein بە واتای هەڵقوڵان یان ڕێچکە بەستن دێت، وە لەزمانی عەرەبی لە وشەی (التوقیع) کە جۆرێکە لە رۆیشتنی خێرا وەرگیراوە بۆ نمونە دەوترێت (وقع الرجل) کەواتە رۆشتنی خێرا لەگەڵ بەرزکردنەوەی هەردوو دەستدا.

دیارو ئاشکرایە کە رۆشتنی مرۆڤ پاپەندە بە ریتمێکی رێک و پێکەوە، لەوە گرنگتر ریتم جوڵەی تێدایە (الحركه) کە لە دەقە یۆنانی و عەرەبییەکەدا ئاشکراو دیارە، بۆیە دەبینین پەیوەندییەکی دیالەکتیکی لەنێوان ریتم و جوڵەدا هەیە، ئەو ریتمەی کە لە ناوەوە و دەرەوەی بونەوەر بە مرۆڤیشەوە کە پێویستییەکی مادی و رۆحییە لەیەک ساتدا بەدی دەکرێت، گومان لەوەدا نییە کە ریتم یەکێکە لەو دیاردانەی سروشت و پێناسەکردنی کارێکی سانا نییە لەبەر هیچ هۆیەک نا، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە هەمیشە لەگەڵیدا دەژین، هەردەم لەگەڵ جەستەو گیانماندا ئاوێزە بووە.

لەبەر ئەوە پێویستە کە بەپێی چاخەکانی بیری مرۆڤایەتی پێناسەی بکەین.

ئەفلاتوون دەربارەی ریتم دەڵێت (ریتم لە هەڵفڕینی باڵندەکان بەدی دەکرێت، لەرەگەکانی درەختدا، لەجوڵە و سەمادا، لەبڕگەکانی ئاخاوتندا) ئەم پێناسەیە تا ماوەیەکی زۆر کاری پێدەکرا، تەنانەت دەروونناسە هاوچەرخەکانیش دەیگەڕێننەوە بۆ جوڵەی فۆنت Wundt ـی ئەڵمانی سەرچاوەی ریتم دەگەڕێنێتەوە بۆ (رۆیشتن) وە ، ریمان Riemenn دەیباتەوە بۆ لێدانی دڵ و یوشر دەیباتەوە بۆ سەر جوڵەکانی جەستە.

بەڵکو زۆربەیان لەسەر ئەوە پێکهاتوون کە بڵێین (بریتییە لە یاسا سروشتیەکانی جوڵە) ئەویش لەبەر ئەوەی ریتم پەیوەندییەکی نەپساوی هەیە بە لێدانی دڵ- هەناسەدان – رۆشتنی مرۆڤ و رۆشتنی چوار لاقی ئاژەڵ، بۆیە جوڵەو جێگۆڕکێی کات و شوێن لای فەیلەسوفی یۆنانی هیرقلیطلس بنەمای تێگەیشتنی بوون و ژیانە لەیەک ساتدا بەڵکو هیچ شتێک لای ئەو نەگۆڕ نییە.

ئەرستۆ جوڵەی کردبوو بە خاڵێکی سەرەکی لە لێکدانەوەی بۆ دیاردەکان، ئەفلاتونیش دەیگوت کە جوڵە بریتییە لەدیاردە سەرەکییە هەست پێکراوەکان بەڵام دەبێت ئەوەش بزانین تەنها جوڵە بەس نییە بۆ پێناسەکردنی ریتم، هەرچەند خاڵێکی سەرەکییە لەناخیدا.

بەڵکو ئەو جوڵەیە دەبێت دووبارەکردنەوەیەکی رێک و پێکی هەبێت، کەواتە رێک و پێکی خاڵێکی گرنگە لە پێناسەکردنی ریتمدا (التنظیم) بۆیە وای لە ئەفلاتوون کردووە کە بڵێت ریتم بریتییە لە (رێک و پێکی جوڵە) واتە پاش جوڵە گرنگی داوە بەرێک و پێکی ئەو جوڵەیە کە ئەمەش بۆ خۆی پەیوەندی بەهۆشەوە هەیە.

نوێترین پێناسە بۆ ریتم بریتییە لە (چۆنێتی دابەشکردنی چرکەکان بەشێوەیەکی رێک و پێک) یان (بەدوای یەکدا هاتنی ئاوازەکان کە چرکەی چوونیەکیان هەیە یان جیاواز)

بۆمان هەیە کە بپرسین ئەم رێک وپێکییە لەکوێوە سەری هەڵداوە بۆیە دەبێت جیاوازی نێوان دوو جۆر رێک و پێکی بکەین یەکەمیان ئەوەیە کە خۆمان دروستی دەکەین و دەیخوڵقێنین، بەهۆش و بیری خۆمان، ئەمەیان هۆش رۆڵێکی تیایدا دەبینێت.

جۆرێکی دی کە سروشت پێمانی بەخشیوە خۆمان دەستەو وەستان دەبین لە ئاستیدا، هەرچەندە هەندێ جار لە سنورێکی دیاری کراودا دەتوانین کۆنترۆڵی بکەین وەک رۆشتنی مرۆڤ و بونەوەر کە بە پێی یاساکانی سروشت رێک و پێککردنی جوڵەی گیانلەبەرە، بەڵام هەرگیز ناتوانین ناوەڕۆکەکەی بگۆڕین، بەڵام دەتوانین هەندێ گۆڕان بەسەر وردەکاریەکانیدا بهێنین بەوەی کە دەتوانین رۆیشتنەکەمان خێرا بکەین یان خاو ببینەوە.

بەڵام هەرگیز ناتوانین کە بەرێگادا نەڕۆین، بۆیە چاکترین پێناسەکردن بۆ ریتم ئەوەیە کە هەردوو توخمەکە کۆبکاتەوە جوڵە + رێک و پێکی جوڵە بەوەی کەجوڵە برتییە لەتوخمی (ماتەری مادی) و رێک و پێکی لە توخمێکی (گیانی – رۆحی) و بەشێوەیەکی هاوئاهەنگی چونکە بنەمای سەرەکی ریتم جوڵەیە، بەڵام ئەگەر بەشێوەیەکی سەربەخۆ ئاوەڵاکرا، ئەو ساتە لە پێناسەکەی دەردەچێت و دەبێتە جوڵەیەکی هەڕەمەکی، بۆیە دەبێت بەشێوەیەکی رێک و پێک کۆنترۆڵ بکرێت.

لێرەدا پرسیارێک دێتە پێشەوە ئایا ئەو جوڵە و ڕێک و پێکییە بریتیە لەوەی کە ڕۆژانە بەدی دەکەین (گۆڕانی شوێن).

بێگومان ریتم لە مۆسیقادا جۆرێکی دییە لە جوڵە کە هیچ پەیوەندی نییە بەگۆڕانی شوێنەوە، بەڵکو لە مۆسیقادا جوڵە لەناو منداڵدانی کاتدا لەدایک دەبێت، بۆیە دەبێت بیرۆکەی کات کە توخمی سێیەمە لە بنەمای ریتم لەبیر نەکەین.

لەژیانی رۆژانەدا بێ ئاگا هەست بەم جیاوازییە دەکەین کە فەیلەسوفی فەرەنسی برجسون دەریبڕیوە، بەشێوەیەکی دیار جیاوازی خستۆتە نێوان کاتی ئاسایی Letemps وە کاتی زیندوو Ladyree ، کاتێ بیر لە بەسەرچوونی کات دەکەینەوە ئەو جیاوازییە بەدی دەکەین لەنێوان ئەو کاتەی کە بە پێی کاتژمێر رۆژانە دەڕوات و نێوان ئەو کاتە زیندووەی کە هەستەکانمان ئاوێزانی دەبێت کە بەپێی کاتژمێر چەند ساتێکە، بەڵام لە ناخماندا چەند چرکەیەکە یان بە پێچەوانەوە کاتێ چاوەڕوانی دەکەین بە پێی کاتژمێر چەند چرکەیەکە بەڵام لەناخماندا چەند ساتێکە.

بۆیە کات بنەمایەکی سەرەکی مۆسیقایە بەڵکو ریتم لە مۆسیقادا بەهێزترین توخمە کە لە هونەری مۆسیقادا زیاتر بەدی دەکرێت وەک لە هونەرەکانی دی.

هەمووومان هەست بەکاتی زیندوو دەکەین ئەو کاتەی برجسون هەستی پێدەکات لە هەستەکانماندا بەدی دەکەین، چاوەڕوانی کات درێژ دەکات ، بەختیاری خێرای دەکات، تەنانەت لە حاڵەتەکانی نەشئەدا هەست بە ونبوونی کات دەکەین. (نەشئەی صوفیان – گوێ گرتن لە مۆسیقا – سەما کردن – ئاوێتەبوون لەگەڵ خۆشەویستێکدا) تەنانەت لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دی دەگۆڕێت.

هەستکردن بەکات لە مۆسیقادا بە پێی هەڵچوون و داچوونی سۆزەکانمان دەگۆڕێت دەگاتە ئەوەی بەتەواوی لەگەڵیدا بتوێینەوە و کاتمان لەبیر بچێتەوە، چ لەلایەن گوێگرەوە یان لەلایەن مۆسیقاژەنەکەوە، یان ئاوازدانەرەکە، کاتێک خەریکی داڕشتنی ئاوازێک دەبێت کاریگەری ئەم جیاوازییە خودیانە دەگەڕێتەوە بۆناخی ئەو ئاوازدانەرە بۆیە دەبینین ئاوازدانەرێک بە پێی سۆز و ئارەزووەکانی ئەویش بە پێی چەند یاسایەکی خێرای مۆسیقا، خێرایی ئاوازەکەمان بۆ دیاری دەکات کە بەهیچ ئاخاوتنێک چەند وردبێت لە دەربڕیندا دەرنابڕێت.

کەواتە خێرایی Tempo رۆڵێکی گرنگ دەبینێت بۆ دیاریکردنی خێرایی هەر

ئاوازێکی مۆسیقا و بۆ ئەم مەبەستەش ئامێرێکی تایبەتی داهێنراوە کە پێی دەڵێن مترۆنۆم(٢) کە ئامێرێکە بۆ کێشانی کات، هەروەک چۆن تەرازوو هەیە بۆ کێشانی قورسایی، ئەم ئامێرەش کات دەکێشێت کە ئەرکی کێشانی ئاوازێکی مۆسیقایە وە بەشێوەیەکی ورد دەیکێشێت کە بریتییە لە ئامێرێک کە لە دار یان نایلۆن دروستکراوەو شێوەیەکی هەرەمی هەیەو چوارلای هەیە لەلایەکەوە والا دەکرێتەوە و لە ناوەڕاستدا راستەیەکی ئاسن هەیە قورساییەکی پێوەیە کە هاتووچۆ دەکات و چەند ژمارەیەکی پێوەیەو هەروەها چەند نوسینێک لەڕووی پێشەوەی ئامێرەکە کە وەک بەندۆڵی کاتژمێر هاتوچۆ دەکات و ئەم خێراییە بەم شێوەیە نوسراوەMM-72 هەرچەندە ژمارەکە پتر بێت خێرایی زیاد دەکات بۆ نمونە ژمارە d120 لە خێراییەکی دوو هێندەی ئەو خێراییە کە بەم شێوەیە نوسراوەd60 وە لەبەردەم هەر ژمارەیەک کە بەژمارە ٤٤ دەستپێدەکات و بەژمارە ٢٠٨ کۆتایی دێت بەم شێوەیە ٢٠٨ و ٢٠٤ و ٢٠٢ و هتد دەبینین کە چەند زاراوەیەک بەزمانی ئیتالی نوسراوە بۆ دیاریکردنی خێرایی و خاوی هەر ئاوازێک بۆ نمونە d60 خێراییە مامناوەندییەکەیە بەم شێوەیە هێمای بۆ کراوە Andante وە d50 لە ژمارەوە بەم شێوەیە هێمای بۆ کراوەd120 وە ژمارەکە خێراترە وە بەم شێوەیە هێمای بۆ کراوە Allegro ئاشکرایە بە ئەنجام گەیاندنی دانراوێکی مۆسیقا لەلایەن ئۆرکسترایەکی گەورەوە دەگەڕێتەوە بۆ توانای مۆسیقاژەنەکان، نمونە دانراوەکانی مۆتزارت – باخ – هایدن – چایکۆفسکی – خاچادوریان لەچەند کاتێکی جیاواز بە ئەنجام گەیەنراوە وە هەرچەندە هەر هەموویان وابەستەی خوێندنەوەیەکن بۆ کارە مۆسیقاییەکە، بەڵام بلیمەتی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو مۆسیقا ژەنانەی کە بەهەموو هەست و نەستیانەوە تێکەڵ و ئاوێزانی ئەو دانراوە دەبن و کات دەسڕنەوە لە ناخ و گیانیاندا. هێندەی زانراوە دەربارەی بیتهۆڤن هەمیشە سەربەستی دەدا بە مۆسیقا ژەنەکان بۆ ئەوەی بە جوانترین شێوە کارە هونەرییەکانیان بە ئەنجام بگەیەنن، جارێکیان بە پیانۆ ژەنێکی ئافرەتی گوت (من ئەم سۆناتەیە وەک تۆ ناژەنم، تۆ بەردەوام بە لەسەر ڕێچکەی خۆت، بەڵام جوان ژەندنی بەم شێوەیە جوانییەکەی لە ڕێچکەی من کەمتر نییە)

ئەم ئاوێزان بوونە لەگەڵ کارە هونەرییەکاندا پەیوەندییەکی ترمان بۆ ڕووندەکاتەوە لەنێوان ریتمی مۆسیقا و کاتدا.

هەرچەندە ریتم لە مۆسیقادا وامان لێدەکات کە هەست بەکات بکەین، بەڵام لە ناخمانەوە، بەهەستمانەوە، بە نەستمانەوە تێکەڵاوی بووین، ئەم چرکانە کات لەبیر دەکەین، مۆسیقا ژەن و گوێگر هەردووکیان پێکەوە بە ئەنجامگەیەنەر و ساتەکان لە هەست و نەستیاندا دەسڕنەوەو ئاوێزانی چرکە ئاسودەکانی زەمەن دەبن.

بەم شێوەیە ریتم لە مۆسیقادا لەیەک ساتدا دەتوانێت کاتمان بیرخاتەوەو توانای سڕینەوەی هەست پێکردنیشمان بە کات تێدا بخوڵقێنێت.

پەراوێز:

١ـ ریتم: لەم نوسینەدا وەک زاراوەیەک بەکارم هێناوە چونکە هێندەی گەڕام لەکوردییدا بەرامبەری ئەم وشەیەم بەدی نەکرد، هەرچەندە لە زمانی مۆسیقادا (کێش) بەکاردێت، بەڵام کێش مانای وەزنە لە عەرەبی و کێش بەرامبەری ریتم یان ئیقاع نابێتەوە.

٢ـ مترۆنۆم: ئەم ئامێرە لەلایەن ئەندازیارێکی ئەڵمانی لیونارد مایلتسل داهێنراوە، ساڵی ١٨٥٠ لە ڤینەنا کۆچی دوایی کردووە.


سەرچاوەکان:

١ـ مع موسیقی ذکریات و دراسات – تالیف (دکتۆر فواد زکریا) الهیئه المصریه العامه للتالیف وه النشر ١٩٧١

٢ـ الموسیقی و النظریه تالیف سلیم الحلو بیروت .

٣ـ مبادیء الموسیقی النظریه ف. أ . فاخر دمییف ترجمه الدکتور رووف موسی.


–


ئەم بابەتە لە پاشکۆی ئەدەب و هونەری کوردستانی نوێ ژمارە ١٥١١ لە رۆژی پێنج شەمە ١٩٩٧/١٢/٤ بڵاوکراوەتەوە.

سالی پێنجەم: ژمارە ١٥١١ پێنجشەممە ١٩٩٧/١٢/٤

# ڕیتم لە نێوان ژیان و مۆسیقادا

ئازاد سالح/ تیپی مۆسیقای شنرۆی

... هەمووی دەربایەکە لەڕیتم(١) ... هەرگیز ... جوڵەکانی داناساکێ، ئەو ... ەردوونەی ... چواردەورمانە ... ردەکانی ... ڕێتمێکی ڕێکوپێکدا ... سوورێت ... بۆیە هاڕقون بیلوف ... لەسەرەتاوە بوون ڕێتمێکی ... اوە». ئەوەی بەئاشکرا ... دەکرێت سوورانەوەی ... ەسارەکانە.. دەرکەوتنی ... کان و خۆشاردنەوەیان تەنانەت ژیانی هەموو بوونەوەرەکان چ نیە جگە لەو ڕیتمە گەردوونیە مەزنە نەبێت.

لە سورەتای بیری مرۆڤایەتیەوە [illegible] ڕیتم بیری مرۆڤی هەژاندووەو [illegible] گەردوونی بە تێڕاماوە. بۆیە تیور لەدوای تیور دەهێنێتە ئاراوە بۆئەوەی بیسەلمێنێت کەڕێچکەی گەردوون بریتی یە لەڕیتمێکی مەزن کەژیانی بوونەوەر چرکەیەکە لەسانەکانی تەنانەت بیرۆکەی سوڕی بێ کۆتا (الفود الابدی) واتە چەند بارەبوونەوەی لەسەرەتاوە بۆ کۆتا بێ کۆتایی هاتن بەر هەرجارەی سوڕێکی گەردوونی و لێکچوونی سورەکان کۆنترین تیورە لەبیری مرۆڤایەتی هەرلە (ئەنکسمندیس)ەوە لەچەرخی یۆنانی کۆنەوە تادەگاتە فەیلەسوفی هاوچەرخ (نیتشە).

ڕیتم لەدەوروبەرماندا خۆی حەشارداوە. لەیەک بەدوای یەک هاتنی شەوو ڕۆژ-سوڕی مانگ- وەرزەکانی ساڵ- تەنانەت لەجەستەی بوونەوەریشدا بەهەست و نەستیشەوە.

لەهەرجێگایەک بوونەوەر هەبێت ڕیتم هەیە کۆچ کردنی پەلەوەرو گیانداران ئیقاعی تایبەتی خۆی هەیە کۆچی مرۆڤ- گۆڕانی ئارەزووەکان گۆڕینی مۆدیلی جلوبەرگ و خواردن و خواردنەوە لەڕیتمێکی ڕێکوپێکدا

بوونەوەریشدا بەهەست و نەستیشەوە.
لەهەرجێگایەک بوونەوەر هەبێت ڕیتم هەیە کۆچ کردنی پەلەوەرو گیانداران ئیقاعی تایبەتی خۆی هەیە کۆچی مرۆڤ- گۆڕانی ئارەزووەکان گۆڕینی مۆدیلی جلوبەرگ و خواردن و خواردنەوە لەڕیتمێکی ڕێکوپێکدا

بەردەوامە مێژووناسەکان لەسوڕی گۆڕینی شارستانیەکان بەدی دەکەن (تعاقب الحضارات) ئابووری ناسەکانیش دەڵێن (هەڵکشان و داکشانی) ئابوری لەسورەیەک لەدوای یەکەکاندا ڕیتمێکی تایبەتی هەیە.

بەڵکو گەر زیاتر ڕۆبچینە ناو وردەکاری ... انەرەوە لەناوکی ئەتۆمدا لەنێوان گەردیلەکانیدا بەدی دەکەین ... هەریەکەی جۆرە ئەزوویەکی ... هەیە. کەواتە هەموو بوون و ... ردستان ... ارەیەک ڕیتمێکی تایبەتی ... یە. سروشت ڕێچکەیەکی شەپۆلداری ... دەگەڕێتەوە لەو جێگایەی ... پێ کردووە بەشێوەی سوڕی تایبەتی. ئەمەش وای کردووە لەهونەرمەندێکی مەزنی وەک لیوناردۆدافنشی کەزۆر بەقوڵی ڕۆچووبووە ناو سروشتەوە کەبڵێت هەموو وێنەکانی سروشت ڕیتمێکی شەپۆلدارەو خودی هەر بوونەوەرێکیش بەندە بەم هەڵچوون و داچوونەوە کەئەم شەپۆلە دروستی دەکات.

ڕیتم چی یە؟ وشەی ڕیتم (rhythm) ی زمانە ئەوروپیەکان لەزاراوەی rhuthmos ی یۆنانی وەرگیراوە ئەویش لەفرمانی rheein بەواتای هەڵقوولان یان ڕێچکەبەستن دێ‌وە لەزمانی عەرەبی لەوشەی (التوقیع) کەجۆرێکە لەڕۆیشتنی خێرا وەرگیراوە بۆنموونە دەوترێت (وقع الرجل) کەواتە ڕۆشتنی خێرا لەگەڵ بەرزکردنەوەی هەردوو دەستدا.

دیارو ئاشکرایە کەڕۆیشتنی مرۆڤ پابەندە بەڕیتمێکی ڕێک و پێکەوە لەوە گرنگتر ڕیتم جوڵەی تێدایە (الحرکة) کەلەدەقە یۆنانی و عەرەبیەکەدا ئاشکراو دیارە. بۆیە دەبینین پەیوەندیەکی دیالەکتیکی لەنێوان ڕیتم و جوڵەدا هەیە. ئەو ڕیتمەی کەلەناوەوەو دەرەوەی بوونەوەر بەمرۆڤیشەوە کەپێویستیەکی مادی و ڕوحی یە لەیەک ساتدا بەدی دەکرێت. گومان لەوەدا نی یە کەڕیتم یەکێکە لەودیاردانەی سروشت و پێناسەکردنی کارێکی سانا نی یە. لەبەر هیچ هۆیەک نابەڵکو لەبەرئەوەی کەهەمیشە لەگەڵیدا دەژین هەردەم لەگەڵ جەستەو گیانماندا ئاوێزەبووە.

لەبەرئەوە پێویستە کەبەپێی چاخەکانی بیری مرۆڤایەتی پێناسەی بکەین. ئەفلاتون دەربارەی ڕیتم دەڵێت (ڕیتم لەهەڵفڕینی باڵندەکان بەدی دەکرێت. لەڕەگەکانی درەختدا. لەجوڵەو سەمادا. لەبڕگەکانی ئاخاوتندا) ئەم پێناسەیە ئاماوەیەکی زۆر کاری پێ دەکرا تەنانەت دەروونناسە هاوچەرخەکانیش دەیگەڕێننەوە بۆجوڵە فونتی ئەڵمانی Wundt سەرچاوەی ڕیتم دەگەڕێنێتەوە بۆ «ڕۆشتن»ەوە ڕیمان H.Riemenn دەیباتەوە بۆلێدانی دڵ و پوشر دەیباتەوە سەر جوڵەکانی

پێ دەکرا تەنانەت دەروونناسە هاوچەرخەکانیش دەیگەڕێننەوە بۆجوڵە فونتی ئەڵمانی Wundt سەرچاوەی ڕیتم دەگەڕێنێتەوە بۆ «ڕۆشتن»ەوە ڕیمان H.Riemenn دەیباتەوە بۆلێدانی دڵ و پوشر دەیباتەوە سەر جوڵەکانی

جەستە.

بەڵکو زۆربەیان لەسەرئەوە پێکهاتوون کەبڵێن (ڕیتم بریتی یە لەیاسا سروشتیەکانی جوڵە) ئەویش لەبەرئەوەی ڕیتم پەیوەندیەکی تەبساوی هەیە بەلێدانی دڵ- هەناسەدان- ڕۆشتنی مرۆڤ و ڕۆشتنی چوار لاقی ئاژەڵ. بۆیە جوڵەو جێ گۆڕکێی کات و شوێن لای فەیلەسوفی یۆنانی هیرقلیطلس بنەمای تێگەیشتنی بوون و ژیانە لەیەک ساتدا بەڵکە هیچ شتێک لای ئەو نەگۆڕ نی یە.

ئەرستۆ جوڵەی کردبوو بەخاڵێکی سەرەکی لەلێکدانەوەی بۆ دیاردەکات. ئەفلاتۆنیش دەیگوت کەجوڵە بریتی یە لەدیاردە سەرەکیە هەست پێ کراوەکان بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین تەنها جوڵە بەس نی یە بۆ پێناسەکردنی ڕیتم هەرچەندە خاڵێکی سەرەکی یە لەناخیدا.

بەڵکو ئەوجووڵەیە دەبێت دووبارەکردنەوەیەکی ڕێکوپێکی هەبێت. کەواتە ڕێکوپێکی خاڵێکی گرنگە لەپێناسەکردنی ڕیتمدا «التنظیم» بۆیە وای لەئەفلاتون کردووە کەبڵێت ڕیتم بریتی یە لە ( ڕێکوپێکی جووڵە) واتە پاش جووڵە گرنگی داوە بەڕێکوپێکی ئەوجووڵەیە کەئەمەش بۆخوێ پەیوەندی بەهۆشەوە هەیە.

نوێترین پێناسە بۆ ڕیتم بریتی یە لە«چۆنیەتی دابەش کردنی چرکەکان بەشێوەیەکی ڕێکوپێک»یان «بەدوای یەکداهاتنی ئەوازەکان کەچرکەی چوونیەکیان هەیە یان جیاواز».

بۆمان هەیە کەبپرسین ئەم ڕێکوپێکی یە لەکوێوەسەری هەڵداوە بۆیە دەبێ جیاوازی نێوان دووجۆر ڕێکوپێکی بکەین یەکەمیان ئەوەیە کەخۆمان دروستی دەکەین و دەیخولقێنین بەهۆش و بیری خۆمان ئەمەیان هۆش ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت تیایدا.

بۆمان هەیە کەبپرسین ئەم ڕێکوپێکی یە لەکوێوەسەری هەڵداوە بۆیە دەبێ جیاوازی نێوان دووجۆر ڕێکوپێکی بکەین یەکەمیان ئەوەیە کەخۆمان دروستی دەکەین و دەیخولقێنین بەهۆش و بیری خۆمان ئەمەیان هۆش ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت تیایدا.

جۆرێکی دی کەسروشت پێمانی بەخشیووەوە خۆمان دەستەوەستان دەبین لەئاستیدا هەرچەندە هەندێ‌جار لەسنوورێکی دیاری کراودا دەتوانین کۆنترۆڵی بکەین وەک ڕۆشتنی مرۆڤ و بوونەوەر کەبەپێی یاساکانی سروشت ڕێکوپێک کردنی جووڵەی گیانلەبەرە. بەڵام هەرگیز ناتوانین ناوەڕۆکەکەی بگۆڕین بەڵام دەتوانین هەندێ گۆڕان بەسەر وردەکاریەکانیدا بهێنین بەوەی کەدەتوانین ڕۆشتنەکەمان خێرابکەین یان خاوبینەوە.

بەڵام هەرگیز ناتوانین کەبەرنگادا نەڕۆین. بۆیە چاکترین پێناسەکردن بۆڕیتم ئەوەیە کەهەردوو توخمەکە کۆبکاتەوە جوڵە+ڕێکوپێکی جووڵە بەوەی کەجووڵە بریتی یە لەتوخمی (ماتەری مادی)و، ڕێکوپێکی لەتوخمێکی (گیانی-ڕوحی)و، بەشێوەیەکی هاوئاهەنگی وچونکە بنەمای سەرەکی ڕیتم جووڵەیە بەڵام ئەگەر بەشێوەیەکی سەربەخۆ ئاوەڵاکرا ئەوساتە لەپێناسەکەی دەردەچێت و دەبێتە جووڵەیەکی هەڕەمەکی. بۆیە دەبێت بەشێوەیەکی ڕێکوپێک کۆنترۆڵ بکرێت.

لێرەدا پرسیارێک دێتەپێشەوە ئایا ئەوجووڵەو ڕێکوپێکیە بریتی یە لەوەی کەڕۆژانە بەدی دەکەین «گۆڕانی شوێن».

بێ گومان ڕیتم لەمۆسیقادا جۆرێکی دی یە لەجووڵە کە هیچ پەیوەندی نی یە بەگۆڕانی شوێنەوە بەڵکو لەمۆسیقادا جووڵە لەناو مندالدانی کاتدا لەدایک دەبێت. بۆیە دەبێت بیرۆکەی کات کەتوخمی سێهەمە لەنەبەمای ڕیتم لەبیرنەکەین.

لەژیانی ڕۆژانەدا بێ ئاگا هەست بەم جیاوازی یە دەکەین کەفەیلەسوفی فەرەنسی برجسون دەریبڕیوە. بەشێوەیەکی دیار جیاوازی خستۆتە نێوان کاتی ئاسایی Letemps

کات کەتوخمی سێهەمە لەنەبەمای ڕیتم لەبیرنەکەین.
لەژیانی ڕۆژانەدا بێ ئاگا هەست بەم جیاوازی یە دەکەین کەفەیلەسوفی فەرەنسی برجسون دەریبڕیوە. بەشێوەیەکی دیار جیاوازی خستۆتە نێوان کاتی ئاسایی Letemps

وەکاتی زیندوو Laduree. کاتێ بیرلەبەسەرچوونی کات دەکەینەوە ئەوجیاوازی یە بەدی دەکەین لەنێوان ئەوکاتەی کەبەپێی کاتژمێر ڕۆژانە دەڕوات و نێوان ئەوکاتە زیندووەی کەهەستەکانمان ئاوێزانی دەبێت کەبەپێی کاتژمێر چەند ساتێکە بەڵام لەناخماندا چەند چرکەیەکە یان بەپێچەوانەوە کاتێ چاوەڕوانی دەکەین بەپێی کاتژمێر چەند چرکەیەکە بەڵام لەناخماندا چەند ساتێکە.

بۆیە کات بنەمایەکی سەرەکی مۆسیقایە بەڵکو ڕیتم لەمۆسیقادا بەهێزترین توخمە کەلەهونەری مۆسیقادا زیاتر بەدی دەکرێت وەک لەهونەرەکانی دی.

هەموومان هەست بەکاتی زیندوو دەکەین ئەوکاتەی برجسون هەستی پێ دەکات لەهەستەکانماندا بەدی دەکەین چاوەڕوانی کات درێژ دەکات، بەختیاری خێرای دەکات. تەنانەت لەحاڵەتەکانی نەشئەدا هەست بەونبوونی کات دەکەین.

(نەشئەی صوفیان-گوێ گرتن لەمۆسیقا-سەماکردن-ئاوێتەبوون لەگەڵ خۆشەویستێکدا) تەنانەت لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی دی دەگۆڕێت.

هەستکردن بەکات لەمۆسیقادا بەپێی هەڵچوون و داچوونی سۆزەکانمان دەگۆڕێت. دەگاتە ئەوەی بەتەواوی لەگەڵیدا بتوێینەوەو کاتمان لەبیربچێتەوە چ لەلایەن گوێگرەوە یان لەلایەن مۆسیقاژەنەکەوە یان ئاوازدانەرەکە

کاتێک خەریکی دارشتنی ئاوازێک دەبێت. کاریگەری ئەم جیاوازی یە خودیانە دەگەڕێتەوە بۆناخی ئەو ئاوازدانەرە بۆیە دەبینین ئاواز دانەرێک بەپێی سۆزو ئارەزووەکانی ئەویش بەپێی چەند یاسایەکی خێرای مۆسیقا خێرایی ئاوازەکەمان بۆدیاری دەکات کەبەهیچ ئاخاوتنێک چەند ووردبێت لەدەربڕیندا دەرنابڕێت.

کەواتە خێرایی Tempo ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت بۆدیاری کردنی خێرایی هەر ئاوازێکی مۆسیقاو بۆئەم مەبەستەش ئامێرێکی تایبەتی داهێنراوە کەپێی دەڵێن مترۆنۆم (٢) کەئامێرێکە بۆکێشانی کات هەر وەک چۆن تەرازوو هەیە بۆ کێشانی قورسایی ئەم ئامێرەش کات دەکێشێت کەئەرکی کێشانی ئاوازێکی مۆسیقایە وە بەشێوەیەکی وورد دەیکێشێت. کەبریتی یە لەئامێرێک کەلەدار یان نایلۆن دروست کراوەو شێوەیەکی هەرەمی هەیەو چوارلای هەیە لەلایەکەوە واڵادەکرێتەوەو لەناوەڕاستیشدا ڕاستەیەکی ئاسن هەیە قورسایەکی پێوەیە کەهاتووچۆ دەکات و چەند ژمارەیەکی پێوەیەو هەروەها چەند نووسینێک لەڕووی پێشەوەی ئامێرەکە کەوەک بەندۆڵی کاتژمێر هاتووچۆ دەکات کەلەیەک چرکەدا ٧٢ جار هات‌وچۆ دەکات و ئەم خێراییە بەم شێوەیە نووسراوە

قورسایەکی پێوەیە کەهاتووچۆ دەکات و چەند ژمارەیەکی پێوەیەو هەروەها چەند نووسینێک لەڕووی پێشەوەی ئامێرەکە کەوەک بەندۆڵی کاتژمێر هاتووچۆ دەکات کەلەیەک چرکەدا ٧٢ جار هات‌وچۆ دەکات و ئەم خێراییە بەم شێوەیە نووسراوە

MM-72 هەرچەندە ژمارەکە پتربێت خێرایی زیاد دەکات بۆ نموونە ژمارە d-120 خێراییەکی دووهێندەی ئەو خێراییە کە بەم شێوەیە نووسراوە d-60. وەلەبەردەم هەر ژمارەیەک کەبەژمارە 44 دەست پێ دەکات و بەژمارە 208 کۆتایی دێت. بەم شێوەیە 208و 204و 202و ..هتد دەبینین کەچەند زاراوەیەک بەزمانی ئیتاڵی نووسراوە بۆدیاری کردنی خێرای و خاوی هەر ئاوازێک بۆنموونە d-60 خێراییە مام ناوەندی یەکە بەم شێوەیە هێمای بۆکراوە Andante وە d-50 ژمارە وەبەم شێوەیە هێمای بۆ کراوە d-120 وەژمارە کەخێراترە وەبەم شێوەیە هێمای بۆ کراوە Allegro. ئاشکرایە بەئەنجام گەیاندنی داراوێکی مۆسیقا لەلایەن ئۆرکسترایەکی گەورەوە دەگەڕێتەوە بۆ تواناکانی مۆسیقا ژەنەکان نموونە داراوەکانی مۆزارت.

=50Lanto

=60 Andante

=120 Allegro

مترونوم

باخ-هایدن-چایکۆفسکی-خاچادوریان لەچەندکاتێکی جیاواز بەئەنجام گەیەنراوە هەرچەندە هەر هەموویان وابەستەی خوێندنەوەیەکن بۆکارە مۆسیقاییەکە بەڵام بلیمەتی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو مۆسیقاژەنانەی کەبەهەموو هەست و نەستیانەوە تێکەڵ و ئاوێزانی ئەوداڕاوە دەبن و کات دەسڕنەوە لەناخ و گیانیاندا. هێندەی زاراوە دەربارەی بیتهۆڤن هەمیشە سەربەستی دەدا بەمۆسیقاژەنەکان بۆئەوەی بەجوانترین شێوە کارە هونەرییەکانیان بەئەنجام بگەیەنن. جارێکیان بەپیانۆژەنێکی ئافرەتی گوت «من ئەم سۆناتایە وەک تۆناژەنم. تۆبەردەوامبە لەسەر ڕێچکەی خۆت. بەڵام جوان ژەندنی بەم شێوەیە جوانیەکەی لەڕێچکەی من کەمتر نی یە».

ئەم ئاوێزانبوونە لەگەڵ کارە هونەریەکاندا پەیوەندیەکی ترمان بۆ ڕوون دەکاتەوە لەنێوان ڕیتمی مۆسیقاو کاتدا.

هەرچەندە ڕیتم لەمۆسیقادا وامان لێدەکات کەهەست بەکات بکەین بەڵام ئەگەر لەناخمانەوە.. بەهەستانەوە-بەنەستمانەوە تێکەڵاوی بووین ئەم چرکانە کات لەبیردەکەین. مۆسیقاژەن و گوێگر هەردووکیان پێکەوە بەئەنجام گەیەنەرو وەرگر، ساتەکان لەهەست و نەستیانا دەسڕنەوەو ئاوێزانی چرکە ئاسوودەکانی زەمەن دەبن.

بەم شێوەیە ڕیتم لەمۆسیقادا لەیەک ساتدا دەتوانێت کاتمان بیرخاتەوەو توانای سڕینەوەی هەست پێ کردنیشمان بەکات تێدا بخولقێنێت.

ساتدا دەتوانێت کاتمان بیرخاتەوەو توانای سڕینەوەی هەست پێ کردنیشمان بەکات تێدا بخولقێنێت.

### پەراوێز

١- ڕیتم: لەم نووسینەدا وەک زاراوەبەکارمهێناوە چونکە هێندەی گەڕام لەکوردیدا بەرامبەری ئەم وشەیەم بەدی نەکرد، هەرچەندە لەزمانی مۆسیقادا (کێش) بەکاردێت بەڵام کێش مانای (وەزن)ە لەعەرەبی و کێش بەوامبەری ڕیتم یان ئیقاع نابێتەوە.

٢- مترۆنۆم: ئەم ئامێرە لەلایەن ئەندازیارێکی ئەڵمانی لیونارد مایلتسل داهێنراوە. ساڵی ١٨٥٠ لەڤیەننا کۆچی دوایی کردووە.

### سەرچاوە

١- مع الموسیقی ذکریات و دراسات - تالیف (دکتور فؤاد زکریا) الهیئة المصریة العامة للتالیف والنشر ١٩٧١
٢- الموسیقی النظریة تالیف سلیم الحلو بیروت.
٣- مبادیء الموسیقی النظریة ف.أ.فاخر دمییف ترجمة الدکتور رؤوف موسی.

## تیپی مۆسیقای شنروێ، رووی گەشی هونەری شاری هەڵەبجە

ئامادەکردنی: یاسین قادر بەرزنجی/ کوردستانی نوێ

لەنیسانی ١٩٧٣تیپی مۆسیقای شنروێ لەهەڵەبجە بەکۆششی هونەرمەندان ئازاد صالح، مستەفا کەمال، ئومێد نوری، حیکمەت تۆفیق دامەزراوەو لەتەموزی ئەو ساڵەدا لەئاهەنگێکدا لەگەڵ شانۆگەرییەکی هونەرمەند جەمالی مەلاقادر، دەیان گۆرانی و مۆسیقای بەسۆزیان پێشکەش کردووە و دواتر لە تەوێڵەو خورماڵ و پێنجوێن گەلێ بۆنەو ناوچەی دیکەدا رووی گەشی هونەری شارەکە بوون و لەو تیپەدا دەیان هونەرمەند بووە بەئەندام و دواتر بەهۆی ژیان و چوونە هەندەران دابڕاون، بەڵام بەڕێز (ئازاد صالح)ی دامەزرێنەرو لێپرسراوی تیپەکە بە خەمخۆری و هونەرمەندی خۆیەوە هەر بەردەوام بووە و لەگەڵ هاوکارانی ناو و دەنگی تیپی مۆسیقاکەی هەڵەبجەی شەهیدیان بەبەرزی هێشتۆتەوە، لەچاوپێکەوتنێکدا چەند پرسیارێکمان لەکاک ئازاد کرد.

- دوای کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە، رۆڵی تیپەکەتان چی بوو؟

ئازاد: ئێمە ئاوارەی ئۆردوگاکانی ئێران بووین لە ١٩٨٨/٥/٣٠ دەوڵەتی ئێران لەشاری مەهاباد ڤیستیڤاڵێکی هونەری سازکرد و منیش چەند منداڵێکم کۆکردەوەو بەهاوکاری هونەرمەند (فەیزی نەژادی) بەچەند بەرهەمێک بەشداریمان کرد، لەدیدارێکیشدا کە هونەرمەندی مەزن کاک محەمەد ماملێمان دی و پێی وتین هیچ کارەساتێک هێندەی هەڵەبجە گورچکبڕنەبووە.

- گرفتەکانی تیپەکەتان چین؟

ئازاد: دیارترینیان پەرەوازە بوونی ئەندامان و نەبوونی بارەگایەکی گونجاو، نەبوونی ئامێری مۆسیقا و تۆمارکردن و باری گوزەرانی ئەندامانیش لەولاوە بوەستێ.

- بەرهەکانی دوای راپەڕینی تیپەکەتان چی بوون؟

ئازاد: ساڵانە بەشداریمان لە ڤیستیڤاڵەکانی هەڵەبجەی شەهیددا کردووە بە بەرهەمەکانمان یادەوەری شارەکەمان گێڕاوەتەوە، چەندین بەرهەمی

تەلەفیزیۆنمان بۆ هونەرمەندان هۆشیار حەمە فەرەج و ئازاد کەریم و نەجم محەمەد تۆمارکردووە، لەم دواییانەدا چەند گۆرانییەکی نوێمان بۆ کاک هۆشیار حەمە فەرەج تۆمارکردووە، کە لە هەندەران گەڕابۆوە، وێڕای بەرهەم بۆ میوانی تیپەکەمان خاتوو تارا رەسوڵ

-ئەی بۆ ڤیستیڤاڵی ئەمساڵی هەڵەبجە؟

ئازاد: کۆڕاڵی هەڵەبجەی عەشق، هەڵەبجەی زام، هەڵەبجەی خەون، بیرۆکەی ئێمەو شیعری مامۆستا ئەمین سەپان، تیایدا ساڵی جارێ نالی و وەلی و ئەحمەد موختار و مەولەوی و گۆران و خاڵە مینەی شمشاڵ دەگەڕێنەوەو سەردانی شەهیدان دەکەن و دەبینن هەڵەبجە جوانەکەی جاران بووە بە وێرانەو رۆشنایی تیانەماوە.

سەرچاوە/ کوردستانی نوێ ژمارە (١٣٩٥) رۆژی دووشەممە ١٩٩٧/٣/١٧

دووشەممە ١٩٩٧/٣/١٧ ژمارە (١٣٩٥) ساڵی پێنجەم

دوالاپەرە

تیپی مۆسیقای شنرۆێ ، رووی گەشی هونەری شاری هەڵەبجە

بۆ کتێبخانە شەهیدەکەی هەڵەبجە

منـاڵ هـەر لەسـەرەتای بوونیـەوە خولیـای دەنـگ و ئـاوازو جوڵەیـە، تەنانـەت هەنـدێ لـە پسـپۆرانی دەروونـی منـاڵ دەڵـێن مۆسـیقا هـەر لەیەکـەم رۆژی لەدایکبوونی مناڵەوە دەبێتە هاوشانی ژیانی مناڵ تا ئەو رادەیەی کە مناڵ لەیەکەم چرکەی لەدایکبوونیدا بە (گریان) مەلاشووی دەکرێتەوە، بۆیە هەر لەسەرەتای ژیانییەوە ئاشنای دەنگە، دەنگیش بنەمایەکی سەرەکی مۆسیقایە. دەنگیش بریتییە لە لەرینەوەیەکی شەپۆلدار کە لەهەوادا بەهۆی لەرینەوەی تەنێکەوە (قورگ ـ ژێ) بڵاودەبێتەوە، هەر چەندە دەنگی مناڵ لەسەرەتادا مۆسیقی نییە، بەڵام ئەگەر لەساڵانی دواتردا رابهێنرێت دەبێتە دەنگی مۆسیقی،چونکە دوو جۆر دەنگ هەیە مۆسیقایی و نامۆسیقایی.

دووەم بنەمای مۆسیقا بریتییە لە (ڕیتم) واتە ئیقاع، ئەویش بریتییە لە یەک بەدوای یەکترداهاتنی کاتە مۆسیقاییەکان ئەگەر وەک یەک بن یان جیاواز، ئیقاعیش بەشێکی گرنگی مۆسیقایە بگرە هەموو بوون لەسەر ئیقاعێکی ڕێک و پێک بەڕێوەدەڕوات، هەر لەدوای یەکترهاتنی ساڵ ومانگ و وەرزەکان (زستان، بەهار، هاوین، پایز) تادەگاتە شەو و رۆژ، تادەگاتە ئەوەی ژیانی هەموو بوونەوەر (مرۆڤ ـ گیاندار) بەندە بەلێدانی دڵەوە کە بەشێوەیەکی ورد کۆک کراوە کە بەبەردەوامی ژیان دەپارێزێت، کەواتە نەمانی ئیقاع، واتە نەمانی ژیان، بۆیە دەبینین مناڵ هەر لەسەرەتای ژیانەوە ئاشنای ئیقاعە، ئەویش بەوەی کە مناڵ لەسەر ئیقاعی (بێشکە ـ جۆلانە) خەوی لێدەکەوێت، چونکە ئەو دووبارە بوونەوەو چەند بارە بوونەوەی جوڵاندنی بێشکەکەی لەشی خاودەبێتەوە چاو دەنێتە خەو، کەواتە دەنگ و ئیقاع دوو توخمی سەرەکی مۆسیقان، بەم شێوەیە مۆسیقا دیاردەیەکی سروشتی ژیانی مرۆڤەو لەگەڵ بوونیدا ئاشنایەتی.

هەر لە مانگەکانی تەمەنی یەکەمی مناڵیەوە گوێی بەدەنگ و ئاواز دەکرێتەوە، نزیکترین دەنگیش بەسۆزی دایکە کە لەمۆسیقادا چینی سۆپرانۆی پێدەگوترێت واتە (تیژ) بۆیە مناڵ ئاشنای ئەو ئاوازانە دەبێت کە لەزاری دایکییەوە دێتە دەرەوە.

نمونە:

هۆ لایە لایە، رۆڵە لای لایە

شەوگار درەنگەو بۆ خەوت نایە

-

دووەم قۆناغی گەورەبوون قۆناغی دانیشتن واتە قنگگرتن ئەو کاتەی منداڵ دەتوانێت دانیشێت لەم قۆناغەدا جۆری ئاوازەکان و ئیقاعەکان دەگۆڕێت و منداڵیش خۆی (شەق شەقە) دەگرێت بەدەستەوەو ئیقاعەکان خێراتر دەبن، بۆنمونە:

ئش ئش

پەڵپینە بەترش

-

پاشان قۆناغی پێگرتن کە ئەم ئاواز و هۆنراوەش هەر لەلایەن گەورەوە دادەنرێت ئەو کاتەی کەمناڵ (ڕەوڕەوەی تەختە)ی دەدرێتە دەست و یارمەتی دەدات زوو پێبگرێت.

دەبینین کە مناڵ لەقۆناغەکانی مناڵیدا تا ئەو کاتەی کە گەورە دەبێت دەچێتە کۆڵان و خوێندنگە لەتوانایدایە ئاواز و هۆنراوە یان خاوەنی یاری کردن بەڵکو گەورە بۆی دادەهێنێت و ئەویش لەگەڵیدا هەستی دەبزوێت بەڵام پاش قۆناغی مناڵی تەمەنی ٥ – ٦ ساڵان خۆی دەبێتە داهێنەری گۆرانی و ئاواز و یارییەکانی خۆی.

ڕۆڵێکی گرنگی تری گۆرانی و مۆسیقای مناڵ ئەوەیە کە مناڵ فێری ئەوە دەکات کە لەگەڵ ئاوازەکاندا (سەما)بکات و یاری بکات، چونکە سەماکردنیش دیاردەیەکی سروشتی مرۆڤەو پابەندە بە جوڵە سروشتییەکانی مرۆڤەوە و هونەرێکی جوانیشە ئەویش ئاوازێک یان ئیقاعێک کاردەکاتە سەر هەستی ئەو بوونەوەرە: مرۆڤ یان گیاندار دەیخاتە جوڵەو سەما.

دەبێت ئەوەش لەیاد نەکەین کە گۆرانی مناڵان هەر تەمەنەو گۆرانی و یاری کردنی خۆی هەیە تەنانەت بیرکردنەوەی خۆی هەیە، ئەو گۆرانییەی بۆ مناڵێکی پێنج ساڵان دەستدەدات بۆ مناڵێکی هەشت ساڵان دەستنادات وە ئەوەی بۆ هەشت ساڵان دەشێت بۆ مناڵێکی دوانزە ساڵان ناشێت و چێژی لێوەرناگرێت، بۆ نمونە

منالْ لەتەمەنی ٥- ٦ ساڵیدا ئەو قامیشەی سواری دەبێت وا دەزانێت ئەسپێکی راستەقینەیە ئەو(سێ پێچکە تەلە)ی لێی دەخورێت وادەزانێت ئۆتۆمبێلێکی راستە، هەروەها ئەو چیرۆکە خەیاڵاویانەی لەتەمەنێکی دی بۆی باس دەکرێت وا دەزانێت خۆی پاڵەوانی چیرۆکەکەیە.

بۆنمونە:

هۆ ڕێوی ڕێوی هۆ و

ڕێوی بێ ئیمان هۆو

شەریکی شەیتان .. هتد

بۆ منالێکی ١٢ساڵان ناگونجێت.

یان لەقۆناغێکی تری گەورەبوونی منالْ پاپەندی ئەو گۆرانییانەیە کە جوڵەو سەماو یاری کردنی تێدایە یان ڕاکردن و هەڵبەزو دابەزکردن،

وەک: سابوونی ڕەقی – پشتم تەقی

ئەوەی جێی باسکردنە منالْ تا تەمەنی ١٢ – ١٣ ساڵی خولیای گۆرانی و یاری منالانەو دوای ئەم تەمەنە تەمەنی هەرزەکاری دێت، ئەمیش لێکۆڵینەوەی تایبەتی خۆی هەیە کە لەم باسەدا نییە.

شیکردنەوەی گۆرانی فۆلکلۆری منالان

گەر سەرنجێک بدەین لەگۆرانی فۆلکلۆری منالانی کورد دەبینین چەند تایبەتمەندییەکی تێدایە چ لەڕووی هۆنراوە یان ئاواز یان ئیقاع، هەروەها لەڕووی گەشەکردنی باری کۆمەلایەتی و ئابووری و رۆشنبیری و ڕامیاری کورد و هەروەها لەڕووی کات و شوێن و تەنانەت لەشارەوە بۆ لادێ، چونکە منالْ لاسایی دەوروبەری دەکاتەوە لەڕووی گەشەکردنی کۆمەلایەتی تێکەڵبوونی لەگەڵ هاوتوخمی خۆیدا ئەگەر کوڕ بێت یان کچ، منالْ هەست بە جیاوازییەکان ناکات، بەڵکو کۆمەڵ بەسەریدا دەیسەپێنێت، هەروەها گۆرانی منالان لەزارێکەوە (لەهجە) بۆ زارێکی تر گۆڕان و جیاوازی تێدایە چ لەڕووی بەکاهێنانی وشە یان ئاواز، ئاشکراشە کە رۆژ بەڕۆژ ئەم ئاواز و گۆرانییانە بەرەو لەناوچوون و لەبیرچوونەوە دەچێت بەهۆی گەشەسەندنی لایەنەکانی ژیان لەڕوی ئابوری و کۆمەلایەتی و رۆشنبیری و کلتوری، هەروەها پەرتبوونی ژیانی کۆمەڵ و گەورەبوونی شار و داهێنانە تەکنەلۆژییەکان و زانستییەکان و ئالۆزبوونی ژیان

و هاتنە کایەی هۆی ڕاگەیاندنی دی وەک تەلەفیزیۆن، ڤیدۆ، ئەتاری، سیگا و چەندەها لایەنی تری ژیانی مناڵ، بۆیە پێویستە لەسەر پسپۆڕانی ئەم بوارە کە ئەم گۆرانی و ئاوازانە بپارێزن چ بە نوسینەوەی هۆنراوەو ئاوازەکانیان یان تۆمارکردنی لەسەر شریتی کاسێت و ڤیدیۆ و هەڵگرتنی لە ئەرشیفی تایبەتی و لێکۆڵینەوە لەسەری، چونکە میللەتان ئەم کارەیان زوو ئەنجامداوەو هەموو گۆرانییە فۆلکلۆرییەکانی خۆیان پاراستووەو لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەن تەنانەت عەرەبەکانیش، وە ئەوەندەی من ئاگادارم لەسەرەتای ساڵانی هەشتادا مامۆستا حسێن قەدوری کتێبێکی بەناونیشانی (أغاني و لعب الاطفال) پێشکەش کردووەو هۆنراوەو نۆتەی هەموو ئەو گۆرانی و یاری منداڵانەی نوسیوەتەوەو لە لەناوچوون ڕزگاری کردووە، وە ئەگەر بەشێوەیەکی ورد و زانستیانە لەم گۆرانی و ئاوازانە بڕوانین، ئەم خاڵانەی خوارەوە بەدی دەکەین:

١۔ئەوەی ئاشکراو دیارە زۆربەی ئەم گۆرانییانە لەتەمەنی یەکەمی منالّی چ ئاواز چ هۆنراوە لەلایەن گەورەوە دانراوە بەتایبەتی دایک چونکە تێکەڵی منالّ زیاتر لەگەڵ دایکیدایە پاشان کاتێ منالّ گەورە دەبێت خۆی دەبێتە خاوەنی ئاوازو هۆنراوەو یارییەکانی خۆی، بۆ نمونە کاتێ منالّ پێدەگرێت ئەو کاتەی نازانێت ئاوازو هۆنراوە دابنێت، گەورە ئەم ئاوازە دەڵێت و لەگەڵ پاڵپێوەنانی ڕەوڕەوەکەیدا دەڵێت (دارە دارە، پێ بگرە بەهارە)

٢۔ئەوەی کە لەگۆرانی منالاّندا ڕەچاودەکرێت کە زۆربەی گۆرانییەکانی کوڕ و کچ پێکەوە یاری دەکەن و گۆرانییەکان دەڵێنەوە، کەواتە کۆمەڵگەی کوردی لەسەرەتای سەدەی بیستەم ڕێیداوە کە منالّ لە منالّییەوە تێکەڵاوی یەکتربن، بەڵام دەبینین لەیارییە فۆلکلۆرییەکاندا کە زۆرتر جوڵەی تێدایە یاری کوڕان لەگەڵ یاری کچان جیاوازە، وەک ماڵە باجێنە، خەتخەتێن، هەڵمەقۆ بۆ کچ و یەکەوحەیزەران، یەکەوگۆتەکەو فڕیوە و هەلوکێن بۆ کوڕ، نمونە بۆ ئەو گۆرانییەی کە کوڕ و کچ پێکەوە دەیڵێنەوە:

أ۔پشیلە سوورە بەکوێیا چوو

عەرزی دڕی و پیایا چوو

بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە کوڕ یان کچ گۆرانی تایبەتی خۆی نییە، بۆ نمونە کوڕان حەز لە شەڕە کەڵەشێر دەکەن و لەکاتی بەگژاچوونی کەڵەشێرەکان

ئەم گۆرانییە دەڵێن

ب ـ دگل دگل دانە
شەڕی مامە خانە
یان کچان پێکەوە یاری دەکەن و ئەم گۆرانییە دەڵێن
نمونە:
ئاگری شینی گیایی
بۆ مەیلی برایی
مەیلی برام حەوت جووتە
ئەسپی کاکم لەجووتە
هۆ کچێ تەقەتەق مەکە
گوارەکانم ئەفرۆشم
ئەیدەم بە قەرەوێڵە
لەسەری دائەنیشم
ـ
نمونەیەکی تر بۆ گۆرانییەک کە کچان پێکەوە دەیڵێنەوە:
ئایشێ بنەوشێ
گسکێ بدە لە حەوشێ
ئەگینا دایکت دەتکوژێ
یاخوا لەشت داوەشێ

٣ـ گۆرانی منالان لەگەڵ وەرزەکانی ساڵ دەگۆڕێت بۆ نمونە ئەو گۆرانییانەی کە لەزستان دەگوترێن جیاوازە لەباران بڕان، چونکە هاوینان بەڕۆژ یان شەو دێنە گۆڕەپان و کۆلان.

بۆ نمونە گۆرانی مامە پیرە لە هاوین یان لەبەهار دەگوترێ کەمناڵ خۆی دەکات بە مامە پیرەو گۆجانێک دەگرێت بەدەستیەوەو سەعاتێک دەکاتە دەستی و منالانیش بە گۆرانییەوە لێی دەپرسن:
مامە پیرە سەعات چەندە
پێم نەگوتی سەعات یەکە
مامە پیرە سەعات چەندە

پێم نەگوتی سەعات دووە

بەم شێوەیە دەڕوات تا دەگاتە دوانزە، ئیتر بەم شێوەیە منداڵان فێری سەعات خوێندنەوە دەبن.

نمونە لەگۆرانی باران بڕان، کاتێ کە باران نابارێت منداڵان لەپەڕۆ بووک دروستدەکەن و بەماڵاندا دەگەڕێن، کەیبانووی ماڵەکەش جامێک ئاو دەکات بە بوکەکەداو منداڵان بە یەکەوە ئەم گۆرانییە دەڵێن:

بووکە بەبارانێ

سەعاتی جارانێ

ئاوی بن دەغڵانێ

هەیاران و مەیاران

یاخوا داکاتە باران

بۆ فەقیرو هەژاران

-

یان شەوانی زستان کە منداڵان بەڕیز دادەنیشن هەموویان قاچ رادەکێشن یەکێک لە منداڵان دەست دەخاتە سەر قاچیان یەکە یەکە لەگەڵ گۆرانییەکەدا دەڕوات و کە دەڵێت (ئەوەی گەزی) ئەو مناڵە قاچی دەنوشتێنێتەوە بەم جۆرە تا کۆتایی گۆرانییەکە:

هەللور بەللور تەکامە

زەردو سوور و شەمامە

ئاوە بەرە دەنکە زەرە

مێخم کوتی مێخ هەڵبەزی

تیکەی راستی ئەوەی گەزی

یان:

٢ـ ئاخچی بوخچی – دایەو بابە سندوقچی

٣ـ هەروەها گۆرانی (سابوونی رەقی) کە لە زستان لە ژوورەوە منداڵان پشت دەکەنە یەکتر و هەردووکیان یەکتر بەرز دەکەنەوە بەم شێوەیە دەڵێن:

سابوونی رەقی

پشتم تەقی

٤ـ لەڕووی هۆنراوەوە دەبینین زۆربەی لە گیاندار دەدوێ، ئەمەش پەیوەندی بەبیرکردنەوەوە هەیە
وەک:
هۆ رێوی رێوی هۆو
رێوی بێ ئیمان هۆو
یان:
حاجی لەقلەق مار هات ماری ژەنگ و ..
لەیلێ بە گریان هات
پیرەژن بە گۆچان هات
٥ـ لەڕووی ئیقاعەوە: زۆربەی ئاوازەکان ئیقاعی سادەن (الوزن البسیط) ئەویش ئیقاعی دوانی وەک ، ٤/ 4وە بەدەگمەن ئیقاعی تێکەڵاو (الوزن المرکب) هەیە، وەک 6/8لەگۆرانی مامە پیرە هەروەها زۆربەیان یەک ئیقاع لەسەرەتای گۆرانییەکە تا کۆتایی گۆرانییەکە.
دەگمەن نەبێت وەک گۆرانی (بووکە بەبارانە) کە ئیقاعەکەی دەگۆڕێت سەرەتا بە ئیقاعی 4/4 دەستپێدەکات پاشان دەگۆڕێت بە ڕەزمی (ئیقاع)6/8ئەویش پەیوەندی بەجوڵەی منداڵەوە هەیە.
٦ـ لەڕووی هۆنراوەوە زۆربەی هۆنراوەکان سادەن، هەروەها منداڵان لاسایی دەوروبەر دەکەنەوە، جاری واهەیە لەوشەکان تێناگەن و ئەیڵێنەوە بۆ نمونە تەنانەت منداڵانی کورد بەهۆی تێکەڵاوییان لەگەڵ منداڵانی عەرەبدا ئەم گۆرانییە منداڵانەی عەرەبیان دەگوتەوە، کە بەم شێوەیەیە:

استعلا فات فات
ئیزیل و سەباع لەفات
رێوییەکە رۆی رۆی
کلکەکەی حەوت جار رۆی
کە خۆی بەعەرەبی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:
الثعلب فات فات
وذیله سبع لفات

یان ئەم گۆرانییەی دی کە لە منالانی عەرەبدا وەرگیراوە
الله بصحبكم بالخير
يالعماره العماره
الله يمسيكم بالخير
يالعماره العماره
٧ـ زۆربەی گۆرانی منالانی کورد لەگەڵ یاری کردندا تێکەڵە لەوانەیە ئەو یارییە بوو بێتە هۆی داهێنانی ئاوازو هۆنراوەکە، کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە مۆسیقاو یاری کردن و سەما پەیوەندییەکی گرێدراویان پێکەوە هەیە و دەچێتە ناوناخی مرۆڤەوەو کاری لێدەکات.
٨ ـ زۆربەی ئەو کاتە مۆسیقایانەی کە لە گۆرانییەکاندا بەکارهاتوون ئەو کاتانەن کە منالْ بە ئاسانی بۆی دەگوترێت وە بلانش(𝅗𝅥) یان نوار (♩) یان کروش (♪) وە یان بەدەگمەن دەبڵ کروش ( ♫ ) بەکاردەهێنرێت، چونکە کاتێکی خێراییە وە بۆ منالْ ئاسان نییە.

وەجارجارەش نیشانەی پشوو (علامة السكوت) ( 𝄾 ) یان (𝄽) بەکاردێت چونکە منالْ هەناسەی کورتە.
٩ـ لەڕووی داڕشتنی ئاوازەکانەوە دەبینین زۆربەی گۆرانییەکان لە پەیژەی گەورەیە major پەیژەی بچووک minor کەم بەکاردێت، هەروەها نیشانەی چارەکە تۆن زۆر دەگمەنە چونکە پێویستی بە راهێنانێکی زۆرە.
١٠ـ لەبەر ئەوەی چینی دەنگی منالْ (سۆپرانۆ – تیژە) ئەو گۆرانییانە لەکاتی وتن و نوسینەوەدا لەو چینە دادەڕێژێت.
١١ـ لەرووی مەودای دەنگەوە (المسافةالصوتية) زۆربەی ئەو گۆرانییانە مەوداکانیان لەیەک (تتراکورد) واتە چواردەنگ تێناپەڕێت وە هەرگیز (ئۆکتاف) octave هەشت دەنگ تەواوناکات، وەبگرە زۆربەیان لەیەک تۆن جێگیر دەبن، مەگەر باز (قفزه) بدەن بۆ چوارمیانە (مسافة رابعة) لەخوارەوە پێی دەڵێن (حركة نازلة) صولْ – دێ یان مەودایەکی سێ دەنگی (مسافه ثالثة) سەرکەوتن (حركة صاعدة) پاشان دەگەڕێتەوە سەر دەنگە جێگیربووەکە (نفمة الاستقرار)
١٢ـ زۆربەی ئەم گۆرانییانە بەشێوەی جیاواز جیاواز دەگوترێن، بەڵام هێندەی

ئەوەی کە بە منداڵی وتراوە بە پێی شارەزایی خۆم لەم بوارەدا و گەڕانەوەم بۆ کاتی منداڵی سوودم لەم ئاوازانە وەرگرتووە لەکاتی نوسینەوەی نۆتەکاندا.

تێبینی/ ئەو گۆرانییانەی کەنوسراوەتەوە هەموو ئەو گۆرانییانە نین بەڵکو گۆرانی زۆری دی هەیە، هەوڵ ئەدەم کە لەسەرچاوەی ترەوە یان کەسانی ترەوە وەریان بگرم و بنوسرێتەوەو لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت بۆ ئەوەی ببێتە بنەمایەک بۆ گۆرانی منداڵانی کورد.

-

ئەم بابەتە لە ژمارە ١٤٥٢ رۆژی پێنج شەمە لە ٢١/ ٨/ ١٩٩٧ لەرۆژنامەی ئەدەب و هونەری کوردستانی نوێ بڵاوکراوەتەوە.

ئەدەب و هونەر



ژمارە (١٤٥٢) پێنجشە ممە ١٩٩٧/٨/٢١ ساڵی پێنجەم

مناڵ هەر لە سەرەتای بوونیەوە خولیای دەنگو ئاوازو جووڵەیە. تەنانەت هەندێ لە پسپۆرانی دەروونی مناڵ دەڵێن: مۆسیقا هەر لەیەکەم ڕۆژی لە دایك بوونی مناڵەوە دەبێتەهاوشانی ژیانی مناڵ. تا ئەو ڕادەیەی کە مناڵ لەیەکەم چرکەی لە دایك بوونیا بە (گریان) مەڵاشووی دەکرێتەوە. بۆیە هەر لەسەرەتای ژیانیەوە ئاشنای دەنگە. دەنگیش بنەمایەکی سەرەکی مۆسیقایە.

دەنگیش: بریتی‌یە لەلەرینەوەیەکی شەپۆلدار کە لەهەوادا بەهۆی لەرینەوەی تەنێکەوە (فورگە ـ ژێ) بڵاودەبێتەوە. هەرچەندە دەنگی مناڵ لەسەرەتادا مۆسیقی نیە بەڵام ئەگەر لەساڵانی دوایی ڕابهێنرێت دەبێتە دەنگی مۆسیقی چونکە دوو جۆر دەنگ هەیە مۆسیقایی‌و نامۆسیقایی.

دووهەم بنەمای مۆسیقا بریتی‌یە لە (ڕیتم) واتە ئیقاع ئەویش بریتی‌یە لەیەك بەدوای یەکتر هاتنی کاتە مۆسیقاییەکان ئەگەر وەك یەکبن یان جیاواز ئیقاعیش بەشێکی گرنگی مۆسیقایە بگرە هەموو بوون لەسەر ئیقاعێکی ڕێك‌وپێك بەڕێوە دەڕوات هەر لەدوای یەکترهاتنی ساڵ‌و مانگ‌و وەرزەکان ـ زستان ـ بەهار ـ هاوین‌ـپایز تا دەگاتە شەوو ڕۆژ تادەگاتە ئەوەی ژیانی هەموو بوونەوەر (مرۆڤ ـ گیاندار) بەندە بەلێدانی (دڵ) ەوە کەبەشێوەیەکی وورد کۆك کراوە کە بەبەردەوامی ژیان دەپارێزێت کەواتە نەمانی ئیقاع واتە نەمانی ژیان. بۆیە دەبینین مناڵ هەر لەسەرەتای ژیانەوە ئاشنای ئیقاعە ئەویش بەوەی کە مناڵ لەسەر ئیقاعی (بێشکە ـ جۆلانە) خەوی لێ دەکەوێت چونکە ئەو دووبارەبوونەوەو چەند بارەبوونەوەی جوڵاندنی بێشکەکەی لەشی خاو دەبێتەوەو چاو دەنێتەخەو کەواتەدەنگ‌و ئیقاع دوو توخمی سەرەکی مۆسیقان بەم شێوەیە مۆسیقادیاردەیەکی سروشتی ژیانی مرۆڤەو لەگەڵ بوونیدا ئاشنایەتی.

هەرلە مانگەکانی تەمەنی یەکەمی مناڵیەوە گوێی بەدەنگ‌و ئاواز دەکرێتەوە وەنزیکترین دەنگیش دەنگی بەسۆزی دایکە کەلەمۆسیقادا چینی سۆپرانۆی پێ دەگووترێت واتە (تیز) بۆیە مناڵ ئاشنای ئەو ئاوازانە دەبێت کەلەزاری دایکی دێتە دەرەوە:

نموونە: هۆلایە لایە ڕۆڵە لای لایە
شەوگار درەنگە بۆ خەوتنایە

دووهەم قوناغی گەورەبوون قۆناغی دانیشتن واتە قنگ‌گرتن ئەو کاتەی مناڵ دەتوانێت دانیشێت لەم قۆناغەدا جۆری ئاوازەکان‌و ئیقاعەکان دەگۆڕێت‌و مناڵیش خۆی (شەق شەقە) دەگرێت بەدەستەوەو ئیقاعەکان

# گۆرانی فۆلکلۆری منداڵانی کوردو چەند لێکۆڵینەوەیەك

نووسینی: ئازاد صالح
تیپی مۆسیقای شنروێ

مناڵان لەزارێکەوە (لهجە) بۆ زارێکی تر گۆڕان‌و جیاوازی تێدایە چ لەرووی بەکار هێنانی ووشە یان ئاواز ئاشکراشە کە ڕۆژبەڕۆژ ئەم ئاوازو گۆرانیانە بەرەو لەناوچوون‌و لەبیرچوونەوە دەچێت بەهۆی گەشەسەندنی لایەنەکانی ژیان لەرووی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و رۆشنبیری‌و کەلتوری هەروەها پەرت بوونی ژیانی کۆمەڵ‌و گەورەبوونی شارو داهێنانە تەکنەلۆژیەکان‌و زانسیەکان‌و ئاڵۆزبوونی ژیان‌و هاتنەکایەوەی هۆی ڕاگەیەندنی دی وەك تەلەفزیۆن ـ ڤیدیۆ ـ ئەتاری ـ سیگاو چەندەها لایەنی تری ژیانی مناڵ بۆیە پێویستە لەسەر پسپۆرانی ئەم بوارە کەئەم گۆرانی‌و ئاوازانە بپارێزن چ بە نووسینەوەی هۆنراوەو ئاوازەکانیان یان تۆمار کردنیان لەسەر شریتی کاسێت‌و ڤیدیوو هەڵگرتنی لەئەرشیفی تایبەتی‌و لێکۆڵینەوە لەسەری چونکە میللەتان ئەم کارەیان زوو ئەنجام داوەو هەموو گۆرانیە فۆلکلۆریەکانی خۆیان پاراستووەو لێکۆڵینەوەی لەسەردەکەن تەنانەت عەرەبەکانیش وەئەوەی من ئاگادارم لەسەرەتای ساڵانی هەشتادا مامۆستا حسین قدوری کتێبێکی بەناونیشانی (أغاني ولعب الاطفال) پێشکەش کردووە هۆنراوەو نۆتەی هەموو ئەو گۆرانی‌و یاری‌یەمناڵانەی نووسیوەتەوەو لەلەناوچوون ڕزگاری کردووە وەئەگەر بەشێوەیەکی ووردو زانستیانە لەم گۆرانی‌و ئاوازانە بڕوانین ئەم خاڵانەی خوارەوە بەدی دەکەین:ـ

١ـ ئەوەی ئاشکراو دیارە زۆربەی ئەم گۆرانیانە لەتەمەنی یەکەمی منداڵی

مامەپیرە سەعات چەندە
پێم نەگوتن سەعات دووە

بەم شێوەیە دەڕوات تادەگاتە دوازدە بەم شێوەیە مناڵان فێری سەعات خوێندنەوەدەبن.

نموونە لە گۆرانی باران بران کاتێ کە باران نابارێت مناڵان لەپەڕۆ بووکێك دروست دەکەن‌و بەماڵاندا دەگەڕێن کەیانووی ماڵەکەش جامێك ئاودەکات بەبووکەکەداو مناڵان ئەم گۆرانی‌یە دەڵێن کوڕو کچ پێکەوە

بووکە بەبارانێ
سەعاتی جارانێ
ئاوی میزەڵدانێ
ئاوی بن دەغڵانێ
هەباران‌و نەباران
یاخوا داکاتە باران
بۆ فەقیرو هەژاران

یان شەوانی زستان کە مناڵان بەڕیز دائەنیشن وەهەموویان قاچ ڕادەکێشن کەیەکێك لەمناڵان دەست دەخاتە سەر قاچیان‌و یەکەیەکە لەگەڵ ئیقاعی گۆرانی‌یەکە دەڕوات‌و کە دەڵێت (ئەوەی گەزی ئەو مناڵە قاچ دەنوشتێنێتەوە) بەم جۆرە تاکۆتایی گۆرانی‌یەکە.

هەللور بەللور تەکامە
زەردو سوورو شەمامە
ئاوەبەرە دەنکە زەرە
مێخ کوتی مێخ هەڵبەزی
تیکەی ڕاستی ئەوەی گەزی

یان

٢ـ ئاتچی بوتچی دایەو بابە سندوقچی

٣ـ هەروەها گۆرانی (سابوونی ڕەقی) کەلەزستان لەژوورەوە مناڵان پشت دەکەنە یەکترو هەردووکیان یەکتر بەرز دەکەنەوە بەم شێوەیە دەڵێن.

سابونی ڕەقی
پشتم تەقی

## موجتەبای میرزادە

### ئەو هونەرمەندە کوردە بلیمەتەیە کە هێندەی تر گۆرانییەکانی حەسەن زیرەکی رازاندۆتەوە

کێ بێ لە ئێمە گوێی لەدەنگی حەسەن زیرەک نەبووبێت، لەگەڵ ئەو گۆرانییانەدا دەنگی بەسۆزی ئەو کەمانچەیە نەیهەژاندبێت کە لەگەڵ گۆرانییەکاندا ئاوێزان دەبوو، وای لە گوێگر دەکرد هێندەی تر چێژ لەو گۆرانییانە وەربگرێت و بەنەمری بمێنێتەوە.

کێ بێ هەست بەو جیاوازییە گەورەیە نەکات لە گۆرانییەکانی حەسەن زیرەکدا ئەوانەی لە ئیستگەی بەغدا تۆمارکراون، یان ئەوانەی لە کرماشان تۆمارکراون، ئەمیان مۆسیقایەکی کرچ و کاڵ، ئەویان تەڕوبڕ، ئەوانەی بەغدا بێ پێشەکی مۆسیقایی، گۆرانییەکانی کرماشان پێشەکییەکی جوان و ڕێک وپێک هەیە، ئەوانەی بەغدا سەرپێی تۆمارکراون، ئەوانەی کرماشان ماندووبوونێکی زۆری لەگەڵ کراوە و زۆر جوان تۆمارکراوە، ئەوانەی بەغدا هەستدەکەیت زۆر بێگیانە، ئەوانەی کرماشان هەستدەکەیت هێندە ڕۆحت دەبزوێنێت.

ڕۆحیەت و مۆرکی مۆسیقاکانی ئیستگەی بەغدا زیاتر عەرەبییە، چونکە مۆسیقاژەنی عەرەب زۆربەی ئامێرەکانیان ژەندووە، بەڵام گۆرانییەکانی کرماشان زۆر نزیکە لە دەنگ و مۆرکی حەسەن زیرەک ئەویش ڕۆحیەت و مۆرکی کوردییە.

بەڵێ لەپشت پەردەکانەوە چەندین مۆسیقاژەنی بەتوانا هەبووە لەدوای ئەو سەرکەوتنە مەزنەی کە گۆرانییەکانی حەسەن زیرەک بەدەستی هێناوە.

دڵنیام لەوەی کە زۆر لە شەیدایانی دەنگە بەسۆزەکەی حەسەن زیرەک تامەزرۆو تینوی ئەوەن تا بزانن ئەو هونەرمەندە بلیمەتە کێیە کە ئەو کەمانچە بەسۆزە لێدەدات؟ چونکە دەتوانین بڵێین چریکەی دەنگی حەسەن زیرەک و سۆزی کەمانچەکەی هونەرمەندی بلیمەت (موجتەبای میرزادە) دوانەن و لێک جیاناکرێنەوە، هەردەم ئاوێزان و دەستلەملانی یەکترن، موجتەبای میرزادە لە ساڵی ١٩٤٥ لە کرماشان لەدایکبووە، بەپێی بارودۆخی ئەو کاتە کە زۆر لە خێزانەکان ڕێگایان دەگرت لە منداڵەکانیان بۆ ئەوەی نەچنە ناو جیهانی هونەرەوە،

بـەڵام لەگـەڵ ئەمەشـدا زۆر لـە هونەرمەنـدان لـەم ناوچەیـە پـەروەردە بـوون و هەڵکەوتوون.

ئەم هونەرمەندە زۆر مناڵ بووە کە لەگەڵ مۆسیقادا ئاشنایەتی پەیداکردووە ئەویش بەهۆی رادیۆی دراوسێیەکیانەوە، خۆی دەڵێ (هەر کاتێ دەنگی مۆسیقای ئاغایـان مەهـدی خالـدی و پـەروێزی یـاحقی)(١) لـەرادیۆی دراوسـێکەمانەوە لێبدرایە، ئیتر من بەهـەموو هەستەکانمەوە لەگەڵیاندا دەژیام، بەتایبـەتی دەنگی صـۆڵۆکانیان(٢) ئاشـکرایە گـوێم لـە مۆسـیقای هـەموو هونەرمەنـدانی وڵاتەکـەم دەگرت کە لە رادیۆوە پەخش دەکران بەڵام دەنگی ئامێری ئەو دوو هونەرمەندە چێژی تایبەتی هەبوو لام)

میرزادە وەک زۆربەی هونەرمەندان زۆر عاشق و شەیدای مۆسیقابووە، بەڵام توانای کڕینی ئامێری مۆسیقای نەبووە بۆ ئەوەی تاسەو ئارەزووی خۆی پێ بشکێنێت. هـەموو رۆژێـک دوور لـەچاوی بـاوکی لەکـەنارێکی ماڵـەوە بـە قـاپ و قاچـاخ لاسـایی ئـەو ئاوازانـەی دەکـردەوە کـە لـەرادیۆ دەیبیسـت، تەنانـەت لـە خوێندنگـە بـە پارچـە گـوێزان لـەمێزی وانـە خوێندنـدا ئـامێرێکی مۆسـیقی لێدروستکردبوو کە دەنگی وەک ئەو ئاوازانە بوو کە رۆژانە لەرادیۆ باوبوو، بۆیە ئـەم بـارە ئـەم هونەرمەنـدەی رازی نـەکرد تـا ئـەو کاتـەی تـوانی ئـامێرێکی (نـای) پەیدابکات و رۆژانە خۆی پێوەخەریک دەکرد و راهێنانی لەسـەر دەکرد، هێندەی ئەو ئامێرەی جوان لێدەدا تـا کـاری کـردە سـەر هەسـت و نەسـتی براگەورەکـەی، وایلێکرد کە سەنتورێک بکڕێت و لاسـایی براکـەی بکاتـەوە، بـەڵام هـیچ فێرنـەبوو بۆیـە زوو وازی لێهێنـاو ئامێرەکـەی خسـتە لاوە، ئالـەم کاتـەدا ئەسـتێرەی بـەختی موجتەبا بێداربووەوەو بە ئامێری سەنتوری براکەی شادبوو، لـەو دەمـە بـەدواوە میـرزادە بەهـەوڵ و کۆششـی خـۆی تـوانی لاسـایی ئـەو گۆرانییانـە بکاتـەوە کـە لـەرادیۆ پـەخش دەکـران، هـەر لـەو رۆژانـەدا خـۆی بگەیەنێتـە هونەرمەنـدی گەورە(حەسەنی کامکار)(٣) ئاشنایەتی لەگەڵ پەیدابکات و بچێتە رادیۆ سنەو لـە ئۆرکسـترای رادیـۆ بەشـداری بکـات و سـوود لـە ڕێنمـایی و ئامۆژگارییـەکانی وەربگرێت.

میرزادە پـاش یـەک سـاڵ لەگـەڵ (حەسـەن زیرەک، مەزهـەری خـالقی، هاشـم ربیعی) بەرنامەکانی خۆی پێشکەش دەکرد کە هێشتا قوتابی ناوەندی بوو، هێشتا

نۆتەی مۆسیقای چاک نەدەزانی، بەڵکو هەمووی بەهۆی ئەو هەستە ناسکەو گوێ سوکەیەوە بوو، کە دەست و پەنجەکانی تێکەڵاوی دەنگی حەسەن زیرەک دەکرد.

میرزادە هێندە عاشقی مۆسیقابوو، دەیویست زیاتر خۆی قوڵ بکاتەوە سوود لەکەسانی تر وەربگرێت، بۆیە ساڵی ١٩٦٧ چۆتە تاران بۆ فێربوونی نۆتەی مۆسیقا، رۆژانە کتێبێکی سەرەتایی نۆتەی دەکڕی و کە (ضیاء مختاری) دەینووسی، ئەم کتێبە بێجگە لەچەند زانیارییەکی سەرەتایی دەربارەی خوێندنەوەی نۆتەکە و ئەلفبای مۆسیقا هیچی تر نەبوو، بەڵام ئەو رۆژانە گۆڤارێک کە ناوی (مۆسیقای ئێران) بوو، دەرچوو، کەبەلای کەمەوە حەفتانە نۆتەی گۆرانییەکی بڵاودەکردەوە، لەکاتی خۆی بەگوێ فێربووبوو، بۆیە بە ئاسانی دەیتوانی نۆتەکان لەبەربکات، وە بەڕاهێنانێکی زۆر توانی بەم ڕێگایە فێری نۆتە خوێندنەوە ببێت.

ساڵی ١٩٦٨ بوو، کە رادیۆ رایگەیاند پێویستی بەچەند مۆسیقا ژەنێکە هەر لەو کاتەدا چوو بەدەم بانگەوازەکەوەو لەتاقیکردنەوەی (مستەفا کسروی) دەرچوو، ئیتر وەک مۆسیقاژەنێکی رادیۆ دامەزرا، لەو کاتەدا سێ تیپی رادیۆ هەبووکە چالاکانە کاری هونەرییان دەکرد بریتی بوون لە :

١-(نگیسا) بەڕابەری مستەفا کسروی

٢-(فارابی) بەڕابەری مورتەزای حەنانە

٣-(باربد) ، بەڕابەری فریدون ناسری

ئەمیش هاوکاری خۆی لەگەڵ تیپی (نگیسا و باربد) کرد، لەساڵی ١٩٧٠ هاوکاری خۆی لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی فەرهەنگ و هونەر دەستپێکرد.

پەراوێزەکان:

١-مهدی خالدی – پروێزی یاحقی، دوو مۆسیقاژەنی بەتوانای ئێرانن کە تا ئێستا پەروێزی یاحقی یەکێکە لە بەتواناترین مۆسیقاژەنی ئێران لەساڵی ١٩٣٦ لەتاران لەدایک بووە.

٢-صۆلۆ لە مۆسیقادا بەوە دەڵێن کە بەتەنیا یەک ئامێر مۆسیقا لێدەدات.

٣-حەسەن کامکار: باوکی هونەرمەندانی بەتوانا (بیژەن، ئەردەشێر، ئەرسەلان .. هتد)

# موجتەبی میرزادە

## ئەو هونەرمەندە کوردە بلیمەتەیە کە هێندەی تر گۆرانییەکانی حەسەن زیرەکی ڕازاندۆتەوە

ئازاد سالح ═ تیپی مۆسیقای شنروێ

لەخێزانەکان ڕێگایان دەگرت لەمناڵەکانیان بۆ ئەوەی نەچنە ناو جیهانی هونەرەوە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا زۆر لەهونەرمەندان لەم ناوچەیەدا پەروەردە بوون و هەڵکەوتوون.

ئەم هونەرمەندە زۆر مناڵ بووە کە لەگەڵ مۆسیقادا ئاشنایەتی پەیداکردووە ئەویش بەهۆی ڕادیۆی دراوسێکەیانەوە.

خۆی دەڵێت «هەرکاتێ دەنگی مۆسیقای ئاغایان (مهدی خالدی- پەرونزی یاحقی)(١) لەڕادیۆی دراوسێکەمانەوە لێ بدرایە ئیتر من بەهەموو هەستەکانمەوە لەگەڵیاندا دەژیام بەتایبەتی دەنگی صۆلۆکانیان(٢)، ئاشکرایە گوێم لەمۆسیقای هەموو هونەرمەندانی وڵاتەکەم دەگرت کە لەڕادیۆوە پەخش دەکران بەڵام دەنگی ئامێری ئەو دوو هونەرمەندە چێژی تایبەتی هەبوو لام». میرزادە هەروەك زۆربەی هونەرمەندان زۆر عاشق و شەیدای مۆسیقا بوو بەڵام توانای کڕینی ئامێری مۆسیقای نەبوو بۆیە نەوەی ئاسەو ئارەزووی خۆی پێ بشکێنێت.

هەموو ڕۆژێك دوور لەچاوی باوکی لەکەنارێکیماڵەوەدا بەقاپ و قاچاغی ماڵەوە لاسایی ئەو ئاوازانەی دەکردەوە کەلەڕادیۆ دەیبیست.

تەنانەت لەخوێندنگا بەپارچە گوێزان لەمێزی وانەخوێندندا ئامێرێکی مۆسیقای لێ دروست کردبوو کەدەنگی وەك ئەو ئاوازانە بوو کەرۆژانە لەڕادیۆدا باوبوو. بۆیە ئەم بارە ئەم هونەرمەندەی ڕازی نەکرد، تائەو کاتەی توانی ئامێرێکی (نای) پەیدا بکات و ڕۆژانە خۆی پێوە خەریك دەکرد و ڕاهێنانی لەسەر دەکرد، هێندە ئەو ئامێرەی جوان لێدەدا تا کاری کردە سەر هەست و نەستی برا گەورەکەی وای لێ کرد کەسەنتورێك بکڕێت و لاسایی براکەی بکاتەوە.

بەڵام هیچ فێر نەبوو بۆیە زوو وازی لێهێناو ئامێرەکەی خستەلاوە، ئالەم کاتەدا ئەستێرەی بەختی موجتەبی بێداربووەوەو بەئامێری سەنتوری براکەی شادبوو. لەو دەمە بەدواوە میرزادە بەهەوڵ و کۆششی خۆی توانی لاسایی ئەو گۆرانیانە بکاتەوە کە لەڕادیۆ پەخش دەکران هەر لەو ڕۆژانەدا خۆی بگەیەنێتە هونەرمەندی گەورە (حەسەنی کامگار)(٣) وئاشنایەتی لەگەڵ پەیدا بکات و بچێتە ڕادیۆی سنەو لەئورکسترای ڕادیۆ بەشداری بکات و سوود لەڕێنمایی و ئامۆژگارییەکان وەربگرێت، میرزادە پاش یەك ساڵ لەگەڵ (حەسەن زیرەك، مەزهەری خالق، هاشم ڕیحی) بەرنامەکانی خۆی پێشکەش دەکرد کە هێشتا قوتابی ناوەندی بوو وەهێشتا نۆتەی مۆسیقا چاك نەدەزانی بەڵکو هەمووی بەهۆی ئەو هەستە ناسکەو گوێ سووکەیەوە بوو کەدەست و پەنجەکانی تێکەڵاو دەنگی بەسۆزی حەسەن زیرەك دەکرد.

میرزادە هێندە عاشق مۆسیقا بوو کەدەبویست زیاتر خۆی قووڵکاتەوەو سوود لەکەسانی تر وەرگرێت بۆیە ساڵی ١٩٦٧ز چۆتە تاران بۆ فێربوونی نۆتەی مۆسیقا ـ ڕۆژانە کتێبێکی سەرەتایی نۆتەی دەکڕی کە (ضیاء مختاری) دەینووسی. ئەم کتێبە پێنجگە لەچەند زانیارییەکی سەرەتایی دەربارەی خوێندنەوەی نۆتەکە ئەلفبای مۆسیقا هیچی تر نەبوو. بەڵام لەو ڕۆژانەدا گۆڤارێك کەناوی (مۆسیقای ئێران) بوو دەردەچوو. کەبەلای کەمەوە هەفتانە نۆتەی گۆرانییەکی بڵاودەکردەوە کەکاتی خۆی بەگوێ فێری بوو بوو بۆیە بەئاسانی دەیتوانی نۆتەکان لەبەر بکات. وەبەراهێنانێکی زۆر توانی بەم ڕێگایە فێری نۆتە خوێندنەوە بێت.

ساڵی ١٩٦٨بوو کەڕادیۆ ڕایگەیاند پێویستی بەچەند مۆسیقاژەنێکە هەر ئەو کاتە چوو بەدەم بانگەوازەکەوەو لەتاقی کردنەوەدا (مستەفا کسروی) دەیکردن دەرچوو ئیتر وەك مۆسیقاژەنێکی ڕادیۆ دامەزرا.

لەوکاتەدا سێ تیپی ڕادیۆ هەبوو کەچالاکانە کاری هونەری دەکرد بریتی بوون لە:

١ـ (نگیسا)(٤) بەڕابەری مستەفا کسروی.

٢ـ (فارابی) بەڕابەری مورتەزای حنانە

٣ـ (باربد)(٥) بەڕابەری فریدون ناسری

ئەمیش هاوکاری خۆی لەگەڵ تیپی (نگیساو باربد) کرد، لەساڵی ١٩٧٠ هاوکاری خۆی لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی فەرهەنگ و هونەر ...

کێن لەتیمە گوێی لەدەنگی حەسەن زیرەك نەبووبێ، لەگەڵ ئەو گۆرانیانەدا دەنگی بەسۆزی ئەو کەمانچەیە نەبیەزاندبێت کە لەگەڵ گۆرانییەکانیدا ئاوێزان دەبوو، وای لەگوێگر دەکرد هێندەی تر چێژ لەو گۆرانیانە وەرگرێت و بەنەمری بمێنێتەوە.

کێن هەست بەو جیاوازییە گەورەیە نەکات لەگۆرانییەکانی حەسەن زیرەکدا ئەوانەی کەلەئێستگەی بەغدا تۆمار کراون لەگەڵ ئەوانەی لەکرماشان تۆمار کراون ئەمیان مۆسیقایەکی کرچ وکاڵ و ئەویان تەڕوبڕ. ئەوانەی بەغدا بێ پێشەکییەکی مۆسیقایی، گۆرانییەکانی کرماشانی پێشەکییەکی جوان و ڕێك وپێکی هەیە. ئەوانەی بەغدا زۆر بەسەرپێی تۆمار کراون ئەوانەی کرماشانی ماندووبوونێکی زۆری لەگەڵ کراوەو زۆرجوان تۆمارکراوە. ئەوانی بەغدا هەست دەکەیت زۆر بێ گیانە، ئەوانی کرماشان هەست دەکەیت هێندە ڕۆحت دەبزوێنێت. ڕۆحیەت و مۆرکی مۆسیقاکانی ئێستگەی بەغدا زیاتر عەرەبییە، چونکە مۆسیقاژەنی عەرەب زۆربەی ئامێرەکانیان ژەندووە.

بەڵام گۆرانییەکانی کرماشان زۆر نزیکە لەدەنگ و مۆرکی حەسەن زیرەك ئەویش ڕۆحیەت و مۆرکی کوردییە.

بەڵێ.. لەپشت پەردەکانەوە چەندین مۆسیقاژەنی بەتوانا لەدوای ئەو سەرکەوتنە مەزنەن کە گۆرانییەکانی حەسەن زیرەك بەدەستی هێناوە.

دڵنیام لەوەی کەزۆر لەشەیدایانی دەنگە بەسۆزەکەی حەسەن زیرەك ئامەزرۆو تینووی ئەوەن تا بزانن ئەو هونەرمەندە بلیمەتە کێیە ئەو کەمانچە بەسۆزە لێدەدات. چونکە ناتوانین بڵێین جریکەی دەنگی حەسەن زیرەك و سۆزی کەمانچەکەی هونەرمەندی بلیمەت (موجتەبی میرزادە) دوانەن و لێك جیاناکرێنەوەو هەردەم ئاوێزان و دەست لەملانی یەکترن موجتەبی میرزادە لەساڵی ١٩٤٥ز لەکرماشان لەدایك بووە. ... بارودۆخی ئەوکاتە کەزۆر

# بۆ کچە غەمبارەکانی شارەکەم

لاوەند ئەوزاد

هەڤاڵانمان... وادێنەوە. بەرەو دڵی شارەکەم و بەرەو ئەوێڵی گەشتان.. هەنگاو دەنێن.

چاوەڕێ بن... لەپایزدا! بەرگی بەهار لەباڵای هەولێر دەپێچن... ئۆقرە بگرن، لەسپێدەیەکی ڕۆژانی پایزدا، لە شاشەقامێکی ماندوو، و ڕۆشن بەتاڤێکی گشنگر، هەڤاڵانی بیروباوەڕ بەدی دەکەن!

سارتەر دەڵێ: مرۆڤ هەڵوێستە. سڵاو لەهەڤاڵانی بە هەڵوێستم... دیسان دەڵێ: قسەکردن لەگەڵ ئافرەت فەلسەفەیە... سڵاو لەفەلسەفەی زامدارتان....

ئەی شارەکەم، بەرۆیینی هەڤاڵانم، تووڕە مەبە!

لێکدابڕانی موزمینی، ئێمەو هەولێر، سەراپێکە... لەبەر خۆرێکی وەهمیدا. بەرۆیینی هەڤاڵانم «شار» لەکچان دڵگیرترە، غەمبارترە...

دڵی کچانی عاشقیش.... لەدڵی تر بەسۆزترە!

پایز داهات... ئۆقرە بگرن، لێکدابڕانی موزمینی ئێمەو هەولێر خەیاڵێکە، هەڵپێنجراوە... لەنێو مێشکی مردوونێکدا... مردوونێکدا!

پەراوێزەکان :

١ـ مهدی خالدی- پەرونزی یاحقی- دوو مۆسیقاژەنی بەتوانای ئێرانین کەتا ئێستاش پەرونزی یاحقی بەیەکێکە لەبەتواناترین مۆسیقا ژەنی ئێران- لەساڵی ١٩٣٦ز لەتاران لەدایك بووە.

٢ـ صۆلۆ: لەمۆسیقادا بەوە دەڵێن کەبەتەنها یەك ئامێر مۆسیقا لێدەدات.

٣ـ حەسەن کامگار: باوکی هونەرمەندانی بەتوانا (بیژەن، ئەردەشیر، ئەرسەلان..هتد)

– تێبینی/ ئەم بابەتە لە پاشکۆی ئەدەب و هونەری کوردستانی نوێ ژمارە ١٤٧٠ ڕۆژی پێنجشەممە ٢-١٠-١٩٩٧ بڵاوکراوەتەوە

## پەیوەندی مۆسیقا بەسەماوە

یەکێک لەو هونەرانەی کە پەیوەندییەکی راستەوخۆیان بە هونەری مۆسیقاوە هەیە (سەما)یە Danse یەکەمین پەیوەستبوونی سەما بە مۆسیقاوە لەوەدا بەدەردەکەوێت کاتێ کە گوێت لە ئاوازێک دەبێت هەموو جەستەت دەکەوێتە جوڵە کە لە پێیەکانەوە دەستپێدەکات تا دەگاتە هەموو لەش، تەنانەت کە مۆسیقا ژەنێک ئامێرەکەی دەژەنێت بە پێی خێرایی و خاوی رەزمی ئەو ئاوازە پێی دەجوڵێت، بۆیە دەتوانین بڵێین یەکەم پەیوەندی بە مۆسیقاوە سەماکردنی ناخ و هەستی ناوەوەیە پاشان دەگاتە جەستە، بە واتایەکی دی کاردانەوەی لەسەر هەست و نەست دەبێت و پاشان خۆی دەگەیەنێتە جەستەی مرۆڤ.

پەیوەندی مۆسیقاو سەما تەنها لەمرۆڤدا رەنگ ناداتەوە بەڵکو زۆربەی گیانداران ئەم پەیوەندییە کاریگەری هەیە لەسەریان، کە (مار) یەکێکە لەو گیاندارانەی لەتەک مۆسیقادا جۆرە سەمایەک دەکات.

ئەم پەیوەندییە لە دێر زەمانەوە هەستی پێکراوە وە لێک جودا کردنەوەیان لای کۆمەڵگا سەرەتاییەکان کارێکی ئاسان نەبووو، تەپڵ لێدان یان چەپڵەکوتان هۆیەکە بۆ ئەنجامێکی تر کە سەمایە.

لای هەندێ کۆمەڵگا شێوەیەکی پیرۆز دەگرێتە خۆ وە دەبێتە بەشێک لەبۆنە ئاینییەکان، سەمای دەروێشان ئەو راستییە دەردەخات. لای قولە رەشەکانیش هۆیەکە بۆ دەربڕینی نارەزایی بۆ داواکردنی مافەکان دژی جیاوازی رەگەز، دەبێت ئەوەش لەیاد نەکەین کە مۆسیقا هونەرێکە پەیوەندی بەکاتەوە هەیە کەچی هونەری سەما پەیوەندی بە شوێنەوە هەیە بۆیە دەتوانین بڵێین کە بەهونەری سەما هەردوو توخمەکە (کات و شوێن) پەیوەست دەبن بەیەکەوە.

چونکە سەما بێ مۆسیقا نابێت، کە هێزێکی جوڵێنەرە کە لە ئاستیدا جەستە ملکەچ دەبێت و لەگەڵ رەزمەکانیکدا رەوتی جوڵەو نەشئە وەردەگرێت.

مۆسیقا هێزێکی کاریگەر لەسەما وەردەگرێت و گیانی پێدەبەخشێت. تەنانەت هەندێ لە توێژەرەکان دەڵێن سەما یەکێک بووە لەو دوو هۆیەی کە مۆسیقی رۆژئاوایی پەرەپێداوە کە ئەوەی دییان کەنیسە بووە. وە ئەوەی جێگای تێرامانە

کاریگەری سەما بۆ سەر مۆسیقا پێچەوانەی کاریگەریێتی کەنیسە بووە. سەما جەستەی پێبەخشیوە و کەنیسەش گیان.

بۆیە کەنیسە هەمیشە هەوڵی داوە مۆسیقا لە جەستە دوور بخاتەوە نمونەش بۆ ئەمە ساڵی ١٩٠٦ کە سەمای تانگۆTango هاتە ناو مۆسیقای رۆژئاواییەوە کەنیسە کەوتە دژایەتی کردنی بەڵام بۆی نەچووە سەر چونکە هەردوو هونەرەکە دەگەڕێنەوە سەر رەگ و ریشەی لێکئاڵاو، تەنانەت هەندێ لە ستایشە ئاینییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست سەمائامێز بوو بۆیە مۆسیقا و سەما هاوسەنگیان پەیداکرد و بەم شێوازە (بالیە) پەیوەستبوونی سەمای بە مۆسیقاوە چەسپاند وە چەندەها دانەری مۆسیقا خۆیان تەرخان کرد بۆ کاری بالیە هەر لە رامۆوە Rameau تا دەگاتە سترافنسکی Stavinsky .

لە تێڕوانیمان بۆ هونەری بالیە پەیوەندی پتەوی نێوان مۆسیقا و سەما بەسانایی بەدی دەکەین کە لە پێ و پل و جوڵانەوە دەستپێدەکات تا دەگاتە دەست و پەنجەو لەنجەی لەش و لار، بەڵکو لەمەش گرنگتر جوڵەی ئەو مایسترۆیەیە کە سەرپەرشتی ئۆرکسترا دەکات، کە لە شێوەدا جۆرێکە لەسەما، لەناخیشدا جیهانێکە لەرەزم و ئاواز و هاودەنگی مۆسیقا.

بەپێی قۆناغەکانی گۆڕانی کۆمەڵ و داهێنانە ئەدەبی و هونەری و زانستیەکاندا سەماش گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە جۆرەها سەما هاتۆتە کایەوە وەک ڤاڵس – تانگۆ – فۆکستروت – روندو – پوپ – دیسکۆ بۆ نمونە بەداهێنانی فرۆکە لە ساڵی ١٩١١ هێندە سەرسوڕهێنەربوو سەمایەک داهێنرابەناوی سەمای فرۆکە کەلاسایی فرۆکەی دەکردەوە لەکاتی هەڵفڕیندا، هەروەها لەسەرهەڵدانی سەرمایەداری و خاوکردنەوەی جەستەی ماندووی کارمەندانی کارگەکان جۆرەها داهێنراوی وەک رۆک – جاز – دیسکۆ پوپ داهێنرا ئەویش بۆ خاڵیکردنەوەی هەست و جەستەی ماندوویان.

لای کۆمەڵگای رۆژهەڵاتیش سەما و مۆسیقا وابەستەی یەکترن، هەڵپەڕکێی میللی میللەتانی رۆژهەڵاتیش چاکترین نمونەن، لای عەرەب هەڵپەڕکێی چوپی – هجح – هێوە ، لای کوردیش شێخانی، گوڵشێنێ، بابلۆکان، سێ پێی و چەپی و سوێسکەیی کە زۆریان بەناوی ئەو گۆرانیانە ناو نراون کە لەگەڵیدا دەوترێت. بەڵکو خێرایی و خاوی ئەم هەڵپەڕکێیانە بە پێی ئاو و هەوا و جوگرافیا و داب و

نەریت دەگۆڕێت (کە هەندێ میللەتان سەما وەک خەوش سەیر دەکەن، بەڵام لە وڵاتانی رۆژئاوا چەندەها خوێندنگە و پەیمانگا دەکرێتەوە بۆ فێرکردنی سەما و بالیە، بۆیە دەبینین هەڵپەرکێ و سەمای شوێنە ساردەکان خێراترە لە گەرمەکان.

بۆیە دەڵێن کە سەما لەلایەک دەمانخاتە نەشوەی سۆفیانەوە لەلایەکی دییەوە جەستە دەهەژێنێت و ئارەزووی سێکس دەجولێنیت، کە لەسەمای رۆژهەڵاتی – دیسکۆ – جاز کە جوڵەی پێی و پل و لارولەنجە و لەرەی سینە، هێندەی تر مۆسیقا و سەما ئاوێتەی یەکتر دەبن و رۆدەچنە قوڵایی هەستی جوانکاریمانەوە و نەشئەو خۆشی دەدەن بەگیان.

سەرچاوە : مع موسیقی دراسات و ذکریات، تالیف الدکتور فواد ذکریا، الهیئە المصریە العامە للتالیف و النشر

تێبینی/ ئەم بابەت لە رۆژنامەی پاشکۆی ئەدەب و هونەری کوردستانی نوێ ژمارە ١٥٧٥ لەرۆژی پێنج شەمە ١٢-٣-١٩٩٨ بڵاوکراوەتەوە

ژمارە: ١٥٧٥ پێنج شەممە ١٩٩٨/٣/١٢ — 8 — Kurdistani Nwe — کوردستانی نوێ

## پەیوەندی مۆسیقا بەسەماوە

ئازاد ساڵح

مۆسیقا نوێنەری بەشێکی سەرەکی شارستانییەتی مرۆڤایەتییە، بۆیە پەیوەندییەکی راستەوخۆی بە ژیانی نەوە یەک لەدوای یەکەکانەوە هەبووە، لەقۆناغەکانی گەشەکردنی شارستانییەتدا، هەر قۆناغەش جۆرە قوتابخانەیەک و جۆرە بۆچوونێک وجۆرە رەنگدانەوەیەکی خۆی هەبووە لەسەر هەست و بیری شارستانییەتی ئەو دەمانەو هەر کۆمەڵگایەک.

ئەفلاتوون مۆسیقای داناوە بە یەکێک لە بزوێنەرە پیرۆزەکانی هەستی مرۆڤ، کە راستی و دادپەروەری تێدا رەنگی داوەتەوە، هەر لەم بۆچوونەی ئەفلاتوونەوە دەردەکەوێت کە مۆسیقا رۆڵی گرنگی بینیوە بۆیەکخستنی هەستەکانی دەربڕین لای مرۆڤ، کە توانیویەتی ببێتە شێوازی دەربڕین لای تاک و کۆمەڵ وهەستەکانیان یەکبخات.

مۆسیقا – لە شارستانیەتی کۆندا هۆیەک بووە بۆ پەرستن و پەیوەندی نێوان مرۆڤ و هێزی سەرەوە، هەروەک چۆن بۆتە هۆیەک بۆ یەکخستنی هەست و نەستی جەنگاوەران لەکاتی شەڕەکاندا، هەر لەگەڵ ئەمانەشدا خۆی ئاوێتەی سەماو سرووتە ئاینییەکان کردبوو، فاکتەرێکی سەرەکی بۆجۆشدان بە جوڵەو رەزمی ئەو نمایشانە.

بەتایبەتی شارستانیەتی فیرعەون و بابلی کە گیانێکی زیندووی خۆرهەڵات بوون، کە تائێستاش سەرچاوەیەکی بەپێزی چەندەها ئیلهامی مۆسیقایی بووە.

مرۆڤ هەر لەسەرەتاوە لەگەڵ دەوروبەری مامەڵەی کردووە، بەپێی گونجاندنی ژیانی چەندەها مەقام و رەزمی (ئیقاع) داهێناوە. شارستانییەتە کۆنەکانیش ئەمە دەسەلمێنن هەروەها نکوڵی لە شارستانییەتی یۆنانی کۆن ناکرێت کە خۆرئاوا بە پێزەوە سوودی لێوەرگرتووە، بۆیە دەتوانین بڵێین پەیوەستمان بوونمان بەو گەشەسەندنە مێژووییە لەگەڵیدا چێژوەرگرتن لەجوانکارییەکانی مۆسیقا هەردەم لە گۆرانکاریدا بووە، چونکە هونەرێک نییە کە بۆ خۆی سەربەخۆ بێت، ئەگەر بێت و بەو گۆرانکارییە بەردەوامانەوە پەیوەست نەبێت کە لە ئاستی چێژ وەرگرتندایە.

وه بەچاوپێداخشاندێک بەو سەردەمە مۆسیقاییە سەرەکیانە دەبینین مۆسیقا وەک هۆیەکی بیرکاری بۆ دەربڕین خۆی لەچەند بنەماو فۆرمێک دا دەبینێتەوە کە هەر سەردەمەو قۆناغی تایبەتمەندی خۆی لە شێواز و دەربڕین و داهێنانەکاندا هەیە بۆ وەدەستهێنانی یەکێک لە توخمە سەرەکییەکانی چێژی مۆسیقا ئەوەیە کە تا چەند دەتوانین پەیوەست بین بە شێوازی هونەری(الاسلوب الفنی) وە پاشکۆی رۆشنبیری ئەو سەردەمەی کە مۆسیقاکەی تێدا بەرهەم هێنراوە، چونکە دیاردە کۆمەلآیەتی و رۆشنبیرییەکانی ئەو سەردەمەیە کە دەتوانێت کارێکی وا بەرهەم بهێنێت کە رەنگدانەوەی خۆی تیادا بەرجەستە بکات.

توێژەرانی مۆسیقا هەریەکی بە جۆرێک پێناسەی (شێواز) دەکات، هەیە دەڵێت بریتییە لە (فۆرم، بیرۆکە، رەزم) ئاوازەکان و مەقامەکانیان چارەسەرکردنی دابەشکردنی (بولیفینی یان هارمۆنی) لەوانەیە بڵێین کە بلیمەتێکی وەک باخ بە جوانترین شێوە پێناسەی شێوازی کردووە کە دەڵێت (شێواز بریتییە لەرەنگ و بۆی گیانی کارە هونەرییەکان)

راستە ئەگەر رەنگ و بۆی مرۆڤێکی ئاسیایی لە ئەفەریقایی و ئەوروپی جیاواز بێت، ئەی چی دەوترێت دەربارەی جیاوازییە گیانی و رۆحییەکان؟ هیچ نکولی لەوە ناکرێت کە شارەزایی بوون لە کلتوری رۆشنبیری مۆسیقایی هۆیەکی گرنگە بۆ پڕبارکردنی چێژ لای گوێگر، ئەم باکگراوندە رۆشنبیرییە پاپەندە بە رۆشنبیری هەموو سەردەمە مۆسیقییەکان و شارستانیەکانی، هەر بەمەشدا شێوازو دەبڕین و بیرۆکەیە دەرکەون و چێژوەرگرتن نەش و نما دەکات و پەروەردە دەکرێت، بۆ ئەوەی هەست بە شێوازی سەردەمە نوێکان بکەین و لێی تێبگەین پێویستە بگەڕێینەوە بۆ بنەماو ئەو رەگ و ریشانەی کە ئەو شیوازانە چۆن چەکەرەیان کردووەو باڵایان گرتووە. بۆیە هەر خوێندنەوەیەکی مۆسیقای کۆن هەرچەندە ساناش بێت پێویست بەو رۆشنبیرییە هونەرییە دەکات، چونکە مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە.

مرۆڤیش خۆی لە خۆیدا مێژووە لە نەوە یەک بەدوای یەکەکاندا، کەواتە هونەر و مرۆڤ مێژوویەکی دانەبڕاون لەیەکدی کە مەحاڵە جودا ببنەوە، هونەری مۆسیقاش ئەو هونەرەیە کە توخمی سەرەکی گۆڕانکاری ویژدانی مرۆڤە لە چاخە یەک لەدوای یەکەکاندا.

ئەو هەگبە پڕبارەی کە گوێگر خۆی پێ قانگداوە، رۆڵێکی کاریگەر دەبینێت لە چێژیدا بۆ مۆسیقا، بەڵکو بنەمایەکیشە بۆ پەرەپێدانی  چێژی ئاستی هەست کردنی بـە شارسـتانییەت و هونـەر و مێـژووەوە رادەی کاردانـەوەی بەرامبـەر ژیـان و مرۆڤ، هەر ئەم هەستانەشە کە بەردەوامی دەبەخشێت بـە ژیـان و نوێگەرایـەتی لەخودی خۆیدا بەرجەستە دەکات.

هەسـت کـردن بـەو جیاوازیـەی  ئیسـتاتیکا مەزنـەی نێـوان جـوان و ناشـرین لـەواتای شـتەکان بـێ ئـەوە کـاری لەسـەر داتـەپانی شارسـتانیەتی و کپبـوونی نەوەکان بێت. هەر بەهۆی هونەری مرۆڤایەتییەوە دەتوانین ئاسـتی داهێنانـەکانی هزر و چەپۆکانی بیر پەی بێ بەرین، لەوەش گرنگتر دەتوانین نهێنییە شاراوەکانی داهێنـان لەگیانـدا بدۆزینـەوە و ئاڕاسـتەی بکـەین. گومـانیش نییـە کـە گـوێگرتنی بەردەوام خۆی لەخۆیدا بەسانایی گەشەی گیانـە هـەروەک چۆن لـە هونـەرەکانی دیدا هەیە، بەڵام ئەگەر بگەڕێین بەدوای تولە ڕێگایەکی تردا بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ مانای هونەرە جوانەکانی تردا، دەبینین خۆمان خستۆتە ناو دەریایەکی بێ بنـەوە و لەگەڵ شەپۆلەکانی ناوەوە مامەڵە دەکەین مانایەکیش وەدەست دێنین کـە بـەها جوانەکانی ژیانمان بۆ بەرجەستە دەکات ئەمەش خۆی لە خۆیدا چێژوەرگرتنە لـە جوانکـاری هونـەردا، واتـە چێـژ وەرگـرتن لـە تێگەیشـتنی هونـەری دانەرەکـە، وە گەڕخســـتنی هەســـت لەگـــەڵ توخمـــەکانی دەربڕینـــی مۆســـیقادا وەک ئـــاواز، دابەشـکردنی هـارمۆنی، فـۆرم، جـۆری رەزمـەکان، بەمـەش کـت و مـت چێـژی ئیستاتیکی پێناسە دەکەین و دەڵێین (کلتورێکی پڕ چێژە کـە هەمیشـە و هەمیشـە لـەنوێ بوونەوەدایـە، هـەرگیز خـۆی لەدەسـت نـادات و کـە لـە تـوێی تێگەیشـتنی ئەقڵیانە کاردانەوەیەکی پڕ سۆز لە ئامێز دەگرین.

ئەمـە تـەنها کـاری هونـەری مەزنـە، بـە پێچەوانەشـەوە داشـەکان دژ بەیـەک دەبنـەوەو کـار بـە پێچەوانەوەیـە، ئـەو مۆسـیقا بـەهادارەی کـە پاشـکۆیە بـۆ ســــەردەمێک خـــۆی لەخۆیـــدا تایبەتمەنـــدی وردکـــراوەی دانەرەکەیـــەتی، بیروبۆچوونیەتی، بەکارهێنانی هێماکان بۆ داڕشتنی واتاکان کە بەدرێژایی تەمەن خۆی مەڵاس داوە لە هەست و بیرکردنەوەو مـەودا خەیاڵەکانیدا، هـەر لەبـەر ئـەم هۆیانە بەگوێگرتن لەم کارانە خۆی لەخۆیدا چێژ وەرگرتنـەو واتاکانمـان بـۆ شـی دەبێتەوە، ژیانمان بۆ جوانتر دەکەن، کێ بێ لـە ئێمـە ژێکـانی هەسـتی لەگـەڵ ژێـی هەستی رابەری ئۆرکسترادا یەک ئەخات و رۆنەچێتـە نـاو دنیـای دانراوەکانـەوەو

لەگەڵ شنەبای لەنجەی مۆسیقاژەنێکی ناسکپەنجەدا با نەیهەژێنێت و تێکەڵ بە پێ و پل و پەنجەی ئەو شۆخە کەمانچە ژنە - ڤیولا ژەنە نەبێت؟

ئەم ساتانە خۆیان لەخۆیاندا فێری مەوداکانی ژیانمان دەکات فێری چرکە پڕتاسەکان، چرکە هەست تەزێنەکان، پڕ موچڕکەکانمان دەکات کە بەختیاری لە ئامێز دەگرێت لەو خواوەندانەمان نزیک دەکاتەوە کە حەقیقەتی لەپشتە ئەویش خوای جوانی و مۆسیقایە کە یۆنانییەکان ناویان لێناوە (الە الجمال) ، کە گوێ رایەڵی مۆسیقایەک دەبین یان چاومان بە دانسێکی نایاب، گۆران واتەنی دەکەوێت ئەو مۆسیقاژەنەی کە بەنەرمی، بە ناسکی، بەشۆخی، پەنجەکانی جووت دەکات لەگەڵ ئاواز دابەشکردن، لەگەڵ جەستەو لەرینەوەی لەش، لەپی و پل و خەندە و بزەی پر واتای هەژان تینوو بە هەموو ئەو کانیاوانەی کە سەرچاوەیان وشک بووەو لەو ساتانەدا هەر هەموویان دەتەقنەوە، لەگەڵ رونـاکی ناو هـۆڵ و ئەفسونی ئارەقی ماندوو بوون و بەد گومانی لە هەموو واتاکان و هەرەسهێنانی هەموو بەها پڕ بایەخە دروستکراوەکان، دارِمانی تەمەن، بەرجەستەبوون، لەساتە وەختەکانی توانەوەو رۆچوون بۆ قولایی حەقیقەت کە ژیان خۆی تێدا مەڵاس داوە لەو چرکانەی کە هەست بە ونبوونی کات دەکەین و ریتمەکانی گەردوون خۆیان لە ریتمەکانی مۆسیقادا دەتوێتەوە.

کە گوێڕایەڵی مۆسیقایەک دەبین لەچەند رێگایەکەوە هەست بە چێژ دەکەین وەک ئەوەی مۆسیقاژەنێکی تاک ژەن (صۆلۆ) زۆر بە سەرکەوتوویی رستە مۆسیقایەکانمان بۆ دەهۆنێتەوە لەگەڵیدا هەست بە دڵەراوکێ دەکەین، هەروەها بەختیاری لە ئامێز دەگرین و پەیوەندیمان لەگەڵیدا پتەوتر دەبێت.

کاتێک لەگەڵ دانراوێکی مۆسیقادا دەژین لەگەڵ رستە یەک لەدوای یەکەکاندا هەست بە هەڵچوون و داچوون دەکەین و دەگەینە لوتکەی چێژەوە، بە کارە سومفۆنیەکاندا، لەگەڵ ئەم هەموو چێژ وەرگرتنەوە چوونە ناو دنیای رستەی جوان و هارمۆنی و گورجی و خاوی ئاوازەکان، نابێت بیرۆکەی (الفکرە) ئەو دانراوانە لەیادبکەین و فەرامۆشی بکەین، ئەم بیرۆکەیەش لەچەند لایەنێکی جوانکاری فەلسەفیدا خۆی دەنوێنێت کە هەندێ کاری زانستە مۆسیقاییەکان ئەگەر بمانەوێ لەماناو واتای رستە مۆسیقاییەکان بکۆڵینەوە کە خۆی بەرجەستە دەکات دەبینین دەنگەکان لە مۆسیقادا چوون وشەن لە زماندا، دواتریش بەرامبەری وشەکان دەوەستینەوە لەو هونەرەی کەپشت بە زمان دەبەستێت، کە

به شێوەیەکی گشتی هێمایەکە بۆ دەربڕین، دەشزانین کە وشە هەڵگری مانـاو بیرۆکەیە کە مرۆڤ ئاڵوگۆڕی پێدەکات، پاشتریش دەنگە مۆسیقاییەکان هـەمان تایبەتمەنـدی زمـانی هەیـە لـە دەربڕینـدا، چونکـە راسـتە لـە ئەدەبـدا شـیعر لـە مۆسیقاشدا رستە بەرامبەری وشە دەوەستێتەوە کە ئەویش خۆی بۆ بیرۆکەیەکە بـۆ دەربـڕین و گـەڕان بـەدوای شـتەکاندا، لەبـەر ئـەم هۆیانـە مانـا لـە مۆسـیقادا ئاوازەکان هەڵیدەگرن کە پێی دەوترێت بیرۆکـەی ئـاواز، کـە کـارە مۆسـیقایەکەی لەسەر بونیاد نراوە.

وەهەر ئەم بیرۆکەو ئاوازانە لە مافورێکی چنراو و بونیـادێکی هـەڵچوو دەچـن کە بیرۆکەی دانەرەکە و هەست و ناوەڕۆکی ئەو کارە پێکدەهێنن.

کاتێ گوێمان لە دەربڕینێکی جوان دەبێت بە هـەموو هەسـتمانەوە دەچینـە نـاو ئەو کارەوە لەوانە بەهۆی ئـەو چەنـد ئـامێرە مسـانەوە بێت کـە خـۆی لـە لوتکـەی هـەڵچوون دەبینێتـەوە، یـان لـە ئـامێرە رەزمییـەکان کـە دڵمـان دەخاتـە خورپـە، وە چەند هەسـتێکی دی لـە ئـاوازێکی هـێمن و لەسـەرخۆدا بـەدی دەکـەین، لەبـەر ئـەم هۆیانە گوێبیستی مرۆڤ بۆ هەر ئاوازێک یان دانراوێک بە پێی ئەو ئاوازە یان ئەو دانراوە دەگۆڕێت.

تەنانەت باری دەروونی گوێگریش رۆڵی خـۆی هەیـە، بـەڵکو چێژوەرگـرتن لـە مرۆڤێکەوە بۆ ئەوی دی دەگۆڕێت و یادگارەکان دەهێنێتەوە یاد تەنانەت مێژووی ژیـانی گـوێگریش بـۆ نمونـە کـە گوێـت لـە ئاوازێـک بـۆ یەکـەمجار بـووە لـەکات و شـوێنێکی دیـاریکراودا کـە بۆچەنـدان جـار گوێـت لـەو ئـاوازە دەبێتـەوە هـەمان یادگاری ژیـانتی تێدا بەرجەسـتە دەبێت، هـەموو ئەمانـە بـرەو پێ دراوتـر دەبێت لەگـەڵ زۆری گـوێگرتن و چێـژ وەرگـرتن لـەو جوانکـاری مۆسـیقایە، دەربڕینـی مۆسیقایی بە چێژو داهێنەرانە لەچەند تـوخمێکی سـەرەکی پێکدێت کـە بریتیـە لـە ئـاواز، دابەشـکردنی هـارمۆنی، رەزم، فـۆرم، چێژوەرگـرتنیش خـۆی لەخۆیـدا پێویستی بە تێگەیشتنی قوڵ هەیە لە هەر یەک لەم بوارانەدا.

گـوێگرێکی ئاسـاییە بـە نغرۆبـوون و قوڵبوونـەوە لـە هەریـەک لـەم توخمانـە هەست بەلایەنە جوانەکانی ئەم کـارە دەکـات، دوای ئـەوە چەنـد جارێـک ئـاوێزانی گوێگرتنی دەبێت، وردە وردە دەگاتە ئەوەی هەریەک لەم توخمانە ببەستێتەوە بـە بونیادی سەرەکی ئەو دانراوە.

ئـەو سـەرچاوانەی کـە دەربـڕین پربـارتر دەکـات خێرایـی، جـۆری ئـامێرە

مۆسیقاییە بەکارهاتووەکان، بەشداری دەنگی مرۆڤ، جۆری ئامێرە رەزمییەکان (الالات الایقاعیە) ئەمانەو جگە لە فۆرمی ئەو دانراوە کە بریتیە لە شێوەو ناوەڕۆکی کارەکە زانستیانەو جوانکاریانە بیرۆکەکەی تێدا دەردەکەوێت.

واتە لە مۆسیقادا بەهەست کردن وەدی دێت کە لە هەناوی ئەو کارەدا خۆی حەشارداوە کە پێی جۆرەکانی دەگۆڕێت، هەروەها بە جیاوازی نێوان دەنگەکان و پێکهاتەکانی ئەو واتایەی کە بیروبۆچوونی دانەر هەڵیدەگرێت و بە وەستایانە دەری دەبڕێت.

گوێگریش خۆی لەبۆتەیدا دەبینێتەوە تا چ رادەیەک دەتوانێت ئەو کارە شی بکاتەوە و هەست بە چێژەکانی بکات... ئەویش بە پێی راهاتن و تاقیکردنەوە لەم بوارەدا.

ئاشکراشە کە هەرسەردەمەی جۆرە فۆرمێک، بیروبۆچوونێک ، کە پەیوەندی بە ئاستی بیرکردنەوەی کۆمەڵ لەبوارەکانی تری ژیاندا رەنگدەداتەوە و تێڕوانینێکی بۆ دیاردەکان (خو و نەریت، باری ژیان و گوزەران، دەسەڵات، ئاینی سەردەم تەنانەت تەکنەلۆژیای پیشەسازی ئامێرە مۆسیقاییەکان و بەکارهێنانیان)

لەو فۆرمانە موتیت (Motet) گۆرانی میللی، ستایشی ئاینی کە تایبەتە بەدەنگی ئەو کارانەی کە تەنها بۆ ئامێرە مۆسیقاییەکان تایبەتە وەک سەمفۆنیاو سۆناتە، کۆنشرتۆ. بەم فۆرمانە دانەر بیرۆکەی خۆی هەڵدەڕێژێت لەشێوەی کاری ئاوازی دژیەک واتا پەیوەندییەکی دیالەکتیک وشەکان بچڕین واتا نابەخشن تا بەشێوەیەکی دژیەک نەچێنرێت، ئەمەش برگە و بەشۆکە پێکدەهێنێت کە تەواوکەری یەکدین، هەمان شێوەش لە مۆسیقادا دەنگەکان لای دانەر هیچ ناگەیەنن، تاپێکەوە گرێ نەدرێت لە پەیوەندییەکی دژیەکدا، چونکە یاسای دژیەکی یەکێکە لە یاسا سەرەکییەکانی ژیان، چونکە هیچ تیۆرێک بێ دژ نییە، سارد بێ گەرم نییە، شەو بێ رۆژ نییە، چاکە بێ خراپە نییە، رەشیش بێ سپی نییە.

لەکۆتاییدا دەبێ ئەوەش لەیاد نەکەین کە هونەری مۆسیقا تایبەتمەندی خۆی هەیە و سێ رەگەزی سەرەکی رۆڵی لەبواری کارە مۆسیقاییەکاندا دەبینێت کە بریتیە لە :

١ـ دانەر

٢ـ دەربڕ (گۆرانی بێژ، یان مۆسیقاژەن)

٣ـ گوێ بیست.

کەواتە دانەرێکی بلیمەت و بیرۆکەیەکی جوان و پاشان ئەنجام گەیاندنی ئەو کارە لە ڕێگای دەربڕەوە پاشان گوێ بیست بەهەموو هەستەکانییەوە چێژی لێ وەردەگرێت، کەواتە بە تەواوکەری ئەو سێ توخمە بڕیار لەسەر جوانی ئەو کارە دەدرێت واتە گوێ بیستیش بەشدارە لەو داهێنانەدا.

سەرچاوەکان:

١ـ دعوة الى الموسيقى مايسترو : يوسف السيسى

٢ـ مع الموسيقى ذكريات و الدراسات، دكتور فواد زكريا.

٣ـ البعد الجمالي، هبرت ماركوز، ترجمه: جورج طرابيشى.

تێبینی/ ئەم بابەتە لە گۆڤاری شاکار ژمارە ١ی ساڵی ١٩٩٩ بڵاوکراوەتەوە.

## چێژ و فۆرم لە جوانکاری مۆسیقادا

ئازاد صالح / تیپی مۆسیقای شنروێ .

مۆسیقا نوێنەری بەشێکی سەرەکی شارستانی‌یەتی مرۆڤایەتی‌یە .بۆیە پەیوەندی‌یەکی ڕاستەخۆی لە ژیانی ئەوە یەك لەدوای یەکاکاندا هەبووە . لە قۆناغەکانی گەشەکردنی شارستانیەتدا ، هەر قۆناغەش جۆرە قوتابخانەیەك و جۆرە بۆچوونێك و جۆرە ڕەنگدانەوەیەکی خۆی هەبووە لەسەر هەست و بیری شارستانیەتی ئەو دەمانە و هەر کۆمەڵگایەك . ئەفلاتون مۆسیقای داناوە بەیەکێك لە بزوێنەرە پیرۆزەکانی هەستی مرۆڤ . کە ڕاستی و دادپەروەری تێدا ڕەنگی داوەتەوە هەر لەم بۆ چوونەی ئەفلاتوونەوە دەردەکەوێت کە مۆسیقا ڕۆڵی گرنگی بینیوە بۆ یەکخستنی هەستەکانی دەبڕین لای مرۆڤ . کە توانیویەتی ببێتە شێوازی دەربڕین لای تاك و کۆمەڵ و هەستەکانیان یەك بخات .

مۆسیقا — لە شارستانیەتی کۆندا هۆیەك بووە بۆ پەرستن و پەیوەندی نێوان مرۆڤ و هێزی سەرەوە — هەروەك چۆن بۆتە هۆیەك بۆ یەکخستنی هەست و نەستی جەنگاوەران لە کاتی شەڕەکاندا . هەر لەگەڵ ئەمانەشدا خۆی ئاوێتەی سەماو سروتە ئاینیەکان کردبوو فاکتەرێکی سەرەکی بۆ جۆشدان بە جووڵە و ڕەزمی ئەو نمایشانە .

بە تایبەتی شارستانیەتی فیرعەونی و بابلی کە گیانێکی زیندووی خۆرهەلات بوون کە تا ئێستاش سەرچاوەیەکی بە پێزی چەندەها ئیلهامی مۆسیقایی بووە .

مرۆڤ هەر لەسەرەتاوە لەگەل دەورویەری مامەڵە کردوە و بەپێی گونجاندنی ژیانی چەندەها مەقام و ڕەزمی (ایقاع) داهێناوە . شارستانیەتە کۆنەکانیش ئەمە دەسەلمێنن هەروەها نکولی لە شارستەنیەتی یۆنانی کۆن ناکرێت کە خۆرئاوا بە پێزەوە سوودی لێ وەرگرتووە . بۆیە دەتوانین بڵێین پەیوەست بوونمان بەو گەشەسەندنە مێژووی‌یە لەگەڵیدا چێژ وەرگرتن لە جوانکاری یەکانی مۆسیقا هەردەم لە گۆڕانکاری دا بووە . چونکە هونەرێك نی‌یە کە بۆ خۆی سەربەخۆ بێت ئەگەر بێتو بەو گۆڕانکاریە بەردەوامانەوە پەیوەست نەبێت کە لە ئاستی چێژ وەرگرتندا یە . وە بەچاو پیاخشاندنێك بەو سەردەمە مۆسیقاییە سەرەکیانە دەبینین مۆسیقا وەك هۆیەکی بیریاری بۆ دەربڕین خۆی لە چەند بنەما و فۆڕمێك دا دەبینێتەوە کە هەر سەردەمە و قۆناغی تایبەت مەندی خۆی لە شێواز و دەربڕین و داهێنانەکاندا هەیە.بۆ وەدەست هێنانی یەکێك لە توخمە سەرەکیەکانی چێژی مۆسیقا ئەوەیە کە تاچەند دەتوانین پەیوەست بین بە شێوازی هونەری (الاسلوب الفنى) وە پاشکۆی ڕۆشنبیری ئەو سەردەمەی کە مۆسیقاکەی تێدا بەرهەم هێنراوە . چونکە دیاردە کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری‌یەکانی ئەو سەردەمەیە کە دەتوانێت کارێکی وا بەرهەم بهێنێت کە ڕەنگدانەوەی خۆی تێدا بەرجەستە بکات.

توێژەروانی مۆسیقا هەریەکەی بە جۆرێك پێناسەی (شێواز) دەکات هەیە دەڵێت بریتی‌یە لە (فۆرم — بیرۆکە — ڕەزم) ئاوازەکان و مەقامەکانیان — چارەسەرکردنی دابەش کردنی (بولیفینی یان هارمۆنی ) لەوانەیە بڵێین کە بلیمەتێکی وەك باخ بە جوانترین شێوە پێناسەی شێوازی کردوە کە دەڵێت ( شێواز بریتی‌یە لە ڕەنگ و بۆی گیانی کارە هونەریەکان)

## پرۆشەی هەستی مرۆیی لە سەمفۆنیاکانی بیتهۆڤن دا

دەبێ و دەبێ کامە نوسین، کام دەربڕین، کام پەڕەموچی بوێر بتوانێت رۆبچێتە ناو قوڵایی دەریای بێ بن و ناخی ئەو شەپۆلانەی کە شەپۆل دەدەن لەناو شەپۆلدا و کە بارانن لەناو باراندا و کە کێڵگەن لەسەوزبووندا کە بوونن لەناو بووندا.. کە هەمیشە پرسیارو گومان و رەخنەن لەسەرجەم دیاردەکانی بوون، کە هەردەم دژن لەناو دژەکاندا کە لەبۆتەی نامۆبوونی مرۆڤ چەندان زنجیر دەشکێنن و سنوورەکان دەڕمێنن و بەرەو راستی ژیان هەنگاودەنێن. ئەوە چ بێت کە نغرۆ ببێت لە قوڵایی دەریای داهێنانی بلیمەتێک لە داهێنەرانی مێژووی لێکدانەبڕاوی نەوەکانی مرۆڤایەتی، کە بە ئاوێتەبوون لەگەڵ دیاردەکانی ژیان، مێژوویان بنیات ناوەو لە رەوڕەوەی خۆی بەردەوامە.

هەبێ و نەبێ .. لە ئێمە نزیک تا دوور، لەکەم تا زۆر، لەرەش تا سپی لەرەگەزی مێیە یان نێر ... لەهەموو چین وتوێژو تەمەنەکان گەر تەنها بۆ ساتەوەختێکیش بووبێت گوێ ڕایەڵی پرشەو ورشەی هەڵچوون و داچوونی پێشەکی و سۆناتەو سەمفۆنییەکانی کەڵە داهێنەر و بلیمەتێکی وەک (لودڤیچ ڤان بیتهۆڤن Ludwing Van Beathoven) نەبووبێت، هێندەی جێگای تێڕامانە تا چ رادەیەک ئەو هونەرمەندە هەستی خۆی لە بۆتەی ژیان و ئازارو خەمەکانیدا چۆن ئاوێتەی کارە هونەرییەکانی کردووە و رەنگی داوەتەوە، ئەویش بەشیکردنەوەو راڤەی هزرو خەیاڵ.

پەیوەست بوونێکی واقیعانە بە دیالێکتیکی ژیان و دەوربەرو سەردەم .

بیتهۆڤن کەلەساڵی ١٧٧٠ لەشاری (بۆن) لەکەنار رووباری (ڕاین) لە خانەوادەیەک کە لەبنەڕەتدا لە (ئەنتۆرب)ی بەلجیکییەوە هاتبوون لەدایک بووە.

باوکی گۆرانی بێژ بووە لەکڵێسای شارداو پیاوێکی کەمتەرخەم بوو، بێهوودە دەیڕوانییە ژیان و کەسەر (مەی خواردنەوە) خۆی راهێنابوو. توندڕەو بەرامبەر جگەرگۆشەکەی کە خولیای منداڵەکەی لە پێناو بەرژەوەندی خۆیدا بەکار دەهێنا بەوەی کە بەتۆپزی راپێچی فێربوونی مۆسیقای دەکرد.

ئەمەش لەدواییدا بەلایەنی چاکە شکایەوە، لای (لودڤیچ) خۆ هەر منداڵێکی دیبوایە هەر زوو مۆسیقای فەرامۆش دەکرد. هەرچی باوکی بوو دەیویست

بەزوویی وە (مۆتزارت)ی منالّی لێبێت چونکە زۆر سەرنج راکێش بوو لای، بەلّام نەیدەزانی کە خونچەی رەسەن بە زوویی ناکرێتەوە، چونکە هێزی داهێنەرانەی بیتهۆڤن لەو جۆرە دەریا بێ بنانە بوو کە بە ئاسانی نەدەچووینە ناو قولاّییەوە و یاقوتە دەگمەنەکانیت نەدەدۆزییەوە!!

کاتێک باوکی شەوانە لە خەلّوەتی بارەکان دەگەڕایەوە بەهاودەنگی هاوڕێکەی کە هەمان کاتیش مامۆستای کوڕەکەی بوو بەناوی (تۆبیاس) لەخەویان رادەکردوو خەوەکەیان دەزڕاند بەزۆرەملێ ملی لەسەر ئامێری پیانۆ مەشقیان پێدەکرد، پاش وەنەوزێکیش بەرەو خوێندنگای سەرەتایی بەڕێدەکەوت، بەرەنگی زەرد و لێوبەبارو جەستەیەکی تێکشکاوەوە، چل و بەرگێکی شێواوەوە خۆی دەکرد بە وانەکانی خوێندندا، نوسین بە خەتێکی جوان فێربوو، هەروەها زمانی فەرەنسی و لاتینی، بەلّام زمانی دایک کە ئەلّمانییە بە ئاسانی وشەکانی بۆ ئەزبەر نەدەکرد، لەبیرکاریشدا تابلّێی کۆلّ بوو، هەر بەم شێوەیەش مایەوە تاکۆتایی ژیانی، کە برازاکەی منالّێکی بچووک بوو هەمیشە یارمەتیدەری بوو بۆ کۆکردنەوەی سادەترین ژمارە. بەپێچەوانەوە دایکی سۆزێکی زۆری دابوویە، کاتێک لەسالّی ١٧٨٧ کە هەوالّی مەرگی زانی لە ڤیەننا بوو، یەکسەر گەڕایەوە (بۆن) ئەو دالّدەی سۆزەی لەدەستدا کە بەدرێژایی ژیانی ئەو خەمەی بە کۆلّەوەبوو.

ئەم لە تەمەنی یانزە سالّیدا چووە ناو جیهانە ئەفسوناوییەکەی مۆسیقاوە، ببوە تانی گیانی، خولیای هەستی، هەرچی دەیکرد نەیدەتوانی لەگەلّ ژیانی ئاساییدا وەک کۆمەلّ بژی، هەرچەند توانای بلیمەتانەیدا هەبوو کە چەندەها زانیاری و زانست دەستەمۆ بکات، بەلّام ئەم گیانی زالّ دەکرد بەسەر مادییەکانی ژیاندا.

(ریس)ی هاوڕێی بەم شێوەیە باسی ئەم لایەنەی ژیانی دەکات:

(شل و شێواو، جێی بەزەیی، خاو و خلیچک لە هەلّس و کەوت، کەمجار هەبوو شتێک نەگرێت بەدەستیەوەو نەیشکێنێت، رۆژانە شووشە مرەکەبی دەڕژاند، تەنانەت پەنجەکانیشی لەسەر ئامێری پیانۆ کە بە گونجاوی نەدەجولاّ)

ژیانی هێندەی خەم و ئازار بوو، هێندە ئاسوودە نەبوو، هێندەی باوەشی بۆ نەمری کردەوە، هێندەش ساتەوەختەکانی تەمەنی تلانەوە بوو بە خەونەکانەوە.

لەگەلّ ئەمانەشدا ئەم خاوەنی خۆڕاگرییەکی پۆلاّین کە نەمری خۆی لە

وێرانەی نوشستی و دارمانەکانی بونیاد دەنایەوە، کاتێک کە گوێی گران بوو، لە خۆشەویستترین هەستی بوو، ١٣٨ شاکاری بەرهەمهێنابوو.

کە نەمری سەرکەوتنی گیانی پڕ دڵە راوکێی خۆی بەرجەستە دەکرد لە جەستەو گیانێکی خەمۆکدا.

بەم وشانە یەکێک لە یاداشتەکانیدا دەستپێدەکات (تا دەتوانیت خاوەن چاکە بە، ئازادی مرۆڤ بەهاترین خۆشەویستییە، بوێر بەو راستییەکان بڵێ، گەر تەختی پاشایەتیش لەدەست بدەیت) ساڵی (١٧٩٢) بۆ جارێکی دی گەڕایەوە ڤییەننا، ئەمجارەیان بە گوڕێکی ترەوە ئەویش بە چوونە ناو دنیای گەشتی مۆسیقاوە برەودان بەتواناو خولیای هونەری لەسەر دەستی مامۆستای کلاسیزم (هایدن)ی مەزن ئەم بۆماوەی یەک ساڵ خوێندکاری بوو، بەڵام هەستی بە ئاسوودەیی نەدەکرد، ئەویش لەلای خۆیەوە نەیدەزانی چۆن وەڵامی پرسیارەکانی ئەم بداتەوە کە هەمیشە ئەم پرسیارانەی دەکرد، چۆن؟ بۆچی؟

ئەوساو ئێستاش وا باوە کە چینە باڵا بەدەست و ئۆرۆسوکراتیەکان خۆیان بەشایانی پیاهەڵدان و ستایش کردن دەزانن بەرامبەر: بڕە یارمەتییەک کە مافی رەوای خۆیانە بگرە پتریش، بەڵام ئەم بە پێچەوانەوە هەرگیز کڕنووشی بۆ نەبردن و خۆی لەوان بە شایستەتر دەزانی، چونکە ئەم نەمر بوو لەدەربڕینی ئازارەکانی مرۆڤ، ئەوانیش بەستەم و زۆرداری، چونکە سەرەتای ئازارەکان کردبوویە خۆڕاگرێکی بەهێز و بەسۆزو شۆڕشگێڕ، ئەم هێزەش لەم یاداشتەدا بەدی دەکرێت کە دەڵێ (ئەمە هێزی لاوییە، بەڵێ ئەمێستاش هەست بە خوێنی شادەمارەکانی گیانم دەکەم، هەر رۆژێک لە تەمەنم گوزەر بکات و لاپەڕەیەک هەڵبدرێتەوە دەمبینن کە لە ئاوات و ئامانجەکانم نزیک دەبمەوە وەک ئەوەی بە چاوانم بیبینم و لەبیرمدا دەچەسپێت ئەوە منم کە دەست بەسەر گەرووی قەدەر و نەهامەتییەکاندا دەگرم و هەرگیز لە وزەو تینم کەم ناکاتەوە) ئەم وشانەی کاتێک دووپات دەکردەوە کە لەکارێکی هونەری، نەهامەتی ژیان، یان لە خۆشەویستییەک شکستی بهێنایە، یان بەرامبەر رەخنەگرانی کە لەوەڵامدا دەیگوت (گوتەی ڕووت ئەمری وەدی ناهێنێت).

هەمیشە و هەمیشە مەلەکانی دڵی بەرامبەر خۆشەویستی بۆ شۆخەکان لەگۆدا بوو، هەرچەندە دەیویست لەگەڵیاندا سەقامگیر بێت، بەڵام کە ئەو شۆخانەی

خۆشی دەویستن لە چینێکی باڵاتر بوون لەخۆی، بۆیە سەرکەوتنی وەدەست دەهێنا.

بەڵام جۆش و خرۆشی ئەم گیانی زیندووی بۆ خۆشەویستی جێی تێڕامان بوو کاتێک لەساڵی ١٨٢٧ کۆچی کرد لە یەکێک لە بنمیچەکانی ژوورەکەیدا نامەیەک دۆزرایەوە کە سۆزی خۆشەویستی دەردەبڕێت (ناتوانم بە درێژی بۆت بنووسم، بمبورە، ئەمە چەند وشەیەکە کە بە پێنووسەکەی خۆت، تەنانەت ناتوانم تا سبەی جێگایەک بۆ خۆم بدۆزمەوە تاسبەی، ئای لەم کاتە چۆن دەڕوات، خۆشەویستی وادەکات کە هەوڵ بدەیت بۆئامانجەکانت ، چ بکەین گەر مەحاڵە بۆ یەکتر بین، بۆ خۆشەویستی هەموو کارێک پێویستییە، ئەمەش هەستی هەردووکمانە.. دەبێ ئەوە لەبیر بکەیت کە دەبێ بۆ یەکدی بین ئای... خۆزگە ئەو پەیوەندییە گیانییەمان دەگەشتە رازەکانی.. ئەو کاتانە چۆکمان بە چارەنووس دادەدا).

هەرچی ئازادی خوازی ئەمیش بوو کردبوویە شۆڕشگێڕ.. لەو کاتەدا شۆڕشی فەرەنسای کردبووە نمونەی ئازادی مرۆڤ، بۆیە کاتێک ناپلیۆن بووە رزگارکەری فەرەنسا، سەمفۆنیای سێیەمی بەناوی (پاڵەوان Eroica) دانا.

ئاواتی چەسپاندنی بنەماکانی شۆڕشی فەرەنسا لە برایی و دادپەروەریی وئازادی هەموو گەلان بگرێتەوە.

بەڵام کاتێک ناپلیۆن خۆی کردە ئیمپراتۆری فەرەنسا هیوا بڕاوبوو، تەنانەت باوەڕی نەدەکرد تا لە رۆژنامەدا کاتێک لەگەڵ (ریس)ی هاوڕێی دابوو، لەو کاتەدا ئاوازەکەی گرت بەدەستەوەو بەرگەکەی دڕاند و کردییە ژێر پێی وتی (پۆناپارت لەوانی دی چاکتر نییە، ئەویش مرۆڤە سبەینێ مافی گەلەکەی پێشێل دەکات) لەم کاتەدا ریس دەیویست لە ژێر پێیدا دەری بهێنێت (واز بهێنە با پێشێلی بکەم، چونکە ئەو ئاواتەکانی منی پێشێل کرد) بۆیە دەبێت مرۆڤایەتی بەڕێز و ستایشەوە شاکارەکانی، هەستی مرۆیی، خۆڕاگری و بە ئەمەکی ئازارەکانی و سۆزی خۆشەویستی لەیاد نەکات.

## تایبەتمەندی شێوازی بیتهۆڤن

بیتهـۆڤن دەروازەیـەکی فراوانـی والآ کـرد بـۆ کـارە مۆسـیقییەکانی سـەدەی نۆزدەهـەم لـەبواری داڕشـتنی کارەکانـدا بـە بـەکارهێنانی بـەهێزی و نـەرمی و جوانکاری لە دەبڕینی دەنگی تاک و کۆمەڵدا، وە ڕێگای بە بەرنامەکردنی کارەکان و دانراوەکان بە شێوەیەک کە بتوانێت لە ڕووداو وناوەڕۆک بدوێت، لەلایەکی دی پەرەپێـدانی قوتابخانـەی کلاسـیک بەتایبـەت مامۆسـتاکانی هایـدن و مـۆزارت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە چەند بەشێک بسڕێتەوە و چەندێکی دی بخاتـە سـەر شـێوازە کۆنـەکان، هـەروەها مانـای کورتکردنـەوەو درێژکـردن و چڕبوونـەوەو جێگۆڕکێ، بۆیـە ئـەم سەربەسـتی دەربڕینـە نەبوایـە لـە مۆسیقادا کـە ئـەم هێنایـە ئـاراوە، هـەرگیز مۆسـیقا بـۆ خـۆی نەدەگەیشـتە کـەنارەکانی دڵنیـابوون و گەشەسەندن.

شێوەی مۆسیقاش تـەنها ڕێگـا باوەکـان ناگرێتـەوە بـۆ نوسینەوەی سۆناتاو کۆنشـترتۆ سـەمفۆنیاکان، بـەڵکو چـۆنێتی نوسـینەوەی دانـاروەکـان لـە وردتـرین خانەی مۆسیقاوە کە یەک بەدوای یەکدا هـاتنی چەند نۆتەیـەکی بچوکـە تادەگاتـە یەکانگیربوونـەوەی ئـەم خانانـە بـۆ ئـەوەی جەسـتەیەکی مۆسـیقایمان بـۆ بێتـە بەرهەم کە خاوەنی تایبەتمەندێتی خۆی بێت.

دەربارەی ئەم شێوازانە دەیگوت (نـازانم و نـازانم چـۆن روونـی بکەمـەوە یـان دایڕێژم کـە چـۆن و لـەکوێ ئـەم بیرۆکانـەم بـۆ دێ) ، بـەڵام بـەوە کۆتـایی دەهێنـا (بیرۆکەکانم دێن و بێ هیچ بانگەوازێک بەشێوەیەکی خۆڕسک لە هەر جێگایەک لە ئامێزی سروشت یان کاتی گەڕان، شـەوێکی بێدەنگ، یـان کـاتی کـازیوەی بـەیان) بەردەوامـەو دەڵـێ (ئـەو بیرۆکانـە دەتەقنـەوە بـە پێـی بیرکردنـەوەی خـۆی و دەستدەکات بە نوسینەوەی تێبینیەکانی هەر ئەم رەشنووسانەشە کە دەبنە کاری مۆسـیقایی و دەیانخاتـە ژێـر یاسـا و ڕێسـاکانی دانراوەکـان و داهێنـانی خـۆی و هەستی جوانکاری ئاوێتەدەکات)

کارەکانی ئـەم خـاوەنی نـاوەڕۆک و تایبەتمەندی خۆیـەتی لـە کـارتێکردنی بـۆ شارستانیەت و بەها جوانەکان، ئەویش بە توێژینـەوەی کـارە بەرهـەمهێنراوەکان بۆ نمونە هێمای لە شکسپیر، گوتـە وەردەگرێت، بـۆ خۆشـی دنیایـەکی فراوان لـە سۆزو میهرو... خۆشـی تامـەزرۆ، لەلایـەکی دی خـەم و ئـازار بەواتایـەکی دی لـە

ئامێزیـدا کۆمیـدیا و تراژیـدیای حەشـاردابوو، کـە لەدڵـە راوکێدایـە لـەنێوان خەڵوەتێکی قوڵ و هیوایەکی پڕ خەندە ، ساکاری و توانای بەهێز کە پەیوەستە بەم جیهانەوە بەرەو باڵاش مل دەنێت.

بۆ جارێک هەستی بلیمەتانەی دەربڕین لەلایەکی دیش چی لە راستییەکاندا هەیە پەی پێدەبات، بەڵکو پتریش لەمانە لە شاکارەکانیدا هەست پێدەکرێت.

هەندێ لە رەخنەگرانیش کارەکانی دەکەن بە سێ قۆناغەوە:

یەکەم: لەم کارانەیدا پەیوەستە بە هونەرمەندانی پێش خۆی وەک مۆزارت، هایـدن، کـە لـە سـەمفۆنیای یەکـەم ، دووەم، کۆنشـێرتۆی یەکـەمی پیـانۆ، بۆیـە دەتوانین بڵێین ئەم ساتانەی رەنگدانەوەی هەستی ئالودەی بوو کە لـە شـێوازێکی کلاسیکی دەریدەبڕی، بەدیوارێکی نەخشکراو نەخشێنراو بوو ، کە هەر لە نـەخش و نیگاری هایدن و مۆزارتدا خۆی دەبینیەوە.

دووەم: دەربــازبوونێکی بــە ئاگــا لــە پێشــینیەکانی خــۆی و چەســپاندنی تایبەتمەنـدێتی خـۆی بـەڵام نـەک دابڕانێکـی یـەکجارەکی لـە دانراوەکـانی ئـەم سـەردەمەی سـەمفۆنیای سـێیەم ، چـوارەم ، پێنجـەم ، شەشـەم، لـە سـەمفۆنیای سێیەمدا بە ئاگاوە خۆی لـە کلتـوری بـاو دەربـاز دەکـات. مامەڵـەش لەگـەڵ دەنگە هارمۆنییەکانـدا رەنـگ و بۆیـەکی ئاشـکرای ئـەو سـەردەمەی پێـوە دیـارەو کـە سـەردەمی شـۆڕش و بونیـادن، ئاشکراشـە هـەموو بیرێکـی نـوێ، دیاردەیـەکی تازەگەری جێگای سەرسوڕمان و رەخنەو پرسیارە؟ یـەکێکیان دەڵێت (بەراسـتی سەمفۆنیای سێیەم دانراوێکە پڕ مانای داهێنەرانە، ئەمەش کەمترین چاوەڕوانییە لـە بلیمەتـەکان، ئـەم سـێیەم نۆتەیەکـەی زینـدووی شـێوازی دووەمـی مۆسـیقای بیتهۆڤنە، بەڵکو خاڵی وەرچەرخاندنە، لەرادەی بیرکردنەوەی باوی گوێبیستان.

بـۆ ئـەوەی ڕێچکەیـەک بـۆ خـۆی بدۆزێتـەوە تەنانـەت یـەکێک لـە نـاودارترین کەمانچەژەنی ئەو دەمانە (شوپانتزیغ) کاتێک کە چوارینەی حەوتەمی لـە پـەیژەی (Fa) دەژەنی بە پێکەنینەوە دەتریقایەوە کە چەند ڕێکخستیەکی دەنگی دەهاتە ڕێ کە هەرگیز لەوەوپێش بەدی نەکردبوو.

سێیەم: لەم قۆناغەدا یەکجاری دەرباز و رەهـابوو، لەهـەموو کۆت و بەنـدێکی کلاسیک، کە بلیمەتی خۆی دەهاویشتە ناو جیهانە تایبەتیەکەی خۆی کە وێنەی لە

سەمفۆنیای نۆیەم و چەند کارێکی وەک (القداس الحافل) کە سەمفۆنیای نۆیەمی بە (سروودی خۆشنووس) کۆتایی پێدەهێنێت لە شیعری شیلر، کە گەیشتە ئەوپەڕی توانای داهێنان کە لەتوانای داهێنانی مرۆڤدا بێت، تا ئەوەی کە بتوانێت لەرادەبەدەر بێت!! ئالەم کاتە ناسکەدا گوێی زیاتر گرانتر دەبوو، بەرەو نەبیستنی تەواو دەچوو، دەیگوت (وا پایزی تەمەن بەڕێ دەکەم، گیانم هەمووی بەروبوومە و بە بەرهەکانی بارگرانم، بە بچوکترین و کەمترین لەرینەوە وەک روبارێکی بەخوڕ پەڕەکانم دەکەونە خوارەوەو پەل و پۆ دەگرن) بۆیە دەوترێ سەمفۆنیای نۆیەمی روباڕێکی بەخوڕی بەرهەمی ناوازەیە.

بەرەو جیهانە تایبەتییەکەی چەند سەمفۆنیایەکی بیتهۆڤن

سەمفۆنیای سێیەم (Symphony Erioca (No3

لەم سەمفۆنیایەدا بیتهۆڤن لە شێوازی دانەرە کلاسیکییەکان دەرچوو، هەمیشە بیستی بەدەنگە نوێیەکانی سەردەم ئاشناکرد، سەردەمی شۆڕش و ئازادی مرۆڤ، هەروەک لە کارەکانیدا دیارە، بیستن لەو نەریتە باوە ئازاد دەکات، و دەیانخاتە جێی رامان و رەخنە.

ئەم ئەفراندنی خۆی لە بۆتەی بیری خۆیدا دەهاوێشتە ناو هزری داهێنانەکانیەوە، ئەگەر بارمتەکەشی گران بوایە کە ئەویش دەبووە سەمەرەی رەخنەگران، بەڵام ئەم هەموو کارێکی دەکرد بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانی و بیروبۆچوونەکانی خۆی.

جوڵەی یەکەم (خێرا Allegr Conbiro)

درێژترین جوڵەی ئەم سەمفۆنیایە یەکەم جار لە شێوازی سۆناتەدا خۆی دەنوێنێت، کە پێش هەموو شتێک مۆسیقایەو مۆسیقا ڤیولونستیلەکان (چەلۆ) دەست بەم جوڵەیە دەکەن و پاشان ڤیۆلۆنەکان لە تاریکییەکی کپدا کە ئیلهام لە ئاوازی سەرەکی وەردەگرن، ئیدی مۆسیقا بەرفراوان دەبێ بەرەو پێگەیشتنێکی گۆرانی ئامێز تا گۆرانی بەسەدا دێت و دەبێتە هێمنییەکی بێدەنگ و بێ چرپە، کە

ئـازاری قـوڵی حەشـارداوە، بەردەوامــە لەبەرزبوونــەوەو هەژانـدن تـا ئـامێرە بوقییەکان ئاوازی سەرەکی لە ڤیۆلۆنەکان دەدزن، کە گوێگر دەخاتە ناو خەونێکی فراوان و بـەرین، هـەروەک ئـەوەی بیـەوێ نەخشـە بـۆ دنیایـەکی جـوانتر بـۆ مـرۆ وەدی بێت و پاشان بانگەشەی دنیای پڕ شکۆ دەکات.

لەجوڵەی کۆتـادا بـەهاوارێکی تاسـاوەوە بـەتاک، پاشـان ئـامێرە مسـییەکان بـە هەرەوەزی چەلۆکان لەیەک بەدوای یەکدا هـاتنێکی هـارمۆنی خـۆی دەنوێنێت تـا لێدانـەکانی لـە جیهانـە تایبەتییەکـەی بیتهـۆڤن ئیلهـام وەردەگرێت و هێدی هێدی ئازارەکان خامۆش دەبن.

جوڵەی دووەم مارشی ماتەم **Marica Funebre**

لەم ماتەمەدا هونەرمەنـد سـڵاو دەنێرێت بـۆ گیـانی ئـەو جەنگاوەرانـەی کـە لـە مەیدانی جەنگدا گیانیان لەدەستدا، کاتێک پاڵەوان بەرەو گڵکۆ بەڕێدەخرێت و دڵی ئەوانەی کە بەشدارن لەو مەراسیمەدا پڕخەم دەکات.

ئاوازەکە بەردەوام دەبێت تا ماڵئاوایی لـە گیانیـان دەکـات و ئـامێرە بوقییـەکان ئـەم ماڵئاواییـە جـێ بـەجێ دەکـەن، هاوکـات ڤیۆلۆنـەکان و ئـامێرە فوودارەکـان تەدارەکەی خەم بەرجەستە دەکەن بە فرمێسکەوە ئازارەکانی بتهۆڤن بە توانایی و بێ توانایی دەردەبڕن، جارجارەش لە نێوانیاندا کوتەی تیمپانی دێت، وەک نرکەی ئـەو شۆڕشـەی کـە مـرۆڤ خـەوی پـێ دەبێـت و چەنـدان سـاڵە دەیـەوێت لـەو نامۆبوونە سەرفراز بێت.

ئازاری بلیمەتی خۆی لە دووتوێی خەمەکانیدا لـە مـەلاس بـوون دەردەکات و تروسکەی هیوا لە هێزی ئۆرکسترادا بەرجەستە دەکات، ئامێرەکان پێکڕا دەژەنن و بانگەواز دەکـەن بـە تایبـەت ئـامێری ترامپێت و تیمپانـەکان ئـەم تەدارەکە سـاز دەکـەن، راسـتییە تاڵـەکانیش لـە تاریکیـدا گـوزەر دەکـەن و کـەژاوەی ماتـەم بـۆ جــەنگاوەران دەگێــڕن، دەگــرین، دەکڕوزێنــەوە، ئــەم تەدارەکــەش بــەدەنگی کۆنتریاسـەکان کۆتـایی پێـدەهێنرێت و مـرۆڤ لـە بێـدادی هۆشـیار دەکاتـەوە و سـەری ڕێـز و نـەوازش بـۆ پاڵەوانـە ئەفسـوناوییەکان دائەنـەوێنن، ئیـدی هیـۆر دەبێتەوە و لە فەزایەکی نادیاردا خۆی لە چاوان وندەکات.

### جوڵەی سێیەم (خێراو بە گوڕوتین Scherzo : Allegro Vivace)

لەم جوڵەیەدا لەکۆت و بەندی باو خۆی مەرەخەس دەکات و دەرباز دەبێت، بەوەی کە جوڵەیەکی سەما ئامێز(السكيزو) دەگەیەنێتە ئاستی ئەفراندن بەچەند ئاوازێکی خەندەبەخشی رەوان و بە ئامێرە ژێدارەکان و ڕێگا خۆش دەکات بۆ ئۆرکستراو رەشبەڵەکی توڕەیی و هەژاندن تا ترەمپێتەکان سەرچۆپییەکەی بگرن، خۆ ڕێڕەوی هەژاندنەش ناوەستێت ئیدی پێکڕا ژێدارەکان ئاوازی سەرەکی سەرهەڵئەداتەوە و هێدی لەیەک گونجاندنێکی هارمۆنیدا ئازارەکان دەسڕڕێتەوە.
ئا لەو ساتانەدا هەست ختوکە دەدرێت و بەرەو ئاسمان شاباڵ دەگرێ، هێند ناخایەنێ کوتەو زرمەی دەهۆڵەکان بە هەرەوەزی مسدارەکان مژدەی سەرکەوتن دێنن، لەپڕ بێ دەنگی، پاش کەمێک ئاوازی رەوان دەبێتە میوان و بە پشتیوانی مسدارەکان رەشبینی وەدەردێنن و هیوایەکی نادیار هێندەی نادیاری چارەنووس، ئۆرکسترا بەردەوام دەبێت و هەموو ئامێرەکان تێکڕا ئاوێزان دەبن و پروشەی هەستی مرۆڤ بەرەو ئاسودەیی دەبەن.

### جوڵەی چوارەم زۆر خێرا ALLEGRO MOLTO

لەچەند زرمەیەکی زۆر خێرادا هەموو ئامێرەکان لە ئازارەکانی (پرۆمتیۆس) کە بێکۆتایە (پێشتر بتهۆڤن پێشەکییەکی بۆ داستانی پرۆمتیۆس دانابوو، کە لە خەمەکانیدا هەموو خەمی مرۆڤی لەکۆڵناوە) لە هێمنییەکی لەسەرخۆدا قوڵ بەڵام بە خێرایی بۆ ماتەمی مرۆڤایەتی لە جوڵەی دووەمدا تا دەگاتە ئەو کاتەی کە خەریکە کۆتایی بێت ڤیۆلۆنەکان وەڵام دەدەنەوە بە دەنگێکی پڕ حەسرەتەوە هێدی هێدی بەرز دەبێتەوە و هەڵدەکشێ و بەرەو ئاسۆ ملدەنێ، لەو شوێنەی کە ئاواتی مەزنی سەماگر، خەندەبەخشن، بانگەوازی ئاسوودەیی رادەگەیەنێت، کە جەورو ستەمی زۆرداران ناتوانێت ببێتە بەربەست چونکە هیچ خەمێک ئەبەدی نییە..!!

(لەسەمفۆنیای پێنجەمدا قەدەر لە دەروازەکان دەدات)

پێشەکی ئەم سەمفۆنیایە بە ناوازەترین و قەشەنگترین کاری مۆسیقای دادەنرێت، هەرچەندە لەدوو دەنگی (SOL –MI) تێپەڕ ناکات، بەڵام لە هۆشدا سەقامگیر دەبێت و لەبیردا یادگاری بەجێدێڵێت، جگە لە ئاوازێکی دی کە لەسەر جوڵەی یەکەم یان چنراوە کە ئیلهامی ئەم ئاوازەی لەدەنگی باڵندەیەک کاتێک لە دارستانەکانی ڤییەننا دەهات و دەچوو وەرگرتووە.

کاتێک (شیندلر) هاوڕێی پرسیاری لێکرد دەربارەی وتی (بەم شێوەیە قەدەر لە دەروازەی ژیان دەدات) لەم کارەدا لە ڕێچکە کۆنەکان دەرباز دەبێت لە جیاتی MINUTE ئاوازی SCHERZO دەخاتە جێی کە لە دوو تویێ دا باری ناهەمواری دەروونی خۆی بەرجەستە دەکات بۆ ئەوەی چارەسەرێک لە هێزی قەدەر وەربگرێت و بیخاتە گەڕ. فەیلەسوفێکی وەک نیتشە بەم شێوەیە دەربارەی دەڵێ (ئەم سەمفۆنیایە هەموو بەها جوانەکانی مرۆڤایەتی لە ئامێز دەگرێت)

جوڵەی یەکەم خێراو بەگورجی ALLEGRO CONBRIO

هەرچی جوڵەی یەکەمە بە سێ کوتە (ضربە) ی کورتی پێشەکی و پاشان چوارەم کوتەی درێژ قەدەر دەهەژێنێت، هێدی هێدی گەشە دەسەنێت و هەموو جەستەی سەمفۆنیاکە دەگرێتەوە، پاش ئامێزگرتنەوەی کورت لەلایەن کلارنێتەکانەوە، پاشان ژێدارەکان لە هەمئاهەنگی لەتەک فوودارەکاندا دەکەونە راڤە کردن پاش کەمێک ئۆرکسترا دێتە ناوەوە، جارجارەش بوار بە (ئۆپوا) دەدەن و ژێدارەکان ئەرک دەگرنە ئەستۆ.

ململانێی نێوان خود و بابەت (الذات و الموضوع) هەمیشە مانایەک بووە لە نێوان بەرەنگاری و ملکەچ بوون، ئەو دەیزانی ئەم دوو توخمە حەقیقەتی ژیانی تیدایە و ململانێی نێوانیان وەک دژ مانای نوێ دەبەخشێ بە ژیان، هەر ئەمانەشن کە پرسیارەکان دەخوڵقێنن لەو دیارانەی کە نادیارن و لەو نادیارانەی کە دیارن، هەریەکەو بە پەردەیەک خۆی پۆشیوە کە لەدیوەکەی دی راستی ماناکانیان هەن، لە پێکهاتەیەکی ئاڵۆز بەرامبەر بوون بە هەردوو لایەنییەوە.

کاتێ بتهۆڤن گوێ گرانییەکەی بەرەو کەڕبوونی تەواوی دەبرد، دەیویست لەڕێگای ئەم جوڵەوە هەستی خۆی بەرامبەر زل هێزی قەدەر دەربڕێت، کە هەمیشە نەفرەتی دەکرد چونکە هەر قەدەرە بوونەوەرەکانی لە بچوکترین رووداوەوە بەرەو گەورەترین هەڵدێر و گلاندن دەبات لەم بۆچوونەوتێگەیشتنەوە جوانترین جولەی ناوازەی لەدەنگە مۆسیقایەکان چنی و ڕست، کە بەتەواوی گوێ بیست خۆی بۆ ناگیرێت.

کە هەرچییەکی تێدایە دژیەکەو بەرامبەرکێیەکی درامی لەدەروونندا هەر لەسەرتاوە تا کۆتا، تەنانەت ئەو کاتە کورتەی کە ئۆبرا نەغمەکان دەدزێ، هەر هەموو ئەمانە دژ بە قەدەرێکی بێ ئەمەک کە دوژمنی بوونەوەرەکانێتی، بۆیە کاردانەوەی سۆزەکانی تەریب بوو لە تێگەیشتنەکانی).

## جوڵەی دووەم (کەمێک هێمن ANADANTE CONMOTO)

ئاوازێکی گۆرانی ئامێزی درێژو بەنۆرە لەنێوان ڤیۆلاو چەلۆدا بە جۆرایەتی کردن بە دەنگەکان کە ئازارەکانی بەرامبەر قەدەر نیشان دەدات، جوڵە کە دابەش دەبێت بەسەر دوو ئاوازدا کە لەچوار لایەندا چەق دەبەستن لە جوانکاری جێگۆڕکێدا کە ئامێرە فوودارەکان رۆڵی دەبینین، پاشان دووبارە بوونەوەیەکی نزمی لە ئاوازی سەرەکی لەلایەن کلارنێتەوە، بۆ دەمێکی دی، ئۆرکسترا گوژم دەبەستێتەوە بە ئاوازێکی مارشی کە دەیەوێت هەموو ئاوازەکان کۆبکاتەوە و ئەم جوڵەیەش بەبەشی کۆتایی ئاوازە سەرەکییەکە کۆتایی دێت.

## جوڵەی سێیەم (خێراو بەگوژم ALLEGRO)

جوانترین (سکریزۆ) کە بتهۆڤن داینا، چونکە لەم شێوەیە ئاوازی پوخت و کورت و نمونەیی دروست کرد، وەلە شێوەیەکی زیندوودا نیشانی دا کە لە قوڵاییەکی نادیارەوە لەلایەن چەلۆ و کۆنترباسەوە هەڵدەهێنجرێت بە ئاوازی دی وەڵام دەدرێتەوە لەلایەن ڤیۆلۆنەکانەوە بەدووبارە کردنەوەی ئاوازی قەدەر کە ڕێگا خۆش دەکات بۆ هاتنە ناوەوەی ئاوازی سەرەکی، پاشان سەرکەوتنێکی

تیژڕەو کە (ڤیۆلا و باسۆن) ئاوازەکە وەردەگرن و دەیدەنە دەست ڤیۆلۆنەکان و (ئۆبوا) و ڕێگا خۆش کردن بۆ سکریزو، بەڵام لەشێوەی پرسیارکردن و وەڵام دانەوەدا، کە بەچەند تووڵەڕێگایەکمان دەبات تا دەگەینە دەنگی تیمپانیەکان و لەهەمان کاتدا ژێدارەکان بەنەرمی ڕێگاخۆش دەکەن بۆ جوڵەی چوارەم، بە هێمایەک کە لەتاریکی دەرچوون بەرەو رووناکی لە هێمنی و بێدەنگیدا دۆش دادەمێنین، بەڵام مۆسیقا لە جۆشدایە بە ئاسوودەیی لە خرۆشدایە بە وتنەوەی ئاوازی یەکەم بۆ ئەوەی مژدەی سەرکەوتن بە ژێی کەمان و کوتەی تیمپانیەکان رابگەیەنێت.

دەڵێن لەکاتی ئامادەبوونی کچی گۆرانی بێژ لاما لیبوان بۆ ئەم سەمفۆنیایە کە لە هۆڵی (کۆنسرفتواری پاریس) پێشکەش دەکرا، لەهۆش خۆی چوو، هێندە جۆش و خرۆشی دەروونی ئاوێزان کردبوو، هەروەها ئەفسەرێکی خانەنشین لەبەر ناپلیۆن هەستایە سەر پێ بەدەنگی بەرز هاواری دەکرد (ئەو ئیمپراتۆرە، من سوێند دەخۆم کە ئەو ئیمپراتۆرە) کە مەبەستی بتهۆڤن بوو.

جوڵەی چوارەم : زۆر خێرا ALLEGRO

لەسەرەتای جوڵەدا مۆسیقا گوژم دێنێ، بەڵام نەک بە ئاوازی سەرەکی کە هەموو ئامێرەکانی مۆسیقا بەڕەزمی مارش دەیژەنن، پاش کەمێک ئاوازێکی دی لە ئاوازی سەرکەوتن ئامێرە فووداڕەکان تا مۆسیقا دەگاتە ئەوپەڕی جوانی ئیتر ئاوازی هێمن بەژێدارو فووداڕەکان لە دەربڕینێکی نایاب گیانی شانازی —کە هەموو ئاوازەکان دەکاتەوە و پێکەوەی گرێ دەدات و گوێ دەگرین لە ئاوازی قەدەر کە لە جوڵەی سێیەمدا بەرچاومان کەوت، بەڵام بە خێرایی کە هێمایە بۆ سەرکەوتنی مرۆڤ، بەسەر نەهامەتییەکاندا کە خۆی بەرجەستە دەکات، لەکەسایەتی هونەرمەند کە هەمیشەو هەمیشە بە گژ ئازارەکانیدا دەچێتەوە، زاڵبوون بەسەریدا بەوەی کە بلیمەتی خۆی و شاکارەکانی بۆ هەتایە نەمر کرد.

## پەیوەستی مرۆڤ بە سروشتەوە لە سەمفۆنیای شەشەمیدا

کاتێک ئەم سەمفۆنیای شەشەمی بەناوی (سەمفۆنیای لادێ) ناودەبرد، هەر خۆشی ناونیشانی بۆ دادەنا، کە ئیلهام وەرگربوو لە هەڵچوون و داچوونی بەرامبەر سروشت و بوون، دەشیزانی کە هەر سروشت نامۆبوونەکانی کەم دەکردەوە، لەتەکیا ئاوێزان دەبوو، دوور لە هەموو دیاردەکانی شارستانیەت بە بەخشینی گیانی خۆی بەسروشت و بەتایبەت لادێی نەمساوی کە بەجوانی ناوی دەرکردبوو، کاتێک لە ژێر سێبەری درەختەکان خورەی ئاوی – دەنگی بولبولەکان، شاد دەبوو، ئەمەش پێش گوێ گران بوونی بەتەواوی، بۆیە رستەی ساکار لەوێنەو تابلۆی هونەریدا داڕشت بۆ ئەوەی کە بەجوانترین شێوە هەستی پەنگخواردووی دەربڕێت لەهەموو پاپەندییەکانی سەمفۆنیای باو دەرچوو، کە پێش خۆی یاسای بۆ دانرابوو بەوەی کە سەمفۆنیای کردە پێنج جوڵەو کە پێش خۆی کەس نەیکردبوو.

### جوڵەی یەکەم(خێراو بێ زێدەڕۆیی ALLEGRO MANON TROPPO)

خۆی ئەم ناونیشانەی بۆ داناوە (هەست کردن بە شادی کاتی گەیشتنە لادێ) کە دەیویست گوێگر بەراستەوخۆ تێبگەیەنێت و سەربەستی بداتێ لە وێناکردنی بۆ تابلۆکان، چونکە خۆی دەیگوت سەربەستی دەدەم بە گوێگر با خۆی وێنەکان شی بکاتەوە بە ئارەزووی خۆی.

یەکەم جوڵە وەک پانۆرامایەک دەکرێتەوە کە وێنەکانی سروشت وێنەی بەهاری لادێمان بۆ بەرجەستە دەکات کە جوتیاران لە مەرزەکاندا پەرش بوونەتەوە کە هونەرمەند جوانکاریەکانی خۆی بۆ ئەفراندووە، کەوا هەستدەکەیت لە گوندێکی رێک و پێکی خنجیلەی جوانی ئەوروپایت کە سەوزایی هەموو سروشت و دەوروبەری داپۆشیوە.

ئەم جوڵەیە لە دوو ئاوازی سەرەکی پێکدێت :

یەکەم: هەموو ئۆرکسترا لە دوو توێی ئاوازێکدایە کە هێز و هێمنی تێدا بەرجەستە دەبێت کە ئەم ئاوازە بنەمایەکە بۆ کانیاوی هەڵقوڵاندن.

دووەم: بە پێچەوانەی یەکەم کە کەمانچەکان پاش ئەمان چەلۆ (باص، کلارنێت، فلوت) دواتر ئاوازەکان بەیەکدا دەچن و دەمانباتەوە سەر بەشی یەکەمی جوڵە.
لەکۆتاییدا هەموو کەمانەکان و فلوت بەهاوکاری ئۆرکسترا جوڵەکە دەچێتەوە دۆخی یەکەم و بەرەو دنیای بەهارو سروشت و شادیمان دەباتەوە.

جوڵەی دووەم: (لەسەرخۆ بەشێوەی سۆناتا ANDAN TH MOLTO MOSSO)

ئەم تابلۆیە بەناوی (وێنەیەک لەسەرکانی) ناوی دەبات، کە هێماکانی هونەرمەندانە دەردەبڕێت کاتێک ژێدارەکان هێدی هێدی نزیکمان دەخەنەوە لەسەرچاوەی کانیاو و وا دەزانین لەسەر چیمەنێکی سەوز راکشاوین و چاومان بڕیوەتە رەوە هەورێکی سپی کە کۆدەبنەوە و دەپوکێنەوە لە ئاسۆدا، لەو دەمانەش خوڕەی ئاوی کانی کە لە بنیا دەلەرزێ مرواریی زیخ و چەو دێتە گوێمان و لەسەر درەختیش دەنگی بولبولی خۆش ئاواز دێتە گوێ، کە ئامێرە فوودارەکان دەیچڕن، هەموو ئەمانە بە دەربڕینێکی سەمفۆنی تۆکمە بێ ئەوەی هیچ لە دنیای رۆمانسیەت کەمبکاتەوە.

جوڵەی سێیەم (خێرا ALLEGRO)

پێدەچێت گەنجینەی یادەکانی بیتهۆڤن لەناو گوندەکان هەرگیز وشکایی نەیەت، پێگگەیشتنی دۆست و یاران لەم سروشتە دڵڕفێنە ئیلهام بەخشی ئەم جوڵەیەن کە لە شێوەی (السکرتسو) ئامادەی کردووە بۆیە بە ئاوازە فەنتازییەکانی کە وەک شێوەی کاریکاتێر وایە لەوێنەدا هاتووە، یادگارییەکانی دەچێتەوە رۆژێکی بەهار لەلادێ کە لەناوچەی (مودلنک) نزیک ڤییەنا، ڕێکەوتی تیپێکی مۆسیقایەکی گەڕۆکی کرد، ئەوەی بۆی کرا چەند سەمایەکی بۆ نوسینەوە بە پێی ئاست و توانای خۆیان، چونکە هەندێکیان بۆ ماوەیەک واز لە ژەنین دێنن بۆ ئەوەی پێکێ دروستبکات یان لەگەڵ هاوڕێکەی بدوێ، ئەم وێنانە کە کاتی پچڕپچڕبوونی ئاوازەکان هەستی پێدەکەین.

جوڵەی چوارەم (خێرا – ڕەشەبا ALLEGRO)

کتوپڕ دەچینە ناو هەڵکردنی باڕەشێک کاتێک جوتیاران لەوپەڕی خۆشیدان دەژەنن، سەمادەکەن، گۆرانی دەڵێن، کاتێک ڕەشەبا هەڵدەکات و ئامێری (پیکلۆ) شاوری هەورە بروسکە لێدەدات و ئامێرە ژێدارەکان گرمەی هەورەکە بەرجەستە دەکەن، فووی بۆقیەکانیش لەگەڵ کوتەی تیمپانیەکان هێندەی تر جۆش بە ڕەشەباکە دەدەن پاش کەمێک هێمنی باڵ دەکێشێت بەسەرداو هێما بۆ جوڵەی پێنجەم دەکەن.

جوڵەی پێنجەم (خێراییەکی مامناوەندی ALLEGERTTO)

ڕەشەباکە خامۆش دەبێت، هێور دەبێتەوە، هەورە بروسکە دەڕەوێتەوە لەو کاتەدا هەست بەدڵنیایی و ئاسوودەیی دەکرێت. لەو کاتەدا شوانکاران دەپاڕێنەوە کە ئامێری کلارنێت بەرجەستە دەکات کە زاڵە بەسەر ئەم جوڵەدا، تیشکی ڕۆژ لە هەورەکان سەردەردێنێ کە هێدی دەڕەوێنەوە و بەرەو نادیار دەچن و سرودی شوانەکان هەڵدەچێ ... تاکۆتایی سەمفۆنیاکە.

سەمفۆنیای حەوتەم (سەمای پیرۆز)

مۆسیقاژەنی ئەڵمانی فاگنەر بەم شێوەیە باسی ئەم کارە دەکات (ئەو واتە بتهۆڤن سەمای گەیاندۆتە ئاستی خواوەندەکان)مۆسیقای جیهانیش ناوی نەمری داوە بەم کارە ئەوەی گوێی لەم سەمفۆنیایە دەبێت رادەمێنێت لە توانای بلیمەتانەی ئەو هونەرمەندە خۆی بەکەم دەزانێت بەرامبەر ئەم ئەفراندنە پڕ بەهایە هەرچەندە داهێنانەکانی کڕنوشت پێ دەبات، لە هەمان کاتدا چەندان پرسیاری لا دروستدەکات بەرامبەر ئەو توانایەی کە لە پشت ئەم ئەفراندنە نادیارو قوڵەوە دەوەستێت.

سەمفۆنیای حەوتەمی بە خۆشترین سەمفۆنیای دادەنرێت لای خۆی، کە لە کاتی گوێ گرانیدا بەرجەستەی دەکرد، ئەو دەنگدانەوەی ئەم سەمفۆنیایە لای گوێگر دروستی دەکات لە ئەنجامی پانتاییە قوڵەکانییەوە کە دابەشکردنی ئۆرکسترایی دەهێنێتە ئاراوە، کەچەند وێنەیەکی نمونەیی لە جوڵەکاندا بەرجەستە دەبن، ئامێرەکان دووبارەو چەند بارە دەبنەوە، پاشان هێمنی میوانت دەبێت،

لەجوڵەی دووەمیشدا هەروەک دەستێک هاتبێت ئەو هێمنیەی شڵەقاندبێت ئامێرە ژێدارەکان لە قەراردا بەرەزمێکی یەکگرتوو جوڵەکە دەردەخەن، هێدی هێدی هەست بە ونبوونی خۆت لە ئاوازەکان دەکەیت، بێ ئاگا، هەروەک ئەوەی هەرچی جوانی دەوری بوونی داوە هەمووی رەشەبا فڕاندوویەتی و وادەزانێت هەرچی سەوزەگیا هەیە هەمووی سوتاوە، کە گوێگر دەخاتە ناو جیهانی نەمانی کەسایەتی خۆی و لەبۆتەی ئاوازێکی نادیاردا دەگاتە حاڵەتی گریان، رەزمە بێوینەکانی هەموو هێزێکت لێ زەوت دەکات، کە بێهوودانە سەیری هەموو بوون دەکەیت، تەنانەت هەست بەشتە مادییەکان ون دەبێت بەیەک هەستەوە سەرقاڵە ئەویش ماتیەکی شاراوە کە لە منداڵانیدا نەشوەیەکی نامۆی تێدایە، پاشان ئاوازەکان هەڵدەکێشین وەک ئەوەی بتهۆڤن بەزەیی بە گوێگردا بێتەوە بۆ ئەوەی دەستەووەستان نەوەستێت، بۆ ئەوەی ئازارەکانی بلیمەتانەی بخاتە گەڕ و پاکی بکاتەوە لە گوناهەکانی کە مژدەی بەیانێکی روونی پێدەبەخشێت و خۆی ئامادە دەکات بۆ جوڵەی سێیەم کە خێرایی مۆرکێکی ئاسوودەیی پێ دەبەخشێت بۆ ئەوەی لەو تەنگاوی جوڵەی دووەمدا ئاسوودەی بکات. تەنانەت رەخنەگران بەجوانی ئەم گۆڕینە سەرمەستن کە کارێکی ناوازەیە لە دنیای ئاوازدا.

گونجاندن لە نێوان دوو ئاوازی دژیەکی پێچەوانە یەکێک کوتەی ئازار، ئەوی دی نەشئەبەخش و شادی ئامێز گوێگر شاگەشکە دەکات، هەروەها گەڕانەوەی کوتەی دەهۆڵەکان کە ئامێزی جوڵەی یەکەم ببوو لە جیهانێکی سەمفۆنیادا یەک دەگرنەوەو بۆئەوەی لە زەمەنێکی ئاساییدا تێکەڵ بەجوڵەی چوارەم بێت و کە هەڵچوونی ژەنین و لێدانە یەک لەدوای یەکەکان کە زیاتر گورچکبڕ دەبن کە بیتهۆڤن دەیویست یەکێک لە جەژنەکانی (باخۆس) بەرجەستە بکات کە خوای مەی و نەشئە مرۆییەکانە وەک ئەوەی بڵێت(من با خۆم کە مەی بەتام و دەگوشم بۆ مرۆڤ بۆ ئەوەی خەڵوەتی عەشقی خودایی پەخش بکەم) رۆمان رۆلان دەڵێت لە جوڵەی چواردا رەسەنایەتی بیتهۆڤن دەردەکەوێت کە زمانی ئاخاوتنیەتی، کە هەرگیز نەشازە بە دنیای یاسا و دەسەڵات و ملکەچبوونی کوێر، ئەمەیە بە فیرۆدانێکی شێتانەی تواناکانی مرۆڤە، بێهودانە تەنهاو تەنها بۆ کات بردنە سەر، ئەوکاتەی رووبارەکان لافاودەکەن و هەموو شت دەکەن بە ژێرەوە.

بۆیە رەخنەگری هاوچەرخ (ریشارد لیۆنارد) دەڵێت (ئەم سەمفۆنیایە کە دەستی مرۆڤ نوسیویەتیەوە)

### بانگهێشتێک بۆ (ئاسوودەیی مرۆڤ) لە سەمفۆنیای نۆیەمدا

کاتێک شاعیری ئەڵمانی(فردریک شیلر) لـە سـاڵی ١٧٨٥ قەسـیدەیەکی بـەناوی (بۆ سەربەستی) نوسیبوو کە لە ژێر کاریگـەرێتی شۆڕشـی فەرەنسـا نوسـیبووی بـەڵام بـاری تایبـەتی وڵاتەکـەی ناونیشـانەکی پـێ گۆڕیبـوو بـە (بانگهێشـت بـۆ ئاسوودەیی) بۆیە بەبیریدا هات کە لەم سـەمفۆنیایەدا کـە دەنگـی مـرۆڤ ئاوێتـەی ئەم کارەی بکات کە تایبەتە بە شێوازی سێیەمی بیتهۆڤن کە لـە هـەموو کۆتـەکانی کلاسـیک دەربـاز دەبێـت، جلـەو بـۆ ئەفرانـدنی خـۆی شـلدەکات کـە لـە پـەیژەی (DMINOR) ڕێ مایزم کە سروودی ئاسوودەیی هەموو جوڵەی چوارەم داگیر دەکات کە کۆڕاڵ دەیڵێتەوە.

### جوڵەی یەکەم خێراو بەراشکاوییەوە (ALLEGRO MA NON TROPPO)

دەربڕینی قەدەر و سیستەمی ئەبـەدی بـوون بەرجەسـتە دەکـات و هەڵوێسـتی رامانی مرۆڤی دەربارەی بیتهۆڤنیش شۆڕشـگێڕی خـۆی بەرامبـەری دەردەخـات مۆسـیقا... ئـەوە دەگەیـەنێت کـە بانگهێشـتی مـرۆڤ بکـات بـەرەودەرباز بـوون لــەئازارو نەهامەتییــەکان، رقــی پیــرۆزیش ئاڕاســتەی زەوتکــەرانی ئــازادی و مرۆڤایەتی دەکات، ئەم جوڵەیە لـە هەسـتی بـەرینی بیتهۆڤنـەوە ئاوازی سـەرەکی پێکدێت کە ژێی هەستمان دەژەنێت و تێکەڵ بە نێرە دەنگی کۆنترباسەکان دەبێت و لەچارەنووس دەدەن و دەسەڵاتی چارەنووس بەرامبەر حەسرەتی ئـەو مرۆڤـەی کە عەوداڵی نهێنییەکانی دڵە راوکێیەتی، نغرۆ لەناو خەمە سـەرمەدییەکاندا، هێور بوونـەوە بـۆ سـاتەوەختێک کـە گـوێ بیسـت دەخاتـە بێدەنگییەکـەوە کـە لـەقوڵایی دەروونەوە سەرچاوە وەردەگرێ دەیخاتە ناو بۆتەی بیرکردنەوەیـەکی بێ بن و نادیار، پاش کـەمێک چەنـد ئاوازێک دەڕژێنـە نـاوەوەو بـە هێزێکـەوە کە نازانیت لەکوێوەیە بوونی خۆی رادەکێشێت بۆ خۆی، بەڵام ئازارەکان و خـەمان هەمیشـە هیوایەکی باڵادەست لە شێوەیەکی جواندا هەمیشە دەچرێنێت بەگوێدا، هەر ئەمانە ئامێری ڤیۆلا و چەلۆ بەرجەستەی دەکات، هەروەها ئاوازێکی دی هەیە لـە هـەمان جوڵــەدا کــە ئاســوودەیی دەبەخشــێت کــە ســەمفۆنیاکە بــەرەو ڕووی دەڕوات وادەزانی کە لە ئاسمان داباریوە و لەگەڵ ئاوازی سەرەکیدا نەش و نما دەکات کە گوێگر وادەزانێت بەرەو دوا دەچێنن، بەڵام نەخێر – باڵا دەبێت و باڵا –.

## جوڵەی دووەم: (زۆر خێرا MOLTO VIVACE )

پێداگرتن لەسەر جوڵەی یەکەم و بیرۆکەی دەروون دێتە جۆش و ئاوازەکان تێکەڵ بە قوڵایی دەبن بۆ ئەوەی خۆی لە دەربازبوونی مرۆڤ لە ئازاروپاکبوونەوە لە گوناە، ئەو (سکیرزو) یە لەم جوڵەدا جوانترین شێوازی بیتهۆڤنیە کاتێک ئاوازە نرکەدارەکە ئاوازی سەرەکی راودەنێ و ڕێگا بۆ ئاوازێکی سەرەکی خۆشدەکات، سۆز دابەشدەکەن لە هارمۆنییەکی گونجاودا، سەما پێکەوە دەکەن، بە هیوایەکەو کە لەناویدا هەست ئازارەکانی گیان کە دۆشداماون بەرامبەر چارەنووسی نادیار کە بەردەوامە لە کوتاندنی تیمپاییەکان هەوڵی وردو خاشبوون دەدات، داوا لە هێزی تاریکی دەکات کە خۆی بسەپێنێت، پاش کەمێک فوارەی چەند ئاوازێکی جوان – جوان دەمانگوشێت وا لەمرۆڤ دەکات سەما بکات و کاژی تاڵی مەینەت فڕێبدات، هیواکان تروسکاییان دیارە، لەدوور، لە ئاسۆیەکی نادیارەوە.

کاتێک بێدەنگی دەمانخەڵەتێنێت کوتەکان شێتانە دەکوتن و ملکەچمان دەکەن، ئاوازێکی خوڕەدار دێت و جارێکی دیش هیوا دەبەخشنەوەو چاوەڕێی مەسیحێک دەکەین، تا رزگارکەر بێت.

## جوڵەی سێیەم (خاو بە سۆزەوە ADAGIO MOLTO ECACANTBILE)

لەم جوڵەیەدا دوو ئاوازمان پێشکەش دەکەن یەکەمیان جوانترین و قوڵترین ئاوازەکانی کە گوێبیست دەخاتە دڵەڕاوکێیەکی خەمناکەوە، ئاوازەکان بەخاوی دێنەدەر، وەک ئەوەی بێدەنگی بێنێتە گۆ، ئاواز دێتە ناخمانەوە بەنەرمی، پاش ئەوە کۆکردنەوەیەکی درامی مۆسیقا، هەروەک ئەوەی هەموو گەنجینەکانی مرۆڤی لە گریان، توانەوە لە رۆح – مەلاس دابێت.

ئەو لەخۆگرتنەی ئەم جوڵەیە مرۆڤ دەگرێتەخۆ، هەموو مادییەکانی هەست دەمرێنێت، هەرچی لەناخدایە دێتە زمان لەگەڵیدا ئازارێکی خۆش و تامەزرۆ کە وردترین خانەی ئاواز پەخشی دەکات کە ئاواتە خوازە هەر لە دەریای خەمی بلیمەتانەی خۆیدا مەلەبکات و ورد وخاش بێت بۆ ئەوەی نهێنییەکانی ئەو دنیا سیحراوییەی بۆ بدۆزێتەوە، هێندە نابات کەمانەکان و ئامێرە بۆقیەکان هێدی

هێدی مت دەبن و لەناکاودا تەوژمی کۆنترباسەکان بەخوڕ دێن .. هەڵدەکێشن و هەڵدەکێشن، ئۆرکستراش مژدەی رۆژانی چاوەڕوانکراو دەدەن بە بەشمەینەتەکان لە هیوایەکدا خنجیلەیە، نەرمە، بەخەونە و تروسکاییەک دەبەخشێ.

جوڵەی چوارەم (زۆر خێرا)

بەبانگهێشتیک بیتهۆڤن ڕێگایەکمان بۆ خۆشدەکات لەم جوڵەدا بەوەی کە داوا لەهەموو بەشمەینەتان دەکات بۆ تەقینەوەی شۆڕشیان لە چوارچێوەی ئاوازی سەرەکیدا بە ئۆرکسترا دێنێتەگۆ بۆ بەرجەستەکردنی سروودی ئەفسوناوی داهاتوو، مۆسیقا گیانی جۆشدان بەرزدەکاتەوە و پاشان نغرۆ دەبێت لە بێدەنگییەکی نادیار، ناخایەنێ دەگەڕێتەوە و لەگەڵ خۆیدا مژدەی ئاسوودەی ژیان دەگەیەنێت بە هەمووانی دەبەخشێت و دەیڕژێنێتە ناو هەموو دڵەکانەوە.

مۆسیقای سروود کە هێشتا نادیارە لەمەودای نێوان هیوا چاوەڕوانکراو لە هاژەیەکی بەخوڕ کە ئۆکسترا بەرجەستەی دەکات جگە لە ئامێرە ژێدارەکان، پاشان هەموو ئاوازەکان یەکانگیر دەبن لەهەرسێ جوڵەی پێشوودا، هەموو ئامێرە ژێدارەکانیش بەردەوام بەرەنگاردەبن، بەڵام ئامێرە فوودارەکان رێچکە دەشکێنن بۆ ڕێگا خۆشکردن بۆ قەصیدەی شیلر بە شاگەشکەی ئاسوودەیی مژدە بەخش، ئۆرکستراش داواخوازە کە نرکەی ببڕێت بەڵام دەنگی باریتونی کۆڕاڵ بە ئاشکرا دەڵێت:

ئەی هاوڕێیان – ئەی هەڤاڵان<br>
ئەم دەنگانە ئەبەدی نییە<br>
با گۆرانی بڵێین، گۆرانی خۆشنوودی<br>
تۆ هەرگیز نەمریت، ئەی خۆشنوودی

رۆمان رۆڵان بەم شێوەیە لەم ساتە نەچرکەی دەستپێکردنی سروودی خۆشنوودی دەدوێت (لەو کاتەدا کە خۆشنوودی لە سەمفۆنیاکە خۆی جلەوکێش دەکات، ئۆرکسترا لە پڕ لە ژەنین دەکەوێت)

بێدەنگییەکی سەیر باڵی دەکێشێت بەسەردا، کە سروودەکە تایبەتمەندییەکی یەزدانی تێدایە، بەرجەستە دەبێت، سەیرەو زۆر سەیرە، لەو کاتەدا گومان لە هەموو شت دەکەیت، تەنانەت لە هێزی یەزدانیش.

لەو کاتەدا ئاسوودەیی باڵ دەکێشێت و ئازارەکان دەسڕێتەوە، لەو ساتانەدا هەست بەگریان دەکەیت، گریانی نەشئەوخۆش.

لەو ساتانەدا خۆشەویستی سەرهەڵدەدات، خۆشەویستییەکی ئەبەدی مرۆڤ بۆ سروشت، بۆ شتە جوانەکان، بۆ لابردنی هەموو دڵەڕاوکێکان، بۆ دەربازبوون، ئەو نامۆبوونەی کە ئاین و نەتەوە و دەسەڵات و خێزان و کۆمەڵی فرەچین وەدی هێناوەو هەر خۆشیان خۆیان بەرەو نەمان دەبەن، لە ململانێیەکی سەختی مێژووییدا.

ئەمە بیتهۆڤنە، شای بلیمەتەکانی ئەفراندن دەڵێت کاتێک ئەم سەمفۆنیایە بۆ یەکەمجار پێشکەشکرا، بۆ ماوەی یەک کاتژمێرو نیو بێدەنگییەکی پڕ مانا، هێندەی مانای سەمفۆنیاکە باڵی بەسەر هۆڵدا کێشا، پاشان چەپڵە ڕێزان و دەستخۆشی شای داهێنەرانیش ئاگای لەم کەین و بەینە نەبوو، بەڵام ئەم نە چەپڵە ڕێزان، نە دەستخۆشی لەشوێنی خۆی چەق وەستابوو، هەموو بانگهێشتەکانی خەڵکی ڤییەننای لا میوان بوو، جگە لەوەی کە رابەری ئۆرکسترا بەناوی (ئەمیلۆف) ئاگاداری کردەوە، لەوکاتەدا تەنانەت گوێی لە چەپڵەڕێزان، رەشبەڵەکی ئەو کەسانە نەبوو کە هەردەم خۆشەویستی بوون، گوێی لە جوتیاران نەبوو کە گۆرانی بۆ دەگوتن، لەو کاتەدا پڕ بە گەرووی گریا و گریاو فرمێسکی ڕشت، بووە رووبار و لەو کاتەدا زێدەتر بوو لەمرۆڤ، لەو کاتەوساتەوەختانەدا خودای ئاسوودەیی هەموو مرۆڤایەتی بوو.

جوڵەی چوارەم: لەشیعری فردریک شیلر:

ئەی هاوڕێیان، ئەی هەڤاڵان
ئەم دەنگانە ئەبەدی نین
با گۆرانی برایی بڵێینەوە - گۆرانی خۆشنوودی
دەبا نەمر بێت تۆ ئەی خۆشنوودی

ئەی خۆشنوودی ، ئەی کانیاوی رووناکی ئەبەدی
ئەی جگەرگۆشەی فیردەوس
ئێمە لە رووناکی دەپاڕێینەوە تا بگەینەلات
بۆ لای گیانی پیرۆزت
بەرووناکی دڵڕفێنی تۆ .. مرۆڤایەتی سەرفرازدەبێت
لەکۆتەکانی ...
لەوکاتەدا شاباڵ دەگرێت
مرۆڤ هەمووی برای یەکە
تۆ ئەی جێگای شانازی
تۆ کە هاوڕێی بەوەفای خۆت هەیە
تۆ ئەوەی کە دڵی ئافرەتێکت راکێشاوە
لێبگەڕێ با نەمرت بکەین
ئەوەی دڵ ناوا
با لە ئەشکەوتی تاریکیدا بێت
بەتەنها ئاسوودەیی مرۆڤایەتی دەگرێتەوە
هەموو کون و قوژبنێکی جیهان
هەتا دوایی ....
-
سەرچاوەکان :
١ـ نزعات انسانیه فی موسیقی بیتهوڤن (غانم الدباغ) بغداد– ١٩٧٩
٢ـ الموسیقی العالمیه ، د.طارق حسون فرید ، بغداد ١٩٨٩
٣ـ تاریخ الحیاه الموسیقیه ، مصطفی کامل الصراف (دار الیقضه العربیه ، للتالیف و النشر السوریه – دمشق)
٤ـ دعوه الی الموسیقی : یوسف السیس .
تێبینی/ ئەم بابەتە لەگۆڤاری شاکار، ژمارە ٢ ساڵی ١٩٩٩ بڵاوکراوەتەوە.

# پڕوشەی هەستی مرۆیی لە سەمفۆنیاکانی بیتهۆڤن دا

ئازاد صالح



دەبێ و دەبێ کامە نووسین – کام دەربڕین – کامە پەڕە موچی بوێر بتوانێت ڕۆبچێتە ناو قووڵایی دەریای بێ بن و ناخی ئەو شەپۆلانەی کەشەپۆل دەدەن لە شەپۆلداو کەبارانن لەناوباراندا و کەکێڵگەن لەسەوزبووندا کە بوونن لەناو بووندا . کەهەمیشە پرسیارو گومان و ڕەخنەن لەسەرجەم دیاردەکانی بوون ، کەهەردەم دژن لەناو دژەکاندا کەلە بۆتەی نامۆبونی مرۆڤ چەندان زنجیر دەشکێنن و سنورەکان دەڕمێنن و بەرەو ڕاستی ژیان هەنگاو دەنێن . ئەوە چ بێت کەنغرۆ ببێت لە قووڵایی دەریای داهێنانی بلیمەتێك لە داهێنەرانی مێژووی لێك دانەبڕاوی نەوەکانی مرۆڤایەتی . کەبەئاوێتە بوون لەگەڵ دیاردەکانی ژیان مێژوو یان بونیاد ناوەو لە ڕەوڕەوەی خۆی بەردەوامە .

هەبێ و نەبێ .... لە ئێمە نزیك تا دوور ..لەکەم تا زۆر – لە ڕەش تا سپی لەرەگەزی مێ یە تا نێر ... لە هەموو چین و توێژ و تەمەنەکان گەر تەنها بۆساتەوەختێکیش بووبێت گوێ ڕایەڵی پرشەو وورشەیی هەڵچون و داچونی پێشەکی و سۆناتە و سەمفۆنیەکانی کەلەداهێنەر و بلیمەتێکی وەك ( لودڤیج ڤان بیتهۆڤن) نەبوبێت؟ ! ! Ludwing Van Beathovenهێندەی جێگای تێڕامانە .. تا چ ڕادەیەك ئەم هونەرمەندە هەستی خۆی لە بۆتەی ژیان و ئازار و خەمەکانیدا چۆن ئاوێتەی کارە هونەرییەکانی کردوەو ڕەنگی داوەتەوە . ئەویش بەشی کردنەوەو ڕاڤەی هزرو خەیاڵ ...

پەیوەست بوونێکی واقعیانە بەدیالێکتێکی ژیان و دەوروبەر و سەردەم .

بیتهۆڤن کەلە ساڵی ١٧٧٠ لە شاری (بۆن) لەکەنار رووباری ڕاین لەخانە وادەیەك کەلەبنەڕەتدا لە (ئەنتۆرب) ی بەلجیکی یەوە هاتبون لەدایك بووە .

باوکی گۆرانی بێژبوو لە کڵێسای شاردا و پیاوێکی کەم تەرخەم بوو بێ هوودە دەیڕوانی یە ژیان و کەسەر (مەی خواردن) خۆی ڕاهێنابوو .

## پێناسەیەک بۆ ئابووری نێودەوڵەتی

ئەم زاراوەیە بریتیە لەکۆی پەیوەندییە دراوی و کاڵاییەکانی نێوان وڵاتانی جۆراوجۆر، هەروەها هەموو چالاکییەکی خزمەتگوزاری و دامەزراوەی کە وڵاتانی جیهان پێکەوە دەبەستێتەوە لە ئەنجامی دابەشکردنی جیاوازی هۆیەکانی بەرهەمهێنان لەڕووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە لە نێوانیاندا.

دەبێت ئەوەش لەیاد نەکەین کە لەڕووی پراکتیکەوە خۆی لە هاریکاری وڵاتان لەڕووی ئابووری و بازرگانییەوە بەرجەستە دەکات، یان بە شێوەیەکی تری بە دەوڵەتکردنی ئابووری، بەڵام لەڕووی تیۆرەوە راستییەکی ئاشکرا خۆی بەرجەستە دەکات ئەویش جیاوازی دابەشکردنی هۆکانی بەرهەمهێنانە لەنێوان وڵاتانی جۆراوجۆردا لە نەبوونی کەرەستەی سروشتی، ئەویش بە پێی جیاوازی ئاو و هەوا و پێکهاتەی جیۆلۆجی زەوی و پیت و فەڕی. هەروەها لەرووی جیاوازی دابەشکردنی سەرمایەوە لە هەندێ وڵاتان زۆرەو لە هەندێکیش دەگمەن، ئاشکرایە کە سەرمایە رۆڵێکی سەرەکی دەبینێت بۆ وەگەڕخستنی کەرەستەی خاو و کرێی کار و بێ ئەویش پرۆسەی بەرهەمهێنان پەکی دەکەوێت و لەبار دەچێت.

ئەم بنەمایە رۆژ لەدوای رۆژ بە شێوەیەکی ئاسۆیی و ستوونی فراوانتر دەبێت لە سایەی پێشکەوتنی زانستی و تەکنەلۆژیاو هۆکانی هاتوچۆ و گەیاندنەوە، کە نوێترینیان سیستمی جیهانگیرییە کە کارێکی گەورە دەکاتە سەر ئابووری بە شێوەیەکی راستەوخۆو ناڕاستەوخۆ.

لێرەدا گرنگی ئابووری دەرەکی دەردەکەوێت بۆ پڕکردنەوەی کەلێنی جیاوازی دابەشکردن لە هۆکانی بەرهەمهێناندا هەر لەم رێگایەوە وڵاتان دەتوانن ئەم ئامانجانە بهێننە دی:

١ـ وەدەستهێنانی کاڵای بەکاربردە کە هەندێ وڵات لەبەر نەبوونی باری لەباری هۆی سروشتی یان زەوی بەفەڕو پیت لە توانایدا نییە بەرهەمی بهێنێت، لەم ڕێگایەوە دەتوانێت پێویستییەکانی هاوڵاتیان دابین بکات.

٢ـ وە دەستهێنانی کاڵای بەرهەمهێن (سلع انتاجية) کە لەناوخۆدا بەرهەم نایەت

لەبەر نەبوونی زانستیەکی پێشکەوتوو یان سەرمایەی لەبار، بەم شێوەیە هێنانی ئامێری بەرهەمهێن دەبێتە هۆی گەشەسەندنی ئابووری.

٣ـ هەر بە هۆی ئابووری نێودەوڵەتییەوە هەندێ وڵات دەتوانن کە سەرچاوەی دراو (مصادر العملة) لە دەرەوە بەدەست بهێنن کە هێزی کڕینی بۆ دەڕەخسێت بۆ ئەوەی هاوردەکانی لە کاڵا پێ دابین بکات، هەروەها سوود وەرگرتن لە پسپۆڕانی زانستی و هونەری بۆ پرۆسەی بەرهەمهێنان.

٤ـ هەر لەڕێگای ئابووری نێودەوڵەتییەوە کە بەرجەستە دەبێت بەهۆی ئاڵوگۆڕەوە هەندێ لەوڵاتان دەتوانن ئەو کاڵایانە بەرهەم بهێنن کە تێچوونیان کەمەو واز لە بەرهەمهێنانی ئەو جۆرە کاڵایانە بهێنن کە تێچوونیان گرانە بەمەش دەتوانن ئەو جۆرە کاڵایانە لە وڵاتانی ترەوە بهێنن.

تو خمەکانی ئابووری نێودەوڵەتی

بریتییە لە چەند توخمێکی سەرەکی لەوانە:

١ـ بازرگانی دەرەوە (لەناردن و دووبارەکردنەوەی ناردن دەگرێتەوە هەروەها هاوردەی کاڵای بەکاربردەو بەرهەمهێن)

٢ـ بازرگانی نەبینراو: (غیر منظورة) کە بریتییە لە هەندێ خزمەتگوزاری بازرگانی یان بازرگانی کە ئەمانە دەگرێتەوە:

أ ـ گواستنەوە (کاڵا یان کەسان) بە ڕێگای خاکی یان هەوایی یان ئاوی لەم وڵات بۆ ئەوی تر.

ب ـ دابینکردنی دەرەکی (التامین الخارجی).

ج ـ جێگیربوون لەدەرەوە بە شێوەی دیبلۆماسی یان رامیاری، سەربازی، رۆشنبیری یان بازرگانی.

د ـ کۆچکردنی هێزی کار و کڕینی مۆڵەتی زانستی و راگەیاندن و پێشانگاکان لەدەرەوە.

هـ ـ بەکارهێنانی سنووری زەمینی و ئاوی و هەوایی هەندێ لەوڵاتان.

٣ـ پەیوەندی دارایی و بانکی نێوان وڵاتان کە جۆرەکانی سەرمایە خۆی تێدا دەنوێنێت.

## جیاوازی نێوان ئابووری نێودەوڵەتی و ئابووری ناوخۆ

هێنـدەی ئاشـکراو دیـارە کـە ئـابووری نێودەوڵـەتی و نـاوخۆ دوو تـوخمی سەرەکین لە توخمەکانی ئاڵوگۆڕی کاری بەهەمهێناندا، لێرەدا هەردووکیان رۆڵی ئاڵوگۆڕکردن دەبینن ئەویش بەگۆڕینی کاڵا بەدراو، پاشان دراو بۆ کاڵا، واتە کاڵا – دراو – کـاڵا، هەرچەنـدە هەنـدێ جیاوازییـان هەیـە چونکـە بازرگـانی دەرەوە بەشـێکە لـە سیسـتمی ئـاڵوگۆڕی دەرەوە بـۆ ئـابووری نیشـتمانی بۆیـە لەسـەر رۆشنایی ئەم جیاوازییە دەتوانین ئەم خاڵانە دیاری بکەین:

١ـ گواسـتنەوەی هۆکـاری بەرهـەمهێنان لـە ئـابووری نـاوخۆ بـە شـێوەیەکی ئاسـان، چونکـە جیـاوازی نێـوان کرێـی کـار لەسـنوری یـەک وڵاتـدا بـە ئاسـانی دەگوازرێتەوە بۆ ئەو جێگایەی کە کرێی کـار لـەبارترە یـان جوڵـەی سـەرمایە بـە ئاسانی هاتوچۆ دەکات، لەبـەر ئـەوە لەهـەمان وڵاتدا یـەک جـۆر دراو بـەکاردێت، بەڵام لەنێو وڵاتان ئەم هاتوچۆیە ئاسان نییە، ئەویش بەهۆی سـنووری جـوگرافی و جیاوازی بەکارهێنانی جۆری دراو.

٢ـ جیـاوازی دراوی نیشـتمانی نێـوان وڵاتـان لەبـەر ئـەوەی هـەر وڵاتـە جـۆرە یاسایەکی هەیە بۆ دەرکردنی دراو و بەهای هەر دراوێک چونکە لەهەر پرۆسـەی هێنان و ناردنێکدا دوو جۆر دراو بەکاردێت، دراوی وڵاتی هێنـەر + دراوی وڵاتـی نێردەر، ئەمەش پێویستی بە گۆڕینەوەی دراوەکان هەیە

٣ـ جیاوازی سـنووری جـوگرافی و رامیـاری کـە بازرگـانی نـاوخۆ لەسـنووری جوگرافی یەک وڵاتدایە، بەڵام بازرگانی دەرەوە لەنێوان چەند وڵاتێکدایـە، چونکـە هـــەر بـــەهۆی بازرگـــانی دەرەکییـــەوە دەتـــوانین بـــازاڕی نیشـــتمانی و بـــازاڕی نێودەوڵەتی گرێ بدەین. لێرەدا بازرگانی دەرەکی رۆڵێکی سەرەکی دەبینێت کە تا چ رادەیەک ئابووری نیشتمانی دەتوانێت لەگەڵ گەشەی ئابووری دەوڵەتاندا خۆی بگونجێنێت.

٤ـ بوونی پێناسـەی گـومرگی (التعریفـه الجمرکیـه)و جیـاوازی سـنوورەکان کـە دەبێتە هۆی بەرجەستەبوونی سیاسـەتێکی گومرگی بۆ بازرگانـانی دەرەکـی، ئـەو کـات سـنووری دەسـەڵاتی جـوگرافی چەنـد ناوچەیـەکی گـومرگی دەسـەپێنێت کـە لەگەڵ سنووری جوگرافیا هاوتانین.

٥. توانای کەڵەکەبوونی سەرمایە  لە ڕێگای بازرگانی دەرەکییەوە کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا جیاوازییەکی سەرەکییە لەنێوان بازرگانی دەرەکی و ناوەکیدا، چونکە بازرگانی دەرەکی نێوان چەند وڵاتێکە کە لەڕووی بەرهەمهێنانەوە جیاوازن و لەپرۆسەی ئاڵوگۆڕی بازرگانیدا (یاسای بەها)کاریگەری دەخاتە سەر نرخەکان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی بۆیە دەبێتە فاکتەرێک بۆ دابەشبوونەوەی سامانی نیشتمانی نێوان ئەم وڵات بۆ ئەو وڵات لەکاتێکدا کە بازرگانی ناوەکی نابێتە هۆیەک بۆ وەدی هێنانی کەڵەکەبوون (تراكمات).

هۆکاری ئاڵوگۆڕی بازرگانی نێودەوڵەتی

١. هەندێ لە وڵاتان بەهۆی هۆکاری سروشتی یان جیۆلۆجی یان تەکنەلۆژی ناتوانن چەند بەرهەمێک بەدەست بهێنن، بۆیە پەنا دەبەنەبەر بازرگانی نێودەوڵەت، بۆ نمونە جیاوازی باری سروشتی دەبێتە هۆی ئاڵوگۆڕی بازرگانی لەسەر ئاستی بەروبوومی کشتوکاڵی، بەڵام جیاوازی جیۆلۆجی دەبێتە هۆی ئاڵوگۆڕکردنی کانزایی وەک (نەوت، ئاسن، بەردی مەڕمەڕ) هەروەها جیاوازی رادەی پێشکەوتنی تەکنەلۆژی دەبێتە هۆی ئاڵوگۆڕکردنیبەرهەمە پیشەسازییەکان، کە هەندێ لەوڵاتان ناتوانن بەرهەمی بهێنن لەبەر نزمی ئاستی پێشکەوتنی زانستی.

٢. هەندێ بەرهەمی نیشتمانی ناتوانێت خواستی دانیشتووان لەسەر جۆرەکانی کاڵایەکی دیاریکراو بهێنێتەدی و تێری بکات، بۆیە ئەو وڵاتە ناچار دەبێت کە پەنا بباتەبەر هێنانی ئەو جۆرە کاڵایە لەدەرەوە.

٣. جاری واش هەیە جیاوازی نرخی تێچوون کە کاڵایەک لەناوخۆدا بەرهەم بهێنرێت زیاتر بێت لەوەی کە لەدەرەوە بهێنرێت کە چاکتر وایە هێزەکانی بەرهەمهێنان ئاڕاستەی پیشەسازییەکی دی بکات، کە بتوانێت بە نرخێکی گونجاوتر بیهێنێتە بەرهەم.

٤. هەندێ بەرهەم و کۆمپانیا ناوبانگی جیهانی تایبەتی خۆی هەیە کە وادەکات هەندێ کاڵا لەدەرەوە بهێنرێت وەک ئەوەی ئەڵمانیا کاتژمێری سویدی لە دەوڵەتە ئەسکەندەنافیەکانەوە بهێنێت لەوەی خۆی بەرهەمی بهێنێت، هەرچەندە لەتواناشیدا هەبێت.

٥ـ هۆی رامیاریش یەکێکە لەو هۆیانەی کە پەیوەندی نێوان وڵاتان بەتین دەکات یان بە پێچەوانەوە گرژی دەکات، کە دەبێتە هۆی بەتین بوونی پەیوەندی بازرگانی یان بە پێچەوانەوە.

## کاریگەریتی بازرگانی دەرەوە

ئاشکرایە کە بازرگانی دەرەوە کاریگەری خۆی هەیە لەسەر رادەی نرخ ئەویش لەڕێگای نەهێشتنی دوو نرخی جیاواز بۆ یەک کاڵا چونکە هۆی جیاوازی نرخ بۆیەک کاڵا لەدوو وڵاتدا دەگەڕێتەوە بۆ بوونی یان نەبوونی هۆیەکانی بەرهەمهێنان، ئەو وڵاتەی کە هۆیەکانی بەرهەمهێنانی بە ئاسانی وە دەستدێت، نرخی شت و مەک تیایدا گونجاوە، بە پێچەوانەوە راستە، ئەمەش پێش ئاڵوگۆڕی بازرگانی، بەڵام ئاڵوگۆڕی بازرگانی هەردوو وڵات دەبنە یەک بازاڕ.

## کاریگەریتی بازرگانی دەرەکی لەسەر بەرهەمهێنان و بەکاربردن

بەهۆی بازرگانی دەرەوە ئەو وڵاتەی کەم بەرهەمە جۆرە کاڵایەکی تێدا زۆرە، ئەگەر بێت و وڵاتێکی دی دروستی بکات بەهاوردنی هەمان کاڵا هەرچەندە بەرهەمەکەش زیاتر بێت کار ناکاتە سەر بەکاربردنی لە هەمان وڵاتدا، چونکە ئەو بەرهەمە زیادەی کە بەرهەمی دەهێنێت وڵاتێکی دی پێویستییەکانی پێ پڕ دەکاتەوە کە ئەو جۆرە کاڵایەی تێدا نییە.

## کاریگەریتی بازرگانی دەرەوە لەسەر نرخی هۆیەکانی بەرهەمهێنان

لەکاتی بە ئەنجام گەیاندنی بازرگانی دەرەوەدا نرخی هۆیەکانی بەرهەمهێنان لەنێوان دوو ناوچەدا وەک یەکی لێدێت بۆیە ئەم بازرگانییە دەبێتە هۆی کەمبوونەی ئەو جیاوازییە، بۆ نمونە ئەگەر وڵاتێک کارو سەرمایەی گونجاو بێت، زەوی گونجاو نەبێت بۆ کشتوکاڵ، وڵاتێکی دی زەوی بە پیتی هەبێت بەڵام کارسەرمایەی نەبێت ئەم دوو وڵاتەش بێ بازرگانی دەرەکی بمێننەوە ئەوا لەیەکەمیاندا کارو سەرمایەی زۆر و بێ زەوی کشتوکاڵی، دووەمیشیان زەوییەکی زۆر بەڵام بێ کار و سەرمایە، بەڵام بەهۆی بازرگانی دەرەوە نرخی هۆیەکانی بەرهەمهێنان بەرەو یەکسان دەچن.

### کاریگەریتی لەسەر خواست بۆ کاڵا

لەکاتی ئاڵوگۆڕی بازرگانیدا پانتایی بەکاربردن فراوان دەبێت بەهۆی باری ئاو و هەوا یان جیۆلۆجی یان تەکنەلۆژی هەندێ وڵات ناتوانێت ئەو کاڵایە بەرهەم بهێنێت و هاوڵاتیان بەکاری بهێنن بۆیە پەنادەباتە بەر بەرهەمهێنانی ئەو جۆرە کاڵایانەو پاشانیش برەوپێدان لەئاستی بەکاربردندا بۆیە گەر بازرگانی دەرەکی نەبوایە لەوانەیە هەندێ وڵات لە زۆر کاڵا بێبەش دەبوون.

### کاریگەریتی لەسەر داهاتی نەتەوەیی

هەر بەهۆی زۆربوونی رادەی ناردنی کاڵاوە وڵاتان دراو وە دەست دێنن ئەویش دەبێتە هۆی پتەوبوونی داهاتی نەتەوەیی و پاشانیش دابەشبوونەوەی بەسەر تاکەکانی کۆمەڵدا وەک چاکبوونی باری گوزەران.

تێبینی:

١ـ بۆ ئامادەکردنی ئەم بابەتە سوود لەم سەرچاوەیە وەرگیراوە:
الاقتصاد الدولي – الدكتور أمين رشيد كنونه ١٩٨٠

٢ـ ئەم بابەتە لە رۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە ٢١١٢ لە رۆژی چوارشەممە لە ٢٠٠٠/٤/٥ بڵاو کراوەتەوە.

کوردستانی نوێ — NO.2112 Wedensday 5/4/2000 — 9 ئابووری

پێناسەیەك بۆ ئابووری نێودەوڵەتی

ئازاد سالح

## هەست بەجوانكاری لە موزیكدا

زانستی جوانناسی واتە ئیستاتیکا، کە بەشێکە لە لقەکانی فەلسەفە، کرۆکی دەربڕینی جوانییەکانە لەئەدەب و هونەردا (Aesthetics) لەیۆنانی کۆنەوە وەرگیراوە، پەیوەندیدارە بە - شت-ەوە یان ڕۆچوونە ناو شتەکانەوە کە دەچنە ناخ و هەستی مرۆڤەکانەوە. لەفەرهەنگ و زانیارییە فەلسەفییەکاندا واتای هەستکردن بەجوانی و چێژوەرگرتن و توانای جیاکردنەوەی ڕەش لەسپی و ناشرین لە جوان، ئەمەش خۆی بۆ خۆی وردبوونەوەیە لەناوکی نەبینراوی شتەکان – هەڵسەنگاندنیان، ڕەخنەگرتن و خوێندنەوەیان بۆ چەندین جاری دی.

ئێمەش لێرەدا موزیک دەخەینە ژێر پرسیارەوە بزانین چەندە جوانە – پڕ بارمان دەکات لە چێژو ئاهـ و حەسرەتمان پێهەڵدەڕێژن، بۆ ئەمەش دەبێت قوڵ بینەوەو خۆمان ڕۆشنبیر بکەین، دەبێت بزانین بنەماو ناوەڕۆکی چییە؟پێکهاتەی بونیادی ئەمانەش خۆی لە زاراوە شاراوەکان ئاشنامان دەکات، شیکردنەوەی پوختتر بە ئەنجام بگەیەنین، ئەویش بە ئەقڵانیکردنی هۆشمەندییە بۆ خوێندنەوەی دیاردەکان ئەمەش بەرەو کەنارەکانی پەیبردن بەجوانییەکانی موزیکمان دەبات، بۆ ئەوەی ڕەخنەگری موزیکناس شیکاری خۆی، بۆچوونەکانی چڕبکاتەوە دەبێت بنەما و سەرەتاو هێماکانی شارەزا بێت، جگە لەمانەش هەست و ناخ و پەروەردەیی و ڕۆشنبیری تێگەیشتن لەژیان بەگشتی بخاتە تەرازووی گیانەوە ئەو ساتانە دادوەرێکی بە ئەمەک بێت، ئەو ساتانە نەغمەی دەنگ و ڕەنگ دێتە جۆش و خورپەو دڵەڕاوکێ سەقامگیر دەبێت و خۆی لە بۆتەی جوانییەکاندا دەبینێتەوە، کاری نەزۆک دەبێتە گڤەی باو گوزەر دەکات ، جوانیەکانیش تا مێژووی مرۆڤایەتی ماوە نەمر دەبێت، ئەدی کارەکانی بتهۆڤن، موزارت، فاگنر، چایکۆفسکی، نەمر نین؟ ئەی کارەکانی سەید دەروێش و ئوم کەلسوم لەمیسر، بەیت و بالۆرەو حەیران و لاوک و سیاچەمانەی لەمەڕ خۆمان؟ ئەدی کوانێ ئەوانەی کە بڵقی سەر ئاو بوون؟

بۆئەوەی ئەم زانیارییە پڕ هەگبەمان هەبێت ئەبێت چی بکەین؟ ئەدی موزیک ئەو ساتانە کارێکی سەخت و دژوار نییە؟ بەهەموو کەس هەرس دەکرێت؟ چونکە موزیک خولیایەکەی بۆماوەییەو پڕ ئەندێشەیە. لەدیاردەکانی سروشت دژوارترو

پڕ هێماترو مانادارترە، چونکە زمانێکی دەربڕینە نەک ڕەنگدانەوەی دیاردەیەک، چونکە موزیک وێناکردن نییەلەبۆتەی سروشتدا، وەک وێنە و نواندن نییە، لەناو کەسایەتیە کۆمەڵایەتیە سروشتیەکاندا، هەڵکۆڵینی کەسایەتیە ناسراو و ناودار و بلیمەتەکان نییە وەک پەیکەرتاشین، بەڵکو دەریایەکە لەدەربڕین، سۆزێکە پڕ عەشق، ئای لەو کەسەی چەند بلیمەتە کە سۆزو عەشق ئاوێتەی شێوازێکی جوانی دەربڕین دەکات و کێڵگەی ژیانی پێ ئاو دەدات، هەر هونەرێک بۆ خۆی یاسا و ڕێسایەکی دیاری کراوی هەیە کەلەسەر ئەو بنەمایە خۆی بونیاد دەنێت و کەسایەتی خۆی دیاری دەکات، بۆ مرۆڤیش هەیە ئەو زاراوانە شی بکاتەوە و چێژیان لێوەربگرێت و شیکاری هێماکانی بکات و واتاکانی راڤە بکات و جوانتر ژیانی پێبخوێنێتەوە چونکە لەکۆتاییدا کاریگەرییەکە هەر لەسەر مرۆڤەو مرۆڤ.

موزیک خۆی بۆ خۆی لەناوک و کرۆکیدا چەندین مانای لەخۆیدا حەشارداوە ڕەزمەکانی وپەیژەکانی و هارمۆنییەکانی و شێوازەکانی دەربڕین، بچوکترین خاڵ و هێما مانایەک، دەستەواژەیەک دەگەیەنێت، مەگەر هەر موزیکناسەکان پەی پێبەرن و لەوردەکارییەکانی و پەرشبوونی وێنەکانی بگەن، کە لەگیانی ئەو بوونەوەرە سیحراوییەدا خۆی بەرجەستە کردووە وەک شیعر ڕۆژانە دادەچۆڕێت، لەکاتێکدا کە ئامانج نادیارە و بەرهەمهێنانی واتاکانی لە کەسانی ئاسایی بەدوورەو سروشتی دەربڕینی بێکۆتاییە. لێرەدا دوو دەستەواژە خۆی دێنێتە ئاراوە، داهێنان + ڕەخنەگرتن، تیۆری سەرەکی لەناخی هونەرمەندا هەموو یاساکان دادەڕمێنێت بۆ پرۆسەی داهێنان، دوای ئەویش کاری ڕەخنەگر دێتە ئاراوە و کاری ڕەخنەگرتن بە ئەنجام دەگەیەنێت. هونەر خۆی بەردەوام هەڵسەنگاندنی زانستیانە ئەنجام دەدات، زانستیش بۆ خۆی شیکارەکانی خۆی بۆ خوێندنەوەی کارە هونەرییەکان بەرجەستە دەکات، موزیک هەرگیز کۆت ناکرێت، تیۆری نەگۆڕ نییە بەڕێوەی بەرێت، چونکە داهێنان لە ئاوێکی وەستاودا ناکرێت، بەڵکو گۆڕان و جوڵە دوو دەستەواژەی خوازراون لەلایەن کارە موزیکییەکانەوە، هەر لە هەمان ساتدا دەربڕینێکە کە هونەرمەند چی مەڵاس داوە لەهەست و نەست و خوێندنەوەو بیرکردنەوەو بواری کۆمەڵایەتی و پەروەردەبوونەوە بەشێوازی نوێ و جیاجیا پەی پێدەبات و ئەنجامی دەدات ئەویش پرسیار کردن لەخۆی و دەوروبەر هەروەک هەموو هونەرەکانی دی موزیک پاپەندە بەجووتبوونی نێوان

هۆشمەندی و نەست لەکاتێکدا هۆشمەندی پێمان دەڵێت موزیک هەردەم لەجوڵەو گۆڕاندایە، نەستیش ئاگادارمان دەکاتەوە کە گەنجینەی نەستمان بۆ ماوەییەو بۆیە پێناسەیەکی ورد و پوخت بۆ جوانکاری نایەتە گۆڕێ و راڤە ناکرێت هەروەک مردن – ژیان – چاک – پیرۆز ، ئەو ساتانەی لەتەک جوانکاری ئاوێزان دەبین لەئەدەب یان لەهونەر یان سروشت ، هەست بە نەشئەو گەشە دەکەین چونکە سۆزێکی فراوان و بەرینمان پێ دەبەخشێت، بۆیە ئاوێزان بوونی بەردەوام لەگەڵ جوانییەکاندا خەیاڵ بەرین دەکات و والای دەکات بۆ بزوت و داهێنان، سێ بواری سەرەکی هەیە بۆ هەست بەجوانکاری لە موزیکدا:

١ـ وەرگرتن بەپێی شێوازە موزیکییەکان

٢ـ وەرگرتن بەپێی خەیاڵ و بەرهەمهێنانەوە

٣– وەرگرتن بەهۆی سۆزەوە. واتە وەرگرتن لە شێواز و خەیالی والا و هەڵچوونی سۆز.

ئەم سێ بوارەش بەهۆی عەقڵەوە راڤە دەکرێت و دەگەینە کەنارەکانی چێژ وەرگرتن، کاتێک مرۆڤ گوێ بۆ رستە موزیکییەکان شلدەکات و ئاوێزانی دەبێت، لەرێگای هەستەوە راستەوخۆ وەریدەگرێت و هەستیش دەهەژێنێت و گەشەی پێ دەدات، لەم ساتانە هەست بەرەزمەکانی دەکەین چونکە رەزم لەبوونی خودی مرۆڤدا بەرجەستەیە بۆیە لەناخدا تێکەڵ بەرستەو رەزمەکان و هێڵی ئاوازەکان و پێکهاتەی هارمۆنی و پەیژەکان دەبین و هەموو کارە موزیکەکە لامان بەرهەمدێت لەعەقڵ و خەیاڵدا خۆی دەسەپێنێت بۆیە ئەو ساتانە دەگەینە لوتکەی چێژ وەرگرتن . هندرسۆن دەڵێت (ئەو یاسا و رێسایانەی پەیوەندی نێوان جوانکاری موزیک و هەستی مرۆڤ رێکدەخات و راڤەی دەکات لایەنێکیان دەگەڕێتەوە بۆ بیرو هۆشمەندی و لایەنەکەی دیش بۆ سۆز و عاتیفە)هەستەکانیش هەمیشەو هەمیشە یاریدەدەری بیرو عاتیفەن واتە هەستەکان هۆن نەک ئەنجام، ئەو هەستانەی رستە موزیکیان وەردەگرن پاپەندی وەرگرتنن ئەویش لەخزمەت بیروسۆزدایە، مرۆڤ ئەو ساتانە رەخنە دەگرێت کە بەم شێوازە سەیری کارەکان دەکات، واتە کام شێواز و بۆتەی هەیە، پەیکەری گشتی کارەکە – ئاوازەکە – بونیادی ناوەکی کارەکەو – توانای بلیمەتی دانەر – لەهەمانکاتدا گرێدانی ئەم پێکهاتانە پێکەوە و بەرجەستەبوونی لە شاکارێکی تۆکمەو بەرابەری نێوان

شـێوەو نـاوەڕۆک و خـەیاڵ .. هـەردەم خولیایەکـە لـەدنیای جوانکـاری موزیکـدا چونکـە هێزێکـی لـەبن نـەهاتووی بنیاتنـەرە بـۆ بیـری مرۆڤایـەتی، هانزلیـک لـەم بارەیەوە دەڵێت (هونـەر پەلهاویشـتنی داهێنەرانەیـە بـۆ جوانی نـا بـۆ هەسـتەکان، بەڵکو بۆ بوونمان وەک مرۆڤ، ئەویش فراوانبوون و واڵابوونی خەیاڵمانە)

بۆ ئەمەش دەڵێین خەیاڵی دانـەر، خـەیاڵی گـوێگر پەلـدەگرێت بـۆ دنیـای خـۆی، دوای ئـەم بگـرەو بەردەیـە دەربـارەی جوانکـاری موزیـک، نێـوان موزیکنـاس و فەیلەسـوف و دەروونـنـاس دەڵێـت (موزیـک زمانێکـە بێمانایـەکی دیـاریکراو، هێمایەکە لە هێماکـان، هێزێکـی وێنـاکردنی عـەقڵ و هۆشـیارییە، ئەگـەر وایـە ئـەی نــەوەکانی داهــاتوو پــەی بــەکام راڤــەو لێکۆڵینــەوەو بۆچــوون بــەرن؟ ئــەوەی سروشـتییە موزیـک کاریگـەرە لەسـەر سـۆز، گـوێگریش هـەردەم نکـولی بـەم کاریگەرییە ناکات، گرنگ ئەوەیە پەیوەندی هەیـەو بـوونی دیـارە راسـتەوخۆ بێت یان لە خەیاڵ ئەمەش کاردانەوەی دروستدەکات. گوێگر! بەچەندین شێوە موزیک لای کاریگەرە لەم ڕێگایەوە دەتوانێت رەخنە لەژەنەر بگرێت چەند گەرم و گوڕە - هەستی شاعیری تێدایە - چەندە بەسۆزە- خەیاڵ فراوانە - چەند گیـانی ئاوێتـەی موزیـک دەبێـت. دەربـڕینیش لـەم بوارانـەدا دەگیرسـێتەوەو وەرگێڕانێکـە بـۆ بیروبۆچوونی دانەرەکـە لـەم بارەیـەوە جـون دیـوی دەڵێـت: (بیـری مـرۆڤ هێـدی هێدی بەرجەستە دەبێت و لەگەڵ وەرگرەکاندا ئاوێزان دەبێت و هـەردەم زانیـاری فراوانتـر دەبێـت لـەو کاتانـەش هەسـت و هۆشـیاری گەشـەدەکات و گۆڕانکـاری بەسەردا دێت و لەجوڵەیەکی بەردەوامدا لەگەڵ ژیاندا مامەڵـە دەکـات) زانیـاری و پەرەپێـدانی و خـۆفێرکردن و بوونـە خوێنـدکار لەهـەر تەمـەنێک کـۆن بـە نـوێ پەیوەسـت دەکـات و لێکیـان دەئاڵێنێـت و لـەم ئاوێتـە بوونـەدا هۆشـیاری و بیـر نەشونما دەکەن و دیسـانەوەو دووبـارە وێنـا دەبنـەوەو لەگـەڵ یەکدی رادێن بـۆ ئەوەی مرۆڤ بە ژیان پەیوەست بێت و گۆڕان هـەردەم بـەردەوام بێت ژیـان بـۆ خۆی لە ململانێی نەوەکاندا بەرجەستە بکات ئەویش پێکگەیشتنە لـەنێوان عـەقڵ و گەردوون، ئەم پێکگەیشتنەش خـۆی بـۆ خـۆی خـەیاڵێکی فراوانـە کـە دەرەنجـامی پێویسـتیە رۆحییەکانـە - ئایـدیای ئارەزووەکـان – خەونـەکان، ئەمـەش هـەر هەمووی تێکدانی هەست و نەستە، هەست بەژیان لەگەڵ واقیع، ئـەمیش گەڕانـەوە بۆ یادگاری و تاقیکردنەوەکان و دیسانەوە بەرهەمهێنانەوەی جوانتر و جوانتر.

**سەرچاوە: جمالیات الابداع الموسیقی – جیزیل برولیە – ترجمە/ فواد کامل**

**تێبینی/ ئەم بابەتە لەپاشکۆی ئەدەب و هونەری کوردستانی نوێ ژمارە ٣١٩٨ رۆژی پێنج شەمە لە ١٦-١٠-٢٠٠٣ بڵاوکراوەتەوە.**

# هەست بەجوانکاریی لەموزیکدا

ئازاد ساڵح/ شنروێ

زانستی جوانناسی واتە ئیستاتیکا کە شێکە لەلقەکانی فەلسەفە کرۆکی دەربڕینی وانیەکانە لەئەدەب و هونەردا. وشەکەش Aesthetics) لەیۆنانی کۆنەوە وەرگیاوە ەیوەندیدارە بە-شت-ەوە یان رۆچوونە وشتەکانەوە کە دەچنە ناخ و هەستی رۆڤەکانەوە. لەفەرهەنگ و زانیارییە لسەفیەکاندا واتای هەستکردن بەجوانی و یژەوەرگرتن و توانای جیاکردنەوەی رەش سپی- ناشیرین لەجوان- ئەمەش خۆی بۆخۆی ردبوونەوەیە لەناوکی نەبینراوی شتەکان- ەڵسەنگاندنیان- رەخنەگرتن و خوێندنەوەیان بۆ ەندین جاری دی. ئێمەش لێرەدا موزیک دخەینە ژێر پرسیارەوە بزانین چەندە جوانە- پڕ ارمان دەکات لەچێژو ئاهو حەسرەتمان یهەڵدەڕێژن. بۆ ئەمەش دەبێت قووڵ بینەوەو زمان رۆشنبیر بکەین دەبێت بزانین بنەماو اوەڕۆکی چییە؟ پێکهاتەی بونیادی ئەمانەش نۆی لەزاراوە شاراوەکان ئاشنامان دەکات. یکردنەوەی پوختتر بەئەنجام بگەیەنین- ئەویش ەئەقلانیکردنی هۆشمەندییە بۆ خوێندنەوەی یاردەکان ئەمەش بەرەو کەنارەکانی پەیبردن ەجوانیەکانی موزیکمان دەبات. بۆئەوەی ڕخنەگری موزیک ناس شیکاری خۆی- ۆچوونەکانی چڕبکاتەوە- دەبێت بنەماو سەرەتاو- هێماکانی شارەزا بێت- یگەلەمانەش هەست و ناخ و پەروەردەیی و ۆشنبیریی تێگەیشتن لەژیان بەگشتی بخاتە ەرازووی گیانیەوەو- ئەوساتانە دادوەرێکی ەئەمەك بێت. ئەوساتانە نەغمەی دەنگ و رەنگ یتە جۆش و خوڕیەو دڵەراوکێ سەقامگیر دەبێت و خۆی لەبۆتەی جوانیەکاندا دەبینێتەوە. کاری نەزۆك دەبێتە گڵەی باو گوزەر دەکات- جوانیەکانیش تامێژووی مرۆڤایەتی ماوە ەمردەبن. ئەدی کارەکانی بتهۆڤن- موزارت- اگنەر- چایکۆفسکی نەمرنین؟ ئەی کارەکانی سەید دەرویش و ئوم کەلسوم لەمیسر- بەیت و بالۆرەو حەیران و لاوك و سیاچەمانەی لەسەر خۆمان؟ ئەدی کوانێ ئەوانەی کەبلقی سەرئاو بوون..؟

بۆئەوەی ئەم زانیارییە پڕهەگبەمان هەبێت ئەبێت چ بکەین؟ ئەدی موزیك ئەوساتانە کارێکی سەخت و دژوار نییە؟ بەهەموو کەس هەرس دەکرێت؟ چونکە موزیك خولیایەکی بزماوییەو پڕئەندێشەیە. لەدیاردەکانی سروشت دژوارترو پڕهێماترو مانادارترە چونکە زمانێکی دەربڕینە نەك رەنگدانەوەی دیاردەیەك. چونکە موزیك وێناکردن نییە لەبۆتەی سروشتدا.. وەك وێنە- نواندن نییە لەناو کەسایەتیە کۆمەڵایەتیە سروشتیەکاندا. هەڵکۆڵینی کەسایەتیە ناسراوو ناودار بلیمەتەکان نییە وەك پەیکەرتاشین- بەڵکو دەریایەکە لەدەربڕین سۆزێکە پڕ عشق ئای لەو کەسەی چەند بلیمەتە کە سۆزو عشق ئاوێتەی شێوازێکی جوانی دەربڕین دەکات و کێلگەی ژیانی پێناودەدات. هەر هونەرێك بۆخۆی یاساو رێسایەکی دیاریکراوی هەیە کەلەسەر ئەو بنەمایانە خۆی بونیاد دەنێت و کەسایەتی خۆی دیاریدەکات. بۆ مرۆڤیش هەیە ئەو زاراوانە شیبکاتەوەو چێژیان لێوەرگرێت و شیکاری هێماکانی بکات و واتاکانی راڤەبکات و جوانتر ژیانی پێبخوێنێتەوە. چونکە لەکۆتاییدا کاریگەریەکە هەر لەسەر مرۆڤە و مرۆڤ.

موزیك خۆی بۆخۆی لەناوك و کرۆکیدا چەندین مانای لەخۆیدا حەشارداوە رەزمەکانی و پەیژەکانی- هارمۆنیەکانی- شێوازەکانی دەربڕین- بچوکترین خاڵ و هێما مانایەك دەستەواژەیەك دەگەیەنێت. مەگەر هەر موزیك ناسەکان پەیپێبەرن و لەوردەکاریەکانی و پەرشبوونی وێنەکانی بگەن کەلەگیانی ئەو بوونەوەرە سیحراویەدا خۆی بەرجەستەکردوە وەك شیعر رۆژانە دادەچۆڕێت. لەکاتێکدا کەئامانج نادیارەو بەرهەمهێنانی واتاکانی لەکەسانی ئاسایی بەدوورەو سرووشتی دەربڕینی بێکۆتاییە. لێرەدا دوو دەستەواژە خۆی دێنێتە ئاراوە- داهێنان+ رەخنەگرتن- تیۆری سەرەکی لەناخی هونەرمەندا هەموو یاساکان دادەرمێنێت بۆ پرۆسەی داهێنان- دوای ئەویش کاری رەخنەگر دێتە ئاراوەو کاری رەخنەگرتن بەئەنجام دەگەیەنێت. هونەر خۆی بەردەوام هەڵسەنگاندنی زانستیانە ئەنجام دەدات زانستیش بۆخۆی شیکارەکانی خۆی بۆ خوێندنەوەی کارە هونەرییەکانی بەرجەستە دەکات. موزیك هەرگیز کۆت ناکرێت- تیۆری نەگۆڕ نییە بەرتوەی بەرێت چونکە داهێنان لەئاوێکی وەستاودا ناکرێت. بەڵکو گۆڕان و جووڵە دوو دەستەواژەی خوازراون لەلایەن کارە موزیکیەکانەوە. هەرلەهەمان ساتدا دەربڕینێکە کەهونەرمەند چی مەڵاس داوە لەهەست و نەست و خوێندنەوەو بیرکردنەوەو بواری کۆمەڵایەتی و پەروەردەبوونەوە. بەشێوازی نوێ و جیاجیا پەی پێدەبات و ئەنجامی دەدات ئەویش پرسیارکردن لەخۆی و دەوروبەر. هەروەك هەموو هونەرەکانی دی موزیك پابەندە بەجووت بوونی نێوان هۆشمەندی و نەست. لەکاتێکدا هۆشمەندی پێمان دەڵێت موزیك هەردەم لەجووڵەو گۆڕاندایە نەستیش ئاگادارمان دەکاتەوە کەگەنجینەی نەستمان بۆماوەییەو. بۆیە پێناسەیەکی وردو پوخت بۆ جوانکاری نایەتە گۆڕێ و راڤەناکرێت هەروەك مردن- ژیان- چاك- پیرۆز. ئەوساتانەی لەتەك جوانکاری ئاوێزان دەبین لەئەدەب یان هونەر یان سروشت هەست بەئەشئەو گەشەدەکەین چونکە سۆزێکی فراوان و بەرینمان پێدەبەخشێت. بۆیە ئاوێزانبوونی بەردەوام لەگەڵ جوانیەکاندا خەیاڵ بەرین دەکات و واڵای دەکات بۆبزووت و داهێنان. سێ بواری سەرەکی هەیە بۆ هەست بەجوانکاری لەموزیکدا.

١-وەرگرتن بەپێی شێوازە موزیکیەکان.

٢-وەرگرتن بەپێی خەیاڵ و بەرهەمهێنانەوە.

٣-وەرگرتن بەهۆی سۆزەوە. واتە وەرگرتن لەشێوازو خەیاڵی واڵا و هەڵچوونی سۆز- ئەم سێ بوارەش بەهۆی عەقڵەوە راڤە دەکرێت و دەگەینە کەنارەکانی چێژوەرگرتن. کاتێك مرۆڤ گوێ بۆ رستە موزیکیەکان شلدەکات و ئاوێزانی دەبێت. لەڕێگای هەستەوە راستەوخۆ وەریدەگرێت و هەستیش دەهەژێت و گەشەی پێدەدات لەم ساتانە هەست بەرەزمەکانی دەکەین چونکە رەزم لەبوونی خودی مرۆڤدا بەرجەستەیە بۆیە لەناخدا تێکەڵ بەرستەو رەزمەکان و هێڵی ئاوازەکان و پێکهاتەی هارمۆنی و پەیژەکان دەبین و هەموو کارە موزیکەکە لامان بەرهەم دێت لەعەقڵ و خەیاڵدا خۆی دەسپێنێت بۆیە ئەو ساتانە دەگەینە لووتکەی چێژوەرگرتن. هندرسۆن دەڵێت(ئەو یاساو رێسایانەی پەیوەندی نێوان جوانکاری موزیك و هەستی مرۆڤ رێکدەخات و راڤەی دەکات لایەنێکیان دەگەڕێتەوە بۆ بیرو هۆشمەندی و- لایەنەکی دیش بۆ سۆزو عاتیفە) هەستەکانیش هەمیشەو هەمیشە یاریدەدەری بیرو عاتیفەن واتە هەستەکان هۆن نەك ئەنجام.

ئەو هەستانەی رستە موزیکیەکان وەردەگرن پابەندی وەرگرتنن ئەویش لەخزمەت بیرو سۆزدایە- مرۆڤ ئەوساتانە رەخنە دەگرێت کەبەم شێوازە سەیری کارەکان دەکات. واتە کام شێوازو بۆتەی هەیە- پەیکەری گشتی کارەکە- ئاوازەکە- بونیادی ناوەکی کارەکەو- توانای بلیمەتی دانەر- لەهەمانکاتدا گرێدانی ئەم ئاوەڕۆك و خەیاڵ.. هەردەم خولیایەکە لەدنیای جوانکاری موزیکدا چونکە هێزێکی لەبن نەهاتووی بنیاتنەرە بۆ بیری مرۆڤایەتی- هانزلیك لەم بارەیەوە دەڵێت (هونەر پەلهاوێشتنی داهێنەرانەیە بۆ جوانی نا بۆ هەستەکان- بەڵکو بۆ بوونمان وەك مرۆڤ ئەویش فراوانبوون و واڵابوونی خەیاڵمانە).

بۆئەمەش دەڵێین خەیاڵی دانەر خەیاڵی گوێگر پەلدەگرێت بۆ دنیای خۆی. دوای ئەم بگرەو بەردەیە دەربارەی جوانکاری موزیك نێوان موزیکناس و فەیلەسوف و دەروونناس دەڵێت (موزیك زمانێکە بێمانایەکی دیاریکراو هێمایەکە لەهێماکان هێزێکی وێناکردنی عەقڵ و هوشیارییە؛ ئەگەر وایە ئەی ئەوەکانی داهاتوو پەی بەکام راڤەو لێکۆڵینەوەو بۆچوون بەرن؟ ئەوەی سروشتیە موزیك کاریگەرە لەسەر سۆز گوێگریش هەردەم نکوڵی لەم کاریگەریە ناکات. گرنگ ئەوەیە پەیوەندیی هەیەو بوونی دیارە راستەوخۆ بێت یان لەخەیاڵ ئەمەش کاردانەوەی دەروونی دروستدەکات. گوێگر..! بەچەندین شێوە موزیك لای کاریگەرە لەم رێگایەوە دەتوانێت رەخنە لەژەنەر بگرێت چەند گەرموگورە- هەستی شاعیر تێدایە- چەندە بەسۆزە- خەیاڵ فراوانە- چەندە گیانی ئاوێتەی موزیك دەبێت. دەربڕینیش لەم بوارانەدا دەگیرسێتەوەو وەرگێرانێکە بۆ بیروبۆچوونی دانەرەکە لەم بارەیەوە، جون دیوی دەڵێت (بیری مرۆڤ هێدی هێدی بەرجەستە دەبێت و لەگەڵ وەرگرەکاندا ئاوێزان دەبێت و هەردەم زانیاری فراوانتر دەبێت و لەوکاتانەش هەست و هوشیاری گشەدەکات و گۆڕانکاری بەسەردا دێت و لەجووڵەیەکی بەردەوامدا لەگەڵ ژیاندا مامەڵە دەکات). زانیاری و پەرەپێدانی و خۆفێرکردن و بوونە خوێندکار لەهەرتەمەنێك کۆن بەنوێ پەیوەست دەکات و لێکیان دەئاڵێنێت و لەم ئاوێتەبوونەدا هۆشیاری و بیر نەشونما دەکەن و دیسانەوە دووبارە وێنا دەبنەوە و لەگەڵ یەکدی رادێن و بۆئەوەی مرۆ بەژیان پەیوەست بێت و گۆران هەردەم بەردەوام بێت و ژیان بۆخۆی لەسلملانێی ئەوەکاندا بەرجەستە بکات ئەویش پێکگەیشتنە نێوان عەقڵ و گەردون ئەم پێکگەیشتنەش خۆی بۆخۆی خەیاڵێکی فراوانە کەدەرئەنجامی پێویستە رۆحیەکانە- ئایدیای ئارەزووەکان-خەونەکان ئەمەش هەرهەمووی تێکدادانی هەست و نەستە هەست بەژیان لەگەڵ واقیع ئەمیش گەرانەوە بۆیادگاری و تاقیکردنەوەکان و دیسانەوە، بەرهەمهێنانەوەی جوانترو جوانتر.

سەرچاوە: جمالیات الابداع الموسیقی- جیزیل برولیە/ترجمە/ فؤاد کامل


چایکۆفسکی


ئوم کلسوم


بتهۆڤن

## بەراوردكارييەك لەنێوان موزيكی رۆژهەڵاتی و رۆژئاوا

بەرايی

دەمەوێت پرسيارێكی گەلێک دژوار واڵابكەم، ئەويش ئەمەيە ئايا لەرۆژهەڵاتدا ناوێكی پڕواتامان هەيە بۆ موزيک؟ ئەوەی راستی بێت موزيک خستنە ژێر ئەم پرسيارە گەورەو گرانەوە چەند داكۆكيكەرو چەندين دژە رای خۆی هەيە، ئەمەش يەكێكە لەبنەماكانی رەخنە، مافی هەر كەسيشە بۆ داكۆكی كردن لەرای خۆی گرنگ ئەوەيە كە عەقڵ و لێكۆڵينەوەی زانستيانە دادوەر بێت، نەک هەڵچوونی سۆز و دەروون، ئێمە لێرەدا بۆ وەڵامی ئەم پرسيارە پشت بە چەند بنەمايەكی زانستيانە دەهێنينەوە نەک هەڵچوونی سۆز ئەويش بە خوێندنەوەی دوو شيكاری زانستی، يەكێک لە تايبەتمەندييەكانی هەر هونەرێک ئەوەيە كە خۆی بۆ خۆی تا چەند دەتوانێت سەربەخۆ بێت پێويستی بەهونەری دی نەبێت، بۆ ئەوەی تەواوكەری بێت بۆ دەربڕين، ئاشكرايە موزيكی خۆرئاوا ئەم سەربەخۆييەی بۆ خۆی دەستەبەركردووە لە شيعرو گۆرانی خۆی جياكردۆتەوە پاش گەشەسەندنێكی مێژوويی دوور و درێژ لەتوانايدايە پەيامی دەربڕين بۆ خۆی مەيسەر بكات.

بەڵام شيعرو سەما ناچێتە ناواخنی موزيک بۆ پڕكردنەوەی بۆشايی تيايدا، بەڵكو بۆ بەرهەمهينانی شێوازێكی نوێ لە موزيكی شيعری يان سەمايی، بەڵام ئەم هەنگاوانە كامانەن كە موزيكی رۆژهەڵاتی ناويەتی بۆ سەربەخۆبوونی؟ ئەوەی ديارە موزيكی رۆژهەڵاتی دەستەو وەستانە بەرامبەر هەر واتايەک لەدەربڕين و سۆز.

خۆی بۆ خۆی توانای دەربڕينی نييە، بەڵكو هەموو هەوڵ و تاقيكردنەوەكان هاوشانە لەگەڵ هونەری گۆرانييدا، گەر هەشبێت ئاوا زۆر دەگمەنە، چونكە موزيكی پوخت جگە لەچەند هەوڵێكی سەرەتايی هيچی ديكە نييە كە كارێكی ئەوتۆ ناكاتە سەر گوێگر، هەرچەندە ساناش بێت بەڵكو تا سەردەمێكيش لەمەوبەر بە موزيكی پوخت و سەربەخۆ دەگوترا (موزيكی بێدەنگ) وەک ئەوەی كە موزيک گۆرانی لەتەک نەبێت و وشە ئامێز نەبێت هيچ زمانێكی دەربڕينی نەبێت!! واتە

لالەو ئەو هەموو دەنگانەی کە دەریدەبڕێت هەمووی بێدەنگە، چونکە لەرۆژهەڵات موزیک و گۆرانی دوو دەستەواژەی لێکئالاون ئەم بێ ئەو نابێت تەنانەت زۆر جار هۆنراوەی گۆرانییەکە بەسە بۆ ئەوەی کاربکاتە سەر گوێگر، هەر چەندە ئەو موزیکەش کە لەتەکیدایە چەند ئاست نزمیش بێت، زۆر جاریش گۆرانیەک جێگای سەرنج راکێشانە بەهۆی هۆنراوەکانییەوە هەرچەندە موزیکێکی زۆر ساکارو بێزارکەری لەتەک بێت، بۆیە تا ئێستا موزیکی رۆژهەڵات پەیوەستە بەگۆرانییەوە، ئێمە هانا بۆ وشە دەبەین بۆ چێژ وەرگرتن بە موزیک و پڕمانای دەکەین لەبەر ئەوەی موزیکمان توانای دەربڕینی کەمەو بەڵکو یەکێتی ئامانج لەنێوان وشەو موزیکدا ونە، بۆ نمونە زۆر جاران ئاوازێک دادەنرێت پاشان وشەکانی دەکرێتە بەر، یان موزیکێک بۆ گۆرانییەکانی شاد دەتوانرێت بۆ موزیکێکی خەم دابنرێت، بێ ئەوەی هەست بەهەر دژێک بکەیت لەنێوانیان، ئێمە لێرەدا خودی (موزیکی بێگەرد) دادگایی دەکەین، نەک توخمی دووەم کە وشەیە، تەنانەت لەبواری وشەشدا ئەرکی خۆی جوان جێبەجێ ناکات، بەڵکو رەنگدانەوەیەکی کۆمەڵایەتی تەندروست نییە خۆی لە خەم و بێهودەیی و کپبوونی ستیلیدا خۆی دەنێتەوە.

بۆ ئەوەی رونتر توخمەکانی زمانی موزیک شی بکەینەوە و لێی بکۆڵینەوە با لە توخمەکانی بکۆڵینەوە لە کرۆکی موزیکی رۆهەڵاتیدا کە ئەویش:

١ـ ئاوازMelody ٢ـ رەزم Rhythm ٣ـ هاودەنگی Harmony ٤ـ شێواز Form

١ـ ئاوازMelody موزیکی رۆهەڵاتی بەوە ناسراوە کە ژمارەیەکی زۆر پەیژەو مەقامی هەیە کە جاری وا هەیە لەژمارە نایەت و ئەمەش وا دەزانرێت کە جێگای ستایش و شانازییە، لەکاتێکدا کە موزیکی رۆژئاوایی لە دوو پەیژەو مەقام تێپەڕ ناکات، ئەویش پەیژەی گەورە (Maijar) و پەیژەی بچووک (Meynor) بەڵام گەر بە زانستیانە ئەم پەیژانە شی بکەینەوە ئەم پەیژانە چ نین جگە لەوشە کە زمانی موزیک و رستەکانی پێ بەرهەم دێت، زۆری ئەم وشانەو نوسینەوەیان بەخەتێکی جوان ئەوە ناگەیەنێت کە ئەم پارچەیە کارێکی ناوازەیە، لێرەدا گرنگ ئەفراندنە و داهێنان و زمانی دەربڕین نەک زۆر بەکارهێنانی مەقامەکان، بۆیە پشت بەستن بە زۆری ژمارەی پەیژەکان ئەوە ناگەیەنێت کە ئێمە گەیشتووینەتە لوتکەی داهینان، چونکە پەیژەکان تەنها وشەن بۆ ئەلفبای هەر دانراوێک بەڵکو بنەمای دادوەری کردن بۆ خودی دانراوەکەیە.

خۆ گەر وابێت زمانی چینی کە بەوە ناسراوە زۆرترین پیتی لە ئامێز گرتووە، دەبێت شاکاری وای پێ بنوسرێت کە زۆر لەزمانی دی باڵاتر بێت! گرنگ ئەوەیە کە کێشەکان وشەکان نین، بەڵکو بیرۆکەی وشەکانە، کاری موزیک ئەوەیە کە چۆن بتوانێت ئەم دەنگانە ریزبەند بکەیت و ڕێکی بخەیت لەچەند کۆمەڵەیەکی کەمی ڕێکخراو کە لە ئەنجامدا چەند ئاوازێک دەربڕێت کە بەهایەکی جوانی ئیستاتیکی لەخۆی بگرێت، ئەتوانین بڵێین رۆژئاوا بە پێی گەشەسەندنێکی مێژوویی دوور و درێژ گوشاریان خستۆتە سەر ئەم مەقام و پەیژانەو لەدوو جۆردا کۆیان کردوونەتەوە.

بۆیە ئەم مەقامانە ئەوە ناگەیەنێت کە نەتوانرێت کارێکی جوان بکرێت، بەڵکو هەر بەم دوو پەیژە شاکاری وا ئەنجام دراوە کە مێژوو هەرگیز ناتوانێت کۆنیان بکات و تا ئێستاش کار لە سۆز و هەست دەکەن.

هێندەی موزیک ناسە رۆژهەڵاتییەکان شانازی بەوە دەکەن کە موزیکی رۆژهەڵاتی ئاوێزانی هۆنراوەو وشەیە هاودەنگی (Hermomy) ئاوێزانی نییە کە دەڵێن موزیکی رۆژهەڵاتی بناغەکەی لەسەر میلۆدییەکان دانراوە نەک هاودەنگییەکان، بۆ وەڵامی ئەمانەش راستە کە ئەم موزیکە لەسەر میلۆدی بونیادنراوە، بەڵام ئەم میلۆدییانەش ئەو بەهایانەش لەدەستدەدەن لەبەر ئەم دوو هۆیە:

أ- پێکەوە لکاندن: زۆربەی هەرە زۆری موزیکە رۆژهەڵاتییەکان بە رستەیەک موزیک دەستپێدەکەن پاشان هەر هەمان ئاواز پلەیەک نزمتر یان بڵندتر دووبارە دەبێتەوە، ئەمەش لە هەرە زۆری میللەتانی رۆژهەڵاتدا دووبارە دەبێتەوە بە موزیکی کوردیشەوە واتە تۆنەکان پێکەوە نوساون، زۆر جاریش هەر هەمان کاتی موزیکی دەبێت.

ئەوەی ئاشکرایە ئەو ئاوازەی کە تۆنەکانی (پلە دەنگییەکانی) پێکەوە لکاون لەمانادا زۆر ساکار و سانان، بەڵکو گەر گوێت لەرستەی یەکەم بێت، بێ ئەوەی گوێت لە رستەی دووەم بێت ئەتوانیت خۆت ئەو رستەیە تەواو نەکراوە بڵێیتەوە، هەرچەندە شارەزاییەکی کەمیشت لە موزیک هەبێت یان گوێگری ئاسایی بیت، بۆیە توانای دەربڕین و چوونە ناو ناخی دەربڕینەوە لای موزیکی رۆژهەڵاتی زۆر نزمە بە پێچەوانەوە لای موزیکی رۆژئاوایی کە تۆنەکانی دوور لەیەک و

بەرزو نزمییەکی تایبەتی تێدایە کە پشت بەدەنگە (باص)ەکان بەواتە دەنگە گڕەکان دەبەستێت، بۆ ئەنجامدانی ئاوازێکی رۆژهەڵاتی چەند گروپێکی موزیک ژەنان بەسە کە پێی دەوترێت (تەختی رۆژهەڵاتی)، بەڵام بۆ ئەنجامدانی شاکارێکی رۆژئاوایی یەک ئۆرکسترای سەمفۆنیایی ئەم کارە ئەنجام دەدات، کە پتر لە (١٠٠) موزیک ژەن پێکهاتووە لە چەندین ئامێری فوداروو رەزمی پشت بە دابەشکردنێکی تۆکمەی هارمۆنی و بەشداری هەموو پلە دەنگییەکان کە بریتییە لە سۆپرانۆ – تیژ / ئاڵتۆ مام ناوەندی تیژ، تینور مام ناوەندی گڕ باص دەنگی گڕ، نمونەیە لەمانە سەرەتای جوڵەی یەکەمی سەمفۆنیای سێیەمی بیتهۆڤن:

نمونەیەکی دی جوڵە کۆتایی سەمفۆنای شەشەمی بیتهۆڤن:

ئەم دوو نمونەیە ئەو سەربەستیەمان نیشان دەدات و مەودای فراوانی میانەکان هەروەها بلیمەتی دانەرەکەی بەرجەستە دەکات، دانەر هەرگیز خۆی لەوە دوور دەگرێت کە مەوداکان نزیک بن و پێکەوە لکابن وەک پەیژەیەک لەپلەی سێیەمەوە بێتە پلەی دووەم بەڵکو سەربەستی جوڵەکان و مەوداکان کارەکە جوانتر دەکات ئەم پێکەوە لکاندنی میانەکان موزیکی رۆژهەڵاتی وا لێکردووە کە هاودەنگی تیایدا ونە، چونکە ئەو ئاوازەی پلەکانی سەربەستانە باز دەدات دەتوانرێت ناوەندەکانی بە هاودەنگی پڕبکرێتەوە بەوەی کە پەیوەندی سێ پلەو پێنج پلە بەرهەم دەهێنێت.

ب - چوون یەک بوون: ئەوەی زانراوە هونەری جوان خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە داهێنان بەرهەم بهێنێت کە هەمیشە چێژ بەخش بێت بەدانەبڕاوی، لێرەدا چوون یەک بوون گەر بوو بە بەشێکی دووبارە بووەوە لەڕووی جوانکارییەوە بێ بەها بێت، بۆ ئەمەش نمونەیەک دەهێنینەوە گەر داوات لێکرا ئەم وێنەیە تەواوبکەیت، ئاسانترین کار ئەوەیە کە شێوەیەکی چوون یەک لەخوارەوە دروستبکەیت بەم شێوەیە، گەر ئەم چوون یەک بوونە بوو بەکارێکی هەمیشەیی جوانییەکەی لەدەستدەدات، چونکە ئەرکێکی هێندە گران نییە، ئەمەش وای کردووە کە وێنە زەخرەفیەکان لە رووی هونەرییەوە هێندەی بەهای نەبێت، گەر شێوەی ئەم نمونە تەشکیلییە لەبواری موزیک ئەنجام بدەین دەبینین زۆربەی ئاوازە میلۆدییە رۆژهەڵاتییەکان بەم شێوەیەن، گەر بەراوردکارییەک ئەنجام بدەین لەنێوان بەشی (أ) و (ب) دەبینین چوون یەکن، ئەوە نەبێت کە تۆنی ئەمیان لەو بەرزترە یان

نزمتـره، بەمـەش ئاوازدانـەری رۆژهـەڵاتی کـارێکی ئاسـان ئـەنجام دەدات، بـۆ ماوەیەکی کورت بڕ دەکات، بە پێچەوانەی موزیکی رۆژئاواوە کە ئەم چوون یەک بوونە لە فەرهەنگی موزیکیاندا بوونی نییە.

بەکورتی گەر توخمی یەکەم کە ئاوازە لە موزیکی رۆژهەڵاتدا هەرچەندە پشت بە میلۆدی دەبەستێت هەمیشەو هەمیشـە هانـا بۆ ئـەو شـێوازە ئـاوازە دەبـات کـە پێکەوە لکاون و میانـەکانیان نزیکـە لـە یەکـەوە ئەمـەش گوێگری هەسـتیار بێزار دەکات.

٢ـ رەزم (Rhythm) دووەمـین تـوخم: رەزمـە، لـەزمانی موزیکـدا دیـارترین جیـاوازی لـە نێـوان مـوزیکی رۆژهـەڵات و رۆژئـاوا ئەوەیـە لەرۆژهەڵاتـدا رەزم دیارەو ئاشکرا، لەیەکەم رەزم سەربەخۆیە لە ئاواز، واتە هەر هـەمان رەزم چەنـد بـارە دەبێتـەوەو بەشـێوەیەکی سـەربەخۆو جیـا لـە میلۆدییەکـە و ئاشـکرا لێـی جیادەبێتـەوە، بـەڵام شـاکارە مۆزیکییـەکانی رۆژئـاوا رەزم ئـاوێزان و لەهـەناوی ئاواز و پێکهاتە بە واتایەکی دی ئـاوازە پێکهاتـە هارمۆنییـەکان لەهەناویاندا رەزم خۆی حەشارداوە و لەتەک ئاوازەکە دەڕوات، بۆ ئەمەش دانەر پێویست ناکات کە دەستنیشانی بکات و بۆیە رەزم لەموزیکی خۆرئـاوا پێویسـت بـە کوتـەی تایبـەت ناکات، تەنها لەهەندێ شوێنی کەم نەبێت.

زۆربـەی کوتـەکان زۆر نزمـە جـاری واهەیـە گوێمـان هەسـتی پێناکـات، بـەڵکو رەزم لەهـــەناوی ئاوازەکـــەدا هەیـــەو لەگـــەڵ بـــەردەوامی هـــەموو پێکهاتـــە هارمۆنییەکـــەدا دەڕوات، دەتـــوانین ئـــەم تایبەتمەندییـــە بکـــەین بـــە دیـــارترین جیاوازکاری نێوان هەردوو رەزم.

٣ـ هاودەنگی (Harmony) یەکێک لەهەرە دیـارترین بنتـی جیاکـەرەوەی نێـوان هەردوو موزیک هاودەنگییە کە دەتوانین بڵێین مـوزیکی رۆژهـەڵاتی پێـی نامۆیـە، ئـەوەی کـە ئـەم دیاردەیـەی لـە مـوزیکی خۆرهـەڵات ونکـردووە میلـۆدی بـوونی موزیکـە لـە رۆژهەڵاتـدا ئەمـەش وایکـردووە کـە موزیـک زۆر سـاکار بێـت و قـاڵ بوونەوە لە چێژدا کەم بێت.

بەپێچەوانەوە دەتوانین بە بوونی هاودەنگی بە بەردەوامی گوێ گـرتن هـەموو جار مانای نوێ بەرهەمدێت و چێژ بە بەردەوامی دەکرێت و جوانتر لێی دەگەین و بەبـەردەوامی مانـا شـاراوەکان ئاشـکرا دەبێـت و بلیمـەتی دانەرەکـەت بـۆ

دەردەکەوێت کە لەچەند هێڵێکی هاودەنگی تێکئاڵاودا کە یەکەیەکی تۆکمەی جوان داڕێژراو چۆن بەبەردەوامی چێژ بەخش دەبێت، بەڵام چونکە موزیکی ڕۆژهەڵاتی یەک هێڵە میلۆدییە گەر بە بەردەوامی گوێ بگریت لەوانەیە بێزارت بکات، ئەمەش یەکێکە لە خاڵە لاوازەکانی موزیکی ڕۆژهەڵات و هەرە دانراوی موزیک بۆ چەند مانگێک پتر بڕناکات، بۆیە ئێمە تا ئێستا شاکارێکی نەمرمان نییە وەک دانراوەکانی باخ و موتزرات.

دەتوانین بڵێین کە موزیکی لەمەڕ ڕۆژهەڵات (وەرز)ییە، چونکە هێندە کارو ماندوو بوون بۆ ئەم کارانە نەکراوە.

٤ـ شێواز (From) هێندەی دەربارەی موزیکی ڕۆژهەڵات ناسراوە دەبینین شێواز ونەو زۆرجار شێوازێکی نەگۆڕی هەیە کە بەچەند (ئاهێک) یان دابەشەیەک (تقاسیم) بە ئامێری موزیکی دەستپێدەکات و لەتەک موزیکدا بەردەوام دەبێت، ئەمە شێواز نییە، بەڵکو چەند وێناکردنێکی باوە بەردەوام دوبارە دەبێتەوە.

گەر بەوردی لە موزیکی ڕۆژهەڵات وردبینەوە دەبینین کە چەند تایبەتمەندییەکی سەرنج ڕاکێشیش هەیە ئەویش (گەڕانەوە بۆ بنەڕەت)ە ، ئاشکرایە هەر پەیژەیەکی موزیکی پلەی بنەڕەتی تایبەتی خۆی هەیە بۆنمونە مەقامی ڕاست بنەڕەتییەکەی دەنگی (دۆ)یە، تایبەتمەندی پلەی بنەڕەت ئەوەیە هەمیشە هەست بە تێربوون دەکەیت لەگوێگرتنداو تێر چێژ دەبێت و دامرکاندنەوەی چێژی موزیکە، هەرپاش پارچەیەکی کورت دەگەڕێتەوە سەر دەنگی بنەڕەت و هەست بە تێربوونی چێژ دەکەین بۆ چەند جارێک بەڵام لەموزیکی ڕۆژئاوادا شێوازی جوڵەیەکی بەردەوام بەخشە بەرەو ئامانجێک مل دەنێت و گەشە دەکات تا دەگاتە ترۆپک تەنها بۆ جارێک پاشان شاکارەکە کۆتایی دێت، بۆیە هەمیشە لەچاوەڕوان بوون داین بەردەوام ئاوێزانی گوێ گرتن دەبین کاتێک هەموو تاڵە داوەکانی ئۆرکسترا هەر لە ئاواز، ڕەزم، هارمۆنی، شێواز تێکەڵ دەبێت و یەکانگیر دەبێت و بەشداری لە کۆتایی هێنان دەکات بۆیە دەبینین لە ئاهەنگە ڕۆژهەڵاتییەکاندا پاش تەواوبوونی هەر بەشێک لەبەشەکانی گوێگران دەست دەکەن بە چەپڵەو هات و هاوار، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هەر پارچەیەک سەربەخۆ گوێگر تێر دەکات لەچێژ چ وشەکان، چ ئاوازەکان واتە

دووباره چەند بارەبوونەوەی چێژوئەمەش پێچەوانەی کۆنسێرتە سەمفۆنیاکانی ڕۆژئاوا کە هەمیشە گوێگر ڕادەمێنێ و لە چاوەڕوانیدایە، لەرستەی جوان لە پێکهاتەی هارمۆنی تاکۆتایی، بەواتایەکی دی گوێگری ڕۆژهەڵاتی زوو تێر دەبێت بەڵکو بەو چەند بارەبوونەوە تووشی ئینتەلای گوێگرتن دەبێت هۆش و بیری هێندە ماندوو ناکات هەر گوێ دەگرێت، کارێکی ئاسان وەردەگرێت و زوو هەرسی دەکات، بە پێچەوانەی گوێگری ڕۆژئاوایی.

ئەم جۆرە هەڵوێستە وای کردووە کە گوێگری ڕۆژهەڵات بەوردی گوێ ناگرێت، جدی نییە، هەر زوو ڕەزامەندی خۆی و شاباشی کارەکە دەکات.

سەرچاوە: التعبير الموسيقي – د.فواد زكريا

تێبینی / ئەم بابەتە لە ڕۆژنامەی ئەدەب و هونەری کوردستانی نوێ ژمارە ٣٢٨٢ ڕۆژی پێنج شەمە لە ڕێکەوتی ٢٠٠٤/١/٢٩ بڵاوکراوەتەوە.

ژمارە (٣٢٨٢) پێنجشەممە ٢٠٠٤/١/٢٩
No:3282 Thursday 29-1-2004

ئەدەب و هونەر

## بەراوردکارییەک لەنێوان مۆزیکی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا

ئازاد ساڵح شنروێ

بەرایی

دێکی دەرەنگوەختی

سەید موحسین

## بەدەستگیرکردنی سەدامی دیکتاتۆر، هەڵەبجەییەکان خۆشحاڵی خۆیان دەردەبڕن

ئازاد سالح:

لەدێی عۆجە بونەوەرێکی دڕندە خۆی بە مرۆڤایەتی ئاشناکرد، هەر لە سەرەتاوە شەڕەنگێز بووە، ئەم بوونەوەرە خۆی لە پاڵ عەرەبی نەتەوەیی ئیسلامی بینیەوە، ئەو خۆی بۆ خۆی نامۆبوو بەهەموو جوانیەکانی دنیا تەنها گوللەیەک کردی بە پاڵەوانی نەتەوەی عەرەب، ئەو گوللەیە کە ئاڕاستەی عەبدولکەریم قاسم کراو ئەو بریندارببوو، بوو بەوەی کە بچنە ڕیزی پێشەوەی هەر هەموو بەعسییەکان، بوو بە قوتابی کۆلێژی قاهیرە و یاسای خوێند، زیندانیکرا رایکرد، بووە قسەراستی هەموو بەعسییەکان، هەر لە سەرەتاوە ئەم مرۆڤە بە دوو فاق دەژیا، کە لە تەلەفزیۆنەکان ئەیبینین مرۆڤێکی تاسەر ئێسقان بە بەزەیی و بەخشندە، بەڵام لە ناخیدا دڕندەترین مرۆڤ بوو، هەرگیز سڵی نەکردۆتەوە لەتاوان کە بچوکترین تا گەورەترین، بەڕاستی بەرهەمی شۆفێنیزمی عەرەبی ئیسلام بوو، ئەو دڕندەیە تەنها و تەنها بۆ ژیانی خۆی دەژیا، گەر عەرەبەکان بە پاڵەوان ناوی دەبەن ئەوا رۆژگار سەلماندی کە ترسنۆکترین بوونەوەرە، کە بیر لە شەڕەکانی دەکەمەوە لەناخی خۆمدا دەمزانی چ ماڵێکە، بۆیە هەرگیز گاڵتەم بەوانە دەکرد کە دەبوون بە سووتەمەنی بۆی، گەر لە سیاسەتەکانی بکۆڵینەوە (حزب بعث – امە عربیە واحدە – ذات رسالە خالدە – میشیل عەفلەق – القائد المؤسس – الاب القاعد) هەموو کەسەکان لەو دڕندەیە کۆبوونەوە، هەموو بوونە قوربانی، ئەو عەشقی چەک بوو تەنها بۆ بێدەسەڵاتەکان، بەڵام ترسنۆک بەرامبەر گەورەکان، هەموو گیانی خۆ بەزل زانین بوو، بەرامبەر نزمتر لەخۆی، ئەیکوشتن، ئەیبڕین، بەڵام ترسنۆک بەرامبەر ئەوانەی کە لە خۆی بەتواناتر بوون، لە بچوکترین تاوان تا گەورەترینی ئەنجام داوە، بەڵام زۆر ترسنۆک، گرگن، زۆر کۆیلە بۆ گەورە و باڵاکان، ئەدی چ چیرۆکێکە، چ کارەساتێکە بە ملیۆنان ببنە سوتەمەنی جرجێکی ترسنۆکی ناو زێرابەکان، ئەدی خۆ وی لە گوندێکی بێ کارەبای، بێخزمەت هاتە ژیان، بوو بە دڕندەترین گیانلەبەر، هەر خۆی بۆ خۆی کونی جرجەکانی هەڵبژارد بۆ ئەوەی

ببێتە عیبرەت، ئای چ کارەساتێکە دەوڵەتێکی وەک عێراق، دڕندەیەک، دیکتاتۆرێک، خەڵکانی خێڵ ببنە دەمڕاستی ئەم وڵاتە، وڵاتێک بەم هەموو مێژووە نازانین بۆ ئاخر سی و پێنج ساڵ کەم نییە ئەوە ژیانی سەدان و هەزاران و ملیۆنانە ، شانازی بەوەوە دەکەم بۆ چریەک هەڵنەخڵەتاوم، ئەمن وەک هونەرمەندێک وەک هەڵەبجەییەک هەرگیزاو هەرگیز ملم نەداوەبۆی، ئێمەی کوردیش یەکەمین جارە بەرژەوەندییەکانمان لەگەڵ داگیرکەر یەکبگرێتەوە، بەڵام داگیرکەرێکی مۆدێرن، خاوەن تەکنەلۆژیا، گەلێک باشترە لە داگیرکەرێکی عەرەبی ئیسلامی خێڵەکی، دەبا ڕێبگرین لەو عەقڵانەی کە ئەم جرجە دڕندەیەیان بەرهەمهێناوە.

تێبینی/ ئەو لێدوانەی سەرەوە لە ڕۆژنامەی هەڵەبجە لە ڕۆژی سێشەمە ١٦-٣-٢٠٠٤ بڵاوکراتەوە.

*چەند دێڕێك بۆ دیكتاتۆر



لە دێی عوجە بوونەوەرێکی دڕندە خۆی بە مرۆڤایەتی ئاشناکرد هەر لە سەرەتاوە شەڕانگێز ئەم بوونەوەرە خۆی لە پاڵ عەرەبی نەتەوەیی ئیسلامی بینییەوە، ئەو خۆی بۆ خۆی نامۆ بوو بە هەموو جوانیەکانی دنیا تەنها گوللەیەك کردی بە پاڵەوانی نەتەوەی عەرەب ئەو گوللەیە کە ئاراستەی عەبدولکەریم قاسم کراو ئەو برینداربوو بو بەوەی کەبچنە ریزی پێشەوەی هەر هەموو بەعسیەکان بوو بە قوتابی کۆلیجی قاهیرەو یاسای خوێن، زیندانیکرا رایکرد ، بووە قسەراسی هەموو بەعسیەکان، هەر لە سەرەتاوە بەڵام لە ناخیدا دڕەندەترین مرۆڤ بوو، هەرگیز سڵی نەکردۆتەوە لە تاوان کە بچوکترین تا گەورەترین، بەراستی بەرهەمی شۆفێنزمی عەرەبی ئیسلام بوو، ئەو دڕندەیە تەنها و تەنها بۆ ژیانی خۆی دەژیا، گەر عەرەبەکان بە پاڵەوان ناوی دەبەن ئەوا ڕۆژگار سەلماندی کە ترسنۆك ترین بوونەوەرە - کە بیر لە شەڕەکانی دەکەمەوە لە ناخی خۆمدا دەمزانی چ ماڵێکە، بۆیە هەرگیز گاڵتەم بە وانە ئەکرد کە دەبوون بە سووتەمەنی بۆی، گەر لە سیاسەتەکانی بکۆڵینەوە -حزب بعث- - امة عربية واحدة ذات رسالة خالدة- میشيل عفلق - القائد المؤسس- الأب القائد- هەموو کەسەکان لەو دڕەندەیە کۆبوونەوە هەمووی بوونە قوربانی ئەو ئەو عەشقی چەك بوو، تەنها بۆ بێ دەسەڵاتەکان - بەڵام ترسنۆك بەرامبەر گەورەکان هەموو گیانی خۆ بەزل زانینبوو بەرامبەر نزم تر لە خۆی، ئەی کوشتن ئەی بڕین بەڵام ترسنۆك بەرامبەر ئەوانەی کە لە خۆی بە تواناى تربوون، لە بچوکترین تاوان تاگەورەترینی ئەنجام داوە، بەڵام زۆر ترسنۆك گرگن زۆر کۆیلە بۆ گەورەو باڵاکان، ئەدی چ چیرۆکێکە چ کارەساتێکە بە ملیۆنان ببنە سووتەمەنی جرجێکی ترسنۆکی ناو زێرابەکان - ئەدی خۆ وی لە گوندێکی بێ کارەبای بێ خزمەت هاتە ژیان بوو بە دڕەندەترین گیان لەبەر هەر خۆی بۆ خۆی کونی جرجەکانی هەڵبژارد بۆ ئەوەی ببێتە عیبرەت ئای چ کارەساتە دەوڵەتێکی وەك عێراق دڕەندەیەك

**رووەو هونەرێکی کوردی ڕەسەن و هاوچەرخ**

ریپۆرتاژی: راز عوسمان

بەئامادەبوونی سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان و ژمارەیەکی زۆر لە هونەرمەندان و شەیدایانی هونەری موزیکی کوردی، دوێنێ سەعات ٤ ی ئێوارە، یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان لەژێر ناوی (رووەو هونەرێکی کوردی ڕەسەن و هاوچەرخ) دووەمین ڤیستیڤاڵی موزیکای کوردی لە هۆڵی سلێمانی بەڕێوەبرد.
سەرەتای ڤیستیڤاڵەکەش سەرجەم ئامادەبووان ساتێک بە بێ دەنگی بۆ گیانی پاکی شەهیدان وەستان، پاشان فەرەیدوون دارتاش وتاری یەکێتی هونەرمەندانی کوردستانی خوێندەوە، دواتر بەڕێز سەرۆکی حکومەتی هەرێم لەوتەیەکدا وێڕای بەخێرهاتنی میوانان و هونەرمەندان بۆ شاری سلێمانی، باسی لەگرنگی ڤیستیڤاڵەکە کرد و هیوای خواست کە کارو هەنگاوەکانی هونەرمەندان هاندەرێک بێت بۆ پێشخستنی موزیکی کوردی.
دوا بەدوای ئەوە تیپی هونەرە میللییەکانی هەولێر و تیپی سەنتەری گەنجانی زاخۆ و تیپی مۆسیقای شنروێ، بەرهەمەکانیان پێشکەش کرد.

شایانی باسە دوا لاپەڕە لەهۆڵی ڤیستیڤاڵەکە چەند بەشداربوویەکی بەم شێوەیە دواند:

مستەفا رەنجەڕۆ:

ئەم ڤیستیڤاڵە، ڤیستیڤاڵێکی سەرکەوتوو دەبێت و دەستخۆشی لەهەموویان دەکەم و خۆزگە هەر چوارپارچەکەی کوردستان بەشدار دەبوون، چونکە هەمووومان یەک زمان و مێژوومان هەیە، ئەم ڤیسیڤاڵەش دەبێتە هۆیەک بۆ ئەوەی یەک بگرینەوەو شتێکی جوانە، پێموایە زۆر چاک خزمەتی هونەری کوردی دەکات و بوار بوایە لە هەر وەرزێکدا لە پارچەیەکی کوردستان ئەم ڤیستیڤاڵە بکرایە، ئێمە وەکو تیپی هونەرە میللییەکانی هەولێر بە سێ بەرهەم بەشداریمان کردووە.

شەوکەت محەمەد:

ئێمە وەک خەڵکی بادینان یەکەمجارە بەشداری دەکەین، دەبینم ئەم ڤیستیڤاڵە زۆر خزمەتی هونەرمەند دەکات وەک تاقیکردنەوەیەکی هونەرمەندانە زۆر خۆشحاڵین بەشداریمان لەم ڤیستیڤاڵە کردووە و دەستخۆشی لە هەموو تیپەکان دەکەم.

لینا جەلال ئەمین:

هەست بە خۆشییەکی زۆر دەکەم کە لەگەڵ تیپەکەمدا لەم ڤیستیڤاڵە بەشدار بووین، چونکە دڵنیام ئەم بەشداربوونەمان هاندەرێکی باش دەبێت بۆ ئەوەی بتوانین لە داهاتوودا زیاتر گرنگی بە موزیکای رەسەنی کوردی بدەین.

تێبینی/ ئەم ریپۆتاژە لە رۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە ٣٦٠٦ رۆژی هەینی ٢٥-٢-٢٠٠٥ بڵاوکراوەتەوە.

کوردستانی نوێ
KURDISTANÎ NWÊ
No:3606 Friday 25/2/2005
ساڵی چواردەهەم- ژمارە (٣٦٠٦) هەینی ٢٥/٢/٢٠٠٥

## رووەو هونەرێکی کوردیی رەسەن و هاوچەرخ

بەئامادەبوونی سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان و ژمارەیەکی زۆر لەهونەرمەندان و شەیدایانی هونەری موزیکی کوردی، دوێنێ سەعات (٤)ی ئێوارە، یەکێتیی هونەرمەندانی کوردستان لەژێر ناوی (رووەو هونەرێکی کوردیی رەسەن و هاوچەرخ) دووەمین فێستیڤاڵی موزیکای کوردی لەهۆڵی سلێمانی بەرێوەبرد.

سەرەتای فێستیڤاڵەکەش سەرجەم ئامادەبووان ساتێك بەبێدەنگی بۆ گیانی پاکی شەهیدان وەستان، پاشان فەرەیدون دارتاش وتاری یەکێتیی هونەرمەندانی کوردستانی خوێندەوە، دواتر بەرێز سەرۆکی حکومەتی هەرێم لەوتەیەکیدا وێڕای بەخێرهێنانی میوانان و هونەرمەندان بۆ شاری سلێمانی، باسی لەگرنگیی فێستیڤاڵەکە کردو هیوای خواست کەکارو هەنگاوەکانی هونەرمەندان هاندەرێك بێت بۆ پێشخستنی موزیکی کوردی.

دوابەدوای ئەوە تیپی هونەرە میللییەکانی هەولێرو تیپی سەنتەری گەنجانی زاخۆو تیپی مۆسیقای شنرۆێ بەرهەمەکانیان پێشکەشکرد.

شایانی باسە، دواڵاپەرە لەهۆڵی فێستیڤاڵەکەدا چەند بەشداربوویەکی بەمشێوەیە دواند:

*مستەفا رەنجەرۆ:

-ئەم فێستیڤاڵە، فێستیڤاڵێکی سەرکەوتوو دەبێت و دەستخۆشیی لەهەموویان دەکەم و خۆزگە هەر چوار پارچەکەی کوردستان بەشدار دەبوون، چونکە هەموومان یەك زمان و مێژوومان هەیە، ئەم فێستیڤاڵەش دەبێتە هۆیەك بۆئەوەی یەك بگرینەوەو شتێکی جوانە، پێموایە زۆرچاك خزمەتی هونەریی کوردی دەکات و بوار بووایە لەهەر وەرزێکدا لەپارچەیەکی کوردستان ئەم فێستیڤاڵە بکرایە. ئێمە وەکو تیپی


تیپی مۆسیقای شنرۆێ

*شەوکەت محەمەد:

-ئێمە وەك خەڵکی بادینان یەکەمجارە بەشداریی دەکەین، دەبینم ئەم فێستیڤاڵە زۆر خزمەتی هونەرمەند دەکات و وەك تاقیکردنەوەیەکی هونەرمەندانە زۆر خۆشحاڵین بەبەشداریمان لەم فێستیڤاڵەو دەستخۆشیی لەهەموو تیپەکان دەکەم.

*لینا جەلال ئەمین:

-هەست بەخۆشییەکی زۆر دەکەم کە لەگەڵ تیپەکەمدا لەم فێستیڤاڵە بەشداربووین، چونکە دڵنیام ئەم بەشداربوونەمان هاندەرێکی باش دەبێت بۆئەوەی بتوانین لەداهاتوودا زیاتر گرنگی بەموزیکای رەسەنی کوردی بدەین.

راز-کۆسار   فۆتۆ/حەمەعومەر


شەوکەت محەمەد

هونەرە میللییەکانی هەولێر بەسێ بەرهەم بەشداریمانکردووە.


لینا جەلال ئەمین


مستەفا رەنجەرۆ

## لەدنیای هونەرو رووناکبیریدا

هەڵەبجە

لەدرێژەی چالاکییەکانیدا، ناوەندی رووناکبیریی هەڵەبجە، رۆژانی (٢٣-

## کەرنەڤاڵی لاوک و حەیران و هۆرەو سیاچەمانە

دەزانن گەلۆ، ئەمن هاتوومە کەرنەڤاڵی عەشق بهۆنمەوە، من هاتووم و دەمەوێت چوارپرچ بهۆنمەوە، وەک زەنگیانە یاقوتەکانی کیژە سرکێکی هەورامان و بیدەم لەیەخەی لاوی خۆم لە بادینان، ئەمن دەنگێکی نەمرم، من لەناو چوار تاقی تاشەبەردەکانی هەورامانەوە لەهاژەی چەم و لەخوڕەی قەڵبەزەو لەقاسپەی کەو و لە زیکری سۆفیانی خانەقاو لە ملە سەختەکانی تولە ڕێکانی لای تەلانی ریزکراوی هەورامانەوە ئەڵێەقوڵێم، سەرچاوەی من لەدەنگی سەدای لایەلایەی کنەلەیلە نازدارەکانی هەورامانەوە دێت، لای خانی دۆڵێ و دۆڵی هەجیج و دوو ئاوانەوە دێت، پەکو چەند خۆشە دەنگی من لەتەک لاوکی بادینان ئاوێزان بێت.

سەدای چاو رەشەکانی لای هەورامان تێکەڵ بەخەمی کیژە هەولێرییان بێت و ئەو ساتانە لاوک ئاوێزانی هۆرە بێت و سیاچەمانەش گۆرانی عەشق بۆ لاوک بچرێت، پێکەوە هەموو دەستەو پەنجە ناسکەکان تار بژەنن، سەنتور لێبدەن و دەف بۆ خۆی هەڵپەڕێت و جۆزە وەک دارگوێزەکانی هەورامان رستەی جوان جوان بەش بکات بەسەر منالانی ئەم دەڤەرەدا.

ئەدی نازانن سیاچەمانە دەنگی زوڵاڵی چاوڕەشەکانی هەورامان، وێنەی رەنگاورەنگی زوڵفی شۆڕی کناچەکانی لای هەورامانی تەخت و لهۆنە، پشتوێنی رەنگاورەنگی ئاڵ و والای بەرکەمەر و دەنگی هەیاسەی لای شاخ و دۆڵەکانە (سیاچەمانە - سیاچەمانە - بەهەشتی عەشقە ئەم هەورامانە) ئەمە کت و مت لەڕووی فەلسەفەوە دەنگێکی ئێجگار سیحراوییە ئەزانن بۆ؟ چونکە لەگاتاکانی زەردەشت و لەسووتەکانی ئاڤێستاوە سەرچاوەی گرتووە، ئەمن لەپیری موغانەوە ئیلهامی لەرینەوەکانی ناخم پێشکەش دەکەم، ئاخر نازانن بۆهێندە چرپینەکانم بەسۆزن، چونکە دەیان ئاهو حەسرەت و عەشقی کپکراوی ئاخنراوی لەگەڵ شەپۆلەکانی زەڵمدا لەناو ناخی خۆیدا حەشارداوە، دەیان چیرۆکی (یۆسۆ ئاسکەی) لەپێچی مێزەرەکەی خان ئەحمەد خان دا مەلاسداوە، خۆی بۆ دەنگی حەسرەتێکی مرۆیی پڕ ئەوینی بارگەکراو بەهۆنینەوەکانی رستەی جوانی و مرواریيەکانی بن زیخی کانیاوەکان هەڵگرتووە.

بۆچ نازانن لەبن کانیاوە روونەکانی لای هەورامان چەندین عەشق کپکراوە؟ ئەدی نازانن بۆ تاشەبەردەکانی هەورامان چەندین دەنگی عاشقانی بێ ئاکام کراوە، ئای لەو مێژووە چەند سەختە! کە بەهەرهەمومان ناتوانین دەنگی چاو ڕەشەکانی لای نزیکترین جوگرافیا پەیوەست بە ئەمڕۆی ئەویندارى ڤیستیڤاڵی موزیک بکەین خۆ ئەم جێژنەوارەشمان هەنگاوێکە بۆ ئاسوودەکردنی رۆحی سووکی سیاچەمانەکانمان، باوە هۆرەکانمان بەڕاستی پەیڤێکە دەبێ هەمومان وانەی نوێ لەرابردوودا بەدی بهێنین لە دیرۆکی بابردووی رابردوو دەیان رستەی جوان و وێنەی قەشەنگ و تابلۆی سەرسوڕهێنەر بێنیتەدی، لە لەرینەوەی سیاچەمانەکان پەیمانگایەک دروستبکەین بۆ خوێندنی ئەم تەرزانە، لەهۆرەو لاوک و حەیران و سیاچەمانەو پارچەیەک لەملا، گۆشەیەک لەولا، حەسرەتێکی قوڵ لای لاوک و دەنگی کاوێس ئاغا و حەیرانی رەسول گەردی و سیاچەمانەی عوسمان کێمنەیی وێنەیەک لە موجتەبا و تابلۆیەک لە خالقی و هارمۆنییەک لای ع.ج.سەگرمەو ... بەهەر هەموو پێکەوە کەرنەڤاڵی ناوازەترین موزیک دروستبکەین، ئەویش وێناکردنی دەنگەکانە لە شێوازێکی چڕ و پڕتر، ناسکتر، ئەکادیمی تر، پاش ئەویش زانستی تر بۆ خوێندنەوەی جوانتر بۆ ئەمڕۆی موزیکی کوردی و پاشەڕۆژی.

تێبینی/ ئەم بابەتە لە رۆژنامەی ئاواز لە بڵاوکراوەی تایبەت بە ڤیستیڤاڵی موزیکی کوردی ژمارە ٤ سلێمانی، لە ٢٩-٣-٢٠٠٥ بڵاوکراوەتەوە.

# کەرنەقالی لاوك و حەیران و

# هۆرەو سیاچەمانە

ئازاد سالح

دەزانـــن گـەلـێ،
ئـەمـن هـاتـوومـە کـەرنـەقـالـی عەشق بهۆنمەوە، من هاتووم و دەمەوێت چوارپرچ بهۆنمەوە، وەك زەنـگـیـانـە یـاقـوتـەکـانـی کیژەسرکێکی هەورامان و بیدەم لەیەخەی لاژی خۆم لە بادینان، ئەمن دەنگێکی نەمرم...من لەناو چـوار تـاقـی تـاشـەبـەردەکـانـی هـەورامـانـەوە، لـەمـازەی چـەم و لـەخـورەی قـەلـبـەزەو لەقاسپەی کـەو و لـەزیـکـری سـۆفـیـانـی خـانـەقـاو لـەملـەسـەخـتـەکـانـی تـولـەرێـکـانـی لای تـەلانـی ریـــزکـــراوی هـــەورامـــانـــەوە هەڵئەقولێم... سەرچاوەی من لە دەنگی سەدای لایەلایەی کللەیلە نازدارەکانی هەورامانەوە دێت، لای خانی دۆڵێ و دۆڵی هەجیج و دوو ئـاوانـەوە دێـت، پەکو چەند خۆشە دەنگی من لەتەك لاوکـی بـادیـنـان ئـاوێـزان بێت.

سـەدای چـاورەشـەکـانـی لای هەورامان، تێکەڵ بەخەمی کیژە هەولێرییان بێت و ئەو ساتانە لاوك ئاوێزانی هۆرەبێت و سیاچەمانەش گۆرانی عەشق بۆ لاوك بچڕێت، پێکەوە هەموو دەستـەو پەنجە ئاسکەکان تار بژەنن، سەنتور لێدەن و دەف بۆخۆی هـەڵـپـەرێـت و جـۆرە وەك دارگوێزەکانی هـەورامـان ڕستەی جوان جوان بەش بکات بەسەر منداڵانی ئەم دەڤەرەدا. ئـەدی ئـازانـن سـیـاچـەمـانـە، دەنگی زوڵاڵـی چاورەشەکانی هـەورامـان، وێـنـەی رەنـگـاو رەنگی زوڵفی شۆڕی کناچەکانی لای هـەورامـانـی تـەخـت و لهۆنە...پشتوێنی رەنگاورەنگی ئاڵ و واڵای بەرکەمەرو دەنگی هەیاسەی لای شاخ و دۆڵەکانە ... (سیاچەمانە-
سیاچەمانە-بەهەشتی عەشقە ئەم هەورامانە) ئەمە کت و مت لـەرووی فەلسەفەوە دەنگێکی نێجگار سیحراوییە، ئەزانن بۆ، چونکە لەگاتاکانی زەردەشت و لـە سـرووتـەکـانی ئاڤێستاوە سـەرچـاوەی وەرگـرتـووە ئەمن لەپیری موغانەکانەوە ئیلهامی لەرینەوەکانی ئاخم پێشکەش دەکـەم؛ ئاخر ئازانن بۆ هێندە چریـنـەکـانم بـەسـۆزن، چونکە دەیان ئاهو حەسرەت و عەشقی کـپ کـراوی ئـاخنـراوی لـەگـەڵ شەپۆلەکانی زەڵمدا... لـەناو ئـاخـی خـۆیـدا حـەشـارداوە، دەیان چیرۆکی (یۆسۆئاسکەی) لـەپێـچـی مـێـزەرەکـەی خـان ئەحمەد خان دا مەڵاسداوە... خۆی بۆ دەنگی حەسرەتێکی مـرۆیـی پـڕئـەوێـنی بارگەکراو بـەهـۆنـیـنـەوەکـانـی ڕسـتـەی جـوانی و مـرواریـیـەکـانـی بن زیخی کانیاوەکان هەڵگرتووە... بـۆ چ ئـازانـن لـەبـن کـانـیـاوە روونـەکـانـی لای هـەورامـان چـەنـدین عـەشـق کـپ کـراوە؟ ئەدێ ئازانن بۆ تاشەبەردەکانی هـەورامـان چـەنـدین دەنگی عاشقانی بێ ئاکام کراوە.. ئای لـەو مـێـژووە چـەنـد سـەختە... کە بەهـەر هـەمـوومـان ناتوانین دەنـگـی چـاورەشـەکـانـی لای نزیکترین جوگرافیا پەیوەست بـەئـەمـرۆی ئـەویـنـداری فیستیڤالی موزیك بکەین خۆ ئەم جێژنەوارەشمان هەنگاوێکە بۆ... ئاسوودەکردنی رۆحی سـووکـی سـیـاچـەمـانـەکـانـمـان، بـاوە هـۆرەکـانـمـان بـەڕاستی پـەیـڤـێـکـە دەبـێ هـەمـوومـان وانـەی نوێ لـەرابـردوودا بەدی بهێنن، لـەدیـرۆکـی بـابـردووی رابـردوو دەیـان ڕسـتـەی جوان و وێـنـەی قـەشـەنـگ و تابلۆی سـەرسـوڕهێـنـەر بێنێتەدی، لە لـەریـنـەوەی سـیـاچـەمـانـەکـان پەیمانگەیەك دروست بکەین بۆ خوێندنی ئەم تەرزانە، لەهۆرەو حەیران و لاوك و سیاچەمانەو پارچەیەك لـەم لا، گۆشـەیـەك لەولا، حەسرەتێکی قوڵ لای لاوك و دەنگی کاوێس ئاغاو حەیرانی رەسول گەردی و سیاچەمانەی عوسمان کێمنەیی، وێنەیەك لە موجتەبار تابلۆیەك لە خالقی و، هارمۆنیەك لای ع.ج. سەگرمەو... بەهەر هەموو پێکەوە کەرنەڤاڵی ئـاوازەتـریـن مـوزیـك دروست بـکـەیـن، ئـەویـش وێـنـاکـردنـی دەنگەکانە لە شێوازێکی چڕو پڕتر، ئاسکتر ئەکادیمی تر... پـاش ئـەویـش زانـسـتـی تـر بۆ خوێندنەوەی جوانتر بۆ ئەمرۆی موزیکی کوردی و پاشەڕۆژی.

## چرکەساتەکانی پرسەی میلۆدییەکان

پێشکەشە بەگیانی نورانی موجتەبای میرزادە

هۆ ئەی رستە هۆنراوەکانی موزیک – میلۆدییەکان، ئەی هەموو کەمانچەکان، بۆ نایەن مانبگرن، بۆ هەڵناسنە سەر پێ وێکڕا مەراسیمی پرسەیەک ساز ناکەن؟! هەر هەمووتان پێکەوە ئاوازێکی ناوازەتان لەدەستداوە، وا کەڵە هونەرمەندێکی رۆح سووکی نورانی هێدی هێدی جەستەی ماندووی رۆحی پڕ سیحر و ئەفسوونی رووەو خاک هەنگاو دەنێت، ئەی هەموو میلۆدییەکانی ئەندێشەی میرزادە.. شایی لۆغانی پرسە دانێن، هەی هەموو کەمانچە دارینەکان، هەموو یەک یەک ریزبن و چەندین ریزیش بەسەر پێوە پرسە بگرن، ئەی هەموو پەنجە ناسکەکانی کەمانچە ژەنەکان لەجوڵە بکەون و هەموو وێکڕا پرسەی پەنجە پڕ ئەفسونەکانی میرزادە سازبکەن، هەی زیرەک لەگۆڕ سەردەربێنە لەسەر ناڵەشکێنەوە بڕوانە، هەی هایدەی شۆخ و شەنگ توبی گیانی شیرین گیانت لە مەنفای دوورەوە سەیربکەو .. ئاوازێکی خەمناکتر لە شیرین گیان بچڕە بۆ گیانی میرزادە، چونکە ئەویش رووەو خاک هەنگاو دەنێت، دەسا ئەی خاک تکا ئەکەم هێندە ئازاری جەستەی ماندووی کەمان ژەنە بلیمەتەکەی خاک و ئەوین ئازار مەدە.. ئای ئای مەرگ تۆ لەخودی حەتمەییەت تری چ قەدەرێکی بێ تەفسیر و تۆ چ فەلسەفەیەکت لە بونیادی خۆتدا حەشارداوە، ژیان چییە؟ بوون چییە؟...

من دەژیم واتە هەم، من ناژیم واتە نیم.. ئەی پاش ئەوەی کەمردم هەموو دنیا بەمن چی؟ با چەندین پەیکەر و شیعرو کتێب لەسەر من بنوسرێت، بەچی ئەبێت؟ خۆ تۆ هەست بەهیچ کامیان ناکەیت، با ملیۆنان لەسەر گۆڕم بن پرسە دانێن، چی لەناوەڕۆکی خودی مەرگ دەگۆڕێت... نازانم... لەکام فەرهەنگ وشەکان کۆبکەمەوە وەک گەردانە یاقوتییەک بیکەمە گەردنی رۆحی میرزادەی هونەرمەند .. ئەوە چ عەشقێک لە مۆسیقا و چ خولیایەک لە میهر و چ ئەفسونێک لە هونەر تۆی کردە ئەو کەڵە بلیمەتە.. بە ئەندێشەت، بە پەنجەکانت بەقەوسی کەمانەکەت سوێندت ئەدەم بیری تۆ لەکام کانی هەڵقوڵا، لەکام کێڵگە سەوز ئەبوو؟ لەکام درەخت بەروبوومی دەهاتە بەرهەم؟ هەر لەمناڵییەوە تاپیری بەرهەمەکانت

جوانتر بوون، ناوازەتر ئەبوون، چەشنی بتهۆڤن ئاسا تۆ هەرچەندە تەمەنت رێی بکردایە چەشنی درەختێکی بەردار بەروبوومەکەت جوانتر دەبوو، گیانی داهێنانی تۆ درەختێک بوو لە دارگوێز تا کاملتر دەبوو، بەرهەمەکەی جوانتر و ناسکتر و نەشمیلانەتر دەبوو.. تاک ژەنینەکانی تۆ، نمونەی داهێنان و ئەفراندن بوو، ئەمن لەم چیرۆک و دیرۆکەدا کام دەستەواژەی موزیک کام هێما بەکاربهێنم کە گیانی خۆڕسکی تۆ ئەنجامی نەدابێت.. ئەتۆ چەشنی دەروێش عەبدوڵای گۆران — ی بیلمەت نە حەرفی مەکتەبێکت خوێند نە ئوستادێ پەلی گرتی، صیرف بەرزی زەکا ئەم سنعەتەی فێرکرد بە شمشاڵت . رۆحی تۆ گەمەی لەتەک هەموو دەستەواژەکان دەکرد هەر هەمووی خۆرسکانە سنوورەکانی دەبەزاند، هەموو کۆتەکانی دەشکاند و مامەڵەی لەگەڵ رۆحدا دەکرد، ئەو خۆی بۆ خۆی تەلیسمێک بوو لە سیحر بەو دەست و پەنجانە ملیۆنان رستەی موزیکی ئەفراندووە، نازانم لە چ نەستێکەوە دەهاتە دەر، بە کەمانچەکەی ئاشنایی لەگەڵ ئەو دەریا بێ بنەدا پەیداکردووە، ئەو دەیان لە گۆرانی بێژان و سەدان لە موزیکزانان و هەزاران لە میلۆدی و ملیۆنان لەرستەی هۆنیوەتەوە، بڕوابکەن هەتا ئێستاش بە ئاسمانی نزیک ئێستگەی کرماشانەوە بە هەزاران لە نۆتەکانی سەر پەنجەی میرزادە سەدای دەنگیان پەخش دەکەن، ئەی نازانن؟ ڤیۆلینەکەی میرزادە و دەنگی زیرەک دوانەیەکی لێکئالاّو بوون، بۆ نازانن ئەو لە رۆحی خالقیدا بلیمەتی و داهێنان بوو. کام لە ئێوە هەی هونەرمەندانی ئێران بەکورد و فارس و تورک هتد قەرزاری باری ڤیۆلینەکەی میرزادە نین؟ هایدەی شۆخ، مەهەستی، حومەیرا، گوگوش، گولپایگان، ئیرەج... هتد.

ئای چەند رۆحت ئاسوودەیە تۆ بۆ گەورەترین و بلیمەتترین هونەرمەندی زەمانی خۆت رستەی میلۆدی جوانت هۆنیەوەتەوە، گوێت لەدەنگی هایدەی شۆخ و مەهەستی و زایەڵەی دەنگی ئیرەج بووە، دەزانی گیانی تۆ دەریایەک بوو لە داهێنان، رووبارێک بوو لە عەشق، کانییەکی روون روون لە ژیان، ئاوی کانی لەبن چەو و زیخەکاندا هەمیشە لە هەڵقوڵیندایە، ئەتۆ مرۆڤێک بوویت لە جەستەو رۆح، کامیان لە پێش کامیان لەدایک بوو، ئەی چۆن ژیایت؟ ئەی بۆ ئالودەی مەی و بێهۆشی بوویت؟ تۆ بەو تەمەنەت عاشقێکی بەهرە بەخش بوویت، هەمیشە گیانت عاشقی شۆخ و شەنگەکانی تاران بوو، کامە راهیب دەرسی دادایت کامە

دین و کامه مەزهەب؟ لای گیانی تۆ مانادار بوو، هەی ڤیۆلینە مێردمنداڵەکە کێ ئاشنای کردی بە زیرەک؟ کام ڕێکەوت بوو؟ تۆیەکی تەمەن حەڤدە هەژدە ساڵ لەگەڵ حەسەنی هەگبەی خەم بناسێنێت، چۆنت ناسی یەکەمین جار تۆ کرماشانی و ئەو بۆکانی، چۆن رۆحتان ئاوێزانی یەکدی کردو ئەو بەرهەمە ناوازەیەتان بۆ مێژوو خولْقاند، هەرچەند دەکەم سیحری گیانت بخوێنمەوە ناتوانم هەروەک دیاردەکانی سروشت و سوڕانەوەی مانگ و شەو رۆژو چاکەو خراپەو خودی مەرگ دژوارن، هەمیشەو هەمیشە هونەرمەندان و شاعیران ژیان بەخشن نەک مەرگ بەخش، ئەوان ناتوانن هەرگیز پیاوێک بکوژن چەشنی سیاسییەکان، ئەوان هەمیشە ژیان دۆستن نەک مەرگ دۆست، شتێکی سەوداسەری هونەری خۆڕسک نازانم چۆن بەو کەمانەت عاشق بووم هەر لە منالْییەوە دەمزانی سەدایەک دێت گوێم پڕ ئەکات لە نەشئە، لە ئیزگەی کرماشانەوە تێکەڵ بەدەنگی شوکرەڵای بابان ومیدیای زەندی و بەرنامەی هەوارگەی دلان، جار جارەش گۆرانییەکی زیرەک سەدایەکی زۆر سەیری هەبوو، گۆرانییەکان زۆر سەیربوون بەدەیان وسەدان لەکرماشان دەهاتن بۆ هەڵەبجە بۆ گەڕەکەکەمان لەناو رادیۆکەماندا دەنگیان دەدایەوە، وەک قومری، ناڵەشکێنە. ئەسمەرێ، نەورۆز، شیرین تەشی دەڕێسێ، بۆنی هەڵالان دێ، ئەوە خودی میرزایە تێکەڵ بەدەنگی زیرەک و خالقییە پەخش دەبێت. ئەتۆ چ بوویت کورد بوویت یان فارس گیانی تۆ ئالودەی یا حەقی بوو یان کلتوری کرماشان؟

لەکۆتایی هەموو میلۆدییەکان شای لۆغانی پرسە بگرن بۆمیرزادەو دە ڤیۆلینەکان لە ژەنین بسرەون... دە ئاوازەکان تێر تێر بگرین .. پرسەی رۆحتان ئاوێزانی جەستەی مردووی زیرەک و هایدەو موجتەبا بکەن، ئێمەش لێرەو لەوێ هەموو پرسەی ماتەمینی بۆ بلیمەتێک سازبکەین، بۆیە دەڵێم هەی ڕۆ، هەی ڕۆ، عاشقی دنیای موزیک و داهێنان ڕۆ.

تێبینی/ ئەم بابەتە لە پاشکۆی ئەدەب و هونەری کوردستانی نوێ ژمارە ٣٧٦٤ لەرۆژی پێنج شەمە لە ٢٠٠٥/٩/١ بڵاوکراوەتەوە.

# چرکەساتەکانی پرسەی میلۆدییەکان

**پێشکەشە بەگیانی نورانی موجتەبای میرزادە**

**ئازاد ساڵح- شنرویێ**

هۆ ئەی رستە هۆنراوەکانی مۆزیك-میلۆدییەکان- ئەی هەموو کەمانچەکان، بۆ نایەن مان بگرن- بۆ هەڵناسنە سەرپێ وێکرا مەراسیمی پرسەیەك ساز ناکەن؟! هەر هەمووتان پێکەوە ئاوازێکی ناوازەتان- لەدەست داوە- وا کەڵە هونەرمەندێکی رۆح سووکی نوورانی هێدی هێدی جەستەی ماندووی رۆحی پڕ سیحرو ئەفسونی رووەو خاك هەنگار دەنێت، ئەی هەموو میلۆدییەکانی ئەندێشەی میرزادە.. شایی لۆغانی پرسە دانێن، هەی هەموو کەمانچە دارینەکان هەموو یەك یەك ریز بن و چەندین ریزیش بەسەر پێوە پرسە بگرن، ئەی هەموو پەنجە ناسکەکانی کەمانچەژەنەکان لەجووڵە بکەون و هەموو وێکرا پرسەی پەنجە پڕ ئەفسونەکانی میرزادە سازکەن، هەی زیرەك لەگۆڕ سەردەرهێنەو لەسەر ناڵەشکێنەوە بڕوانە هەی هایدەی شۆخ و شەنگ تویی گیانی شیرین گیانت لەمەنفای دوورەوە سەیر بکە.. و ئاوازێکی خەمناکتر لەشیرین گیان بچڕە بۆ گیانی میرزادە، چونکە ئەویش رووەو خاك هەنگاو دەنێت.. دەسائەی خاك تکا ئەکەم هێندە ئازاری جەستەی ماندووی کەمان ژەنە بلیمەتەکەی خاك و ئەوین ئازار مەدە.. ئای ئەی مەرگ تۆ لەخودی حەتمیەت حەتمیەت تری چ قەدەرێکی بێ تەفسیرو تۆ چ فەلسەفەیەکت لەبونیادی خۆتدا حەشارداوە، ژیان چییە؟ بوون چییە؟..

من دەژیم واتە هەم، من ناژیم واتە نیم.. ئەی پاش ئەوەی کە مردم هەموو دنیا بەمن چی.. باچەندین پەیکەرو شیعرو کتێب لەسەر من بنووسرێت بەچی ئەبێت.. خۆ تۆ هەست بەهیچ کامیان ناکەیت.. باملیۆنان لەسەر گۆڕم بن پرسە دانێن چی لەناوەرۆکی خودی مەرگ دەگۆڕێت... نازانم.. لەکام فەرهەنگ وشەگان کۆکەمەوە وەك گەردانە یاقوتیەك بیکەمە گەردنی رۆحی میرزادەی هونەرمەند.. ئەوە چ عەشقێك لەمۆسیقار چ خولیایەك لەمیهرو چ ئەفسونێك لەهونەر تۆی کردە ئەو کەڵە بلیمەتە.. بەئەندێشەت.. بەپەنجەکانت، بەقەوسی کەمانەکەت، سوێندت ئەدەم بیێ تۆ لەکام کانی هەڵقولا، لەکام کێڵگە سەوز ئەبوو؟ لەکام درەخت بەروبوومی دەهاتە بەرهەم، هەر لەمنداڵیەوە ئاپێری بەرهەمەکانت جوانتر بوون، ناوازەتر ئەبوون چەشنی بتهۆڤن ئاسا تۆ هەرچەندە تەمەنت رێی کردایە چەشنی درەختێکی بەردار بەروبوومەکەت جوانتر دەبوو، گیانی داهێنانی تۆ درەختێك بوو لەدارگوێز تا کامڵتر دەبوو بەرهەمەکەی جوانترو ناسکترو ئەشیلانەتر دەبوو.. تاك ژەنینەکانی تۆ.. نموونەی داهێنان و ئەفراندن بوو.. ئەمن لەم چیرۆك و دیرۆکەدا کام دەستەواژەی مۆزیك.. کامە هێما بەکاربهێنم کە گیانی خۆرسکی تۆ ئەنجامی ئەدابێت.. ئەتۆ چەشنی دەروێش عەبدوڵلا-ی گۆران-ی بلیمەت ئەحەرفی مەکتەبێکت خوێند ئەئوستادێ پەلی گرتی، حرف بەرزی زەکا ئەم سیفەتەی فێرکردی بەشەشالتا- رۆحی تۆ گەمەی لەتەك هەموو دەستەواژەکان دەکرد، هەر هەمووی خۆرسکانە سنوورەکانی دەبەزاند هەموو کۆتەکانی دەشکاندو مامەڵەی لەگەڵ رۆحدا دەکرد. ئەو.. خۆی بۆ خۆی، تەلیسمێك بوو لەسیحر بەر دەست و پەنجانە ملیۆنان رستەی مۆزیکی، ئەفراندووە، نازانم لەچ ئەستێکەوە دەهاتە دەر، بەکەمانچەکەی ئاشنایی لەگەڵ ئەو دەریا بێبنەدا پەیداکردووە، ئەو دەیان لەگۆرانیبێژان و سەدان لەموزیککاران و هەزاران لەمیلۆدی و ملیۆنان لەرستەی هۆنیوەتەوە، بڕوا بکەن هەتا ئێستاش بەئاسمانی نزیك ئێستگەی کرماشانەوە بەهەزاران لەتۆنەکانی سەر پەنجەی میرزادە سەدای دەنگیان پەخش دەکەن، ئەی نازانن؟ ڤیۆلینەکەی میرزادەو دەنگی زیرەك دووانەیەکی لێکنالاو بوون، بۆ نازانن ئەو لەرۆحی خالقیدا.. بلیمەتی و داهێنان بوو. کام لەئێوە..

هەی هونەرمەندانی ئێران بەکوردو فارس و تورك.. هتد قەرزاری باری ڤیۆلینەکەی میرزادە نین؟ هایدەی شۆخ، مەحەستی، حمیرا، گوگوش، گولپایگان، ئیرەج.. هتد.

ئای چەندە رۆحت ئاسوودەیە، تۆ بۆ گەورەترین و بلیمەتترین هونەرمەندی زەمانی خۆت رستەی میلۆدی جوانت هۆنیوەتەوە، گوێت لەدەنگی هایدەی شۆخ و مەحەستی و زایەڵەی دەنگی ئیرەج بووە، دەزانی، گیانی تۆ.. دەریایەك بوو لەداهێنان، رووبارێك بوو لەعەشق، کانیەکی روون روون، لەژیان، ئاوی کانی لەبن چەوو زیخەکانیدا هەمیشە لەهەڵقوڵین دایە. ئەتۆ مرۆڤێك بوویت لەجەستەو رۆح کامیان لەپێش کامیان لەدایکبوو.. ئەی چۆن ژیایت، ئەی بۆ ئالوودەی مەی و بێهۆشی بوویت، تۆ بەو تەمەنەت عاشقێکی بەهرە بەخش بوویت هەمیشە گیانت عاشقی شۆخ و شەنگەکانی تاران بوو.. کامە راهیب دەرسی دادایت کامە دین و کامە مەزهەب.. لای گیانی تۆ مانادار بوو.. هەی ڤیۆلینە مێردمنداڵەکە کێ ئاشنای کردی بەزیرەك کام رێکەوت بوو، تۆیەکێ تەمەن هەڤدە هەژدە ساڵ، لەگەڵ حەسەنی هەگبەی خەم، بناسێنێت، چۆنت ناسی یەکەمین جار تۆ کرماشانی و ئەو بۆکانی، چۆن رۆحتان ئاوێزانی یەکدی کردو ئەو بەرهەمە ئاوازەیەتان بۆ مێژوو خوڵقاند. هەرچەند دەکەم سیحری گیانت بخوێنمەوە ناتوانم هەروەک دیاردەکانی سروشت و سورانەوەی مانگ و شەو رۆژو چاکەو خراپەو خودی مەرگ دژوارن هەمیشەو هەمیشە هونەرمەندان و شاعیران ژیان بەخشن، ئەك مەرگ بەخش ئەوان ناتوانن هەرگیز پیاوێك بکوژن، چەشنی سیاسیەکان، ئەوان هەرگیز ژیاندۆستن ئەك مەرگدۆست. شتێکی سەودا سەری هونەری خۆرسك نازانم چۆن بەو کەمانەت عاشق بووم، هەر لەمنداڵییەوە دەمزانی، سەدایەك دێت گوێم پڕ ئەکات لەنەشئە، لەئێزگەی کرماشانەوە، تێکەڵ بەدەنگی شوکرەڵلای بابان و میدیای زەندی، بەرنامەی هەوارگەی دڵان، جارجارەش گۆرانییەکی زیرەك سەدایەکی زۆر سەیری هەبوو، گۆرانییەکان زۆر سەیربوون بەدەیان و بەسەدان لەکرماشان دەهاتن بۆ هەڵەبجە بۆ گەرەکەکەمان لەناو رادیۆکەماندا دەنگیان دەدایەوە، وەك قومری، ناڵەشکێنە، ئەسمەرێ، نەورۆزێ، شیرین ئەمشی دەرێسێ، بۆنی هەڵاڵان دێ، ئەوە خودی میرزادەیەو تێکەڵ بەدەنگی زیرەك و خالقییە پەخش دەبێت. ئەتۆ چ بوویت کورد بوویت یان فارس گیانی تۆ ئالودەی یاحقی بوو یان کلتووری کرماشان.

موجتەبای میرزادە

لەکۆتایی هەموو میلۆدیەکان شای لۆغانی پرسە بگرن بۆ میرزادەو دە ڤیۆلینەکان لەژەنین بسرەون.. دە ئاوازەکان تێر تێر بگرین.. پرسەی رۆحتان ئاوێزانی جەستەی مردوی زیرەك و هایدەو موجتەبا بکەن. ئێمەش لێرەو لەوێ هەموو پرسەی ماتەمینی بۆ بلیمەتێك ساز بکەین، بۆیە دەڵێم هەی رۆ هەی رۆ عاشقی دنیای مۆزیك و داهێنان رۆ.

## ڕیپۆرتاژ

خراپی ئابووری (شنرویٚ)ی دوورخستۆتەوە

سابات – سەروەر محەمەد

هەرچەنـده تیپـی مۆسـیقای شـنرویٚ سـالانێکی زۆرە کاردەکـات و وەک سەرپەرشتیارەکەشـی دەڵێـت: لـە ئێسـتادا خراپـی بـاری ئابووریـیـان دووری خستوونەتەوە، بەڵام بەڵێنی دانەبڕان بە هەوادارانیان دەدەن.

تیپی مۆسیقای شنرویٚ، یەکێکە لە تیپە دێرینە ناودارەکانی کوردستان و لـە ساڵی ١٩٧٣دا لەسەر دەستی چەند لاوێک لە هەڵەبجە دامەزراوە.

ئازاد ساڵح سەرپەرشتیاری تیپی مۆسیقای شنرویٚ، ئاماژە بەوە دەکات یەکەم ئەندامی تیپەکەیان مستەفا کەمال بووە کە ئێستا دانیشتووی شاری هەولێرە و دواتر چەند هونەرمەندێکی تر هاتوونەتە تیپەکەیانەوە، لە لێدوانێکدا بۆ سابات وتی: (ئێمە کە تیپەکەمان دامەزراند بیرمان لەوە نەکردبۆوە خزمەتی گەلی کورد بکەین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خزمەتمان کرد) لەساڵانی رابردوودا و غەریبی و دەردەسەری شارەکەیان تیپی شنرویێ دانەبڕی لەکاری هونەری بەڵام ماوەیەکە شنرویٚ بێ بەرهەمە، سەرپەرشتیارەکەشی هۆکارەکەی بۆ خراپی باری ئابووری تیپەکەیان و هان نەدانیان گەڕاندەوە. وتی (ئەمڕۆ بەگشتی هونەر لە قەیراندایە، ئیمەش بەشێکین لەو قەیرانە) بەڵام باسی لەوە کرد : کە بەنیازن لەم ماوەیەدا لە چەند بەرنامەیەکی تەلەفیزیۆنیدا دەربکەونەوە.

سەرپەرشتیاری تیپەکە بۆ سابات وتی (ساڵی ١٩٩٧ چووین بۆ هەڵەبجە لەگەڵ سابیر کوردستانی، برادەرێکمان لەگەڵ بوو ، پێڵاوەکەی کاک سابیر شاردەوە، ئینجا نزیکەی پەنجا پێڵاوی لێبوو، کاک سابیر هەر دەستی بەسەر پێڵاودا ئەهێنا و ئەیوت ئەمە نییە، دواجار دەستی بۆ پێڵاوێک برد و وتی ئەمەیە، وتمان چۆن دەزانیت؟ وتی بە گوڵەکەی دەیناسمەوە.

تێبینی/ ئەم ریپۆتاژە لە رۆژنامەی رۆژنامە ژمارە ٦٤٦ لە رۆژی سێشەمە ٩-٨-٢٠١١ بڵاوکراوەتەوە.

## چاوپێکەوتن

هونەرمەند ئازاد صاڵح :

وەک هونەرمەند هێندەی بۆم کرابێت بەشداریم کردووە لە ڕەوتی هونەری مۆسیقا

دیداری / موحسین یاسین

مۆسیقا وەکو خۆراکی گیان وایەو مێشکی مرۆڤ ئارام دەکات و دڵی مرۆڤیش شاد دەکات.

هونەرمەند (ئازاد صاڵح) کەمانچە ژەنی دەستڕەنگین و داهێنەر، هاوڕێی گیانی بەگیانی هەمیشەیی هونەری مۆسیقای کوردی و ئامێری کەمانچە، لەدیمانەیەکی هونەریدا بەم شێوەیە وەڵامی چەند پرسیارێکی داینەوە:

- چۆن پێناسەی خۆت دەکەیت؟

دەڵێم من باوەڕم بە بەها مرۆییەکانی مرۆڤ هەیە کە دەبێت هەر هەموو ژیانێکی شایستە بە حەزوئارەزووەکانیان دابین بکەن، وەک هونەرمەندیش هێندەی بۆم کرابێت بەشداریم کردووە لەرەوتی هونەری مۆسیقاداو زانستیانە لەبوارە جیاجیاکاندا هەر لە ژەنین و ئاوازدانان و باری تیۆرییەوە تەنانەت نوسینەوەش لەلایەن ستاتیکیەکەوە دەڕوانمە ئەم هونەرە مەزنە.

- گۆرانی بێژی ئەمڕۆ چۆن هەڵدەسەنگێنیت؟

لەمۆسیقای رۆژهەڵاتدا گۆرانی بێژ لایەنێکی سەرەکی هونەری مۆسیقایە، تەنانەت لە کوردییدا کە باس لە مۆسیقا دەکرێت دەوترێت (گۆرانی و مۆسیقا) کە پەیوەندییەکی جەدەلی لەنێوانیاندا هەیەو تەواوکەری یەکترن.

گۆرانی بێژی شیاویش بەچەند خاڵێک هەڵدەسەنگێنرێت لەوانە تۆنی قورگی جوانکاری تێدابێت، لەرینەوەی دەنگ، هەناسە درێژی، شارەزایی لە لایەنە جیاوازەکانی وتن هەبێت واتە (اداء)ی چاک بێت، شارەزایی لە نۆتە خوێندنەوە، هەرچەندە ئەمە لای ئێمە دەگمەنە، گۆیندە (مقامات) لێکجیابکاتەوە، لەم گۆیندە بۆ ئەو ئاڵوگۆڕ بکات، لەگەڵ ئیقاعدا بگونجێت، زۆر وردەکاری تر، کە دەچێتە بواری تیۆری مۆسیقاوە.

**- وەک هونەرمەندێکی مۆسیقاژەن تێڕوانینت چییە بەرامبەر بەو تازەگەرییەی ئەمڕۆ کە لە مۆسیقادا بەرچاو دەکەوێت؟**

هونەر وەک هەموو لایەنەکانی تری ژیان لەگۆڕاندایە وە (جوڵە) واتە گۆڕان لە هەموو ئاستەکانی ژیان دەماودەم دەگۆڕێت، تەنانەت لە خودی خانەکانی مرۆڤدا لە چرکەیەکدا بە ملیۆنان خانە لەناو دەچێت، لە جێگای خانەی نوێ دروست دەبێتەوە، تەنانەت ئەو رووبارەی کە پیایدا دەپەڕیتەوە هەر هەمان رووبار نییە کە دووەمجار دەپەڕیتەوە، چونکە ئاوەکەی هەمان ئاو نییە، ئەی دەبێت چۆن هونەر لەگۆڕاندا نەبێت کە جوانترین دەربڕینە لە هەست و نەستی مرۆڤ، بەڵام بە مەرجێک پشت بە زانستی مۆسیقاو لایەنە جیاجیاکانی ببەستێت، ناوەڕۆک وەک خۆی، بەڵکو دەبێت گۆڕانکاری لەسەرجەم بونیادەکەدا بێت، بەهەموو شێوەو دەربڕینەکانیەوە، ئەو کاتە روانینم گەشبینە بەرامبەری، چونکە ئەوەی کە کلتوورە پیرۆز نییە، بەڵکو دەبێت گۆڕانکاری بەسەردابێت.

**- تیپی مۆسیقای شنروێ لای تۆ چی دەگەیەنێت؟**

یەکێکە لەو تیپانەی کە هەوڵ دەدات کاری جوان پێشکەش بکات و رۆژانە لەگەڵ ئاڵوگۆڕەکاندا دەژین لەبواری هونەردا، بەڵام بە پێی تواناو بواری لەبار.

منیش وەک دامەزرێنەری ئەو تیپە لەگەڵ چەندانی تر کە لە منداڵییەوە لەگەڵیدا ئاشنابووم و هێندەی کرابێت درێغیم نەکردووە لە دڵسۆزیم بۆی.

ژمارە (٢٢) دووشەممە ٢٨ی شوباتی 2000 — پارێزگاران — 8

هونەرمەند ئازاد صالح :

## وەك هونەرمەند هێندەی بۆم کرابێت بەشداریم کردووە لەڕەوتی هونەری مۆسیقا

دیدار/ محسن یاسین

مۆسیقا وەکو خۆراکی گیان وایەو مێشکی مرۆڤ ئارام دەکاتو دڵی مرۆڤیش شاد دەکات... هونەرمەند (ئازاد صالح)ی کەمانچە ژەنی دەست رەنگینو داهێنەر، هاوڕێی گیانی بەگیانی هەمیشەیی هونەری مۆسیقای کوردیو ئامێری کەمانچە، لەدیمانەیەکی هونەریدا بەم شێوەیە وەڵامی چەند پرسیارێکی داینەوە.

*چۆن پێناسەی خۆت دەکەیت؟*

-دەڵێم من باوەڕم بە بەها مرۆییەکانی مرۆڤ هەیە کە دەبێ هەر هەموو ژیانێکی شایستە بەحەزو ئارەزووەکانیان دابین بکەن، وەك هونەرمەندیش هێندەی بۆم کرابێت



بەشداریم کردووە لەڕەوتی هونەری مۆسیقاداو زانستیانە لە بوارە جیاجیاکانیدا هەر لەژەنینو ئاواز دانانو باری تیۆرییەوەو تەنانەت نووسینەوەش لەلایەنە ستاتیکیەکەوە دەڕوانمە ئەم هونەرە مەزنە.

*گۆرانی بێژی ئەمڕۆ چۆن هەڵدەسەنگێنیت؟*

-لە مۆسیقای رۆژهەڵات دا گۆرانی بێژ لایەنێکی سەرەکی هونەری مۆسیقایە، تەنانەت لە کوردیدا کەباس لە مۆسیقا دەکرێت دەووترێت (گۆرانی و مۆسیقا) کە پەیوەندییەکی جەدەلی لە نێوانیاندا هەیەو تەواوکەری یەکترن.

گۆرانی بێژی شیاویش بەچەند خاڵێك هەڵدەسەنگێنرێت لەوانە.. تۆنی قورگی جوانکاری تێدابێت.. لەرینەوەی دەنگ.. هەناسە درێژی.. شارەزایی لەلایەنە جیاوازەکانی ووتن هەبێت وانە (اداء) ی چاك بێت شارەزایی لەنۆتە خوێندنەوە. هەرچەندە ئەمە لای ئێمە دەکمە.. گۆیندە (مقامات) لێك جیابکاتەوەو لەم گۆیندە بۆ ئەو ئاڵوگۆڕبکات.. لەگەڵ ئیقاعدا بگونجێتو.. زۆر وورده‌کاری تر کەدەچێتە بواری تیۆری مۆسیقاوە

*وەك هونەرمەندێکی مۆسیقا ژەن تێروانینت چییە بەرامبەر بەو تازەگەرییەی ئەمڕۆ کە لەمۆسیقادا بەرچاو دەکەوێ؟*

-هونەر وەك هەموو لایەنەکانی تری ژیان لەگۆڕاندایە وە (جووڵە) واتە گۆڕان لەهەموو ئاستەکانی ژیان دەماودەم دەگۆڕێت تەنانەت لەخودی خانەکانی مرۆڤدا لە چرکەیەکدا بە ملیۆنان خانە لەناودەچێتو لەجێگای خانەی نوێ دروست دەبێتەوە، تەنانەت ئەو رووبارەی کە پیایدا دەپەڕیتەوە هەر هەمان رووبار نیە کەدووەم جار دەپەڕیتەوە چونکە ئاوەکەی هەمان ئاو نییە، ئەی دەبێت چۆن هونەر لەگۆڕاندا نەبێت کە جوانترین دەربڕینە لەهەستو نەستی مرۆڤ، بەڵام بەمەرجێك پشت بەزانستی مۆسیقاو لایەنە جیاجیاکانی ببەستێت نەك هەر شێوە بگۆڕێتو

بۆ ل٧

هونەرمەند (ئاثار الحکیم): کاری هونەری لەوانەیە سوود یاخود زیان بە مرۆڤ بگەیەنێ

دەسەڵاتدارانی هەولێر بەرپرس لەتەشەنەکردنی تیرۆرو تۆقاند...

کلۆڵۆز بۆ وازهێنان

## لێدوان لە ریپۆرتاژێکی رۆژنامەوانیدا لەسەر ڤیستیڤاڵی موزیکی کوردی:

سازدانی ئەم جۆرە ڤیستیڤاڵانە بە شێوەیەکی بەردەوام و ساڵانە، یاخود هەموو وەرزێک سازبکرێت کارێکی زۆرباشە، چونکە گوڕ و تین دەدا بە هونەری ئەکادیمی کوردی، ئەو بەرهەمانەی کە بینیتان لە ١٠ رۆژدا لەدایک بووە، راستە ئێمە وەک دارایی یارمەتی دراوین، بەڵام ئەو هاندەرە مەعنەویەمان نەبووە، هیوادارم ئەو هاندانە مەعنەوییە لەمەودوا بچێتە پاڵ هاندانە داراییەکە تاوەکو کاری جوانتر و پاکتر بەرهەم بهێنین ولەئەنجامدا بگەینە ئاستێکی باڵای جیهانی.

7 — پارێزگاران — ...ە ٢٨ی شوباتی 2000

**گۆشەی چاوپێکەوتن**

**بەڕێز (بەکر مستەفا محیەدین) سەرۆکی یەکێتی باڵەی کوردستان**

**ئاگاداریەک لە یەکێتی باڵەی کوردستان**

(یەکێتی ناوەندی تۆپی باڵەی کوردستان ئاگاداری سەرجەم یانەو بنکە وەرزشییەکانی کوردستان دەکات کە سەعات ٢ی پاش نیوەڕۆی ...

### هونەرمەند ئازاد ساڵح ..... پاشماوە

ناوەرۆک وەك خۆی، بەڵکو دەبێت گۆڕانکاری لەسەرجەم بونیادەکە دابێت بەهەموو شێوە دەربڕینەکانەوە.. ئەو کاتە روانینم گەش بینە بەرامبەری چونکە ئەوەی کە کلتوورە پیرۆز نیە، بەڵکو دەبێت گۆڕانکاری بەسەردابێت.

*تیپی مۆسیقای شنرویَ لای تۆ چی دەگەیەنێت؟*

-یەکێکە لەو تیپانەی کە هەوڵ دەدات کاری جوان پێشکەش بکاتو رۆژانە لەگەڵ ئاڵوگۆڕەکاندا دەژین لەبواری هونەردا بەپێی تواناوە بواری لەبار.

منیش وەك تاك دامەزرێنەری ئەو تیپەم لەگەڵ چەندانی تر کەلەمنداڵیەوە لەگەڵیدا ئاشنا بوومو هێندەی کرابێت درێغیم نەکردووە لەدڵسۆزیم بۆی.

### لە یادی .... پاشماوە

وە هەروەها توانیویەتی زۆربەی شیعرەکانی لە رۆژنامەکانی (ژینو دەنگی گێتی تازەو گۆڤاری گەلاوێژی ئەو سەردەمەدا بڵاو بکاتەوە. بەڵام بەداخەوە ئەم هەموو بەرهەمە بەنرخو بەپێزەی کەلەبواری دڵداریدا پێشکەش نەتەوەکەی کرد لەرۆژی ١٩٩٤/٢/٢٦ داو بۆ یەکجاری لە شاری

### بەڕێز هەڵو رواندزی ... پاشماوە

عیراق بەگشتیو هتد. پرۆگرامەکانی پەخش بکرێ. بۆیە بەم بۆنەیەوە بەڕێوەبەرایەتی رادیۆی پارێزگاران بەڵێنی خەباتی بەردەوام و پێشکەوتنێکی بێ ووچان دەدات بۆ خزمەتکردنی زیاتری چینو توێژەکانی کۆمەڵگاکەمان. سڵاو لەو کارمەندانەی کە نەیانتوانیوە بگەنە سلێمانیو لەهەولێر گەمارۆدران. سڵاو لەو کارمەندانەی کە دامەزرێنەری رادیۆی پارێزگاران بوون، سڵاوو وەفا بۆ ئەو کارمەندانەی کەلەشاری سلێمانی بە پیرمان وەهاتن.

سڵاو لەیەکەم رۆژی پەخشی دەنگی سەربەخۆیی لە شاری هەولێر.

### بەڕێز محەمەد کەساس ..... پاشماوە

گۆمەڵگاو مرۆڤایەتیدا، لەفەرەنساو بەریتانیاو هۆڵەندا دەیان رێکخراوو گروپی رۆشنبیری هەن کە هەریەکەیان بەجۆرێك لە جۆرەکانی خزمەت بەبوارە رۆشنبیریو کەلتووریەکەی خۆیان دەکەن وباشترین بەرهەمیش لەلایەن هەموویانەوە پێشوازی گەرمی لێ دەکرێت (دوور لە جیاوازی فکری).

ئێستاش کە (یانەی قەڵەم) بەهەوڵ وماندووبوونی چەند نووسەرو

٤) پرۆگرامـــی
ـهـمی تیپـی
ره میللیـەکانی
ستیپێکرد کـه
ێکهاتبوون له:
(خۆشەویـستم)
ڕەنجـەرۆ) وتـنی

(مەمرەنجێنـــه)
ڕەنجـەرۆ) وتـنی
).
ی (بێنـــه دڵ)
ڕەنجـەرۆ) وتـنی

جەلال سەعید)
ی فیسـتیڤاڵەکه
سیاری (داخـــۆ
یڤاڵی لـەمجۆره
سیّ بۆ هونەری
ردی؟) وتـــی:
م فیـــستیڤاڵی
بـه بەشـتێکی
که لەژێر سایەی
سەرکەوتنەکاندا
بەبۆنـەی ئـەو
ه یەك کۆمەڵ
ان کۆبونەتـەوه
ی کوردستانەوه
سادەبوون، ئیـتر
لـــەناو ئـــەو
یبەرزی سـەیری
که بـەچاوی
هاندەری ئـەو
ەرەو پێشـــمان
ن هونەرەکەی
ه پاڵ هونـەری

سەرۆکی تیپی

ـــــەرەتادا
ەکـەم لـەم
سوڕاوانی ئـەم
ــه توانیـــان
ۆر بگەنـە ئـەو
ەمـوو گرووپـه
کوردستـانەوه
خزمـەت بـەو
ری گۆرانـی و
دەتـوانم بڵێم
دەیـــەکی زۆر
ت، هیـوادارم
ێك ئـــەمجۆره
از بکرێــت و
ەفیـستیڤاڵی
، چونکه ئێمه
زۆر پشـتگوێ
بـــۆ ئێمــه
و سـەرچاوەی
ردییه.
ای سـەنتەری

نیا بو بـەهار)
ەد).
اوین نزانن)
م زاخۆیی).
ەلیێ زیـلان)
د).
یکیێ) وتـنی

فیستیڤالەکە لەلایەن یەکێتی هونەرمەندانی کوردستانەوە جێگەی بایەخ و ڕێزلێنانە.

**تیپە بەشدار بووەکانی دووەمین فیستیڤاڵی کوردی پێك هاتووە لە:**

***لەسلێمانی:** تیپی موزیکی سلێمانی، کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان، مەڵبەندی گشتی، تیپی موزیکی مەولەوی، گرووپی سەمەند، تیپی موزیکـــی شنرویّ.

***لەهەولێر :** تیپی مۆزیکای هونەرە میللییەکانی هەولێر، گرووپی نالی.

***لەدهۆك:** تیپی موزیکی شوورەشڤان، تیپی موزیکی سۆلاڤ..

***لەزاخۆ:** تیپی مۆزیکای سەنتەری گەنجان.

***لەدەربەندیخان:** تیپی مۆزیکای دەربەندیخان.

***لەرواندزو سۆران :** تیپی مۆزیکای شاکار.

***لەشارەزوور:** تیپی مۆزیکای شارەزوور.

***لەکۆیە:** تیپی مۆزیکای باواجی، تیپی موزیکیی گەنجان.

ئازاد سالح

سەلاح ڕەووف

عەبدوڵلا زێڕین

مستەفا ڕەنجەڕۆ

وریا ئەحمەد

جەلال سەعید

بەستراوەتەوە بەهونەرو مۆسیقای ئەو میللەتەوە، سازدانی ئەمجۆرە فیستیڤالانە ئەوە دیاری دەکات کە بایەخێکی گرنگ دراوە بەهونەرو شارستانیەت، من لەو بڕوایەدام سازدانی ئەمجۆرە فیستیڤالانە دەبێتە هاندەرێکی گرنگ بۆ بەرەو پێشەوەچوونی هونەرو بەرزکردنەوەی ڕۆڵی هونەر لەناو گەلی کوردستاندا.

*عەبدوڵلا زێڕین-هونەرمەند:*

*ئاستی بەرهەمە بەشداربووکان چۆن هەڵدەسەنگێنن؟

-من ناتوانم بڵێم ١٠٠٪ بەرهەمە بەشداربووەکان سەرکەوتوو بوون، بەڵکو دەکرێت بڵێین لە٩٠٪ سەرکەوتوو بووە، تیپ هەبوو زۆر باش بوو، تیپ هەبوو مامناوەندی بوو.

*تیپی مۆسیقای شنرویّ:*

١-گۆرانی (سیّ چریکەو سۆزێکی شارەزوور) وتنی (کۆرس).

٢-گۆرانی (وێسگەی ژیان) هۆنراوەی (ئەحمەد محەمەد) ئاوازو وتنی (ئەکرەم حەمە ڕەشید).

٣-گۆرانی (باخی ژین) وتنی (ئازاد کەریم).

٤-گۆرانی (کزەی شەماڵ) وتنی (بەهرۆز بەڵخەیی).

*ئازاد سالح-سەرۆکی تیپی شنرویّ:*

-سازدانی ئەمجۆرە فیستیڤالانە بەشێوەیەکی بەردەوام و ساڵانە یاخود هەموو وەرزێك سازبکرێت کارێکی زۆرباشە، چونکە گرێتین دەدا بەهونەری ئەکادیمی کوردی، ئەو بەرهەمانەی کە بینیتان لە(١٠)ڕۆژدا لەدایکبووە، ڕاستە ئێمە وەك دارایی یارمەتی دراوین، بەڵام ئەو هاندەرە مەعنەویەمان نەبووە، هیوادارم ئەو هاندانە مەعنەویە لەمەودوا بچێتە پاڵ هاندانە داراییەکە تاکو کاری جوانترو پاکتر بەرهەمبهێنن و لەئەنجامدا بگەینە ئاستێکی باڵای جیهانی.

**ڕۆژی دووەم:**

٢-گۆرانی (پەری شێوە) هۆنراوەی (گۆران عەباس) ئاوازی (کامەران محەمەد) وتنی (دانا مستەفا).

٣-گۆرانی (یاد) هۆنراوەی (فۆلکلۆر) مۆسیقاو دابەشکردنی (نیاز نوری) ئاوازو وتنی (ئیسماعیل سابوری).

فیستیڤاڵی ئەمجۆرە ...
شـارەزایی گۆڕینـەوە ل
ئەندامانی گرووپە موزی
چونکە کاری ڕەسەن درو
لەوانـە، کـاری هونـەر بە
بـەهرەش دەبێـت لـەدا
ئەوە نییە تۆ بەزۆر شت
بکـەیت، بـەڵام دیاردەیـ
جوانــە، دیاردەیـەکی
ڕاگۆڕینـەوەو یـەکتر بین
برادەرایەتی دروستکردن
کە دووەمین ڕۆژی فیستی

هـەر تیپـەو بەشێوازی
هەڵسـەنگێنرێت تـاکو
مەغدوور نەکرێت، دیارە
کە لەناو شاری سلێمانیەو
بـواری ئـەوەی هەیـ
بەئـەندامێکی زۆرەوە بێ
بەراهێنانێکی جوانـەوە..
لـەماڵی خۆیدایـە، مـ
کارانەی تیپی کۆمەڵـەی
جوانەکانم بەجوان بینی چ
مۆزیك ژەنەوە، چ لەرووی
کـە سیّ کچ لـەناو گرووپە
دانیشـتبوو کـە دەبیّ ه
بەراسـتی هـەر کـوڕ نـ
هەروەها بەرهەمـەکان ئا
بـەرزو جوانـی هـەبوو، هـ
دەنگی هونەرمـەند (ئیس
سابوری) بـیّ شـك دەنگ
شیرینەو دەنگێکی ڕەسەنە.
*سەلاح ڕەئووف-مۆزیکار:*
بـەڕای مـن ئـەنجامدان
جۆرە فیستیڤالانە کارێکی
بـەڵام زیـاتر دەبێـت دیر
بکرێـت، کـیّ بەشـداری
دەکات، بەچی بەشداری د

## حەسرەتێک بۆ گیانی هاوڕێی هونەرمەند سابیر کوردستانی

نـازانم چـۆن وەک دەنکـە زیخـی نـاوی کانیـاوی خـەیاڵم کۆبکەمـەوەو وەک ملوانکە بیهۆنمەوەو بیکەمە مل و گەردنی دەنگ و ئاوازەکانت، تۆ ئەی نەوڕەس و عەنـدەلیبی هەناسـەی شـەتاوی کـەرکوک، قـەتاری کـاروانی مـەقامی خاوکـەرو ئەڵاوەیسی و ئای ئای و هیجران و گەڕەکەکانی رەحیم ئاواو ئیمام قاسـم و تەپە، دەشـتی لـەلایلان و کـاکی بـەکاکی گـەرمیان، تـۆ هــەر لەتەمــەنی مێردمنـاڵی و هەرزەکارییەوە گۆشکراوی، سەداو دەنگی عەلی مەردان و سەلاح داودەو حسێن عەلی و چەندینی تر بوویت بەو کلتوورە دەوڵەمەندە بوویت، خۆڕسکانە فێری هـەموو وەزن و مـەقامێک بوویت، لـە تـولانی هـەتا کـورتی بەچریکـەی دەنگت و ئاشـنابوون، هەسـتی داهێنەرانـەت تێدا خولْقا بـە لەدەسـتدانی بینایت هێندەی تـر رۆچویتـە نـاو قـوڵایی نـاخی خۆتـەوە، هـەموو جوانییـەکانت لـە ئـاوازو شـیعرو گوێگرتنەوە لە مێژوودا نمونەی ئەو داهێنەرانە زۆرە هەر لە ئەبوعەلای موعەڕی و تەها حسێن و دکتۆر کامیل بەصیر ، ئەوان لـەبواری شـیعر و ئـەدەب، تـۆش لـی ژیانتـا دەسـت گیرۆیـت بکرایـە کـەمتر نەئـەبوویت لەگـەورە ئاوازدانـەری نابینـای میسـری عمارالشـریعی، چونکـە هــەر لــەو کاتــەوە رێگــای بەغـدات گرتەبــەرو بەرەوئیزگـەی کـوردی بەغـدا رۆشـتیت و بـە مـەقامبێژی گـەورە عـەلی مـەردان ئاشنابوویت و چەند گۆرانییەکت تۆمارکرد، وەهەمیشە خولیـای ئـەوە بوویت کـە خـۆت داهێنـەری ئـاوازو شـیعرەکانت بیت و هەرواشـت کـرد و لاسـایی کـەرەوە نەبیت و خۆت بیت لەناخی خۆتدا و تابوویتە قوتابخانەیەکی هونـەری بـۆ خـۆت و هەرواشـت کـرد، تـۆ (نـە حـەرفی مەکتـەبێکت خوێنـدو نـە ئوسـتادێ پـەلی گرتـی، صیرف بەرزی زەکا ئەم سنعەتەی فێرکرد بـە عـود و شمشـاڵت)، هـەر ئاوازێکت، شیعرێکت رەنگدانەوەی چیرۆکێکی راستەقینەی لە پشتەوەیە.

ئەمیرە، بەڵێن بێ ئیتر، غەریبم، و چەندینی تر، نابینایت هێندەی تـر ئاوازەکـانی جوانتر کردبوویت، هەر لەسەرەتای حەفتاکانەوە نازناوی کوردستانیت هەڵبژارد و تا ئێستاش کەس نازانێت ناوی راستەقینەی باوکت چییە؟ بەخۆشـمەوە هـەموو وا ئەزانین کوردستان ناوی باوکتـە، هێندە هەسـتی نەتەوایـەتیت تێدا بەرجەسـتە بووبـوو لەکـەرکوکی تـەعریب و تـەبعیس کـراودا بـەم هەسـتە جوانـەت چەنـدین

ئـاوازو مـەقام و شـیعرت داهێنـا، وە کـاری ئەفرانـدن لـە ناختـا چەکـەرەی کـرد، بەداخـەوە هـاوڕێ ونبـوو و لەدەسـتچووم، هێشـتا زوو بـوو بـۆ ئـەوەی ئـەم پـەتا نەگریسە جیهانییە (کۆرۆنا) زەفـەر بـە هەناسـەت بـەرێت و سـیەکانت و جەسـتەو رۆحت بخاتە ژێر گڵ و دەرگای کراوەی ژیانت کلۆم بکات بۆ ئەبەد سەر بنێیتەوە، چونکە کە یەکترمان ئەدی ئەتگوت کە چەندین ئاوازو شیعری نـوێم لایـەو توانـای تۆمـارکردنیم نییـەو ئاواتـە خوازبوویت کـە ئـاوازە کۆنـەکانت بـە شـێوازی نـوێ تۆماربکەیتەوە بە موزیک و ئامادەکردنێکی پڕاوپڕ لە کوالێتی و تازەگەری، بـەڵام بەداخەوە مردن کە لە حەتمیەت حەتمیـەتترە لـە نـەبوون نـەبوونترە، چ قـەدەرێکی ئەو تەلیسمەی کە دەستەواژەو مانای ژیان دەگەیەنێتە خاڵی سفر بوون و کۆتایی هەموو ئاواتەکانی فەنا کرد، وەک فەنابوونی هەموو فەناکانی تر، چونکە لە ژیانـدا هەموو شتەکان لەدونیا ماندوو بوونە، تەنها مردن نەبێت کە کۆتایی هەموو هیوا و ئومێد و تەنانەت ئازارەکانیشە، تۆ کەسێک بوویت لەوانەی کە ژیانت بـەو هـەموو ناهــەمواری و نەهامــەتی و داچــوون و هەڵچوونــەوە، ژیانــت خــۆش ئەویســت، هەمیشە شیک و پاک و خاوێن و لەسەرخۆ و دەم بەخەندەو قسەی خۆش و گەمە و سـوعبەت و کـۆڕی دانیشـتنی هـاوڕێ و دۆسـتان، ژیانـت خـۆش ئەویسـت بـۆ ئەوەی بزانیت چۆن دەمریت، لەوانەشە مردن وەک ژیان وابێت کێ ئـەزانێت؟ خـۆ کەس لەودنیا نەهاتۆتـەوە تـا بزانێت دۆزەخ یـان بەهەشـت چۆنـە؟ ئایـا بوونـەوەر وەک کۆمپیوتەرێک وایە کە کوژایەوە ئیتر بێگیان ئـەبێت؟ یـان کـە مـردین رۆح لـە جەستە جیادەبێتـەوەو دەڕوات بـۆ ئاسـمان؟ ئەمانـە هـەمووی پرسـیاری سـەختی وجودین لەوەتەی مرۆڤ فامی کردۆتەوە و چەندین ئاینی زەمینی و ئاسمانی هەر لـە بـودی و زەردەشـتی و یـەهودی و کریسـتان و بـە ئیسلامیشـەوە کـە کۆتـایی ئاینەکانە .. هاوڕێی لەدەستچووم هەرچەند مردن دوورت بخاتەوە لێمان، هێندەی دووری هەسـارەکانی ئاسـمان، بـەڵام هەمیشـە بـە زینـدوویی لـە یادەوەریمـان بەرجەسـتەیت، لـە منداڵانی خەیاڵمانـدا دەیـان چیرۆکـی دابـڕان هەیـە کـە ئێـواران لەیادماندایـەو تـا درەنگـانی شـەو ئەیانلاوێنینـەوەو بـۆ ئـەوەی ئـازار نـەیکوژێت، چونکـە ژیـان خەونێکـە مـردن ئاگادارمـان ئەکاتـەوە لێـی، کاتێـک نـەزانین ژیـان چ مانایـەکی هـەیە بـۆچ هـەین؟ کەواتـە بـۆ دروسـتبووین؟ ئـەی دوای مـردن چیمـان لێدێت؟ جارێکی تر ئەبینەوە بە شێوازێکی جیاوازتر؟!

ئەمانە هەمووی پرسیاری ئەزەلی مرۆڤە تا هەنوکەش بەوەڵامی هەموو ئاینەکانەوە گومان و پرسیار هەیە و بەچۆنی ئەوان حەقیقەتن، زانستیش بەم هەموو پێشکەوتنەوە بە بیردۆزی تەقینەوەی مەزنیش دەستەووەستانە لە ئاست حەقیقەتی رەها کەواتە ئێمە هەموو بەستەزمانین بەرامبەر بە گەردوونی مەزن و لێکدانەوەی زانستیش، تەنانەت ئەم نەخۆشییە نەگریسە کە گەردوونییەگیانی هەزاران کەسی کردۆتە قوربانی ڤایرۆسێکی نەگریس، هەر زانستە بتوانێت بەری پێبگرێت و لەناوی بەرێت، بۆیە هەموو لەم خەونە خۆش و ناخۆشانەی ژیان نەزان و سەرگەردانین، هەرکەس بەجۆرێک، تۆ بە هونەرەکەت هزرو هەستت سەرقاڵ بوو، چالاکییەکی جوانی ستاتیکایە خۆت سەرقاڵ کردبوو، ئاوێزانی هەست و گیانت بوو، تا دەنگ و سەدات نەمر بێت وەک چۆلەکەی پاساری و کۆترە شینکە بە ئاسمانی هەستماندا باڵەفڕکێ بات و ناخ هەژێن بێت، نەوە دوای نەوە نەمر بێت، زۆر ماوە بیڵێم بەڵام ئەفسوس ئەوە قەدەری هەموومانە.

گیان ورۆحت شاد ـ ٢٠٢٠ سلێمانی

## حەسرەتێک بۆ گیانی هاوڕێی هونەرمەند سابیر کوردستانی

**ئازاد صالح**

نازانم چۆن وەک دەنکە زیخی ناو کانیاوی خەیاڵم کۆکەمەوە و وەک ملوانکەو بیهۆنمەوە و بیکەمە مل و گەردنی دەنگ و ئاوازەکانت .تۆ ئەی نەورەس و عەندەلیبی هەناسە ی شەتاوی کەرکوک، قەتاری کاروانی مەقامی خاوکەرو اللە وە یس ی و ئای ئای و هیجران و گەڕەکەکانی

رە حیم ئاواو ئیمام قاسم وتە پە ، دەشتی لەیلان و کاکی بە کاکی گەرمیان .تۆ ..هە ر لە تەمەنی مێرد منالّی و هە رزەکاریەوە گۆش کراوی سە داو دەنگی عەلی مەردان و سەلاح داودەو حسین عە لی چەندینی تر بوویت بەو کلتووورە دەوڵە مەندە بوویت .خۆڕسکانە فێری هە موو وەزن و مەقامێک بوویت لە توولانی هەتا کوورتی بە چریکە دەنگت و ئاشنا بوون .هەستی داهینەرانەت تیدا خولّقاو بە لەدەست دانی بیینایت هێندەی تر ڕۆ چویتە ناو قووڵایی ناخی خۆتەوە هە موو جوانیەکانت لە ئاوازو شیعرو گوێگرتنەوە لە میژوودا نمونەی ئە و داهێنەرانە زۆرە هەر لەئەبو علا المعری و تەها حسین و د.کامل البصیر ئە وان لە بواری شیعرو ئەدەب





دایکم  بەدریە میرزا حسەین بانەیی، لەدایکبووی ساڵی (١٩٣٨)
ئەو دایکەی لیرەیەکی خۆی بۆ فرۆشتم بۆ کڕینی یەکەمین کەمانچە



**ساڵی (١٩٦٠) . لەگەڵ خاڵە حەمە عەلی**



**ساڵی (١٩٩٦٠) ماڵی دایە گەورەم لە گەڕەکی جولەکەکان لە هەڵەبجە**

**ئەوەی بە پێوە وەستاوە دایە گەورەم (فاتمە ئەحمەد سنەیی). لە راستەوە .ئازاد، کاوە، دایکم بەدریە میرزا حسین بانەیی، منالەکەی باوەشی بەیانی خوشکم. سەرگوڵی پورە فەخریم. پورە فەخریە منالەکەی باوەشی سەرنج، سروە، پورە نەجیبەم، ڕوناکی کچی ئەوانەی لە خوارەوە دانیشتون .تەلعەتی پورە نەجیبە و دڵنیایە**



لەراستەوە: خاڵە مەجید، ئازاد، کاوە



مامۆستایان و کارمەندانی قوتابخانەی (الانتصار) ساڵانی شەستەکان کە وانەیان پێ وتوم
لە راستەوە: شێخ عومەر، عەفان نەقشبەندی، زاهیر ئەفەندی، بەڕێوەبەر، ئەحمەد محمود، بیرم نەماوە،
نوری محمد محمود، شێخ ئەکرەم، عبدالله سوور. کارگوزاران: ئەحمەد، عبدالله، محمد



سەیرانی قوتابیانی پۆلی چوارەمی گشتی بۆ سەرچنار مانگی ١٩٧٢/٤/١٣

لە ڕاستەوە: عوسمان محمد سید ئەحمەد.عومەر خورماڵی .ئازاد محمود سەراج.فەوزی ڕەشید.عوسمان مەلا محمد .ئەفراسیاب ئیبراهیم .نەوزاد حاجی ئەمین.عوسمان .هێمن عبدالقادر .ابراهیم عەلی میرزا، فؤاد عوسمان . ئازاد سالەح



سەیرانی ئەحمەد ئاوا مانگی چواری ١٩٧٢ قوتابیانی پۆلی چواری گشتی

لە ڕاستەوە، ئەوانەی بە پێوەن: عومەر کامل،ئەفراسیاب ئیبراهیم،سەرکۆ ئەحمەد،دواوە: کۆزاد محمد نانەوا دانیشتوەکان: نەوزاد جاجی ئەمین،ئیبراهیم عەلی میرزا، عومەر خورماڵی، هێمن عبدالقادر، فؤاد عوسمان، عوسمان عەلی شین .ئازاد سالح



مینەی لولک ژەن .عبدالله سعید جەواهیر ساڵانی شەستەکان



بەغدا - باب المعظم - چێشتخانەی دارالطلبة ، ساڵی ١٩٧٥

لەراستەوە : بەکر کۆلیجی ئاداب - ئینگلیزی، سەرکۆ ئەحمەد پەروەردە – مێژوو، ئازاد سالح - ئابووری و بەڕێوەبردن



تەفتەڤانی  عەنەب ١٩٧٧/١١/٣ کاتی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەی هاوکاری
لەڕاستەوە: ئازاد سالّح ، هێرش محمد ئەمین ،مینەی لولک ژەن  ،ئەحمەد ڕەشید



ساڵی (١٩٧٩) لە ڕاستەوە: ئازاد ساڵەح،هەلکەوت محمد، ڕزگار فەرەج. دواوە: ئەحمەد عەلی، محمد ئەحمەد کارەبا



سالّی (١٩٧٩) لەڕاستەوە: ئازاد، هەڵكەوت، ڕزگار



لەڕاستەوە: بەهمەن ئەحمەد، عومەر حەمە ڕەحیم، ئیسماعیل سعید، ئومێد نوری، ئازاد ساڵح، هەڵكەوت محمد، ڕزگار فەرەج
كۆرسەكان لە ڕاستەوە: فائق، بەختیار هاشم، نازانم، سیروان عەلی ڕەزا
منالّی لای ڕاست ڕوشدی تۆفیق، هەردی تۆفیق





**بەهاری ساڵی (١٩٨٠) نمایشی وەرزشی قوتابخانەکان، بە ڕیتمی (مارش) بەشداریمان کرد**






(۱۹۸۰/۲/۱۸) هۆڵی سانەوی کچان هەڵەبجە - تیپی مۆسیقای مناڵانی مامڵێ

لەڕاستەوە: بەهمەن ئەحمەد، سەلام میر ئەحمەد، شوان عەلی مەجیلان، فەلاح حەسەن، نەوزاد محمد سۆفی، ڕزگار شیخ سدیق، ڕوشدی تۆفیق، شێرکۆ جافر، جەمیل سید قادر، گیتارەکە. سۆران کەمال

کۆرسی کچ ئەوانەی ئەیانناسمەوە: نەرمین محمد لاسلکی، پەیمانی خۆشکم، نیاز حەمەی سابیر ئەوانی تر ناناسمەوە.




لەڕاستەوە :بەهمەن ئەحمەد، سەلام میر ئەحمەد. شوان عەلی، نەوزاد محمد سۆفی، کۆرسە کچەکە: نەرمین محمد



کلارنیتەکە نازانم، شیرکۆ جافر، سۆران کەمال، جەمیل سید قادر



٢٠/٦/١٩٨٠ سەیرانی مەڵبەندی لاوانی هەڵەبجە بۆ دهۆک، نزیک پردی دەلال لە زاخۆ
لەڕاستەوە: ئازاد سالّح، هەلکەوت محمد.
ئەوەی نێوانمان جانتای کامێرا سینەماییەکەمە، چەندین وێنەی ئەو ناوچەیەم گرت بەڵام بەداخەوە فەوتان



لەڕاستەوە :بەهمەن ئەحمەد :ئیسماعیل حەسەن :ئاراس شێخ جەمال .حیکمەت تۆفیق هەلکەوت محمد
لە دواوە ئیسماعیل سعید ،عزیز حەمە کەریم بە پێوە ئازاد سالەح : گۆرانی بێژەکە سیروان عەلی ڕەزا



چالاکی ١٩٨٠



تیپی مناڵانی ماملێ ١٩٨٠



لەڕاستەوە: ڕزگار شێخ سدیق -ڕوشدی تۆفیق، شێرکۆ جافر، جمیل سید قادر





**سەرەتای ساڵی (٢٠٠٠)**

**لە ڕاستەوە: ئازاد ساڵح، هونەرمەندی گەورە مەزهەری خالقی، نیاز محمد، خلیل عەبدوڵا**



**لەراستەوە: ڕەوان شاد سابیر کوردستانی, ئازاد ساڵح سەیرانێک لە دوکان  ساڵانی نەوەدەکان**



کۆتایی نەوەدەکان. وێنەیەکی یادگاری لەگەڵ هونەرمەند بێژەن کامگار



کۆتایی نەوەدەکان. وێنەیەکی یادگاری لەگەڵ هونەرمەندی گۆرانی بێژ  حسەینی شەریفی

# پێڕست